# سنن الترمذي بە کوردی بە سەرجەم وتەکانی (ترمذي)ەوە- بەرگی یەکەم

نووسینی: لأبي عيسى محمد بن عيسى (الترمذي)

وەرگێڕانی: ناصح ئیبراهیم سازانی



چاپی یەکەم ١٤٤٢ك – ٢٠٢١ز



**نوسینگەی تەفسیر**

بۆچاپ و بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

سازانی، ناصح ئیبراهیم

سنن الترمذي بە کوردی - بەرگی یەکەم، لأبي عيسى محمد بن عيس (الترمذي)، ناصح ئیبراهیم سازانی(وەرگێڕ)

٨٨٤ لاپەڕە،

١٧* ٢٤ سم

بابەت، فەرموودە

ISBN: 978-9922-632-89-6

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٧٥) ی ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە.



دیزاین: نوسینگەی تەفسیر

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

# سنن الترمذي

## بەکوردی

لأبی عیسی محمد بن عیسی الترمذی
(٢٠٩ - ٢٧٩ هـ)

بەرگی یەکەم

لە فەرموودەی
(1080-1)

وەرگێرانی
ناصح ئیبراهیم سازانی

# پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْـدَ للهِ نَحْمَـدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ ونَعُـوذُ باللهِ مِن شُـرُورِ أنفُسِـنَا وسَـيِّئَاتِ أعْمَالِنَا مَن يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وأشْهَدُ أن لاَّ إلَهَ إلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

لەدوایدا: خوای گەورەو پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر: ٧. واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێیدان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت: (مَنْ أحْدَثَ فِي أمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)[1]. واتە: هەر کەسێك شتێك لەم دین و شەرعەی ئێمە زیاد بکات کە تیایدا نەبێت، ئەوە لێی قبولّ ناکرێت و دەدرێتەدواوە.

سوپاس بۆ خوای گەورە لەپاش ئەوەی لە وەرگێڕانی (سوننەنی ئەبو داود) بوومەوە و جێگەی رەزامەندی زۆرێك لە خوێنەرانی خۆشەویست بوو، بریارمدا سوننەنی (الترمذي)یش وەرگێڕم، بێگومان ئەم پەرتوکە بەنرخەش تا ئێستا وەرنەگێڕراوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، یەکێکە لە باشترین کتێبەکانی

---

[1] مُتَفَقٌ عَلَيْهِ. أخرجه البخاري ٣/٢٤١ ( ٢٦٩٧ ) ، ومسلم ٥/١٣٢ ( ١٧١٨) ( ١٧) و(١٨).

فــەرمووده، ریزبەندیەکــەی رێکوپێکــەو دووپاتبونــەوەی کەمــە، راڤــەی خــۆی و بەراوردکردن و شیکاری ســەنەد و، دیـاریکردنی صـحیح و حەســەن و لاوازی تێـدا رونکراوەتەوەو ئەحکامی شەرعی و، زانستی (جرح والتعدیل)ی تێدایە.

ناصح سازانی

سلێمانی ٢٠١٥ - ١٤٣٦ کۆچی

# کتێبی پاکژی لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم

## ١- كِتاب الطَّهَارَةِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### دەربارەی نوێژ وەرناگیرێ بەبێ دەستنوێژ

### ١ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ

١- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ (ح) وحَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلاَ صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ). قَالَ هَنَّادٌ فِي حَدِيثِهِ: (إِلاَّ بِطُهُورٍ). هَذَا الْحَدِيثُ أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ وَأَحْسَنُ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ. وَأَبُو الْمَلِيحِ بْنُ أُسَامَةَ اسْمُهُ عَامِرٌ، وَيُقَالُ: زَيْدُ بْنُ أُسَامَةَ بْنِ عُمَيْرٍ الْهُذَلِيُّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نوێژ بەبێ لەشی پاك و دەستنوێژ وەرناگیرێ، هەروەها خێر و سەدەقەی دزی و ناپاکی لە دەستکەوتی جەنگی(غەنیمە)ش وەرناگرێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی دەستنوێژ

## ٢- بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الطُّهُورِ

٢- (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَى الْقَزَّازُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ، أَوِ الْمُؤْمِنُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَتْ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ، أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، أَوْ نَحْوَ هَذَا، وَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَتْ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ، أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو صَالِحٍ وَالِدُ سُهَيْلٍ هُوَ أَبُو صَالِحٍ السَّمَّانُ، وَاسْمُهُ ذَكْوَانُ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ اخْتُلِفَ فِي اسْمِهِ، فَقَالُوا: عَبْدُ شَمْسٍ، وَقَالُوا: عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو، وَهَكَذَا قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، وَهَذَا الأَصَحُّ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَثَوْبَانَ، وَالصُّنَابِحِيِّ، وَعَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ، وَسَلْمَانَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَالصُّنَابِحِيُّ هَذَا الَّذِي رَوَى عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، لَيْسَ لَهُ سَمَاعٌ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَاسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عُسَيْلَةَ، وَيُكْنَى أَبَا عَبْدِ اللهِ، رَحَلَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُبِضَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي الطَّرِيقِ، وَقَدْ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَادِيثَ. وَالصُّنَابِحُ بْنُ الأَعْسَرِ الأَحْمَسِيُّ صَاحِبُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يُقَالُ لَهُ: الصُّنَابِحِيُّ أَيْضًا، وَإِنَّمَا حَدِيثُهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: إِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ فَلاَ تَقْتَتِلُنَّ بَعْدِي.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێرنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێك بەندەی موسڵمان ـ یان باوەڕدار ـ دەستنوێژ دەگرێت ئەو گوناهانەی بە چاوەکانی کردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی

ئاوی دەستنوێژەکەدا دەوەرن یـان لەگـەڵ دوا دڵـۆپی ئاوەکـەدا دادەکـەون و دەڕۆن، کەدەستی دەشوات ئەو گوناهانەی بە دەستەکانی کردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئـاوی دەسـتنوێژەکەدا دەوەرن یـان لەگـەڵ دوا دڵـۆپی ئاوەکـەدا دادەکـەون و دەڕۆن، کـە هەردوو قاچی دەشـوات هـەروەها... بەوشـێوەیە هـەتا پـاك دەبێتـەوە لـە گونـاهو تاوان).

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویـەتی: (مـن لەناو گەلاندا شانازی بە زۆریتانـەوە دەکـەم، لـەپاش مـن یـەکتر مـەکوژن و یـەکتر مەبڕێننەوە).

## ئەوەی هاتوە دەربارەی کلیلی نوێژ دەستنوێژە

٣ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ مِفْتَاحَ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ

٣- (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَهَنَّادٌ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالُوا: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ (ح) وحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ). هَذَا الْحَدِيثُ أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ وَأَحْسَنُ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ هُوَ صَدُوقٌ، وَقَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وسَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، يَقُولُ: كَانَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَإِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، وَالْحُمَيْدِيُّ، يَحْتَجُّونَ بِحَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، قَالَ مُحَمَّدٌ: وَهُوَ مُقَارِبُ الْحَدِيثِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە پێشـەوا عەلیـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەر

(صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووییەتی: (کلیلی نوێـژ لـەش پـاکی و دەسـتنوێژە، دابەستنی بە (الله أكبر) دەست پێ دەکات، بە سەلام دانەوەش تەواو دەکرێت).

٤- (ضعيف. والشطر الثاني صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ زَنْجَوَيْهِ الْبَغْدَادِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ قَرْمٍ، عَنْ أَبِي يَحْيَى الْقَتَّاتِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ الصَّلاَةُ، وَمِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الْوُضُوءُ).

واتـە: لـە جـابری کـوڕی (عبـد الله) وە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی:پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کلیلـی بەهەشـت نوێژە، کلیلی نوێژیش لەش پاکی و دەستنوێژە).

## کاتێ کەسێ ویستی بچێتە سەرئاو چی بڵێت.

٤ – بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ.

٥- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ، قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ) قَالَ شُعْبَةُ: وَقَدْ قَالَ مَرَّةً أُخْرَى: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبِيثِ، أَوِ: الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ). فِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ وَأَحْسَنُ. وَحَدِيثُ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ فِي إِسْنَادِهِ اضْطِرَابٌ: رَوَى هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ، وَسَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، فَقَالَ سَعِيدٌ: عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عَوْفٍ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، وَقَالَ هِشَامٌ: عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، وَرَوَاهُ شُعْبَةُ، وَمَعْمَرٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، فَقَالَ شُعْبَةُ: عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، وَقَالَ مَعْمَرٌ: عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ ، عن النبي صلى الله عليه وسلم. سَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا، فَقَالَ: يُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ قَتَادَةُ رَوَى عَنْهُمَا جَمِيعًا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەرکاتێ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیویستایە بچێتە سەرئاو، دەیفەرموو: (خوایە پەنا دەگرم بە تۆ). شوعبە وتی: جارێکی تر بەم شێوەیەی فەرموو: (خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپەی خراپەکارانی نێر و مێی جنۆکەکان).
– قاچی چەپی پێش دەخست –.

٦– (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ، قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە هەرکاتێ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیویستایە بچێتە سەرئاو، دەیفەرموو: (خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپەی خراپەکارانی نێر و مێی جنۆکەکان).

## کەسێ دەرچوو لەسەرئاو چی بلێت.

٥ – بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْخَلاَءِ

٧– (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْخَلاَءِ، قَالَ: (غُفْرَانَكَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ. وَأَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى، اسْمُهُ عَامِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ الأَشْعَرِيُّ. وَلاَ يُعْرَفُ فِي هَذَا الْبَابِ إِلاَّ حَدِيثُ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) لەسەرئاو دەربچوایە، دەیفەرموو: (غُفْرَانَكَ). واتە: خودایە داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم. — قاچی راستی پێش دەخست -.

قەدەغەکردنی رووکردنە قیبلە لەسەرئاو.

٦ - بَابٌ فِي النَّهْيِ عَنِ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ بِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ

٨- (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَتَيْتُمُ الْغَائِطَ فَلاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ وَلاَ بَوْلٍ، وَلاَ تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا). قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّامَ فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ مُسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْهَا، وَنَسْتَغْفِرُ اللَّهَ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ الزُّبَيْدِيِّ، وَمَعْقِلِ بْنِ أَبِي الْهَيْثَمِ، وَيُقَالُ: مَعْقِلُ بْنُ أَبِي مَعْقِلٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ. حَدِيثُ أَبِي أَيُّوبَ أَحْسَنُ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ وَأَصَحُّ. وَأَبُو أَيُّوبَ اسْمُهُ خَالِدُ بْنُ زَيْدٍ، وَالزُّهْرِيُّ اسْمُهُ مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ شِهَابٍ الزُّهْرِيُّ، وَكُنْيَتُهُ أَبُو بَكْرٍ. قَالَ أَبُو الْوَلِيدِ الْمَكِّيُّ: قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ الشَّافِعِيُّ: إِنَّمَا مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ وَلاَ بَوْلٍ، وَلاَ تَسْتَدْبِرُوهَا، إِنَّمَا هَذَا فِي الْفَيَافِي، فَأَمَّا فِي الْكُنُفِ الْمَبْنِيَّةِ لَهُ رُخْصَةٌ فِي أَنْ يَسْتَقْبِلَهَا، وَهَكَذَا قَالَ إِسْحَاقُ. وقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: إِنَّمَا الرُّخْصَةُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي اسْتِدْبَارِ الْقِبْلَةِ بِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ، فَأَمَّا اسْتِقْبَالُ الْقِبْلَةِ فَلاَ يَسْتَقْبِلُهَا، كَأَنَّهُ لَمْ يَرَ فِي الصَّحْرَاءِ وَلاَ فِي الْكُنُفِ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ.

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر چوونە سەرئاو بۆ پیسایی کردن و میزکردن ڕوو مەکەنە قیبلەو پشتیشی تێ مەکەن، بەڵکو روو بکەنە ڕۆژهەڵات یان روو بکەنە خۆرئاوا). ئەبو ئەیوب ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: کاتێك کە هاتینە شام بینیمان ئاودەستەکان بەرەو ڕووی قیبلە دروستکراون، ئێمەش ڕوومان وەردەگێڕا لە قیبلەو دوای لێ خۆشبوونمان دەکرد لە خوای گەورە.

ئەبو (عبد الله) شافیعی دەفەرمووێت: ئەمە بۆ بیابان و دەشت و دەرە، بەڵام لەناو ئەم سەرئاوانەی ئەمڕۆدا کە چواردەوریان گیراوە روخسەت هەیە و دروستە. پێشەوا ئەحمەد دەفەرمووێت: بۆ هیچیان ڕوو کردنە قیبلە دروست نیە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی روخسەتی ڕووکردنە قیبلە

٧ - بَابُ مَا جَاءَ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

٩- (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبَانَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِبَوْلٍ، فَرَأَيْتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ بِعَامٍ يَسْتَقْبِلُهَا. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، وَعَائِشَةَ، وَعَمَّارٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ فِي هَذَا الْبَابِ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێی قەدەغەکردبووین کە بەرەو قیبلە میز بکەین، بەڵام ساڵێ پێش ئەوەی وەفات بکات بینیم بەرەو قیبلە دەستی بەئاو دەگەیاند.

١٠ – (ضعيف الإسناد) وَقَدْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبُولُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ. أَخْبَرَنَا بِذَلِكَ قُتَيْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ. وَحَدِيثُ جَابِرٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ. وَابْنُ لَهِيعَةَ ضَعِيفٌ عِنْدَ أَهْلِ الْحَدِيثِ؛ ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ وَغَيْرُهُ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە هاتووە، کە پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە بەرەو قیبلە میزی دەکرد.

١١ – حَدَّثَنَا هَنَّادٌ قال: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَمِّهِ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: رَقِيتُ يَوْمًا عَلَى بَيْتِ حَفْصَةَ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى حَاجَتِهِ مُسْتَقْبِلَ الشَّامِ مُسْتَدْبِرَ الْكَعْبَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژێ سەرکەوتم بۆ سەربانیماڵی حەفصە - ی خوشکم ڕەزای خوای لێ بێ کە هاوسەری پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو - ، پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بینی دەستی بەئاو دەگەیاند ڕووی کردبووە شام و پشتی لە کەعبە بوو.

### قەدەغەکردنی میزکردن بە پێوە.

٨ – بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْبَوْلِ قَائِمًا

١٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَنْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَبُولُ قَائِمًا فَلاَ تُصَدِّقُوهُ، مَا كَانَ يَبُولُ إِلاَّ قَاعِدًا. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُمَرَ، وَبُرَيْدَةَ. حَدِيثُ

عَائِشَةَ أَحْسَنُ شَيْءٍ فِي الْبَابِ وَأَصَحُّ. وَحَدِيثُ عُمَرَ إِنَّمَا رُوِيَ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الْكَرِيمِ بْنِ أَبِي الْمُخَارِقِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ، قَالَ: رَآنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبُولُ قَائِمًا، فَقَالَ: يَا عُمَرُ، لاَ تَبُلْ قَائِمًا، فَمَا بُلْتُ قَائِمًا بَعْدُ. وَإِنَّمَا رَفَعَ هَذَا الْحَدِيثَ عَبْدُ الْكَرِيمِ بْنُ أَبِي الْمُخَارِقِ، وَهُوَ ضَعِيفٌ عِنْدَ أَهْلِ الْحَدِيثِ؛ ضَعَّفَهُ أَيُّوبُ السَّخْتِيَانِيُّ وَتَكَلَّمَ فِيهِ. وَرَوَى عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ: مَا بُلْتُ قَائِمًا مُنْذُ أَسْلَمْتُ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الْكَرِيمِ. وَحَدِيثُ بُرَيْدَةَ فِي هَذَا غَيْرُ مَحْفُوظٍ. وَمَعْنَى النَّهْيِ عَنِ الْبَوْلِ قَائِمًا عَلَى التَّأْدِيبِ لاَ عَلَى التَّحْرِيمِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: إِنَّ مِنَ الْجَفَاءِ أَنْ تَبُولَ وَأَنْتَ قَائِمٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: هەرکەس بۆی گێڕانەوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە پێوە میزی کردووە باوەڕی پێ مەکەن، چونکە هەمیشە بە دانیشنەوە میزی دەکرد.

لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بە پێوە میزم دەکرد پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بینیمی، فەرمووی: (ئەی عومەر، بە پێوە میز مەکە)، ئیتر لەدوای ئەوە هەرگیز بەپێوە میزم نەدەکرد.

پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: لەوەتی موسوڵمان بووم هەرگیز بەپێوە میزم نەکردووە.

مانای قەدەغەکردنی میزکردن بە پێوە بۆ ئەدەبە نەك لەبەر ئەوەی کە حەرامە.

لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بێگومان لەکاتێکدا کە تۆ بە پێوە بی و میز دەکەیت ئەوە لە زوڵم و ستەم و دڵ ڕەقیەوەیە، وە دوورکەوتنەوەیە لە خێر و چاکە.

## دەربارەی روخسەت لە بەپێوە میزکردندا

٩- بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ، فَبَالَ عَلَيْهَا قَائِمًا، فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوءٍ، فَذَهَبْتُ لأَتَأَخَّرَ عَنْهُ، فَدَعَانِي حَتَّى كُنْتُ عِنْدَ عَقِبَيْهِ، فَتَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ.

واتە: لە (حُذَيْفَة)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چووە سەر سەرەنوێلکی قەومێك - ئەو شوێنەی کە خۆڵ و خاشاك و زبڵی تێ دەکرێت - بە پێوە میزی کرد، ئاوم بۆ برد بۆ ئەوەی دەستنوێژی پێ بگرێت، جا رۆشتم بۆ ئەوەی لێی دووربکەومەوە، بانگی کردم کە نزیك ببمەوە بۆ ئەوەی ببمە حەشارگە بۆی و نەیبینن، منیش رۆشتم هەتا گەیشتمە لای پاژنەپێکانی، جا دەستنوێژی گرت و مەسحی (خُف)کاڵەکانی کرد.

١٣م- وسَمِعْت الْجَارُودَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا يُحَدِّثُ بِهَذَا الْحَدِيثِ، عَنِ الأَعْمَشِ، ثُمَّ قَالَ وَكِيعٌ: هَذَا أَصَحُّ حَدِيثٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْحِ.

١٣م/٢ - وسَمِعْت أَبَا عَمَّارٍ الْحُسَيْنَ بْنَ حُرَيْثٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا، فَذَكَرَ نَحْوَهُ. وَهَكَذَا رَوَى مَنْصُورٌ، وَعُبَيْدَةُ الضَّبِّيُّ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ، مِثْلَ رِوَايَةِ الأَعْمَشِ. وَرَوَى حَمَّادُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، وَعَاصِمُ بْنُ بَهْدَلَةَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَحَدِيثُ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ أَصَحُّ. وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي الْبَوْلِ قَائِمًا.

بێگومان هەندێ لە زانایان پێیان وایە میزکردن بەپێوە دروستە.

## دەربارەی خۆحەشاردان لەكاتی دەست بە ئاوگەیاندندا

### ١٠ - بَابٌ فِي الِاسْتِتَارِ عِنْدَ الْحَاجَةِ

١٤- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ الْحَاجَةَ لَمْ يَرْفَعْ ثَوْبَهُ حَتَّى يَدْنُوَ مِنَ الأَرْضِ. هَكَذَا رَوَى مُحَمَّدُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَنَسٍ، هَذَا الْحَدِيثَ. وَرَوَى وَكِيعٌ، وَالْحِمَّانِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ الْحَاجَةَ لَمْ يَرْفَعْ ثَوْبَهُ حَتَّى يَدْنُوَ مِنَ الأَرْضِ. وَكِلاَ الْحَدِيثَيْنِ مُرْسَلٌ، وَيُقَالُ: لَمْ يَسْمَعِ الأَعْمَشُ مِنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَلاَ مِنْ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ نَظَرَ إِلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: رَأَيْتُهُ يُصَلِّي فَذَكَرَ عَنْهُ حِكَايَةً فِي الصَّلاَةِ. وَالأَعْمَشُ اسْمُهُ سُلَيْمَانُ بْنُ مِهْرَانَ أَبُو مُحَمَّدٍ الْكَاهِلِيُّ، وَهُوَ مَوْلًى لَهُمْ. قَالَ الأَعْمَشُ: كَانَ أَبِي حَمِيلاً فَوَرَّثَهُ مَسْرُوقٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیویست دەست بەئاو بگەیەنێت هەتا تەواو لە زەوی نزیك نەبوایەتەوە جلەكانی بەرزنەدەكردەوە.

ئیبنو عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیویست دەست بەئاو بگەیەنێت جلەكانی بەرزنەدەكردەوە هەتا تەواو لەزەوی نزیك نەبوایەتەوە.

## خۆپاككردنەوە بەدەستی ڕاست باش نیە

### ١١ - بَابٌ فِي كَرَاهَةِ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْيَمِينِ

١٥- (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عُمَرَ الْمَكِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَمَسَّ الرَّجُلُ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ. وَفِي الْبَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَسَلْمَانَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو قَتَادَةَ، اسْمُهُ الْحَارِثُ بْنُ رِبْعِيٍّ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: كَرِهُوا الاِسْتِنْجَاءَ بِالْيَمِينِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبی قەتادەوە لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قەدەغەیکردووە پیاو لەکاتی میزکردندا بە دەستی ڕاستی زەکەری بگرێت.

کەواتە بەپەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان خۆپاککردنەوەیان بەدەستی ڕاست پێ باش نیە.

## خۆپاککردنەوە بە بەرد.

١٢ - بَابُ الاِسْتِنْجَاءِ بِالْحِجَارَةِ

١٦- (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: قِيلَ لِسَلْمَانَ: قَدْ عَلَّمَكُمْ نَبِيُّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلَّ شَيْءٍ، حَتَّى الْخِرَاءَةَ، فَقَالَ سَلْمَانُ: أَجَلْ نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ أَوْ بِبَوْلٍ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ، أَوِ أَنْ يَسْتَنْجِيَ أَحَدُنَا بِأَقَلَّ مِنْ ثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ بِعَظْمٍ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَخُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ، وَجَابِرٍ، وَخَلاَّدِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ. وحَدِيثُ سَلْمَانَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ: رَأَوْا أَنَّ الاِسْتِنْجَاءَ بِالْحِجَارَةِ يُجْزِئُ، وَإِنْ لَمْ يَسْتَنْجِ بِالْمَاءِ، إِذَا أَنْقَى أَثَرَ الْغَائِطِ وَالْبَوْلِ، وَبِهِ يَقُولُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی یەزیدەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە سەلمانی فارسی وترا: ئێوە پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێرکردوون، تەنانەت دەستوری دەست بەئاو گەیاندنیش؟ سەلمانیش وتی: بەڵێ وایە، ئەوەتە لێی قەدەغەکردووین لەکاتی دەست بەئاو گەیاندا ڕوو بکەینە قیبلە، یان بە دەستی ڕاست خۆمان پاك بکەینەوە، یان یەکێکمان بە سێ بەرد کەمتر خۆی پاك بکاتەوە، یا بە پاشەڕۆی ئاژەڵان وەك: تەپاڵەو پشقل یان بە ئێسك و شتی وا خۆمان پاك بکەینەوە.

ئەمەش وتەی زۆرینەی زانایانە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و، ئەوانەی دوای ئەوانیش: ڕاو بۆچوونیان وایە لە جیاتی ئاو خۆپاککردنەوە بە بەرد بەسەو دروستە، ئەگەر شوێنەواری میز و پاشەڕۆکە بە بەرد نەدەماو پاك دەبووەوە، پێشەوایان (ثوری) و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقیش ئەمە دەفەرموون.

## دەربارەی خۆپاککردنەوە بە دوو بەرد.

### ١٣ - بَابٌ فِي الاِسْتِنْجَاءِ بِالْحَجَرَيْنِ

١٧- (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَقُتَيْبَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَال: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِحَاجَتِهِ، فَقَال: الْتَمِسْ لِي ثَلاَثَةَ أَحْجَارٍ، قَال: فَأَتَيْتُهُ بِحَجَرَيْنِ وَرَوْثَةٍ، فَأَخَذَ الْحَجَرَيْنِ، وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ، وَقَال: إِنَّهَا رِكْسٌ. وَهَكَذَا رَوَى قَيْسُ بْنُ الرَّبِيعِ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ نَحْوَ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ. وَرَوَى مَعْمَرٌ، وَعَمَّارُ بْنُ رُزَيْقٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ. وَرَوَى زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ

الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ. وَرَوَى زَكَرِيَّا بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ. وَهَذَا حَدِيثٌ فِيهِ اضْطِرَابٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەرچوو بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، فەرمووی: سێ بەردم بۆ بێنە، (عبد الله) وتی: منیش دوو بەردوو پارچەیە ڕیخ یان تەرس یا تەپاڵەم بۆ برد، دوو بەردەکەی وەرگرت و ئەوی تری فڕێدا، فەرمووی: (بەڕاستی ئەمە پیسە).

١٧م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، هَلْ تَذْكُرُ مِنْ عَبْدِ اللهِ شَيْئًا؟ قَالَ: لاَ. سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَيُّ الرِّوَايَاتِ فِي هَذَا عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ أَصَحُّ؟ فَلَمْ يَقْضِ فِيهِ بِشَيْءٍ، وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا، فَلَمْ يَقْضِ فِيهِ بِشَيْءٍ وَكَأَنَّهُ رَأَى حَدِيثَ زُهَيْرٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، أَشْبَهَ، وَوَضَعَهُ فِي كِتَابِ الْجَامِعِ. وَأَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا عِنْدِي حَدِيثُ إِسْرَائِيلَ، وَقَيْسٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، لأَنَّ إِسْرَائِيلَ أَثْبَتُ وَأَحْفَظُ لِحَدِيثِ أَبِي إِسْحَاقَ مِنْ هَؤُلاَءِ، وَتَابَعَهُ عَلَى ذَلِكَ قَيْسُ بْنُ الرَّبِيعِ. وسَمِعْت أَبَا مُوسَى مُحَمَّدَ بْنَ الْمُثَنَّى، يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ مَهْدِيٍّ، يَقُولُ: مَا فَاتَنِي الَّذِي فَاتَنِي مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، إِلاَّ لِمَا اتَّكَلْتُ بِهِ عَلَى إِسْرَائِيلَ، لأَنَّهُ كَانَ يَأْتِي بِهِ أَتَمَّ. وَزُهَيْرٌ فِي أَبِي إِسْحَاقَ لَيْسَ بِذَاكَ لأَنَّ سَمَاعَهُ مِنْهُ بِأَخِرَةٍ. وَسَمِعْت أَحْمَدَ بْنَ الْحَسَنِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ، يَقُولُ: إِذَا سَمِعْتَ الْحَدِيثَ عَنْ زَائِدَةَ، وَزُهَيْرٍ، فَلاَ تُبَالِي أَنْ لاَ تَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِهِمَا إِلاَّ حَدِيثَ أَبِي إِسْحَاقَ. وَأَبُو إِسْحَاقَ اسْمُهُ عَمْرُو بْنُ عَبْدِ اللهِ

السَّبِيعِيُّ الْهَمْدَانِيُّ. وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ وَلاَ يُعْرَفُ اسْمُهُ.

## ئەو شتانەی کە باش نین بۆ خۆ پاککردنەوە.

### ١٤ - بَابُ كَرَاهِيَةِ مَا يُسْتَنْجَى بِهِ

١٨- (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَسْتَنْجُوا بِالرَّوْثِ، وَلاَ بِالْعِظَامِ، فَإِنَّهُ زَادُ إِخْوَانِكُمْ مِنَ الْجِنِّ). وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَلْمَانَ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، وَغَيْرُهُ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْجِنِّ، الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، فَقَالَ الشَّعْبِيُّ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَسْتَنْجُوا بِالرَّوْثِ، وَلاَ بِالْعِظَامِ، فَإِنَّهُ زَادُ إِخْوَانِكُمْ مِنَ الْجِنِّ. وَكَأَنَّ رِوَايَةَ إِسْمَاعِيلَ أَصَحُّ مِنْ رِوَايَةِ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الْحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ.

**واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بە تەرس و تەپاڵەو ریخ، یان بە ئێسك و پروسك خۆتان پاك مەكەنەوە، چونكە ڕۆزی و خواردنی برا جنۆكەكانتانن).**

## خۆپاککردنەوە بە ئاو.

### ١٥ - بَابُ الاِسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ

١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُعَاذَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مُرْنَ أَزْوَاجَكُنَّ أَنْ يَسْتَطِيبُوا بِالمَاءِ، فَإِنِّي أَسْتَحْيِيهِمْ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَفْعَلُهُ. وَفِي البَابِ عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ البَجَلِيِّ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَعَلَيْهِ العَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، يَخْتَارُونَ الاِسْتِنْجَاءَ بِالمَاءِ، وَإِنْ كَانَ الاِسْتِنْجَاءُ بِالحِجَارَةِ يُجْزِئُ عِنْدَهُمْ، فَإِنَّهُمْ اسْتَحَبُّوا الاِسْتِنْجَاءَ بِالمَاءِ، وَرَأَوْهُ أَفْضَلَ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە بە ئافرەتانی فەرموو: فەرمان بکەن بە هاوسەرانتان با بەئاو خۆیان پاك بکەنەوە، چونکە من شەرمیان لێ دەکەم بۆیان بەیان بکەم، بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەو کارەی دەکرد واتە بە ئاو خۆی پاك دەکردەوە.

زانایان کار بەم فەرموودە دەکەن و ئەمەیان هەڵبژاردووە، هەرچەندە بەلایانەوە خۆپاککردنەوە بە بەرد دروستە، بەڵام خۆپاککردنەوەیان بە ئاو بەلاوە باشترە، پێشەوایان (ثوری) و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

## پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا دوور دەکەوتەوە.

١٦ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

كَانَ إِذَا أَرَادَ الْحَاجَةَ أَبْعَدَ فِي الْمَذْهَبِ

٢٠- (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَال: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَأَتَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَاجَتَهُ، فَأَبْعَدَ فِي الْمَذْهَبِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي قُرَادٍ، وَأَبِي قَتَادَةَ، وَجَابِرٍ، وَيَحْيَى بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَأَبِي مُوسَى، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَبِلاَلِ بْنِ الْحَارِثِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيُرْوَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ كَانَ يَرْتَادُ لِبَوْلِهِ مَكَانًا كَمَا يَرْتَادُ مَنْزِلاً. وَأَبُو سَلَمَةَ اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ الزُّهْرِيُّ.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەفەرێدا لە خزمەت پێغەمبەردا بووم (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) کە دەچوو بۆ دەست بە ئاو گەیاندن تەواو دووردەکەوتەوە لە خەڵك.

هەروەها لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە بۆ میزکردن شوێنی نەرمانی هەڵدەبژاد بۆ ئەوەی پرشی میزەکەی نەگەڕێتەوە بۆی و بەری نەکەوێت.

## میزكردنە ناو شوێنی خۆشتن كارێكی باش نیە.

### ١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الْبَوْلِ فِي الْمُغْتَسَلِ

٢١ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، وَأَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ مُوسَى مَرْدَوَيْهِ، قَالاَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَبُولَ الرَّجُلُ فِي مُسْتَحَمِّهِ، وَقَالَ: (إِنَّ عَامَّةَ الوَسْوَاسِ مِنْهُ). وَفِي الْبَابِ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَشْعَثَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَيُقَالُ لَهُ أَشْعَثُ الأَعْمَى. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ الْبَوْلَ فِي الْمُغْتَسَلِ، وَقَالُوا: عَامَّةُ الْوَسْوَاسِ مِنْهُ، وَرَخَّصَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْهُمْ ابْنُ سِيرِينَ، وَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُ يُقَالُ: إِنَّ عَامَّةَ الْوَسْوَاسِ مِنْهُ، فَقَالَ: رَبُّنَا اللَّهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ. وقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: قَدْ وُسِّعَ فِي الْبَوْلِ فِي الْمُغْتَسَلِ إِذَا جَرَى فِيهِ الْمَاءُ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الآمُلِيُّ، عَنْ حِبَّانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی موغەففەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله وسلم قەدەغەیكردووە كەسێ میز بكاتە گەرماوەكەی یان شوێنی خۆشتنەكەی. هەروەها فەرمووی: بێگومان سەرجەم وەسوەسەی شەیتان لەوەوە دروست دەبێت.

بێگومان هەندێ لە زانایان میزكردنە ناو شوێنی خۆشتنیان پێ باش نیە، دەفەرموون: سەرجەم وەسوەسەی شەیتان لەوەوەیە. بەڵام هەندێ لە زانایان ڕێگەیان داوە لەوانە: ئیبنو سیرین، پێی وترا: سەرجەم وەسوەسەی شەیتان لەوەوەیە، فەرمووی: پەروەردگارمان (الله)یە، هاوەڵ و هاوبەشی نیە، ئیبنو موبارەك

دەفەرمووێت: بۆ میزکردنە شوێنی خۆشتن بابەتەکە بواری تێدایەو بەرفراوانە ئەگەر ئاوەکە بڕوات قەیدی نیەو دروستە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سیواك كردن.

١٨ – بَابُ مَا جَاءَ فِي السِّوَاكِ

٢٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ). وَقَدْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَحَدِيثُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِلاَهُمَا عِنْدِي صَحِيحٌ لأَنَّهُ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الْحَدِيثُ، وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ، إِنَّمَا صَحَّ لأَنَّهُ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ. وَأَمَّا مُحَمَّدٌ فَزَعَمَ أَنَّ حَدِيثَ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ أَصَحُّ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَعَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَابْنِ عُمَرَ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَتَمَّامِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ حَنْظَلَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَوَاثِلَةَ، وَأَبِي مُوسَى. وَأَمَّا مُحَمَّدٌ فَزَعَمَ أَنَّ حَدِيثَ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ أَصَحُّ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَعَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَابْنِ عُمَرَ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَتَمَّامِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ حَنْظَلَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَوَاثِلَةَ، وَأَبِي مُوسَى.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە دەبووە زەحمەت و بارگرانی و ئەرکی زۆر بەسەر ئوممەتەکەمەوە ئەوا فەرمانم پێ دەکردن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا سیواك بکەن).

٢٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، قَال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: (لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَلأَخَّرْتُ صَلاَةَ الْعِشَاءِ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ). قَال: فَكَانَ زَيْدُ بْنُ خَالِدٍ يَشْهَدُ الصَّلَوَاتِ فِي الْمَسْجِدِ وَسِوَاكُهُ عَلَى أُذُنِهِ مَوْضِعَ الْقَلَمِ مِنْ أُذُنِ الْكَاتِبِ لاَ يَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ إِلاَّ اسْتَنَّ ثُمَّ رَدَّهُ إِلَى مَوْضِعِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە، لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە دەبووە زەحمەت و بارگرانی و ئەرکی زۆر بەسەر ئوممەتەکەمەوە ئەوا فەرمانم پێ دەکردن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا سیواك بکەن، وە نوێژی عیشاشم دوادەخست بۆ سێ یەکی شەو). ئەبو سەلەمە وتی: زەیدی کوڕی خالید ئامادەی پێنج فەرزەی نوێژ دەبوو لە مزگەوت سیواکەکەی بە گوێچکەوە بوو ئەو شوێنەی کە نوسەر قەڵەمی لێ دادەنێت، هەرکاتێك هەستایە بۆ نوێژ سیواکی دەکرد، لەپاشدا دەیخستەوە شوێنی خۆی.

**دەربارەی ئەگەر کەسێ لە خەو هەستا با دەستی نەخاتە ناو ئاوی ئەو دەفرەی کە بەکاری دەهێنێ هەتا نەیشوات.**

١٩ – بَابُ مَا جَاءَ إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ، فَلاَ يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا

٢٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ أَحْمَدُ بْنُ بَكَّارٍ الدِّمَشْقِيُّ مِنْ وَلَدِ بُسْرِ بْنِ أَرْطَاةَ صَاحِبِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلاَ يُدْخِلْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يُفْرِغَ عَلَيْهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ. وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ، وَعَائِشَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: أُحِبُّ لِكُلِّ مَنْ اسْتَيْقَظَ مِنَ النَّوْمِ قَائِلَةً كَانَتْ أَوْ غَيْرَهَا، أَنْ لاَ يُدْخِلَ يَدَهُ فِي وَضُوئِهِ حَتَّى يَغْسِلَهَا، فَإِنْ أَدْخَلَ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَهَا، كَرِهْتُ ذَلِكَ لَهُ، وَلَمْ يُفْسِدْ ذَلِكَ الْمَاءَ إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَى يَدِهِ نَجَاسَةٌ. وقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: إِذَا اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِي وَضُوئِهِ قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَهَا فَأَعْجَبُ إِلَيَّ أَنْ يُهْرِيقَ الْمَاءَ. وقَالَ إِسْحَاقُ: إِذَا اسْتَيْقَظَ مِنَ النَّوْمِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ فَلاَ يُدْخِلْ يَدَهُ فِي وَضُوئِهِ حَتَّى يَغْسِلَهَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنـەوە، کـە پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەستا بادەستی نەخاتە نـاو ئەو دەفرەوە کە ئاوی تێدایە و بەکاری دەهێنێ، هەتا دوو جار یان سـێ جـار ئـاوی لێ دەرنەهێنێ و دەستی پێ نەشوات، چونکە نازانێ دەستی بەرکوێ کـەوتووە). – یان دەستی گێڕاوە و بەر چی شتێکی پیس کەوتووە کاتێ کە لەخەودا بووە – .

پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: پێم خۆشە هەرکەس لەخەو هەستا دەستی نەخاتە ناو ئەو دەفرەوە کە ئاوی دەستنوێژی تێدایە تاکو نەیشوات، ئیتر خەوی قەیلولە بێت یان هەر خەوێکی تر، ئەگەر دەستی خستەناوی پێش ئەوەی بیشوات ئەوەم پێ باش نیە، ئەگەر دەستی پیسی پێوە نەبێت ئاوەکە پیس نابێت.

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرمووێت: ئەگەر کەسێ شەو لەخەو هەستا دەستی خستە ناو ئاوی دەستنوێژەکەی پێش ئەوەی دەستی بشوات، بەلامەوە سەیرە ئاوەکە برێژێ.

پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێت: ئەگەر کەسێ شەو یان رۆژ لەخەو هەستا با دەستی نەخاتە ناو ئاوی دەستنوێژەکەیەوە هەتا دەستی نەشوات.

## دەربارەی وتنی: (بِسْمِ اللَّهِ) لەکاتی دەستنوێژدا

### ٢٠ – بَابٌ فِي التَّسْمِيَةِ عِنْدَ الْوُضُوءِ

٢٥– (حسن) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، وَبِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ الْعَقَدِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَرْمَلَةَ، عَنْ أَبِي ثِفَالٍ الْمُرِّيِّ، عَنْ رَبَاحِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ حُوَيْطِبٍ، عَنْ جَدَّتِهِ، عَنْ أَبِيهَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: (لاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ). وَفِي الْبَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، وَأَنَسٍ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: لاَ أَعْلَمُ فِي هَذَا الْبَابِ حَدِيثًا لَهُ إِسْنَادٌ جَيِّدٌ. وقَالَ إِسْحَاقُ: إِنْ تَرَكَ التَّسْمِيَةَ عَامِدًا أَعَادَ الْوُضُوءَ، وَإِنْ كَانَ نَاسِيًا أَوْ مُتَأَوِّلاً أَجْزَأَهُ. قَالَ مُحَمَّدٌ: أَحْسَنُ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ حَدِيثُ رَبَاحِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ. وَرَبَاحُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ جَدَّتِهِ، عَنْ أَبِيهَا، وَأَبُوهَا سَعِيدُ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ. وَأَبُو ثِفَالٍ الْمُرِّيُّ اسْمُهُ ثُمَامَةُ بْنُ حُصَيْنٍ. وَرَبَاحُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، هُوَ أَبُو بَكْرِ بْنُ حُوَيْطِبٍ. مِنْهُمْ مَنْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ، فَقَالَ: عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حُوَيْطِبٍ، فَنَسَبَهُ إِلَى جَدِّهِ.

واتــە: لــە رەبــاحی کــوڕی (عبــد الــرحمن)ی کــوڕی ئــەبو ســوفیانی کــوڕی (حُوَيْطِبٍ)ەوە، لە نەنکیەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کـە فەرموویـەتی: بـۆ خـۆم گوێم لە پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) بـوو دەیفـەرموو: (دەسـتنوێژ بـۆ کەسێك نیە لەسەرەتاوە (بسم الله) نەکات).

پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێت: ئەگەر کەسـێ بـە قەسـتی تـەرکی وتنـی: (بِسْمِ اللَّهِ)ی کرد لەکاتی دەستنوێژدا بـا دەسـتنوێژەکەی دووبـارە بکاتـەوە، بـەڵام ئەگـەر لەبیری چوو یان تەئویلی کرد ئەوە دەستنوێژەکەی دروستە.

٢٦ – حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الْحُلْوَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عِيَاضٍ، عَنْ أَبِي ثِفَالٍ الْمُرِّيِّ، عَنْ رَبَاحِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ حُوَيْطِبٍ، عَنْ جَدَّتِهِ بِنْتِ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِيهَا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاو رادان لە دەم و لوت.

### ٢١ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَضْمَضَةِ وَالِاسْتِنْشَاقِ

٢٧– (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، وَجَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ هِلَالِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا تَوَضَّأْتَ فَانْتَثِرْ، وَإِذَا اسْتَجْمَرْتَ فَأَوْتِرْ). وَفِي الْبَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَلَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَالْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ، وَوَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ سَلَمَةَ بْنِ قَيْسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِيمَنْ تَرَكَ الْمَضْمَضَةَ وَالِاسْتِنْشَاقَ، فَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: إِذَا تَرَكَهُمَا فِي الْوُضُوءِ حَتَّى صَلَّى أَعَادَ الصَّلَاةَ، وَرَأَوْا ذَلِكَ فِي الْوُضُوءِ وَالْجَنَابَةِ سَوَاءً، وَبِهِ يَقُولُ ابْنُ أَبِي لَيْلَى، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وقَالَ أَحْمَدُ: الِاسْتِنْشَاقُ أَوْكَدُ مِنَ الْمَضْمَضَةِ. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ

أَهْلِ الْعِلْمِ: يُعِيدُ فِي الْجَنَابَةِ، وَلاَ يُعِيدُ فِي الْوُضُوءِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَبَعْضِ أَهْلِ الْكُوفَةِ. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ: لاَ يُعِيدُ فِي الْوُضُوءِ، وَلاَ فِي الْجَنَابَةِ، لأَنَّهُمَا سُنَّةٌ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلاَ تَجِبُ الْإِعَادَةُ عَلَى مَنْ تَرَكَهُمَا فِي الْوُضُوءِ، وَلاَ فِي الْجَنَابَةِ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی قەیسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر دەستنوێژت گرت ئاو رادە لە لوتت، ئەگەر خۆشت پاك کردەوە بە بەرد با بەردەکان تاك بن). — واتە: سێ بەرد، یان پێنج بەرد، یا حەوت بەرد -.

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر ئاو رادان لە دەم و لوت، هەندێکیان دەفەرموون: ئەگەر کەسێ لەکاتی دەستنوێژدا ئاوی ڕانەدا لەدەم و لوتی و نوێژی کرد، ئەوە دەبێ دەستنوێژ بگرێتەوە و نوێژەکەی بکاتەوە، ڕایان وایە ئەمە لە دەستنوێژ و خۆشتن لە لەشگرانی هەمان حوکمیان هەیە و دەبێ ئاو رابدرێت لەدەم و لوت، پێشەوایان ئیبنو ئەبی لەیلاو (عبد الله)ی کوڕی موبارەك و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرمووێت: ئاو رادان لە لوت زیاتر جەختی لەسەر کراوەتەوە لە ئاو رادان لەدەم. هەندێ لە زانایانیش دەفەرموون: خۆشتن لە لەشگرانی دەبێ دووبارە بکرێتەوە ئەگەر ئاو ڕانەدرێت لە دەم و لوت، بەڵام دەستنوێژ دووبارە ناکرێتەوە. ئەمەش وتەی پێشەوایان: (ثوری) و هەندێ لە ئەهلی کوفەیە. هەندێکیان دەفەرموون: هیچ کامیان دووبارە ناکرێنەوە، لەبەرئەوەی سوننەتی پێغەمبەرن (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەگەر کەسێ تەرکی کردن واجب نییە دووبارەیان بکاتەوە. ئەمەش وتەی پێشەوایان: مالیك و شافعیيە.

## دەربارەی مشتێ ئاو رادان لە دەم و لوت

## ٢٢ - بَابُ الْمَضْمَضَةِ وَالِاسْتِنْشَاقِ مِنْ كَفٍّ وَاحِدٍ

٢٨- (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدٍ، فَعَلَ ذَلِكَ ثَلاَثًا. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ. وَحَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَى مَالِكٌ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، وَلَمْ يَذْكُرُوا هَذَا الْحَرْفَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدٍ، وَإِنَّمَا ذَكَرَهُ خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، وَخَالِدٌ ثِقَةٌ حَافِظٌ عِنْدَ أَهْلِ الْحَدِيثِ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: الْمَضْمَضَةُ وَالِاسْتِنْشَاقُ مِنْ كَفٍّ وَاحِدٍ يُجْزِئُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُفَرِّقُهُمَا أَحَبُّ إِلَيْنَا. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنْ جَمَعَهُمَا فِي كَفٍّ وَاحِدٍ فَهُوَ جَائِزٌ، وَإِنْ فَرَّقَهُمَا فَهُوَ أَحَبُّ إِلَيْنَا.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی مشتێ ئاوی رادا لە دەم و لوتی. سێ جار ئەمەی دووبارەی كردەوە.

هەندێ لە زانایان دەفەرموون: مشتێ ئاو بەسە بۆ ئاو رادان لەدەم و لوت، هەندێكیان دەفەرموون: ئەگەر جیا بكرێنەوە بەلامانەوە باشترە، پێشەوا شافیعی دەفەرموێت: بۆ هەردووكیان مشتێ ئاو بەسە و دروستە، بەڵام بەلای ئێمەوە جیا بكرێنەوە باشترە.

**دەربارەی دەست خستنە نێوان مووەکانی ریشەوە.**

٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ

| ٢٩- (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ الْكَرِيمِ بْنِ أَبِي الْمُخَارِقِ أَبِي أُمَيَّةَ، عَنْ حَسَّانَ بْنِ بِلاَلٍ، قَالَ: رَأَيْتُ عَمَّارَ بْنَ يَاسِرٍ تَوَضَّأَ فَخَلَّلَ لِحْيَتَهُ، فَقِيلَ لَهُ، أَوْ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: أَتُخَلِّلُ لِحْيَتَكَ؟، قَالَ: وَمَا يَمْنَعُنِي؟ وَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ. |
|---|

واتە: لە حەسانی کوڕی بیلالەوە دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: عەممارى کوڕی یاسرم دی دەستنوێژی دەگرت پەنجەی دەخستنە نێوان مووەکانی ریشیەوە، پێی وترا، یان حەسان وتی: پێم وت: ئەوە دەستت دەخەیتە نێوان مووەکانی ریشتەوە؟ عەممار وتی: ئەی چی رێگری ئەوەم لێ دەکات؟ بەڕاستی بە چاوی خۆم پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی ئەو کارەی کرد واتە دەستی دەخستنە نێوان مووەکانی ریشیەوە.

| ٣٠ - حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ حَسَّانَ بْنِ بِلاَلٍ، عَنْ عَمَّارٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَعَائِشَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ أَبِي أَوْفَى، وَأَبِي أَيُّوبَ. وَسَمِعْتُ إِسْحَاقَ بْنَ مَنْصُورٍ، يَقُولُ: قَالَ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ، قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: لَمْ يَسْمَعْ عَبْدُ الْكَرِيمِ مِنْ حَسَّانَ بْنِ بِلاَلٍ حَدِيثَ التَّخْلِيلِ. وقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ حَدِيثُ عَامِرِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عُثْمَانَ. وقَالَ بِهَذَا أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ: رَأَوْا تَخْلِيلَ اللِّحْيَةِ وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ. وقَالَ أَحْمَدُ: إِنْ سَهَا، عَنْ تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ فَهُوَ جَائِزٌ. وقَالَ إِسْحَاقُ: إِنْ تَرَكَهُ نَاسِيًا أَوْ مُتَأَوِّلاً أَجْزَأَهُ، وَإِنْ تَرَكَهُ عَامِدًا أَعَادَ. |
|---|

واتـە: لـە حەسـانی کـوڕی بیلالـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ، لـە عـەممارەوە، لـە پێغەمبەری خـواوە (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فـەرموودەی پێشـوو بـە هـەمان شێوە هاتووە.

زۆرینەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) و ئەوانـەی دوای ئەوانیش رایان لەسەر دەست خستنە نێوان مووەکانی ریشە. پێشەوا شـافیعی ئەمە دەفەرموێت. پێشەوا ئەحمەدی کـوڕی حەنبـەل دەفـەرموێت: ئەگـەر کەسـێ لـەیادی چـوو سـەهوی کـرد دەسـتی نەخسـتە نێـوان مووەکـانی ریشـیەوە ئـەوە دەستنوێژەکەی دروستە. پێشەوا ئیسحاق دەفەرموێت: ئەگەر کەسێ لـەبیری چـوو یان تەئویلی کرد ئەوە دەستنوێژەکەی دروستە، بـەڵام ئەگـەر بـە ئەنقەسـت تـەرکی کرد با دەستنوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.

٣١- (صـحيح) حَـدَّثَنَا يَحْـيَى بْـنُ مُوسَـى، قَـالَ: حَـدَّثَنَا عَبْـدُ الـرَّزَّاقِ، عَـنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ عَامِرِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستی دەخستە نێوان مووەکانی ریشیەوە.

### دەربارەی دەستی تەڕ هێنان سەردا لەبەشی پێشەوەی سەرەوە دەست پێ دەکرێت هەتا بەشی دواوەی.

### ٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مَسْحِ الرَّأْسِ أَنَّهُ يَبْدَأُ بِمُقَدَّمِ الرَّأْسِ إِلَى مُؤَخَّرِهِ

٣٢- (صـحيح) حَـدَّثَنَا إِسْـحَاقُ بْـنُ مُوسَـى الأَنْصَـارِيُّ، قَـال: حَـدَّثَنَا مَعْـنُ بْـنُ عِيسَى الْقَزَّازُ، قَال: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ

بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ مُعَاوِيَةَ، وَالْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ وَأَحْسَنُ، وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مەسحی سەری کرد بە هەردوو دەستی ئەیهێنان و ئەیبردن لەپێشی سەریەوە هەردوو دەستی ئەهێنا هەتا پشتی سەری و لەپاشدا دەستی دەگێڕایەوە هەتا دەگەیشتەوە ئەو شوێنەی مەسحەکەی لێوە دەست پێکردبوو، ئینجا هەردوو پێی - هەتا قولەپێکانی - شت.

## دەربارەی دەست پێ کردن لە بەشی دواوە سەر

٢٥- بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يَبْدَأُ بِمُؤَخَّرِ الرَّأْسِ

٣٣ – (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ بِرَأْسِهِ مَرَّتَيْنِ، بَدَأَ بِمُؤَخَّرِ رَأْسِهِ، ثُمَّ بِمُقَدَّمِهِ، وَبِأُذُنَيْهِ كِلْتَيْهِمَا، ظُهُورِهِمَا وَبُطُونِهِمَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَحَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ أَصَحُّ مِنْ هَذَا وَأَجْوَدُ إِسْنَادًا. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ الْكُوفَةِ إِلَى هَذَا الْحَدِيثِ مِنْهُمْ وَكِيعُ بْنُ الْجَرَّاحِ.

واتە: لە روبەیعی کچی (مُعَوِّذ)ی کوڕی عەفرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دووجار مەسحی سەری دەکرد، لە بەشی دواوەی سەریەوە دەستی پێ دەکرد، لەپاشدا لە بەشی پێشەوەی سەریەوە، بە ناوەوە و دەرەوەی هەردوو گوێچکەشیەوە.

## دەربارەی مەسحی سەر یەك جارە

### ٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ مَسْحَ الرَّأْسِ مَرَّةً

٣٤- (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ، أَنَّهَا رَأَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ، قَالَتْ: مَسَحَ رَأْسَهُ، وَمَسَحَ مَا أَقْبَلَ مِنْهُ، وَمَا أَدْبَرَ، وَصُدْغَيْهِ، وَأُذُنَيْهِ مَرَّةً وَاحِدَةً. وَفِي الْبَابِ، عَنْ عَلِيٍّ، وَجَدِّ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ. حَدِيثُ الرُّبَيِّعِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ مَسَحَ بِرَأْسِهِ مَرَّةً. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ وَبِهِ يَقُولُ: جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، رَأَوْا مَسْحَ الرَّأْسِ مَرَّةً وَاحِدَةً. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَال: سَمِعْتُ سُفْيَانَ بْنَ عُيَيْنَةَ يَقُولُ: سَأَلْتُ جَعْفَرَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنْ مَسْحِ الرَّأْسِ أَيُجْزِئُ مَرَّةً؟ فَقَال: إِي وَاللَّهِ.

واتە: لە روبەیعی کچی (مُعَوِّذ)ی کوڕی عەفرائەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە دەستنوێژی دەگرت، روبەیع وتی: یەك جار مەسحی سەری کرد، هەروەها بەشی پێشەوەی سەری و بەشی دواوەی و لاجانگەکانی و ناوەوە و دەرەوەی هەردوو گوێچکەی مەسح کرد.

زۆرینەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان پەیڕەوی ئەم فەرموودە دەکەن، پێشەوایان جەعفەری کوڕی موحەممەد و سوفیان و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون، رایان لەسەر یەك جار مەسحی سەرە. موحەممەدی کوڕی مەنصور وتی: بۆ خۆم

گوێم لە سوفیانی کوڕی عویەینە بوو دەیفەرموو: پرسیارم کرد لە جەعفەری کوڕی موحەممەد دەربارەی یەك جار مەسحی سەر کە ئایا دروستە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، سوێند بە (الله) یەك جار دروستە.

## بەکارهێنانی ئاوی تازە بۆ مەسحی سەر

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يَأْخُذُ لِرَأْسِهِ مَاءً جَدِيدًا

٣٥- (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ الْحَارِثِ، عَنْ حَبَّانَ بْنِ وَاسِعٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ، وَأَنَّهُ مَسَحَ رَأْسَهُ بِمَاءٍ غَيْرِ فَضْلِ يَدَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى ابْنُ لَهِيعَةَ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ حَبَّانَ بْنِ وَاسِعٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ، وَأَنَّهُ مَسَحَ رَأْسَهُ بِمَاءٍ غَيْرِ فَضْلِ يَدَيْهِ. وَرِوَايَةُ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ حَبَّانَ أَصَحُّ، لأَنَّهُ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ هَذَا الْحَدِيثُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، وَغَيْرِهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ لِرَأْسِهِ مَاءً جَدِيدًا. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ رَأَوْا: أَنْ يَأْخُذَ لِرَأْسِهِ مَاءً جَدِيدًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى ابْنُ لَهِيعَةَ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ حَبَّانَ بْنِ وَاسِعٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ، وَأَنَّهُ مَسَحَ رَأْسَهُ بِمَاءٍ غُبْرِ فَضْلِ يَدَيْهِ. وَرِوَايَةُ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ حَبَّانَ أَصَحُّ، لأَنَّهُ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ هَذَا الْحَدِيثُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، وَغَيْرِهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ لِرَأْسِهِ مَاءً جَدِيدًا. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ رَأَوْا: أَنْ يَأْخُذَ لِرَأْسِهِ مَاءً جَدِيدًا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە دەستنوێژی گرتووە، بە ئاوی تازە مەسحی سەری دەکرد نەك بەو ئاوە زیادەی کە بە پەنجەکانیەوە بوو.

## مەسحی ناوەوە و دەرەوەی هەردوو گوێ.

٢٨ – بَابُ مَسْحِ الأُذُنَيْنِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا

٣٦- (حسن صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ، ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا. وَفِي الْبَابِ عَنِ الرُّبَيِّعِ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ؛ يَرَوْنَ مَسْحَ الأُذُنَيْنِ: ظُهُورِهِمَا، وَبُطُونِهِمَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مەسحی سەری دەکرد، لەگەڵ ناوەوە و دەرەوەی هەردوو گوێچکەی.

## دەربارەی هەردوو گوێچکە بەشێکن لە سەر.

٢٩ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الأُذُنَيْنِ مِنَ الرَّأْسِ

٣٧- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ سِنَانِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، وَيَدَيْهِ ثَلاَثًا، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَقَالَ: الأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ، قَالَ قُتَيْبَةُ: قَالَ حَمَّادٌ: لاَ أَدْرِي، هَذَا مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ مِنْ قَوْلِ أَبِي أُمَامَةَ؟ وَفِي الْبَابِ عَنْ أَنَسٍ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ الْقَائِمِ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ، أَنَّ الأُذُنَيْنِ مِنَ الرَّأْسِ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ

بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: مَا أَقْبَلَ مِنَ الأُذُنَيْنِ فَمِنَ الْوَجْهِ، وَمَا أَدْبَرَ فَمِنَ الرَّأْسِ. قَالَ إِسْحَاقُ: وَأَخْتَارُ أَنْ يَمْسَحَ مُقَدَّمَهُمَا مَعَ الْوَجْهِ، وَمُؤَخَّرَهُمَا مَعَ رَأْسِهِ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: هُمَا سُنَّةٌ عَلَى حِيَالِهِمَا؛ يَمْسَحُهُمَا بِمَاءٍ جَدِيدٍ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەیە دەستنوێژی گرت: سێ جار دەم و چاوی شت، لەگەڵ هەردوو دەستی هەتا ئەنیشکی، وە یەك جار مەسحی سەری کردو، فەرمووی: هەردوو گوێچکە بەشێکن لە سەر، قوتەیبە وتی: حەمماد وتی: نازانم، (هەردوو گوێ بەشێکن لە سەر) فەرمایشتی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، یان وتەی ئەبو ئومامەیە؟

بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرموودە لای زۆرینەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان، هەردوو گوێ بەشێکن لە سەر، پێشەوایان سوفیان و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون. هەندێ لە زانایان دەفەرموون: بەشی پێشەوەی هەر دوو گوێ بەشێکن لە روخسار، بەشی دواوەشیان بەشێکن لە سەر. پێشەوا ئیسحاق دەفەرموێت: ئەمەم هەڵبژاردووە بەشی پێشەوەی هەر دوو گوێ لەگەڵ روخسارن، بەشی دواوەشیان لەگەڵ سەر. پێشەوا شافیعی دەفەرموێت: هەردووکیان سوننەتن، بە ئاوی تازە مەسح بکرێن.

## دەربارەی دەست خستنە نێوان پەنجەکان.

## ٣٠ - بَابٌ فِي تَخْلِيلِ الأَصَابِعِ

٣٨- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي هَاشِمٍ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا تَوَضَّأْتَ فَخَلِّلِ الأَصَابِعَ). وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَالْمُسْتَوْرِدِ وَهُوَ ابْنُ شَدَّادٍ الْفِهْرِيُّ، وَأَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّهُ يُخَلِّلُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ فِي الْوُضُوءِ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ إِسْحَاقُ: يُخَلِّلُ أَصَابِعَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ فِي الْوُضُوءِ. وَأَبُو هَاشِمٍ اسْمُهُ: إِسْمَاعِيلُ بْنُ كَثِيرٍ المكِيُّ.

**واتە: لە عاصیمی کوڕی (لَقِیط)ی کوڕی صەبرەوە، لە باوکیەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر دەستنوێژت گرت پەنجەکانت بخەرە نێوان پەنجەکانتەوە).**

٣٩- (حسن صحيح) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الْجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ صَالِحٍ مَوْلَى التَّوْأَمَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا تَوَضَّأْتَ فَخَلِّلْ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدَيْكَ وَرِجْلَيْكَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

**واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر دەستنوێژت گرت پەنجەت بخەرە نێوان پەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو پێتەوە).**

٤٠- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي

عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ الْفِهْرِيِّ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا تَوَضَّأَ دَلَكَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ بِخِنْصَرِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ.

**واتە: لە موستەوریدی کوڕی شەددادی فیهریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بینیوە کە دەستنوێژی دەگرت پەنجە توتەی (چەپی) دەخستە نێوان پەنجەکانی هەردوو پێیەوە.**

## سەبارەت بە ئاگری دۆزەخ بۆ پاژنە پێکان

٣١ – بَابُ مَا جَاءَ: (وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ)

٤١– (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ). وَفِي الْبَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَائِشَةَ، وَجَابِرٍ وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ، وَمُعَيْقِيبٍ، وَخَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، وَشُرَحْبِيلَ ابْنِ حَسَنَةَ، وَعَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، وَيَزِيدَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ، وَبُطُونِ الأَقْدَامِ مِنَ النَّارِ). وَفِقْهُ هَذَا الْحَدِيثِ: أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ الْمَسْحُ عَلَى الْقَدَمَيْنِ إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِمَا خُفَّانِ أَوْ جَوْرَبَانِ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (تیاچوون یان ئاگری دۆزەخ بۆ پاژنە پێکان). واتە ئەوانەی لەکاتی دەستنوێژدا پاژنەی پێیان ناشۆن. لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئاگری دۆزەخ بۆ پاژنەکان و بنی پێکان). واتە ئەوانەی لەکاتی دەستنوێژدا پاژنەکانیان و بنی پێیان ناشۆن.**

کەواتە بە پێی تێگەیشتن لەم فەرمودەیە: مەسح کردنی پێکان دروست نیە ئەگەر کەسەکە گۆرەوی یان کاڵە(خوف)ی لە پێدا نەبێت.

## شتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ یەك جار یەك جار

٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً

٤٢- (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَهَنَّادٌ، وَقُتَيْبَةُ، قَالُوا: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ (ح) وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُمَرَ، وَجَابِرٍ، وَبُرَيْدَةَ، وَأَبِي رَافِعٍ، وَابْنِ الْفَاكِهِ. وَحَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ أَحْسَنُ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ وَأَصَحُّ. وَرَوَى رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، وَغَيْرُهُ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً. وَلَيْسَ هَذَا بِشَيْءٍ، وَالصَّحِيحُ مَا رَوَى ابْنُ عَجْلَانَ، وَهِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَعَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەندامەکانی دەستنوێژی یەك جار یەك جار دەشت.

هەروەها لە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب)یشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەندامەکانی دەستنوێژی یەك جار یەك جار دەشت.

## شتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ دوو جار دوو جار

٣٣ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوُضُوءِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ

٤٣- (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَابِتِ بْنِ ثَوْبَانَ، قَال: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ الْفَضْلِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ جَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ ثَوْبَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الفَضْلِ، وَهُوَ إِسْنَادٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى هَمَّامٌ، عَن عَامِرٍ الأَحْوَلِ، عَن عَطاء، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ ثَلاَثًا ثَلاَثًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەندامەکانی دەستنوێژی دوو جار دوو جار دەشت.

هەروەها لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەندامەکانی دەستنوێژی سێ جار سێ جار دەشت.

## شتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ سێ جار سێ جار

٣٤ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوُضُوءِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا

٤٤- (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي حَيَّةَ، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ ثَلاَثًا ثَلاَثًا. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَعَائِشَةَ، وَالرُّبَيِّعِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي رَافِعٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَمُعَاوِيَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، وَأُبَيٍّ.

حَدِيثُ عَلِيٍّ أَحْسَنُ شَيْءٍ فِي هَذَا الْبَابِ وَأَصَحُّ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّ الْوُضُوءَ يُجْزِئُ مَرَّةً مَرَّةً، وَمَرَّتَيْنِ أَفْضَلُ، وَأَفْضَلُهُ ثَلاَثٌ، وَلَيْسَ بَعْدَهُ شَيْءٌ. وقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: لاَ آمَنُ إِذَا زَادَ فِي الْوُضُوءِ عَلَى الثَّلاَثِ أَنْ يَأْثَمَ. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: لاَ يَزِيدُ عَلَى الثَّلاَثِ إِلاَّ رَجُلٌ مُبْتَلًى.

**واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەندامەكانی دەستنوێژی سێ جار سێ جار دەشت.**

**سەرجەم زانایان بە لایانەوە وایە بە هەر سێ شێوكە دروستە دەستنوێژ بگیرێت، بەڵام سێ جار سێ جار چاكترینە.**

## شتنیان یەك جار و دوو جار و سێ جار

### ٣٥ - بَابٌ فِي الْوُضُوءِ مَرَّةً، وَمَرَّتَيْنِ، وَثَلاَثًا

٤٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى الْفَزَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ أَبِي صَفِيَّةَ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي جَعْفَرٍ: حَدَّثَكَ جَابِرٌ؛ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً، وَمَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَثَلاَثًا ثَلاَثًا؟ قَالَ: نَعَمْ.

**واتە: لە (ثَابِتِ)ی كوڕی ئەبو صەفیەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم بە ئەبو جەعفەر: جابیر ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕاویەتەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەندامەكانی دەستنوێژی یەك جار یەك جار و دوو جار دوو جار و سێ جار سێ جار دەشت؟ فەرمووی: بەڵێ.**

٤٦ - (صحيح بحديث ابن عباس المتقدم برقم: (٤٢)) وَرَوَى وَكِيعٌ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ أَبِي صَفِيَّةَ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي جَعْفَرٍ: حَدَّثَكَ جَابِرٌ أَنَّ النَّبِيَّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً؟ قَالَ: نَعَمْ، وحَدَّثَنَا بِذَلِكَ هَنَّادٌ، وَقُتَيْبَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ ثَابِتٍ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ، لأَنَّهُ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، هَذَا عَنْ ثَابِتٍ، نَحْوَ رِوَايَةِ وَكِيعٍ. وَشَرِيكٌ كَثِيرُ الْغَلَطِ. وَثَابِتُ بْنُ أَبِي صَفِيَّةَ هُوَ: أَبُو حَمْزَةَ الثُّمَالِيُّ.

واتە: لە (ثَابِتٍ)ی کوڕی ئەبو صەفیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم بە ئەبو جەعفەر: جابیر ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەندامەکانی دەستنوێژی یەك جار یەك جار دەشت؟ فەرمووی: بەڵێ.

**دەربارەی ئەوانەی هەندێ لە ئەندامەکانی دەستنوێژیان**
**دوو جار دوو جار دەشۆن، وە هەندێکی تریان سێ جار سێ جار**

٣٦ - بَابٌ فِيمَنْ يَتَوَضَّأُ بَعْضَ وُضُوئِهِ مَرَّتَيْنِ، وَبَعْضَهُ ثَلاَثًا

٤٧ - (صحيح الإسناد، وقوله في الرجلين: (مرتين) شاذٌ) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، وَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ ذُكِرَ فِي غَيْرِ حَدِيثٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ بَعْضَ وُضُوئِهِ مَرَّةً، وَبَعْضَهُ ثَلاَثًا. وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي ذَلِكَ، لَمْ يَرَوْا بَأْسًا أَنْ يَتَوَضَّأَ الرَّجُلُ بَعْضَ وُضُوئِهِ ثَلاَثًا، وَبَعْضَهُ مَرَّتَيْنِ أَوْ مَرَّةً.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستنوێژی گرت سێ جار دەم و چاوی شت،

پاشان هەردوو دەستی هەتا ئەنیشکی دوو جار دووجار شت، مەسحی سەری کرد، ئینجا هەردوو پێی هەتا قولەپێکانی شت. لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەندێ لە ئەندامەکانی دەستنوێژی یەك جار یەك جار دەشت، وە هەندێکی تریانی سێ جار سێ جار دەشت.

هەندێ لە زانایان ڕێگەیان داوە بەو شێوانە دەستنوێژ بگیرێت.

## چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

٣٧ – بَابٌ فِي وُضُوءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ كَانَ؟

٤٨ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَقُتَيْبَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي حَيَّةَ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا تَوَضَّأَ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ حَتَّى أَنْقَاهُمَا، ثُمَّ مَضْمَضَ ثَلاَثًا، وَاسْتَنْشَقَ ثَلاَثًا، وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، وَذِرَاعَيْهِ ثَلاَثًا، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ مَرَّةً، ثُمَّ غَسَلَ قَدَمَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَأَخَذَ فَضْلَ طَهُورِهِ فَشَرِبَهُ وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ قَالَ: أَحْبَبْتُ أَنْ أُرِيَكُمْ كَيْفَ كَانَ طُهُورُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَالرُّبَيِّعِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أُنَيْسٍ، وَعَائِشَةَ.

واتە: لە ئەبو حەییەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عەلیم ڕەزای خوای لێ بێ دی دەستنوێژی دەگرت: هەردوو مشتی شت هەتا خاوێنی کردنەوە، لەپاشدا سێ جار ئاوی ڕادا لە دەم و لوتی، سێ جار دەم وچاوی شت، پاشان هەردوو قۆڵی هەتا ئانیشکی سێ جار شت، یەك جار مەسحی سەری کرد، ئینجا هەردوو پێی سێ جار شت تا قولەپێی، لەپاشدا هەستا بە پێوە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژەکەی خواردەوە، ئینجا فەرمووی: پێم خۆش بوو چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەرتان

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نیشان بدەم کە چۆن بووە.

٤٩ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ، ذَكَرَ عَنْ عَلِيٍّ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي حَيَّةَ، إِلاَّ أَنَّ عَبْدَ خَيْرٍ، قَالَ: كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ طُهُورِهِ أَخَذَ مِنْ فَضْلِ طَهُورِهِ بِكَفِّهِ فَشَرِبَهُ. حَدِيثُ عَلِيٍّ، رَوَاهُ أَبُو إِسْحَاقَ الْهَمْدَانِيُّ، عَنْ أَبِي حَيَّةَ، وَعَبْدِ خَيْرٍ، وَالْحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ. وَقَدْ رَوَاهُ زَائِدَةُ بْنُ قُدَامَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ، عَنْ عَلِيٍّ، حَدِيثَ الْوُضُوءِ بِطُولِهِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى شُعْبَةُ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ عَلْقَمَةَ، فَأَخْطَأَ فِي اسْمِهِ، وَاسْمِ أَبِيهِ، فَقَالَ: مَالِكُ بْنُ عُرْفُطَةَ. وَرُوِيَ عَنْ أَبِي عَوَانَةَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ، عَنْ عَلِيٍّ. وَرُوِيَ عَنْهُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ عُرْفُطَةَ مِثْلُ رِوَايَةِ شُعْبَةَ، وَالصَّحِيحُ خَالِدُ بْنُ عَلْقَمَةَ.

واتە: (عَبْدِ خَيْر) وەك فەرموودەکەی ئەبو حەییەی ڕەزای خوای لێ بێ لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ گێراوەتەوە، ئەوەندە هەیە کە (عَبْدِ خَيْر) فەرمووی: کاتێ کە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەستنوێژەکەی تەواو کرد لە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژەکەی بە مشت هەڵگرت و خواردیەوە.

## دەربارەی ئاوپڕژاندن لە نافەك لەدوای دەستنوێژ

## ٣٨ – بَابٌ فِي النَّضْحِ بَعْدَ الْوُضُوءِ

٥٠ – (ضعيف) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، وَأَحْمَدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدِ اللهِ السَّلِيمِيُّ الْبَصْرِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ الْهَاشِمِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: جَاءَنِي جِبْرِيلُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِذَا تَوَضَّأْتَ فَانْتَضِحْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وسَمِعْت مُحَمَّدًا، يَقُولُ: الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الْهَاشِمِيُّ مُنْكَرُ الْحَدِيثِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي الْحَكَمِ بْنِ سُفْيَانَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَزَيْدِ

بْنِ حَارِثَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ. وقَالَ بَعْضُهُمْ سُفْيَانُ بْنُ الْحَكَمِ، أَوِ الْحَكَمُ بْنُ سُفْيَانَ، وَاضْطَرَبُوا فِي هَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (جبریل هات بۆ لام وتی: ئەی موحەممەد كاتێ كە لە دەستنوێژ بوویتەوە ئاو بپژێنە لە نافەكت).

**سەبارەت بە دەستنوێژگرتن لە كاتی ناخۆشیدا**

٣٩ – بَابٌ فِي إِسْبَاغِ الْوُضُوءِ

٥١ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟) قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (إِسْبَاغُ الوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (شتێكتان نیشان بدەم ئەگەر كردتان گوناهتان هەڵدەوەرێنێ و پلەتان بەرزدەكاتەوە؟) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! فەرمووی: (دەستنوێژ گرتنی تەواو لەكاتی زەحمەت و ناخۆشیدا، وە هەنگاونانی زۆر بەرەو مزگەوتەكان، چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن بۆ خەبات و تێكۆشان).

٥٢ – (صحيح) وَحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ، نَحْوَهُ،

وقَـالَ قُتَيْبَةُ فِي حَدِيثِهِ: (فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ) ثَلاَثًا. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبِيدَةَ، وَيُقَالُ: عُبَيْدَةُ بْنُ عَمْرٍو، وَعَائِشَةَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَائِشٍ الحَضْرَمِيِّ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَلاَءُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ هُوَ ابْنُ يَعْقُوبَ الجُهَنِيُّ، وَهُوَ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ.

**واتە: لە عەلائەوە فەرموودەی پێشـو بـە هـەمان شـێوە هـاتووە، قوتەیبـە لـە فەرموودەكەیدا فەرمووی: (ئا ئەوەیە سـەنگەرگرتن، ئـا ئەوەیـە سـەنگەرگرتن، ئـا ئەوەیە سەنگەرگرتن). سێ جار.**

## وشككردنەوەی ئەندامەكانی دەستنوێژ.

٤٠ - بَابُ التَّمندُلِ بَعْدَ الْوُضُوءِ

٥٣- (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعِ بْنِ الجَرَّاحِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ حُبَابٍ، عَنْ أَبِي مُعَاذٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خِرْقَةٌ يُنَشِّفُ بِهَا بَعْدَ الوُضُوءِ. حَدِيثُ عَائِشَةَ لَيْسَ بِالقَائِمِ وَلاَ يَصِحُّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا البَابِ شَيْءٌ. وَأَبُو مُعَاذٍ يَقُولُونَ: هُوَ سُلَيْمَانُ بْنُ أَرْقَمَ، وَهُوَ ضَعِيفٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ. وَفِي البَابِ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ.

**واتـە: لـە عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) پارچـە قوماشـێكی هـەبوو ئەندامـەكانی دەستنوێژی پێ وشك دەكردەوە لەدوای دەستنوێژ.**

٥٤ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زِيَادِ بْنِ أَنْعُمٍ، عَنْ عُتْبَةَ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ نُسَيٍّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ

غَنْمٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا تَوَضَّأَ مَسَحَ وَجْهَهُ بِطَرَفِ ثَوْبِهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَإِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ، وَرِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زِيَادِ بْنِ أَنْعُمٍ الأَفْرِيقِيُّ يُضَعَّفَانِ فِي الحَدِيثِ. وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ فِي التَّمَنْدُلِ بَعْدَ الوُضُوءِ. وَمَنْ كَرِهَهُ إِنَّمَا كَرِهَهُ مِنْ قِبَلِ أَنَّهُ قِيلَ: إِنَّ الوُضُوءَ يُوزَنُ وَرُوِيَ ذَلِكَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَالزُّهْرِيِّ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، قَالَ: حَدَّثَنِيهِ عَلِيُّ بْنُ مُجَاهِدٍ عَنِّي، وَهُوَ عِنْدِي ثِقَةٌ، عَنْ ثَعْلَبَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: إِنَّمَا كُرِهَ الْمِنْدِيلُ بَعْدَ الوُضُوءِ لأَنَّ الوُضُوءَ يُوزَنُ.

واتە: لە (مُعَاذِ)ی کوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی بە چمکی پۆشاکەکەی دەم و چاوی وشککردەوە لەدوای دەستنوێژ.

## لەدوای دەستنوێژ چی ویردێ دەخوێنرێت.

٤١ - بَابُ مَا يُقَالُ بَعْدَ الوُضُوءِ

٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عِمْرَانَ الثَّعْلَبِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ يَزِيدَ الدِّمَشْقِيِّ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيِّ، وَأَبِي عُثْمَانَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الوُضُوءَ ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ، فُتِحَتْ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الجَنَّةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ). وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ. حَدِيثُ عُمَرَ قَدْ خُولِفَ زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ فِي هَذَا الحَدِيثِ. وَرَوَى عَبْدُ اللهِ بْنُ صَالِحٍ، وَغَيْرُهُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ، عَنْ

عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ عُمَرَ، وَعَنْ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنْ عُمَرَ. وَهَذَا حَدِيثٌ فِي إِسْنَادِهِ اضْطِرَابٌ، وَلاَ يَصِحُّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا البَابِ كَبِيرُ شَيْءٍ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَبُو إِدْرِيسَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عُمَرَ شَيْئًا.

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس دەستنوێژێ بە جوانی بگرێت لەپاشدا بڵێ: من شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوا کە تەنیایەو هاوەڵی نیە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەی خوایەو پێغەمبەریەتی، خودایە بمکە بە تەوبەکار و یەکێ لەوانەی کە خۆیان خاوێن رادەگرن، ئەوا هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەهەر کامیانەوە بیەوێت بچێتە ژوورەوە ئارەزووی خۆیەتی).

### دەستنوێژ گرتن بە مشتێ(مودد)ێك ئاو

٤٢ - بَابُ الوُضُوءِ بِالمُدِّ

٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ أَبِي رَيْحَانَةَ، عَنْ سَفِينَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَوَضَّأُ بِالمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. حَدِيثُ سَفِينَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو رَيْحَانَةَ اسمه عَبْدُ اللهِ بْنُ مَطَرٍ. وَهَكَذَا رَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ الوُضُوءَ بِالمُدِّ، وَالغُسْلَ بِالصَّاعِ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: لَيْسَ مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ عَلَى التَّوْقِيتِ أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ أَكْثَرُ مِنْهُ، وَلاَ أَقَلُّ مِنْهُ وَهُوَ قَدْرُ مَا يَكْفِي.

واتە: لە سەفینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە (مودد)ێك ئاو دەستنوێژی دەگرت و بە مەن(صاع)ێك خۆی دەشت.

بەکارهێنانی ئاوی زۆر باش نیە.

٤٣ - بَابُ كَرَاهِيَةِ الْإِسْرَافِ فِي الْمَاءِ

٥٧- (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَارِجَةُ بْنُ مُصْعَبٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عُتَيِّ بْنِ ضَمْرَةَ السَّعْدِيِّ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (إِنَّ لِلْوُضُوءِ شَيْطَانًا، يُقَالُ لَهُ: الوَلَهَانُ، فَاتَّقُوا وَسْوَاسَ الْمَاءِ). وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ. حَدِيثُ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ وَالصَّحِيحِ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ، لأَنَّا لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا أَسْنَدَهُ غَيْرَ خَارِجَةَ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنِ الحَسَنِ قَوْلَهُ: وَلاَ يَصِحُّ فِي هَذَا البَابِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْءٌ وَخَارِجَةُ لَيْسَ بِالقَوِيِّ عِنْدَ أَصْحَابِنَا، وَضَعَّفَهُ ابْنُ الْمُبَارَكِ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (دەستنوێژ شـەیتانێکی هەیـە نـاوی وەلەهانـە، خۆتان بپارێزن لە وەسوەسەی ئاوی دەستنوێژ و خۆشتن).

دەستنوێژگرتن بۆ هەموو نوێژێ.

٤٤ - بَابُ الوُضُوءِ لِكُلِّ صَلاَةٍ

٥٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ الفَضْلِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ طَاهِرًا أَوْ غَيْرَ طَاهِرٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: فَكَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ أَنْتُمْ؟ قَالَ: كُنَّا نَتَوَضَّأُ وُضُوءًا وَاحِدًا. حَدِيثُ أَنَسٍ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالمشْهُورُ عِنْدَ أَهْلِ

الحَدِيثِ حَدِيثُ عَمْرِو بْنِ عَامِرٍ، عَنْ أَنَسٍ. وَقَدْ كَانَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ يَرَى الوُضُوءَ لِكُلِّ صَلاَةٍ اسْتِحْبَابًا لاَ عَلَى الوُجُوبِ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ هەموو نوێژە فەرزەکان دەستنوێژی دەگرت ئیتر دەستنوێژی ببوایە یان نەیبوایە، وتی: وتم بە ئەنەس: ئەی ئێوە چیتان دەکرد؟ فەرمووی: ئێمە بە دەستنوێژێکەوە چەند نوێژێکمان دەکرد.

٥٩ – (ضعيف) وَقَدْ رُوِيَ فِي حَدِيثٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ تَوَضَّأَ عَلَى طُهْرٍ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهِ عَشْرَ حَسَنَاتٍ). وَرَوَى هَذَا الحَدِيثَ الإِفْرِيقِيُّ، عَنْ أَبِي غُطَيْفٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الوَاسِطِيُّ، عَنِ الإِفْرِيقِيِّ، وَهُوَ إِسْنَادٌ ضَعِيفٌ. قَالَ عَلِيٌّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ: ذُكِرَ لِهِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ هَذَا الحَدِيثُ، فَقَالَ: هَذَا إِسْنَادٌ مَشْرِقِيٌّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس دەستنوێژی هەبێ و دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە بۆ نوێژ دە چاکەی بۆ دەنوسرێت).

٦٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَامِرٍ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، قُلْتُ: فَأَنْتُمْ مَا كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ مَا لَمْ نُحْدِثْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی عامیری ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك بوو ڕەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ هەموو نوێژە فەرزەکان دەستنوێژی دەگرت، وتم بە ئەنەس: ئەی ئێوە چیتان دەکرد؟ فەرمووی: ئێمە بە دەستنوێژێکەوە هەموو نوێژەکانمان دەکرد ئەگەر دەستنوێژمان نەشکایە.

## بە یەك دەستنوێژ چەند نوێژێ بکرێت

### ٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ

٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، فَلَمَّا كَانَ عَامُ الفَتْحِ صَلَّى الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّكَ فَعَلْتَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ فَعَلْتَهُ، قَال: (عَمْدًا فَعَلْتُهُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى هَذَا الحَدِيثَ عَلِيُّ بْنُ قَادِمٍ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَزَادَ فِيهِ: تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ هَذَا الحَدِيثَ أَيْضًا، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ. وَرَوَاهُ وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مُحَارِبٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ. وَرَوَاهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، وَغَيْرُهُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ وَكِيعٍ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّهُ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ مَا لَمْ يُحْدِثْ، وَكَانَ بَعْضُهُمْ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ اسْتِحْبَابًا، وَإِرَادَةَ الفَضْلِ. وَيُرْوَى عَنِ الإِفْرِيقِيِّ، عَنْ أَبِي غُطَيْفٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: مَنْ تَوَضَّأَ عَلَى طُهْرٍ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهِ عَشْرَ حَسَنَاتٍ. وَهَذَا إِسْنَادٌ ضَعِيفٌ وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ،

أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ وَالعَصْرَ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ هەموو نوێژە فەرزەکان دەستنوێژی دەگرت، بەڵام لە ڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا بە یەك دەستنوێژ هەر پێنج نوێژە فەرزەکەی کرد، پێکانی نەشت لە باتی ئەوە مەسحی خوفەکانی کرد، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ پێی فەرموو: ئەمەی ئەمڕۆ کردت نەم دیوە پێشتر بیکەیت؟ فەرمووی: (بە ئەنقەست ئەو کارەم کرد).

لە سوفیانی (ثوری)ەوە فەرموودەی پێشوو هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەك جار یەك جار ئەندامەکانی دەستنوێژی دەشت.

لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ هەموو نوێژە فەرزەکان دەستنوێژی دەگرت.

لە جابری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە یەك دەستنوێژ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کرد.

بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرموودە لای زانایان هەردوو شێوەکە دروستە، بەڵام باشتر وایە بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژی بگیرێت.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس دەستنوێژی هەبێ و دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە بۆ نوێژ دە چاکەی بۆ دەنوسرێت).

## دەربارەی دەستنوێژی ژن و پیاو لە دەفرێکدا.

٤٦ – بَابٌ فِي وُضُوءِ الرَّجُلِ وَالمَرْأَةِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ

٦٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي مَيْمُونَةُ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنَ الجَنَابَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ الْفُقَهَاءِ: أَنْ لاَ بَأْسَ أَنْ يَغْتَسِلَ الرَّجُلُ وَالْمَرْأَةُ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسٍ، وَأُمِّ هَانِئٍ، وَأُمِّ صُبَيَّةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبُو الشَّعْثَاءِ اسْمُهُ جَابِرُ بْنُ زَيْدٍ.

واتە: لە مەیمونەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: مـن و پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لـە دەفرێکدا پێکەوە خۆمان دەشت لەکاتێکدا کە هەردووکمان لەشمان گران بوو.

ئەمە وتەی سەرجەم شەرعزانەکانە: هیچی تێدا نیە و دروستە ژن و پیاو لە دەفرێکدا پێکەوە خۆیان بشۆن.

## پاشماوەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەت باش نیە.

٤٧ – بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ فَضْلِ طَهُورِ الْمَرْأَةِ

٦٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي حَاجِبٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ بَنِي غِفَارٍ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ فَضْلِ طَهُورِ الْمَرْأَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسَ. وَكَرِهَ بَعْضُ الفُقَهَاءِ الوُضُوءَ بِفَضْلِ طَهُورِ الْمَرْأَةِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ: كَرِهَا فَضْلَ طَهُورِهَا، وَلَمْ يَرَيَا بِفَضْلِ سُؤْرِهَا بَأْسًا.

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ڕێگری کردووە پیاو بە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژ و پاشماوەی ئاوی خۆشتنی ئافرەت دەستنوێژ بگرێت و خۆی بشوات.

هەندێ لە زانایان دەستنوێژگرتنیان بە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەت بەلاوە باش نیە، ئەمەش وتەی ئەحمەد و ئیسحاقە.

٦٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حَاجِبٍ يُحَدِّثُ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ عَمْرٍو الغِفَارِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَتَوَضَّأَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ طَهُورِ الْمَرْأَةِ، أَوْ قَالَ: بِسُؤْرِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو حَاجِبٍ اسمه سَوَادَةُ بْنُ عَاصِمٍ. وقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ فِي حَدِيثِهِ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَتَوَضَّأَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ طَهُورِ الْمَرْأَةِ، وَلَمْ يَشُكَّ فِيهِ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ.

واتە: لە حەکەمی کوڕی عەمری ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ڕێگری کردووە پیاو بە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژ و خۆشتنی ئافرەت دەستنوێژ بگرێت. یان فەرمووی: (بەو ئاوەی کە لێی دەخواتەوەو دەمێنێتەوە).

## دەربارەی ڕوخسەت لەمەدا

٤٨ – بَاب بَاب مَا جَاءَ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

٦٥ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: اغْتَسَلَ بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَفْنَةٍ، فَأَرَادَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَتَوَضَّأَ مِنْهُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا، فَقَالَ: إِنَّ الْمَاءَ لاَ يُجْنِبُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: یەکێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە تەشتێ ئاودا خۆی شت، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ویستی دەستنوێژی تێدا بگرێت، هاوسەرەکەی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەشم گران بوو خۆم تێدا شتووە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (خۆ ئاوەکە لەشگران نابێت واتە بەوە پیس نابێت).

## سەبارەت بە هیچ شتێ ئاو پیس ناکات.

٤٩ – بَاب مَا جَاءَ أَنَّ الْمَاءَ لاَ يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ

٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ كَثِيرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَتَوَضَّأُ مِنْ بِئْرِ بُضَاعَةَ، وَهِيَ بِئْرٌ يُلْقَى فِيهَا الحِيَضُ، وَلُحُومُ الكِلاَبِ، وَالنَّتْنُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ لاَ يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ جَوَّدَ أَبُو أُسَامَةَ هَذَا الحَدِيثَ، فَلَمْ يَرْوِ أَحَدٌ حَدِيثَ أَبِي سَعِيدٍ فِي بِئْرِ بُضَاعَةَ أَحْسَنَ مِمَّا رَوَى أَبُو أُسَامَةَ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ .

واتە: ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئایا تۆ لە ئاوی بیری (بُضَاعَة) دەستنوێژ دەگریت لەکاتێکدا کە بیرێکە پەڕۆی بێ نوێژی ئافرەتان و گۆشتی بەرماوەی سەگ و شتی تری پیس و بۆگەن فڕێ دەدرێتە ناوی؟ پێغەمبەری

خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بەڕاستی ئاو پاك و پاكەوەكەریشە – چونكە گەیشتۆتە رادەی قولەتێن – بە هیچ شتێ پیس نابێت). – مەگەر بە شتێ تام و بۆن و رەنگی بگۆڕێت –.

**باسێكی تر لەو بابەتە.**

٥٠ – بَابُ مِنْهُ آخَرُ

٦٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جَعْفَرِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُسْأَلُ عَنِ الْمَاءِ يَكُونُ فِي الفَلاَةِ مِنَ الأَرْضِ، وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ السِّبَاعِ وَالدَّوَابِّ؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الخَبَثَ). قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ: القُلَّةُ هِيَ الجِرَارُ، وَالقُلَّةُ الَّتِي يُسْتَقَى فِيهَا. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، قَالُوا: إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يُنَجِّسْهُ شَيْءٌ مَا لَمْ يَتَغَيَّرْ رِيحُهُ أَوْ طَعْمُهُ، وَقَالُوا: يَكُونُ نَحْوًا مِنْ خَمْسِ قِرَبٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو كە پرسیاریان لێ كرد دەربارەی ئاوێ لە خاكێكی چۆڵەوانیدا گیانەوەران و درندە یەك لەدوای یەك دەچنەسەری و ئاوی لێ دەخۆنەوە، كە ئایا ئاوەكە پاكە یان نا؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەگەر ئاو گەیشتە رادەی قوللەتێن ئیتر پیسی هەڵناگرێت واتە: پیس نابێت)[1]. – ئەگەر تام و بۆن و رەنگی نەگۆڕێت –.

---

[1] (قلتین) نزیكەی پێنج سەد رەتڵی بەغدادیە: كە بە پێوانەی ربەیی دەكاتە ١٩٢ لیتر واتە: نزیكەی بەرمیلێ نەوت. روناكی (رب العالمین) رونكردنەوەی منهاج م هەرتەلی.

## میزکردنە ناو ئاوی وەستاوەوە باش نیە.

٥١ - بَابُ كَرَاهِيَةِ البَوْلِ فِي الْمَاءِ الرَّاكِدِ

٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ مِنْهُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (با یەکێ لە ئێوە میز نەکاتە ئاوێکی وەستاوەوە لەپاشدا دەستنوێژی لێ بگرێت).

## سەبارەت بە ئاوی دەریا کە پاکە.

٥٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مَاءِ البَحْرِ أَنَّهُ طَهُورٌ

٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، ح، وحَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ سَلَمَةَ مِنْ آلِ ابْنِ الأَزْرَقِ، أَنَّ الْمُغِيرَةَ بْنَ أَبِي بُرْدَةَ وَهُوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَرْكَبُ البَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا القَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ مِنَ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الحِلُّ مَيْتَتُهُ). وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَالفِرَاسِيِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ الفُقَهَاءِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِنْهُمْ: أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَابْنُ عَبَّاسٍ، لَمْ يَرَوْا

بَأْسًا بِمَاءِ البَحْرِ. وَقَدْ كَرِهَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الوُضُوءَ بِمَاءِ البَحْرِ، مِنْهُمْ: ابْنُ عُمَرَ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو، وَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو: هُوَ نَارٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئێمە بەناو دەریادا دەڕۆین، ئاوی ڕەوانی کەم لەگەڵ خۆمان هەڵئەگرین، جا ئەگەر بەو ئاوە دەستنوێژ بگرین تینو دەبین، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (دەریا ئاوەکەی پاك و پاکەوەکەرەوەیە مرداربووەکانیشی حەڵاڵە).

## هەڕەشەی توند لەوکەسانەی لەپاش میز خۆیان پاك ناکەنەوە.

٥٣ – بَابُ التَّشْدِيدِ فِي الْبَوْلِ

٧٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَقُتَيْبَةُ، وَأَبُو كُرَيْبٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: سَمِعْتُ مُجَاهِدًا يُحَدِّثُ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: (إِنَّهُمَا يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: أَمَّا هَذَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ، وَأَمَّا هَذَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ). وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي مُوسَى، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ ابْنِ حَسَنَةَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَأَبِي بَكْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى مَنْصُورٌ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ طَاوُوسٍ، وَرِوَايَةُ الأَعْمَشِ أَصَحُّ. وَسَمِعْتُ أَبَا بَكْرٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبَانَ البَلْخِيَّ مُسْتَمْلِي وَكِيعٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا، يَقُولُ: الأَعْمَشُ أَحْفَظُ لِإِسْنَادِ إِبْرَاهِيمَ مِنْ مَنْصُورٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دای بەلای دوو گۆڕدا فەرمووی: (ئێستا

خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، ئەمەیان خۆی نەپاراست لە میزی خۆیو لەکاتی میزکردندا خۆی حەشار نەدەدا، ئەمەشیان دوو زمانی دەکرد، واتە قسەی دەهێناو دەبرد بۆ تێکدانی نێوانی خەڵك).

## ئاوپژاندن لە شوێنی میزی کوڕ پێش ئەوەی خواردن بخوا.

٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نَضْحِ بَوْلِ الغُلاَمِ قَبْلَ أَنْ يُطْعَمَ

٧١ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ، قَالَتْ: دَخَلْتُ بِابْنٍ لِي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ فَبَالَ عَلَيْهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَرَشَّهُ عَلَيْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَزَيْنَبَ، وَلُبَابَةَ بِنْتِ الحَارِثِ وَهِيَ أُمُّ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبِي السَّمْحِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي لَيْلَى، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِثْلِ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، قَالُوا: يُنْضَحُ بَوْلُ الغُلاَمِ، وَيُغْسَلُ بَوْلُ الجَارِيَةِ، وَهَذَا مَا لَمْ يَطْعَمَا، فَإِذَا طَعِمَا غُسِلاَ جَمِيعًا.

واتە: لە ئوم قەیسی کچی (مِحْصَن)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کوڕێکی کۆرپەی بچوکم هەبوو نانی نەدەخوارد - واتە شیرەخۆرە بوو- بردم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەسەر کۆشی خۆی داینا، میزی کرد بە پۆشاکەکەیدا، داوای ئاوی کردو ئاوەکەی پژاند لە پۆشاکەکەی و، نەیشت.

ئەمەش وتەی زیاتر لە کەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان و ئەوانەی دوای ئەوانە وەك پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق، دەفەرموون: ئەگەر میزی کوڕ بەر پۆشاك کەوت ئاوی لێ دەپژێنرێت، بەڵام هی کچ

دەشۆردرێت، ئەمە ئەگەر خواردن نەخۆن، ئەگەر خواردنیـان خـوارد دەبـێ جێگـەی میزی هەردووکیان بشۆردرێت.

## میزی ئەو ئاژەڵەی گۆشتی دەخورێ

٥٥ – بَابُ مَا جَاءَ فِي بَوْلِ مَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ

٧٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَال: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، قَال: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، وَقَتَادَةُ، وَثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ نَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ، فَاجْتَوَوْهَا، فَبَعَثَهُمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي إِبِلِ الصَّدَقَةِ، وَقَال: (اشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا)، فَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَاسْتَاقُوا الإِبِلَ، وَارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ، فَأُتِيَ بِهِمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ مِنْ خِلاَفٍ، وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ، وَأَلْقَاهُمْ بِالحَرَّةِ، قَالَ أَنَسٌ: فَكُنْتُ أَرَى أَحَدَهُمْ يَكُدُّ الأَرْضَ بِفِيهِ، حَتَّى مَاتُوا. وَرُبَّمَا قَالَ حَمَّادٌ: يَكْدُمُ الأَرْضَ بِفِيهِ حَتَّى مَاتُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ. وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا: لاَ بَأْسَ بِبَوْلِ مَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: کۆمەڵێ لە هۆزی عورەینە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئاو هەوای مەدینەیان پێ نەکـەوت و نەخۆشـکەوتن، پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کردن بڕۆن بۆ دەرەوەی شار بـۆ نـاو گەلـە وشـترە شیردەرەکان، فەرمووی: (لەوێ شیر و میزی وشترەکان بخـۆن هـەتا چـاك دەبنـەوە)، ئەوانیش ڕۆشتن، کاتێ کە چـاك بوونـەوە لـە ئیسـلام پاشـگەزبوونەوە و شـوانەکەی پێغەمبەری خوایـان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کوشـت و وشـترەکانیان بـرد بـۆ وڵاتـی خۆیان، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کۆمـەڵێ پیـاوی نـارد بەشـوێنیاندا،

الغُسْلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَذَا قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ: أَنْ لاَ يَتَوَضَّأَ بَعْدَ الغُسْلِ.

**واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای خۆشتن لە لەشگرانی دەستنوێژی نەدەگرت.**

**ئەمەش وتەی هەندێ لە زانایانە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان: دەستنوێژگرتن پێویست ناکات لەدوای خۆشتن لە لەشگرانی.**

## هەردوو شوێنی خەتەنە بەیەك گەیشتن خۆشتن واجب دەبێت.

٨٠ – بَابُ مَا جَاءَ إِذَا التَقَى الخِتَانَانِ وَجَبَ الغُسْلُ

١٠٨ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَال: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: إِذَا جَاوَزَ الخِتَانُ الخِتَانَ وَجَبَ الغُسْلُ، فَعَلْتُهُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاغْتَسَلْنَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَرَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ.

**واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر شوێنی خەتەنەی ئەندامی نێرینە چووەژوورەوە بۆ ناو شوێنی خەتەنەی مێینە و نقوم بوو ئەوە خۆشتن واجب دەبێت - ئیتر ئاویان بێتەوە و خۆشیان پێ بگات یان نا - ، جاری وا بووە من و پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەو کارەمان کردووە و خۆشمان شۆردووە.**

١٠٩ – (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا

جَاوَزَ الخِتَانُ الخِتَانَ وَجَبَ الغُسْلُ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ: إِذَا جَاوَزَ الخِتَانُ الخِتَانَ وَجَبَ الغُسْلُ. وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، وَعَلِيٌّ، وَعَائِشَةُ، وَالفُقَهَاءِ مِنَ التَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِثْلِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، قَالُوا: إِذَا التَقَى الخِتَانَانِ وَجَبَ الغُسْلُ.

واتـە: لـە عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویـەتی: (ئەگـەر شـوێنی خەتەنـەی ئەندامی نێرینە چووەژوورەوە بۆ ناو شوێنی خەتەنەی مێینەو نقوم بوو ئەوە خۆشـتن واجب دەبێت).

## خۆشتن بە ئاوهاتنەوە پێویست دەبێت

٨١ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْمَاءَ مِنَ الْمَاءِ

١١٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: إِنَّمَا كَانَ الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ رُخْصَةً فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، ثُمَّ نُهِيَ عَنْهَا.

واتـە: لـە ئوبـەی کـوڕی کەعبـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: بێگومان خۆشتن بە هاتنەوەی ئاوی مەنی پێویست دەبێت لەسەرەتای ئیسلامەوە روخسەتێ بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بەلاّم لەدوای ئەوە ڕێگری لێ کردوو فەرمانی کرد بە خۆشتن با ئاویشیان نەیەتەوە.

١١١ – حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ

الزُّهْرِيِّ بِهَذَا الإِسْنَادِ مِثْلَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَإِنَّمَا كَانَ الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، ثُمَّ نُسِخَ بَعْدَ ذَلِكَ. وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَرَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: عَلَى أَنَّهُ إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فِي الفَرْجِ وَجَبَ عَلَيْهِمَا الغُسْلُ وَإِنْ لَمْ يُنْزِلاَ.

بێگومان لەسەرەتای ئیسلامەوە خۆشتن بە هاتنەوەی ئاوی مەنی واجب بـوو، لەپاشدا نەسخ بوەوە.

بە پەیڕەوكردنی ئەم فەرموودە زۆربەی زانایان رایان وایـە ئەگـەر پیـاوێ لەگـەڵ ژنەكەی جووت بوو ئاویان بێتەوە یان نا واجبە خۆیان بشۆن.

١١٢ - (صحيح دون قوله: (فِي الاِحْتِلاَمِ) وهو ضعيف الإسناد موقوف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي الجَحَّافِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ فِي الاِحْتِلاَمِ. سَمِعْت الجَارُودَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا، يَقُولُ: لَمْ نَجِدْ هَذَا الحَدِيثَ إِلاَّ عِنْدَ شَرِيكٍ. وَأَبُو الجَحَّافِ اسْمُهُ دَاوُدُ بْنُ أَبِي عَوْفٍ. وَيُرْوَى عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الجَحَّافِ وَكَانَ مَرْضِيًّا. وَفِي البَابِ عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَالزُّبَيْرِ، وَطَلْحَةَ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: بێگومان خۆشتن بە هاتنەوەی ئاوی مەنی پێویست دەبێت بۆ كاتی شەیتانی بوونە، واتە ئەگەر كەسێ شەیتانی بوو ئاوی نەهاتەوە واجب نیە لەسەری خۆی بشوات.

لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (خۆشتن بە هاتنەوەی ئاوی مەنی پێویست دەبێت).

## كەسێ لەخەو هەستا تەڕایی بینی بەڵام لەیادی نەبوو كە شەیتانی بووە.

٨٢ - بَابٌ فِيمَنْ يَسْتَيْقِظُ فَيَرَى بَلَلاً وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا

| ١١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ خَالِدٍ الخَيَّاطُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ البَلَلَ وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا؟ قَالَ: يَغْتَسِلُ، وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَدْ احْتَلَمَ وَلَمْ يَجِدْ بَلَلاً؟ قَالَ: لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ تَرَى ذَلِكَ غُسْلٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِنَّ النِّسَاءَ شَقَائِقُ الرِّجَالِ. وَإِنَّمَا رَوَى هَذَا الحَدِيثَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، حَدِيثَ عَائِشَةَ، فِي الرَّجُلِ يَجِدُ البَلَلَ وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا، وَعَبْدُ اللهِ ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ فِي الحَدِيثِ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ: إِذَا اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ فَرَأَى بِلَّةً أَنَّهُ يَغْتَسِلُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَأَحْمَدَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ: إِنَّمَا يَجِبُ عَلَيْهِ الغُسْلُ إِذَا كَانَتِ البِلَّةُ بِلَّةَ نُطْفَةٍ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَإِسْحَاقَ. وَإِذَا رَأَى احْتِلاَمًا وَلَمْ يَرَ بِلَّةً فَلاَ غُسْلَ عَلَيْهِ عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ. |
|---|

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوایان (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی: ئەگەر پیاوێ تەڕایی تۆماوی هەست پێ كرد بەڵام نەیەتەوە یادی كە شەیتانی بووبێ، ئایا خۆی بشوات یان نا؟ فەرمووی: (با خۆی بشوات). وە لێشیان پرسی: ئەگەر پیاوێ وای دەزانی كە شەیتانی بووە بەڵام تەڕایی تۆماوی هەست پێ نەكرد، ئایا خۆی بشوات یان نا؟ فەرمووی: (خۆ شتێنی لەسەر نیە). ئومو سەلەمەش ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خوای (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر ئافرەتیش هەستی بەو تەڕاییە کرد ئایا خۆشتنی لەسەرە یان نا؟ فەرمووی: (بەڵێ، بێگومان خۆ شتنی لەسەرە ئافرەتان هاوشێوەی پیاوانن).

سەبارەت بە (منی) و (مذي).

٨٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَنِيِّ وَالْمَذْيِ

١١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو السَّوَّاقُ الْبَلْخِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ (ح) وحَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمَذْيِ، فَقَالَ: مِنَ الْمَذْيِ الْوُضُوءُ، وَمِنَ الْمَنِيِّ الْغُسْلُ. وَفِي الْبَابِ عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ: مِنَ الْمَذْيِ الْوُضُوءُ، وَمِنَ الْمَنِيِّ الْغُسْلُ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی (مذي) لە پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی؟ فەرمووی: (بۆ (مذي)ئاوە لینجەکە دەستنوێژ گرتنەوە واجبە، بۆ مەنیش خۆشتن واجبە).

## ئەگەر (مذي) بەر پۆشاك بكەوێت.

## ٨٤ - بَابٌ فِي الْمَذْيِ يُصِيبُ الثَّوْبَ

١١٥ - (حسن) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عُبَيْدٍ هُوَ ابْنُ السَّبَّاقِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، قَالَ: كُنْتُ أَلْقَى مِنَ الْمَذْيِ شِدَّةً وَعَنَاءً، فَكُنْتُ أُكْثِرُ مِنْهُ الغُسْلَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَسَأَلْتُهُ عَنْهُ، فَقَالَ: إِنَّمَا يُجْزِئُكَ مِنْ ذَلِكَ الوُضُوءُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ بِمَا يُصِيبُ ثَوْبِي مِنْهُ، قَالَ: يَكْفِيكَ أَنْ تَأْخُذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ فَتَنْضَحَ بِهِ ثَوْبَكَ حَيْثُ تَرَى أَنَّهُ أَصَابَ مِنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ فِي الْمَذْيِ مِثْلَ هَذَا. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الْمَذْيِ يُصِيبُ الثَّوْبَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ يُجْزِئُ إِلاَّ الغَسْلُ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَإِسْحَاقَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُجْزِئُهُ النَّضْحُ وقَالَ أَحْمَدُ: أَرْجُو أَنْ يُجْزِئَهُ النَّضْحُ بِالماءِ.

واتە: لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (مذي)م زۆر زۆر بوو زۆر خۆم دەشت زۆر زەحمەت بوو بۆم، ئەوەم باس کرد بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: (بۆ (مذي) بەس دەستنوێژ گرتنەوەت لەسەرە). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر بەر پۆشاکەکەم کەوت چی بکەم؟ فەرمووی: (ئەوەندە بەسە کە مشتێ ئاو بپژێنی بەو شوێنەدا کە (مذي)یەکەی بەرکەوتووە).

زانایان ڕایان جیاوازە بۆ (مذي) ئەگەر بەر پۆشاك كەوت، هەندێکیان دەفەرموون: دەبێ شوێنەکەی بشۆردرێت، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئیسحاقە، هەندێکی تریان دەفەرموون: ئاوپژاندن لێی بەسە، پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت: ئومید دەکەم ئاو لێ پژاندنی بەس بێ.

## ئەگەر مەنی بەر پۆشاك بکەوێت.

### ٨٥ - بَابٌ فِي الْمَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ

١١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ الحَارِثِ، قَالَ: ضَافَ عَائِشَةَ ضَيْفٌ، فَأَمَرَتْ لَهُ بِمِلْحَفَةٍ صَفْرَاءَ، فَنَامَ فِيهَا، فَاحْتَلَمَ، فَاسْتَحْيَا أَنْ يُرْسِلَ بِهَا وَبِهَا أَثَرُ الاِحْتِلاَمِ، فَغَمَسَهَا فِي الْمَاءِ، ثُمَّ أَرْسَلَ بِهَا، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لِمَ أَفْسَدَ عَلَيْنَا ثَوْبَنَا؟ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَفْرُكَهُ بِأَصَابِعِهِ، وَرُبَّمَا فَرَكْتُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَصَابِعِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ الفُقَهَاءِ مِثْلِ: سُفْيَانَ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، قَالُوا: فِي الْمَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ يُجْزِئُهُ الفَرْكُ وَإِنْ لَمْ يُغْسَلْ. وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ عَائِشَةَ، مِثْلَ رِوَايَةِ الأَعْمَشِ. وَرَوَى أَبُو مَعْشَرٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ. وَحَدِيثُ الأَعْمَشِ أَصَحُّ.

واتە: لە هەمامی کوڕی (حَارِث)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ داپۆشەرێکی زەردی هەبوو وەك عەبا جارێ میوانێکی هەبوو فەرمانی پێ کرد، کە خەوت بیدات بە خۆیدا، ئەویش خەوت و شەیتانی بوو، پێی شەرم بوو بۆی ڕەوانە بکاتەوە چونکە شوێنەوای مەنیەکەی پێوە بوو، بۆیە هەستا نوقمی ناو ئاوی کردو شۆردی و ناردیەوە بۆی، عائیشە فەرمووی: ئەوە بۆ پۆشاکەکەی خراپ کردین؟ ئەوەندە بەس بوو کە بە پەنجەکانی شوێنەکەی بپرواندایە. بۆ خۆم هەندێ جار بە پەنجەکانم (مەنی)م بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەپرواند.

## دەربارەی شۆردنی مەنی بە پۆشاکەوە

٨٦ - بَابُ غَسْلِ الْمَنِيِّ مِنَ الثَّوْبِ

١١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونِ بْنِ مِهْرَانَ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا غَسَلَتْ مَنِيًّا مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَحَدِيثُ عَائِشَةَ أَنَّهَا غَسَلَتْ مَنِيًّا مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَيْسَ بِمُخَالِفٍ لِحَدِيثِ الفَرْكِ، لأَنَّهُ وَإِنْ كَانَ الفَرْكُ يُجْزِئُ فَقَدْ يُسْتَحَبُّ لِلرَّجُلِ أَنْ لاَ يُرَى عَلَى ثَوْبِهِ أَثَرُهُ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: الْمَنِيُّ بِمَنْزِلَةِ الْمُخَاطِ، فَأَمِطْهُ عَنْكَ وَلَوْ بِإِذْخِرَةٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە مەنی بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شۆردووە. فەرموودەکەی عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ کە مەنی بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شۆردووە، پێچەوانەی فەرموودەی پرواندنەکە نییە، چونکە ئەگەر پرواندن بەس بێ پیاو پێی خۆش نیە شوێنەواری مەنیەکە ببینێ بە پۆشاکەکەیەوە، ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێت: حوکمی مەنی بەر پۆشاك بکەوێ وەك حوکمی چڵم وایە لەخۆتی بکەرەوە با بە (إِذْخِر)یش بێت کە پوشێکی بۆن خۆشە.

## دەربارەی لەشگران پێش خۆشتن بخەوێت

٨٧ - بَابُ فِي الجُنُبِ يَنَامُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ

١١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ يَنَامُ وَهُوَ جُنُبٌ وَلاَ يَمَسُّ مَاءً.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەکاتێکدا کە لەشگران بوو دەخەوت، وە ئاویشی بەرنەدەکەوت. واتە: نە دەستنوێژی دەگرت و نەخۆشی دەشت.

١١٩ – حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفيانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، نَحْوَهُ. وَهَذَا قَوْلُ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَغَيْرِهِ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ كَانَ يَتَوَضَّأُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ. وَقَدْ رَوَى عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ هَذَا الحَدِيثَ شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، وَيَرَوْنَ أَنَّ هَذَا غَلَطٌ مِنْ أَبِي إِسْحَاقَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێش ئەوەی بخەوێت دەستنوێژی دەگرت.

## □ دەستنوێژگرتن بۆ لەشگران ئەگەر ویستی بخەوێت

٨٨ – بَابٌ فِي الوُضُوءِ لِلْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ

١٢٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟، قَالَ: نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَمَّارٍ، وَعَائِشَةَ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ عُمَرَ أَحْسَنُ شَيْءٍ فِي هَذَا البَابِ وَأَصَحُّ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالتَّابِعِينَ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، قَالُوا: إِذَا أَرَادَ الجُنُبُ أَنْ يَنَامَ تَوَضَّأَ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لـە پێغەمبـەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسیوە: ئایا ئەگەر کەسێکمان لەشـگران بـوو لـەپێش ئـەوەی خۆی بشوات بخەوێت یان نا؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەگەر دەستنوێژی گرت بخەوێ).

## دەربارەی تەوقەکردن لەگەڵ لەشگران

٨٩ – بَابُ مَا جَاءَ فِي مُصَافَحَةِ الجُنُبِ

١٢١ – (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُزَنِيِّ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقِيَهُ وَهُوَ جُنُبٌ، قَالَ: فَانْبَجَسْتُ، فَاغْتَسَلْتُ، ثُمَّ جِئْتُ، فَقَالَ: أَيْنَ كُنْتَ؟، أَوْ أَيْنَ ذَهَبْتَ؟، قُلْتُ: إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا، قَالَ: إِنَّ الْمُسْلِمَ لاَ يَنْجُسُ. وَفِي البَابِ عَنْ حُذَيْفَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَخَّصَ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ فِي مُصَافَحَةِ الجُنُبِ، وَلَمْ يَرَوْا بِعَرَقِ الجُنُبِ، وَالحَائِضِ بَأْسًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە جـارێ لەشـگران بووە لە یەکێ لە ڕێگاکانی مەدینە تووشی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووە، لەبەرئەوەی لەشگران بوو خۆی لێ شاردەوە و چوو خۆی شـت و هاتۆتـەوە بـۆ لای، فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیرە! لە کوێ بویـت؟ یـان بـۆ کـوێ چـوویت؟). وتم: ڕاستیەکەی من لەشگران بووم بۆیە پێم خۆش نەبوو بێمە خزمەتت، چووم خۆم شت و هاتمەوە. ئەویش فەرمووی: (بەڕاستی موسوڵمان هەرگیز پیس نابێت).

تەوقەکردن و تێکەڵی لەشگران دروستە و جەستەی لەشگران و ئافرەتی بێ نوێـژ پاك و خاوێنە.

## دەربارەی ئافرەت ئەوە دەبینێ لەخەودا کە پیاو دەیبینێ.

٩٠ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَرْأَةِ تَرَى فِي الْمَنَامِ مِثْلَ مَا يَرَى الرَّجُلُ

١٢٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ بِنْتُ مِلْحَانَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الحَقِّ، فَهَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ، تَعْنِي غُسْلاً، إِذَا هِيَ رَأَتْ فِي الْمَنَامِ مِثْلَ مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ قَال: نَعَمْ، إِذَا هِيَ رَأَتِ الْمَاءَ فَلْتَغْتَسِلْ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: قُلْتُ لَهَا: فَضَحْتِ النِّسَاءَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ الفُقَهَاءِ: أَنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا رَأَتْ فِي الْمَنَامِ مِثْلَ مَا يَرَى الرَّجُلُ فَأَنْزَلَتْ أَنَّ عَلَيْهَا الغُسْلَ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ. وَفِي البَابِ عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ، وَخَوْلَةَ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسٍ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئوممو سولەیمی کچی میلحان هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بەڕاستی خوا شەرم لە هەق و ڕاستی ناکات، ئایا ئافرەت خۆ شتنی لەسەرە، ئەگەر لەخەودا ئەوەی بینی کە پیاو دەیبینێ؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بەڵێ، خۆ شتنی لەسەرە ئەگەر تەڕایی تۆماوی هەست پێ کرد). ئوممو سەلەمە فەرمووی: ئەی ئوممو سولەیم تۆ ئافرەتت شەرمەزار کرد.

## دەربارەی پیاو لەدوای خۆشتن خۆی گەرم بکاتەوە بە ژنەکەی.

٩١ – بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَسْتَدْفِئُ بِالمَرْأَةِ بَعْدَ الغُسْلِ

١٢٣ – (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ حُرَيْثٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ

مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: رُبَّمَا اغْتَسَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الجَنَابَةِ، ثُمَّ جَاءَ فَاسْتَدْفَأَ بِي، فَضَمَمْتُهُ إِلَيَّ وَلَمْ أَغْتَسِلْ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ بِإِسْنَادِهِ بَأْسٌ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا اغْتَسَلَ فَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يَسْتَدْفِئَ بِامْرَأَتِهِ وَيَنَامَ مَعَهَا قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ الْمَرْأَةُ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جاری وا دەبوو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە لەشگرانی خۆی دەشت، لەپاشدا دەهات ئەندامەکانی جەستەی دەخستە سەر ئەندامەکانی جەستەی من بە ڕووتی و خۆی بە من گەرم دەکردەوە، منیش دەمگوشی بە خۆمەوە و خۆشم نەدەشت.

## ئەگەر لەشگران ئاوی دەست نەکەوت تەیەموم بکات.

٩٢ – بَابُ التَّيَمُّمِ لِلْجُنُبِ إِذَا لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ

١٢٤– (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ بُجْدَانَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ الْمَاءَ فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ. وقَالَ مَحْمُودٌ فِي حَدِيثِهِ: إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ. وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ بُجْدَانَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي عَامِرٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَلَمْ يُسَمِّهِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ الفُقَهَاءِ: أَنَّ الجُنُبَ، وَالحَائِضَ إِذَا لَمْ يَجِدَا الْمَاءَ تَيَمَّمَا

وَصَلِّيَا. وَيُرْوَى عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ كَانَ لاَ يَرَى التَّيَمُّمَ لِلْجُنُبِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ. وَيُرْوَى عَنْهُ أَنَّهُ رَجَعَ عَنْ قَوْلِهِ: فَقَالَ: يَتَيَمَّمُ إِذَا لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەبو (ذَرّ)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر ئاو دەست نەكەوت گڵی پاك پاك و پاكژكەرەوەیە بۆ دەستنوێژی موسوڵمان واتە تەیەموم بكات با دە ساڵیشی پێ بچێت، بەڵام ئەگەر ئاو دەستكەوت با دەستنوێژی پێ بگرێ چونكە ئەوە چاكترە و خێر و پاداشتی زۆر ترە).

بێگومان لەشگران و ئافرەتێ هەمیشە خوێنی هەبێ ئەگەر ئاویان دەست نەكەوت بۆیان هەیە تەیەموم بكەن و نوێژ بكەن. ئەمەش وتەی جەماوەری زانا شەرعزانەكانە بە گشتی.

## دەربارەی ئافرەتێ كە بەردەوام خوێنی هەبێ.

### ٩٣ - بَابٌ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ

١٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَعَبْدَةُ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ قَال: لاَ، إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَيْسَتْ بِالحَيْضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي. قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ فِي حَدِيثِهِ: وَقَال: تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ حَتَّى يَجِيءَ ذَلِكَ الوَقْتُ. وَفِي البَابِ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكٌ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ: أَنَّ

الْمُسْتَحَاضَةَ إِذَا جَاوَزَتْ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا اغْتَسَلَتْ وَتَوَضَّأَتْ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: (فَاطِمَة)ی كچی ئەبو حوبەیش هات بۆ لای پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: مـن ئافرەتێكم خوێن لەبەر رۆشتنی بەردەوامم هەیەو پاك نابمەوە، ئایا واز لە نوێژكردن بهێنم؟ فەرمووی: (نا، ئەوە خوێنی دەمارە، خوێنی حەیز نیە، ئەگەر خوێنی حەیز دەستی پێ كرد ئەوە نوێژ مەكە، بەلاّم ئەگەر خوێنی حەیزەكە وشكی كردو نەما پاك بوویتەوە ئەوە خۆت بشۆ، پاشان ئەو خوێنەش بشۆ كە لەدوای خۆشتنەكە دێت، ئینجا نوێژ بكە). ئەبو موعاویە لەفەرموودەكەیدا فەرمووی: هەروەها فەرمووی: (بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بگرە تا كاتی خوێنی حەیزەكە دێتە پێشەوە).

ئەمەش وتەی هەندێ لە زانایانە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنكەوتوان، پێشەوایان سوفیان و مالیك و ئیبنو موبارەك و شافیعی ئەمە دەفەرموون: ئافرەتی (مستحاضة) ماوەی بێ نوێژیەكەی تەواو بوو خۆی بشوات و بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بگرێت.

### (مستحاضة) دەبێ بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بگرێ

٩٤ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْمُسْتَحَاضَةَ تَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

١٢٦- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي الْيَقْظَانِ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: (تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا الَّتِي كَانَتْ تَحِيضُ فِيهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ وَتَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَتَصُومُ وَتُصَلِّي).

واتە: لە عەدی کوڕی (ثابت)ەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئافرەتێ هەمیشە خوێنی هەبێ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (با ڕۆژانی بێ نوێژیەکەی نوێژ نەکات ئەو ماوەیەی کە تێیدا دەکەوتە حەیزەوە، لەپاشدا خۆی بشوات و بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بگرێتەوە و نوێژ بکات، وە ڕۆژووش بگرێت).

١٢٧ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُرَيْكٌ، نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ قَدْ تَفَرَّدَ بِهِ شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي الْيَقْظَانِ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَقُلْتُ: عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، جَدُّ عَدِيٍّ، مَا اسْمُهُ؟ فَلَمْ يَعْرِفْ مُحَمَّدٌ اسْمَهُ، وَذَكَرْتُ لِمُحَمَّدٍ قَوْلَ يَحْيَى بْنِ مَعِينٍ: أَنَّ اسْمَهُ دِينَارٌ، فَلَمْ يَعْبَأْ بِهِ. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: إِنْ اغْتَسَلَتْ لِكُلِّ صَلاَةٍ هُوَ أَحْوَطُ لَهَا، وَإِنْ تَوَضَّأَتْ لِكُلِّ صَلاَةٍ أَجْزَأَهَا، وَإِنْ جَمَعَتْ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ بِغُسْلٍ أَجْزَأَهَا.

پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق دەربارەی ئافرەتێ هەمیشە خوێنی هەبێ دەفەرموون: ئەگەر بۆ هەموو نوێژێ خۆی بشوات ئەوە بۆی دڵنیاترە و باشترە، وە ئەگەر بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بگرێت ئەوەی بەسە، وە ئەگەر بە خۆشتنێ دوو نوێژی کۆکردەوە ئەوەشی بەسەو هەموویان دروستن.

## دەربارەی (مستحاضة) بە خۆشتنێ دوو نوێژ بکات

### ٩٥ - بَابٌ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ أَنَّهَا تَجْمَعُ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ

١٢٨ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ الْعَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَمِّهِ عِمْرَانَ بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أُمِّهِ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ قَالَتْ: كُنْتُ أُسْتَحَاضُ

حَيْضَةً كَثِيرَةً شَدِيدَةً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْتَفْتِيهِ وَأُخْبِرُهُ، فَوَجَدْتُهُ فِي بَيْتِ أُخْتِي زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أُسْتَحَاضُ حَيْضَةً كَثِيرَةً شَدِيدَةً، فَمَا تَأْمُرُنِي فِيهَا، فَقَدْ مَنَعَتْنِي الصِّيَامَ وَالصَّلاَةَ؟ قَالَ: أَنْعَتُ لَكِ الكُرْسُفَ، فَإِنَّهُ يُذْهِبُ الدَّمَ قَالَتْ: هُوَ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: فَتَلَجَّمِي قَالَتْ: هُوَ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: فَاتَّخِذِي ثَوْبًا قَالَتْ: هُوَ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، إِنَّمَا أَثُجُّ ثَجًّا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سَآمُرُكِ بِأَمْرَيْنِ: أَيَّهُمَا صَنَعْتِ أَجْزَأَ عَنْكِ، فَإِنْ قَوِيتِ عَلَيْهِمَا فَأَنْتِ أَعْلَمُ فَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ رَكْضَةٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَتَحَيَّضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ فِي عِلْمِ اللهِ، ثُمَّ اغْتَسِلِي، فَإِذَا رَأَيْتِ أَنَّكِ قَدْ طَهُرْتِ وَاسْتَنْقَأْتِ فَصَلِّي أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، أَوْ ثَلاَثًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَأَيَّامَهَا، وَصُومِي وَصَلِّي، فَإِنَّ ذَلِكِ يُجْزِئُكِ، وَكَذَلِكِ فَافْعَلِي، كَمَا تَحِيضُ النِّسَاءُ وَكَمَا يَطْهُرْنَ، لِمِيقَاتِ حَيْضِهِنَّ وَطُهْرِهِنَّ، فَإِنْ قَوِيتِ عَلَى أَنْ تُؤَخِّرِي الظُّهْرَ وَتُعَجِّلِي العَصْرَ، ثُمَّ تَغْتَسِلِينَ حِينَ تَطْهُرِينَ، وَتُصَلِّينَ الظُّهْرَ وَالعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ تُؤَخِّرِينَ الْمَغْرِبَ، وَتُعَجِّلِينَ العِشَاءَ، ثُمَّ تَغْتَسِلِينَ، وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ، فَافْعَلِي، وَتَغْتَسِلِينَ مَعَ الصُّبْحِ وَتُصَلِّينَ، وَكَذَلِكِ فَافْعَلِي، وَصُومِي إِنْ قَوِيتِ عَلَى ذَلِكَ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَهُوَ أَعْجَبُ الأَمْرَيْنِ إِلَيَّ.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَاهُ عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو الرَّقِّيُّ، وَابْنُ جُرَيْجٍ، وَشَرِيكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَمِّهِ عِمْرَانَ، عَنْ أُمِّهِ حَمْنَةَ، إِلاَّ أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ يَقُولُ: عُمَرُ بْنُ طَلْحَةَ، وَالصَّحِيحُ عِمْرَانُ بْنُ طَلْحَةَ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: هُوَ حَدِيثٌ حَسَنٌ.وَهَكَذَا قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: هُوَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: إِذَا كَانَتْ تَعْرِفُ حَيْضَهَا بِإِقْبَالِ الدَّمِ وَإِدْبَارِهِ، وَإِقْبَالُهُ أَنْ يَكُونَ أَسْوَدَ، وَإِدْبَارُهُ أَنْ يَتَغَيَّرَ إِلَى الصُّفْرَةِ، فَالحُكْمُ لَهَا عَلَى حَدِيثِ فَاطِمَةَ بِنْتِ أَبِي حُبَيْشٍ، وَإِنْ كَانَتِ الْمُسْتَحَاضَةُ لَهَا أَيَّامٌ مَعْرُوفَةٌ قَبْلَ أَنْ تُسْتَحَاضَ، فَإِنَّهَا تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ وَتَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ وَتُصَلِّي،

وَإِذَا اسْتَمَرَّ بِهَا الدَّمُ وَلَمْ يَكُنْ لَهَا أَيَّامٌ مَعْرُوفَةٌ وَلَمْ تَعْرِفِ الحَيْضَ بِإِقْبَالِ الدَّمِ وَإِدْبَارِهِ، فَالحُكْمُ لَهَا عَلَى حَدِيثِ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: الْمُسْتَحَاضَةُ إِذَا اسْتَمَرَّ بِهَا الدَّمُ فِي أَوَّلِ مَا رَأَتْ فَدَامَتْ عَلَى ذَلِكَ، فَإِنَّهَا تَدَعُ الصَّلاَةَ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا، فَإِذَا طَهُرَتْ فِي خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا، أَوْ قَبْلَ ذَلِكَ، فَإِنَّهَا أَيَّامُ حَيْضٍ، فَإِذَا رَأَتِ الدَّمَ أَكْثَرَ مِنْ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا، فَإِنَّهَا تَقْضِي صَلاَةَ أَرْبَعَةَ عَشَرَ يَوْمًا، ثُمَّ تَدَعُ الصَّلاَةَ بَعْدَ ذَلِكَ أَقَلَّ مَا تَحِيضُ النِّسَاءُ، وَهُوَ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ.وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي أَقَلِّ الحَيْضِ وَأَكْثَرِهِ: فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: أَقَلُّ الحَيْضِ ثَلاَثَةٌ، وَأَكْثَرُهُ عَشَرَةٌ.وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ، وَبِهِ يَأْخُذُ ابْنُ الْمُبَارَكِ، وَرُوِيَ عَنْهُ خِلاَفُ هَذَا.وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْهُمْ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ: أَقَلُّ الحَيْضِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَأَكْثَرُهُ خَمْسَةَ عَشَرَ.وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالأَوْزَاعِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَأَبِي عُبَيْدٍ.

واتە: لە حەمنەی كچی جەحشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هەمیشە خوێنی زۆرم هەبوو، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەواڵەكەی بۆ باس بكەم و لەو بارەوە پرسیاری لێ بكەم، لەماڵی زەینەبی خوشكم بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، خوێنی یەكجار زۆرم هەیە، ڕێگەی نوێژ و ڕۆژووی لێ گرتووم، فەرمانم بەچی پێ دەكەیت؟ فەرمووی: (لۆكەت نیشان دەدەم بە ڕۆن زەیت چەوری بكە و هەڵی بگرە - واتە بیخە شەرمگەتەوە — ئیتر خوێنەكەت دەوەستێنێ). حەمنە فەرمووی: زۆر لەوە زیاترە؟ فەرمووی: (پەڕۆیە بۆ خۆت دروست بكە و خۆتی پێ شەتەك بدە)، فەرمووی: زۆر لەوەش زیاترە؟ فەرمووی: (فەرمانت پێ دەكەم بەم دوو شت: هەر كامیان بكەی ئەوەیانت بەسە، ئەگەر توانای هەردووكیانت هەبوو ئەوە خۆت دەزانی و خۆت سەرپشكی. فەرمووی: (ئەوە سەرلێشێواندنێكی شەیتانە، شەش ڕۆژ یان حەوت ڕۆژ خۆت بە بێ نوێژ دابنێ، وەك ئەو ماوەیەی لە عیلم و زانستی

خوای گەورەدا هەیە، لەپاشدا خۆت پاك بشۆ، كاتێ كە دیت پاك بویتەتەوە ئیتر بیست و چوار شەو یان بیست و سێ شەو بە رۆژەكانیەوە نوێژ بكە و رۆژووش بگرە، ئیتر ئەمەت بەسە، هەموو مانگێ بەم شێوەیە حەوت رۆژ یان شەش رۆژ دابنێ بۆ ماوەی بێ نوێژیت، باقیەكەی دابنێ بۆ پاكێتی، ماوەی بێ نوێژی خۆت بەرامبەر بكە بە ماوەی بێ نوێژی ژنانی تر لەخزم و هاوتەمەنانت، ئەگەر توانات هەبوو نوێژی نیوەڕۆ دوابخە و نوێژی عەصر زوو بكە، بەم شێوەیە لەپێشدا خۆت بشۆ و دەستنوێژ بگرە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بكە، ئینجا نوێژی شێوان دوابخە و نوێژی عیشا زوو بكە، بەم شێوەیە لەپێشدا خۆت بشۆ و دەستنوێژ بگرە نوێژی شێوان و نوێژی عیشا بكە، بۆ نوێژی بەیانی خۆت بشۆ و نوێژی بەیانی بكە، ئەگەر ئارەزووت بوو رۆژوویش بگرە. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (من ئەمەیانم بەلاوە باشترە).

## دەربارەی (مستحاضة) بۆ هەموو نوێژێ خۆی بشوات

### ٩٦- بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ أَنَّهَا تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ

١٢٩- (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: اسْتَفْتَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ ابْنَةُ جَحْشٍ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ فَقَال: (لاَ، إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، فَاغْتَسِلِي ثُمَّ صَلِّي). فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ. قَالَ قُتَيْبَةُ: قَالَ اللَّيْثُ: لَمْ يَذْكُرْ ابْنُ شِهَابٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ أُمَّ حَبِيبَةَ أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ وَلَكِنَّهُ شَيْءٌ فَعَلَتْهُ هِيَ. وَيُرْوَى هَذَا الحَدِيثُ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: اسْتَفْتَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ. رَوَاهُ الأَوْزَاعِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ.

**واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دایکی حەبیبە حەمنەی کچی جەحش ڕەزای خوای لێ بێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مـن ئافرەتێکم خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامم هەیەو پاك نابمەوە، ئایا واز لە نوێـژکردن بهێنم؟ فەرمووی: (نا، ئەوە خوێنی دەمارە، خوێنی حەیز نیە، خۆت بشـۆ لەپاشـدا نوێژ بکە). ئیتر لەوە بەدواوە حەمنە بۆ هەموو نوێژێ خۆی دەشت.**

## ئافرەتی بێ نوێژ نوێژە فەوتاوەکانی ناگێڕێتەوە

### ٩٧- بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَائِضِ أَنَّهَا لاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ

١٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ مُعَاذَةَ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: أَتَقْضِي إِحْدَانَا صَلاَتَهَا أَيَّامَ مَحِيضِهَا؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قَدْ كَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ فَلاَ تُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَائِشَةَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ أَنَّ الحَائِضَ لاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ الفُقَهَاءِ لاَ اخْتِلاَفَ بَيْنَهُمْ فِي أَنَّ الحَائِضَ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ.

واتە: لە (مُعَاذَة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ پرسیاری کرد لە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئایا یەکێ لە ئێمە نوێژە فەوتاوەکانی ڕۆژانی بێ نوێژی بگێڕێتەوە؟ عائیشەش ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆچی تۆ (حَرُورِيَّة)یت؟ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین کاتێ کە بێ نوێژ دەبووین نە نوێژە فەوتاوەکانمان دەگێڕایەوە، وە نە فەرمانیشمان پێ دەکرا بە گێڕانەوەیان[1] .

ئافرەتی بێ نوێژ ڕۆژووە فەرزە فەوتاوەکانی دەگێڕێتەوە، بەڵام نوێژە فەوتاوەکانی ناگێڕێتەوە. ئەمەش رای تێکڕای زانایانە بە گشتی و بەبێ جیاوازی.

(١) (حَرُورِية) کۆمەڵێ (خوارج)ی گومڕابوون لە فەرمانی ئیمام عەلی دەرچوون, جا (حَرُورِية) شوێنێکە نزیکەی دوو میل لە کوفەوە دوورە یەکەم کۆبونەوەیان تێدا ئەنجام دا, بۆیە ئەوەی بیروباوەڕی خەوارجی هەبووایە پێیان دەوت: حەروری(حَرُورِيَّة).

## دروست نیە کەسی لەشگران و ئافرەتی بێ نوێژ قورئان بخوێننەوە.

### ٩٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْجُنُبِ وَالْحَائِضِ أَنَّهُمَا لاَ يَقْرَآنِ الْقُرْآنَ

١٣١ - (منكر) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، وَالْحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَقْرَإِ الْحَائِضُ، وَلاَ الْجُنُبُ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَقْرَإِ الْجُنُبُ وَلاَ الْحَائِضُ. وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِثْلِ: سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، قَالُوا: لاَ تَقْرَإِ الْحَائِضُ وَلاَ الْجُنُبُ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْئًا، إِلاَّ طَرَفَ الآيَةِ وَالْحَرْفَ وَنَحْوَ ذَلِكَ، وَرَخَّصُوا لِلْجُنُبِ وَالْحَائِضِ فِي التَّسْبِيحِ وَالتَّهْلِيلِ. وسَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، يَقُولُ: إِنَّ إِسْمَاعِيلَ بْنَ عَيَّاشٍ يَرْوِي عَنْ أَهْلِ الْحِجَازِ، وَأَهْلِ الْعِرَاقِ أَحَادِيثَ مَنَاكِيرَ، كَأَنَّهُ ضَعَّفَ رِوَايَتَهُ عَنْهُمْ فِيمَا يَتَفَرَّدُ بِهِ، وَقَالَ: إِنَّمَا حَدِيثُ إِسْمَاعِيلَ بْنَ عَيَّاشٍ عَنْ أَهْلِ الشَّأْمِ. وقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ أَصْلَحُ مِنْ بَقِيَّةَ، وَلِبَقِيَّةَ أَحَادِيثُ مَنَاكِيرُ عَنِ الثِّقَاتِ. حَدَّثَنِي بِذَلِكَ أَحْمَدُ بْنُ الْحَسَنِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ ذَلِك.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کەسی لەشگران و ئافرەتی بێ نوێژ دروست نییە هیچ شتێ لە قورئان بخوێننەوە).**

## موباشەرە لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ

٩٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مُبَاشَرَةِ الحَائِضِ

١٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مِنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا حِضْتُ يَأْمُرُنِي أَنْ أَتَّزِرَ، ثُمَّ يُبَاشِرُنِي. وَفِي البَابِ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، وَمَيْمُونَةَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ، وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە دەکەوتمە حاڵەتی بێ نوێژیەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ دەکردم ئیزارەکەم توند ببەستم واتە نێوانی ئەژنۆ و ناوکم داپۆشم، لە پاشدا دەسبازی و ماچ و موچی لەگەڵ دەکردم و جەستەی بەر جەستەم دەکەوت و خۆی دەنوساند پێمەوە و چێژی لێ وەردەگرتم بەبێ ئەنجامدانی کاری جوت بوون.

## سەبارەت بە خواردن لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ

١٠٠- بَابُ مَا جَاءَ فِي مُؤَاكَلَةِ الحَائِضِ وَسُؤْرِهَا

١٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ العَنْبَرِيُّ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَال: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ حَرَامِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدٍ، قَال: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ مُؤَاكَلَةِ الحَائِضِ؟ فَقَال: وَاكِلْهَا. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ: لَمْ يَرَوْا بِمُؤَاكَلَةِ الحَائِضِ بَأْسًا. وَاخْتَلَفُوا فِي فَضْلِ وَضُوئِهَا، فَرَخَّصَ فِي ذَلِكَ بَعْضُهُمْ، وَكَرِهَ بَعْضُهُمْ فَضْلَ

طَهُورِهَا.

واتە: لە حەرامی کوڕی حەکیمەوە، لە مامیەوە (عبد الله)ی کوڕی سەعدەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی نان خواردن لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: (نانیان لەگەڵ بخۆ).

ئەمەش وتەی سەرجەم زانایانە نان خواردن لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ دروستە، بەڵام رایان جیاوازە لەسەر پاشماوەی ئاوی دەستنوێژەکەی، هەندێکیان ڕێگەیان پێداوە، هەندێکیشیان بەلایانەوە باش نیە.

## ئافرەتی بێ نوێژ شتێ بدات بەدەست کەسێکەوە لەمزگەوتدا بێ

### ١٠١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَائِضِ تَتَنَاوَلُ الشَّيْءَ مِنَ الْمَسْجِدِ

١٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، قَال: قَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَاوِلِينِي الخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ، قَالَتْ: قُلْتُ: إِنِّي حَائِضٌ، قَال: إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ، لاَ نَعْلَمُ بَيْنَهُمْ اخْتِلاَفًا فِي ذَلِكَ: بِأَنْ لاَ بَأْسَ أَنْ تَتَنَاوَلَ الحَائِضُ شَيْئًا مِنَ الْمَسْجِدِ.

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لە هۆدەکەی خۆمدا بووم پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ناو مزگەوتدا بوو پێی فەرمووم: (خُمْرَة)کەم بدەرێ - (خُمْرَة) بەرماڵێکی بچوك بووە لە پەلکە خورما دروست دەکرا)، وتم: من بێ نوێژم بۆیە ناتوانم دەست درێژ بکەم بۆ ناو مزگەوت. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

فەرمووی: (خۆ خوێنی بێ نوێژیەكەت لە ناو دەستتدا نیە).

## دەربارەی چوونە لای ئافرەتی بێ نوێژ باش نیە

١٠٢- بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ إِتْيَانِ الحَائِضِ

١٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، وَبَهْزُ بْنُ أَسَدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ حَكِيمٍ الأَثْرَمِ، عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الهُجَيْمِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَتَى حَائِضًا، أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا، أَوْ كَاهِنًا، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ. لاَ نَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حَكِيمٍ الأَثْرَمِ، عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الهُجَيْمِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ عَلَى التَّغْلِيظِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَتَى حَائِضًا فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ. فَلَوْ كَانَ إِتْيَانُ الحَائِضِ كُفْرًا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِالكَفَّارَةِ. وَضَعَّفَ مُحَمَّدٌ هَذَا الحَدِيثَ مِنْ قِبَلِ إِسْنَادِهِ. وَأَبُو تَمِيمَةَ الهُجَيْمِيِّ اسْمُهُ طَرِيفُ بْنُ مُجَالِدٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەو كەسەی بچێتە لای ئافرەتی بێ نوێژ، یان لەدواوە بچێتە لای ژنێ، یا بچێت بۆ لای (كاهین)كولەنانی، ئەوە كافر و بێ بڕوا بووە بە موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

مانای ئەمە لای زانایان بۆ هەڕەشەیە، بێگومان ڕیوایەت كراوە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، كە فەرموویەتی: (ئەو كەسەی بچێتە لای ئافرەتی بێ نوێژ با دیناریێ بكات بە خێر). واتە دینارێكی ئالتون. ئەگەر چوونە لای ئافرەتی بێ نوێژ كوفر بوایە فەرمانی نەدەكرد كەفارەت بدات، لەبەرئەوە موحەممەد ئەم فەرموودەی بە لاواز(ضعیف) داناوە لەرووی سەنەدەكەیەوەوە.

## دەربارەی کەفارەتی چوونە لای ئافرەتی بێ نوێژ

۱۰۳- بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَفَّارَةِ فِي ذَلِكَ

۱۳٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ خُصَيْفٍ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الرَّجُلِ يَقَعُ عَلَى امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: (يَتَصَدَّقُ بِنِصْفِ دِينَارٍ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی پیاوێ بچێتە لای ژنەکەی لەکاتێکدا بێ نوێژ بێ، فەرموویەتی: (با نیو دینار – ئاڵتون- بکات بە خێر).

۱۳۷- (ضعيف، والصحيح عن هذا تفصيل موقوف) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ السُّكَّرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الكَرِيمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا كَانَ دَمًا أَحْمَرَ فَدِينَارٌ، وَإِذَا كَانَ دَمًا أَصْفَرَ فَنِصْفُ دِينَارٍ. حَدِيثُ الكَفَّارَةِ فِي إِتْيَانِ الحَائِضِ قَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ مَوْقُوفًا وَمَرْفُوعًا. وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: يَسْتَغْفِرُ رَبَّهُ وَلاَ كَفَّارَةَ عَلَيْهِ. وَقَدْ رُوِيَ مِثْلُ قَوْلِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ بَعْضِ التَّابِعِينَ مِنْهُمْ: سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ، وَإِبْرَاهِيمُ النَّخَعِيُّ، وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ عُلَمَاءِ الأَمْصَارِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر خوێنەکە سوور بێ کەفارەتەکەی دینارێکە، ئەگەر زەرد بوو نیو دینارە).

پێشەوا ئیبنو موبارەك دەفەرموێت: داوای لێخۆشبوون بکات لە پەروەردگاری و کەفارەتی لەسەر نیە. وەك وتەکەی ئیبنو موبارەك هاتووە، لەلایەن هەندێ لە شوێنکەوتوانەوە لەوانە: سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئیبراهیمی نەخەعیەوە، ئەمەش وتەی سەرجەم زانایانی وڵاتی ئیسلامە.

## دەربارەی شتنی خوێنی حەیز بە پۆشاکەوە

### ١٠٤- بَابُ مَا جَاءَ فِي غَسْلِ دَمِ الحَيْضِ مِنَ الثَّوْبِ

١٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الثَّوْبِ يُصِيبُهُ الدَّمُ مِنَ الحَيْضَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: حُتِّيهِ، ثُمَّ اقْرُصِيهِ بِالماءِ، ثُمَّ رُشِّيهِ، وَصَلِّي فِيهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأُمِّ قَيْسِ بِنْتِ مِحْصَنٍ. حَدِيثُ أَسْمَاءَ فِي غَسْلِ الدَّمِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الدَّمِ يَكُونُ عَلَى الثَّوْبِ فَيُصَلِّي فِيهِ قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَهُ: فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ: إِذَا كَانَ الدَّمُ مِقْدَارَ الدِّرْهَمِ فَلَمْ يَغْسِلْهُ وَصَلَّى فِيهِ أَعَادَ الصَّلَاةَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ الدَّمُ أَكْثَرَ مِنْ قَدْرِ الدِّرْهَمِ أَعَادَ الصَّلَاةَ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ. وَلَمْ يُوجِبْ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ وَغَيْرِهِمْ عَلَيْهِ الإِعَادَةَ وَإِنْ كَانَ أَكْثَرَ مِنْ قَدْرِ الدِّرْهَمِ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: يَجِبُ عَلَيْهِ الغَسْلُ وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْ قَدْرِ الدِّرْهَمِ، وَشَدَّدَ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ دەربارەی پۆشاکێ خوێنی حەیزی پێوە بوو چی لێ بکرێت پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ ئەویش فەرمووی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە خوێنی بێ نوێژی بەر پۆشاکەکەی کەوت با بیپروێنێت - ئەگەر وشك بوو — ، ئینجا بە ئاویشەوە چاك لەنێوان پەنجەکانیدا بیپروێنێ، لەپاشدا بەچاکی بە ئاو بیشوات، جا نوێژی پێوە بکات).

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر ئەو خوێنەی کە بە پۆشاکەوەیە کە ئایا نوێژی

پێوە بکات پێش ئەوەی بیشوات یان نا؟ هەندێ زانا لە شوێنکەوتوان دەفەرموون: ئەگەر خوێنەکە بەئەندازەی درهەمێك بوو نەیشت و نوێژی پێوە کرد ئەوە دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر خوێنەکە لە ئەندازەی درهەمێك زیاتر بوو نوێژی پێوە کرد ئەوە دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە، ئەمەش وتەی سوفیان و ئیبنو موبارەکە.

هەندێك لە زانایان لە شوێنکەوتوان و جگە لەوانیش ئەگەر خوێنەکە لە ئەندازەی درهەمێك زیاتر بوو نوێژی پێوە کرد واجب نیە لەسەری نوێژەکەی بکاتەوە، پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون. پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: واجبە لەسەری بیشوات با لە ئەندازەی درهەمێك کەمتریش بێت، توندە لەمەدا.

### ئافرەتی زەیسان تاکەی نوێژ نەکات

### ١٠٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَمْ تَمْكُثُ النُّفَسَاءُ

١٣٩ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُجَاعُ بْنُ الوَلِيدِ أَبُو بَدْرٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ أَبِي سَهْلٍ، عَنْ مُسَّةَ الأَزْدِيَّةِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: كَانَتْ النُّفَسَاءُ تَجْلِسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، فَكُنَّا نَطْلِي وُجُوهَنَا بِالوَرْسِ مِنَ الكَلَفِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَهْلٍ، عَنْ مُسَّةَ الأَزْدِيَّةِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. وَاسْمُ أَبِي سَهْلٍ، كَثِيرُ بْنُ زِيَادٍ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى ثِقَةٌ، وَأَبُو سَهْلٍ ثِقَةٌ. وَلَمْ يَعْرِفْ مُحَمَّدٌ هَذَا الحَدِيثَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَهْلٍ. وَقَدْ أَجْمَعَ أَهْلُ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ عَلَى أَنَّ النُّفَسَاءَ تَدَعُ الصَّلاَةَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، إِلاَّ أَنْ تَرَى الطُّهْرَ

قَبْلَ ذَلِكَ، فَإِنَّهَا تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي. فَإِذَا رَأَتِ الدَّمَ بَعْدَ الأَرْبَعِينَ فَإِنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا: لاَ تَدَعُ الصَّلاَةَ بَعْدَ الأَرْبَعِينَ، وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ الفُقَهَاءِ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَيُرْوَى عَنِ الحَسَنِ البَصْرِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّهَا تَدَعُ الصَّلاَةَ خَمْسِينَ يَوْمًا إِذَا لَمْ تَرَ الطُّهْرَ. وَيُرْوَى عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، وَالشَّعْبِيِّ سِتِّينَ يَوْمًا.

واتە: لە ئەمو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئافرەتی زەیسان چل ڕۆژ، یان چل شەو دادەنیشت، واتە لەدوای منداڵ بوون دەستی هەڵدەگرت لە نوێژ و پەرستش و جوتبوون و کۆبونەوە لەگەڵ مێردەکەیدا، هەتا وامان لێ دەهات لەبەر زیپکەو قنجکە و پەڵەی دەم و چاو ڕووی خۆمان دەگرتە زەعفەران.

سەرجەم زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان و ئەوانەی دوای ئەوان کۆ و یەکدەنگن لەسەر ئەمە: ئافرەتی زەیسان چل ڕۆژ نوێژ نەکات، مەگەر لەپێش ئەو ماوەیەدا ببینێ پاك بۆتەوە لە خوێنی زەیسانیەکە، ئەوکاتە خۆی بشوات و نوێژەکانی بکات. ئەگەر لەدوای چل شەو و ڕۆژەکە خوێنی بینی، زۆربەی زانایان دەفەرموون: با واز لە نوێژکردن نەهێنێ و بەردەوام نوێژەکانی بکات، ئەمەش وتەی زۆربەی زانایانە. پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون . لە حەسەنی بەصریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئافرەتی زەیسان ئەگەر بینی پاك نەبوەتەوە لەخوێن با هەتا پەنجا ڕۆژ نوێژ نەکات. لە (عطاء)ی کوڕی ئەبی ڕەباح و شەعبیەوە دەگێڕنەوە، هەتا شەست ڕۆژ نوێژ نەکات.

## دەربارەی پیاوێ بچێتە لای ژنەكانی و یەكجار خۆی بشوات

### ١٠٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ

١٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي رَافِعٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْهُمْ: الحَسَنُ البَصْرِيُّ: أَنْ لاَ بَأْسَ أَنْ يَعُودَ قَبْلَ أَنْ يَتَوَضَّأَ. وَقَدْ رَوَى مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ هَذَا، عَنْ سُفْيَانَ، فَقَالَ: عَنْ أَبِي عُرْوَةَ، عَنْ أَبِي الخَطَّابِ، عَنْ أَنَسٍ. وَأَبُو عُرْوَةَ هُوَ مَعْمَرُ بْنُ رَاشِدٍ، وَأَبُو الخَطَّابِ، قَتَادَةُ بْنُ دِعَامَةَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) شەوێكیان گەڕا بەسەر سەرجەم هاوسەرەكانیدا جووتبوو لەگەڵیان و یەك جاریش خۆی شت.

ئەمەش وتەی هەندێ لە زانایانە لەوانە: حەسەنی بەصری: دروستە بۆ كەسێ پێش ئەوەی دەستنوێژ بگرێ و خۆی بشوات كاری جووتبوون دووبارە بكاتەوە.

## ئەگەر ویستی دووبارەی بكاتەوە با دەستنوێژ بگرێ

### ١٠٧ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعُودَ تَوَضَّأَ

١٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ أَبِي المُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ، فَلْيَتَوَضَّأْ بَيْنَهُمَا وُضُوءًا. وَفِي البَابِ عَنْ

أَجْرًا، وَاسْتَحَبُّوا لِلْمُؤَذِّنِ أَنْ يَحْتَسِبَ فِي أَذَانِهِ.

واتە: لە (عُثْمَان)ی کوڕی ئەبو عاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کۆتا بەڵێن و پەیمانێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی ڕاگەیاندم ئەمە بوو کە بانگبێژێ دابنێم کرێ وەرنەگرێت، بە هیوای پاداشتی خوای پەروەردگار بانگ بدات.

## کەسێ کە گوێی لە بانگ بوو چی دوعایە دەخوێنێ

١٥٦ - بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ مِنَ الدُّعَاءِ

٢١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ الْحُكَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ حُكَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ گوێی لە بانگبێژ بوو بڵێ: (وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ، رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا). واتە: منیش شایەتی دەدەم کە جگە لە (الله) هیچ فریاد ڕەس و پەرستراوێکی تر بەهەق نیەو تاق و تەنیاو بێ هاوەڵە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری ئەوە،

رازیم بەوەی کە (اللّٰه) پەروەردگارمە، موحەممەد پێغەمبەرمە، ئیسلامیش دینمە، خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت).

## باسێکی تر لەوبارەوە

## ١٥٧ - بَابٌ مِنْهُ أَيْضًا

٢١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَهْلِ بْنِ عَسْكَرٍ البَغْدَادِيُّ، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَيَّاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، إِلاَّ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ يَوْمَ القِيَامَةِ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَوَاهُ غَيْرَ شُعَيْبِ بْنِ أَبِي حَمْزَةَ.

واتە: لە جابری کوری (عبد الله)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەو کەسەی کە گوێی لە بانگ بوو بلێ: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِى وَعَدْتَهُ). واتە: ئەی خودایە! ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوەو، ئەم نوێژە دابەستراوە، ببەخشە بە موحەممەد پایەی هەرە بەرزی (الْوَسِيلَة) و پلەی هەرەگەورەی (الْفَضِيلَةَ)، وە بیبەرە ئەو بارەگا پەسەندەی کە خۆت بەڵێنت پێی داوە، ئیللا شەفاعەتی من بۆ ئەو حەڵاڵ دەبێت لە رۆژی قیامەتدا تکای بۆ دەکەم).

## نزاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە.

١٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ الدُّعَاءَ لاَ يُرَدُّ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ

٢١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ، وَأَبُو أَحْمَدَ، وَأَبُو نُعَيْمٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَيْدٍ العَمِّيِّ، عَنْ أَبِي إِيَاسٍ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الدُّعَاءُ لاَ يُرَدُّ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَاهُ أَبُو إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَ هَذَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نزاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە واتە وەرگیراوە).

## خوای گەورە پێنج نوێژی لەسەر بەندەکانی فەرزکردووە

١٥٩ - بَابُ مَا جَاءَ كَمْ فَرَضَ اللَّهُ عَلَى عِبَادِهِ مِنَ الصَّلَوَاتِ

٢١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: فُرِضَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ، ثُمَّ نُقِصَتْ حَتَّى جُعِلَتْ خَمْسًا، ثُمَّ نُودِيَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّهُ لاَ يُبَدَّلُ القَوْلُ لَدَيَّ، وَإِنَّ لَكَ بِهَذِهِ الخَمْسِ خَمْسِينَ. وَفِي البَابِ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، وَطَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَأَبِي قَتَادَةَ، وَمَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: لەو شەوەدا کە شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پەنجا نوێژ لەسەر خۆی و ئوممەتەکەی دانرا، لەپاشدا کەمکرایەوە بۆ پێنج فەرزەی نوێژ، ئینجا خوای گەورە پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بانگ کردوو فەرمووی: (ئەی موحەممەد هەرگیز وتەی من گۆڕانی بەسەردا نایەت، لەجیاتی ئەو پێنج نوێژە پاداشتی پەنجا نوێژ هەیە بۆ تۆ و بۆ هەموو نوێژخوێنێکی ئوممەتەکەت).

## دەربارەی گەورەیی پێنج فەرزەی نوێژ

١٦٠ - بَابٌ فِي فَضْلِ الصَّلَوَاتِ الخَمْسِ

٢١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ العَلَاءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ، وَالجُمُعَةُ إِلَى الجُمُعَةِ، كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ، مَا لَمْ تُغْشَ الكَبَائِرُ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَنَسٍ، وَحَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پێنج فەرزەی نوێژ واتە ئەم نوێژ بۆ ئەو نوێژ و، نوێژی هەینی بۆ نوێژی هەینی دواتر دەبن بەهۆی کەفارەتی ئەو گوناهانەی کە لەنێوانیاندا دەکرێن، بەمەرجێ لە گوناهو تاوانە گەورەکان نەبن).

## دەربارەی گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵ

### ١٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الجَمَاعَةِ

٢١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَلاَةُ الجَمَاعَةِ تَفْضُلُ عَلَى صَلاَةِ الرَّجُلِ وَحْدَهُ، بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَكَذَا رَوَى نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَال: تَفْضُلُ صَلاَةُ الجَمِيعِ عَلَى صَلاَةِ الرَّجُلِ وَحْدَهُ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً. وَعَامَّةُ مَنْ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّمَا قَالُوا: خَمْسٍ وَعِشْرِينَ، إِلاَّ ابْنَ عُمَرَ فَإِنَّهُ قَال: بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نوێژی بە کۆمەڵ خێر و پاداشی بیست و حەوت نوێژی کەسێکی هەیە کە خۆی بە تەنیا ئەنجامیان بدات).**

٢١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَال: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إِنَّ صَلاَةَ الرَّجُلِ فِي الجَمَاعَةِ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ وَحْدَهُ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بێگومان نوێژی بە کۆمەڵی کەسێ خێر و پاداشی زیاترە لە خێر و پاداشی بیست و پێنج نوێژ کە خۆی بە تەنیا ئەنجامیان بدات).**

## کەسێ گوێی لەبانگ بێ نەچێت بۆ جەماعەت

### ١٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلاَ يُجِيبُ

٢١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ بُرْقَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ الأَصَمِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ فِتْيَتِي أَنْ يَجْمَعُوا حُزَمَ الحَطَبِ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ أُحَرِّقَ عَلَى أَقْوَامٍ لاَ يَشْهَدُونَ الصَّلاَةَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَمُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُمْ قَالُوا: مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يُجِبْ فَلاَ صَلاَةَ لَهُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: هَذَا عَلَى التَّغْلِيظِ وَالتَّشْدِيدِ، وَلاَ رُخْصَةَ لأَحَدٍ فِي تَرْكِ الجَمَاعَةِ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نیازم کرد فەرمان بدەم قامەت بکرێ بۆ نوێژ، پاشان فەرمان بکەم بە یەکێك پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، خۆشم لەگەڵ کۆمەڵە لاوێك کە یەکی کۆمەڵێ داریان پێ بێت، بڕۆم ماڵی ئەو کەسانە بسوتێنم بە سەریاندا کە ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ نابن).

لە جگە لە کەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێرنەوە، کە فەرموویانە: هەرکەسێ گوێی لەبانگ بێ و نەچێت بۆ جەماعەت نوێژی بۆ نیە. هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەمە بەپێی قورسکردن وتراوە، روخسەت نیە بۆ هیچ کەسێ نیە تەرکی نوێژی بە کۆمەڵ بکات مەگەر بەهانەیەکی شەرعی هەبێ.

٢١٨ – (ضعيف الإسناد) قَالَ مُجَاهِدٌ، وَسُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنْ رَجُلٍ يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ، لاَ يَشْهَدُ جُمْعَةً وَلاَ جَمَاعَةً؟ فَقَالَ: هُوَ فِي النَّارِ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ. وَمَعْنَى الحَدِيثِ: أَنْ لاَ يَشْهَدَ الجَمَاعَةَ وَالجُمُعَةَ رَغْبَةً عَنْهَا، وَاسْتِخْفَافًا بِحَقِّهَا، وَتَهَاوُنًا بِهَا.

واتە: موجاهید دەفەرموێت: دەربارەی كەسێ بە ڕۆژ بە ڕۆژوویێ و بەشەو شەونوێژ بكات بەڵام ئامادەی جومعە و جەماعەت نەبێت پرسیار كرا لە ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ كە حوكمی چییە؟ فەرمووی: لە ئاگردایە.

مانای فەرموودەكە: ئامادەی جومعە و جەماعەت نەبێت بە ئارەزووی خۆی و گوێ نەداتێ و بە كەمیان بزانێ و كەموكوڕی بنوێنێ.

## كەسێ بە تەنیا نوێژ بكات لەپاشدا بگات بە جەماعەتدا

١٦٣ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُصَلِّي وَحْدَهُ ثُمَّ يُدْرِكُ الجَمَاعَةَ

٢١٩ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَعْلَى بْنُ عَطَاءٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ يَزِيدَ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَّتَهُ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ صَلاَةَ الصُّبْحِ فِي مَسْجِدِ الخَيْفِ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ انْحَرَفَ فَإِذَا هُوَ بِرَجُلَيْنِ فِي أُخْرَى القَوْمِ لَمْ يُصَلِّيَا مَعَهُ، فَقَالَ: عَلَيَّ بِهِمَا، فَجِيءَ بِهِمَا تُرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا، فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا، فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا، قَالَ: فَلاَ تَفْعَلاَ، إِذَا صَلَّيْتُمَا فِي رِحَالِكُمَا ثُمَّ أَتَيْتُمَا مَسْجِدَ جَمَاعَةٍ فَصَلِّيَا مَعَهُمْ، فَإِنَّهَا لَكُمَا نَافِلَةٌ. وَفِي البَابِ عَنْ مِحْجَنٍ، وَيَزِيدَ بْنِ عَامِرٍ. حَدِيثُ يَزِيدَ بْنِ الأَسْوَدِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ

سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. قَالُوا: إِذَا صَلَّى الرَّجُلُ وَحْدَهُ ثُمَّ أَدْرَكَ الجَمَاعَةَ فَإِنَّهُ يُعِيدُ الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا فِي الجَمَاعَةِ، وَإِذَا صَلَّى الرَّجُلُ الْمَغْرِبَ وَحْدَهُ ثُمَّ أَدْرَكَ الجَمَاعَةَ، قَالُوا: فَإِنَّهُ يُصَلِّيهَا مَعَهُمْ وَيَشْفَعُ بِرَكْعَةٍ، وَالَّتِي صَلَّى وَحْدَهُ هِيَ الْمَكْتُوبَةُ عِنْدَهُمْ.

واتە: لە جابیری كوڕی یەزیدی كوڕی ئەسوەدەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئامادەی حەجی ماڵ ئاوایی بووم، لە مزگەوتی خیف نوێژی بەیانیم لەخزمەتیدا كرد، ڕاوی فەرمووی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاوڕی دایەوە بۆ لامان بینی دوو پیاو لەدوای خەڵكەكەوە دانیشتوون نوێژیان لەگەڵ نەكردبوو، فەرمووی: (بیانهێنن بۆلام)، هێنانیان ترسان لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: (چ شتێك ڕێگری لێ كردن كە نوێژمان لەگەڵدا نەكەن؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بەڕاستی ئێمە لەناو بنەوبارگەی خۆماندا نوێژمان كردووە، فەرمووی: (جارێكی تر كاری وا مەكەن، ئەگەر لەناو بنەوبارگەی خۆتاندا نوێژتان كرد، پاشان هاتن بۆ مزگەوت نوێژی بە كۆمەڵی تێدا دەكرا نوێژیان لەگەڵدا بكەن، ئەوەتان بە نوێژی سوننەت بۆ دەنوسرێت).

## دەربارەی نوێژی بە كۆمەڵی دووەم جار لە مزگەوتێكدا

## ١٦٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الجَمَاعَةِ فِي مَسْجِدٍ قَدْ صُلِّيَ فِيهِ مَرَّةً

٢٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ النَّاجِيِّ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَال: جَاءَ رَجُلٌ وَقَدْ صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَال: أَيُّكُمْ يَتَّجِرُ عَلَى هَذَا؟ فَقَامَ رَجُلٌ فَصَلَّى مَعَهُ. وَفِي

البَابِ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي مُوسَى، وَالحَكَمِ بْنِ عُمَيْرٍ. وَحَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ مِنَ التَّابِعِينَ. قَالُوا: لاَ بَأْسَ أَنْ يُصَلِّيَ القَوْمُ جَمَاعَةً فِي مَسْجِدٍ قَدْ صَلَّى فِيهِ جَمَاعَةٌ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ آخَرُونَ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: يُصَلُّونَ فُرَادَى. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَمَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، يَخْتَارُونَ الصَّلاَةَ فُرَادَى.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرنوێژی کردبوو بۆ هاوەڵان لەنوێژ بوو بووەوە، پیاوێ هات بۆ مزگەوت نەگەیشت بە جەماعەتدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەوە کەسێ نیە لەگەڵ ئەم پیاوەدا نوێژ بکات بە کۆمەڵ بۆئەوەی خێر و پاداشتێکی دەستکەوێ؟) پیاوێ هەستا نوێژی لەگەڵ کرد.

ئەمەش ڕای جگە لە کەسێکە لە زانایان لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش لەهاوەڵان دەفەرموون: ئەگەر لە مزگەوتێکدا نوێژی بە کۆمەڵ کرا دروستە نوێژی بە کۆمەڵی تێدا بکرێتەوە. ئەمەش ڕای پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێکی تریان دەفەرموون: بە تەنیا ئەنجامی بدەن. پێشەوایان سوفیان و ئیبنو موبارەك و مالیك و شافیعی ئەمە دەفەرموون، نوێژی تەنیایان بەلاوە پەسەندە.

## دەربارەی گەورەیی نوێژی خەوتنان و بەیانی بە کۆمەڵ

١٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ العِشَاءِ وَالفَجْرِ فِي الجَمَاعَةِ

٢٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، قَالَ:

حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ شَهِدَ العِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ لَهُ قِيَامُ نِصْفِ لَيْلَةٍ، وَمَنْ صَلَّى العِشَاءَ وَالفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ لَهُ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَعُمَارَةَ بْنِ رُوَيْبَةَ، وَجُنْدَبٍ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَأَبِي مُوسَى، وَبُرَيْدَةَ. حَدِيثُ عُثْمَانَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ عُثْمَانَ مَوْقُوفًا، وَرُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عُثْمَانَ مَرْفُوعًا.

واتە: لە پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەفانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس نوێژی خەوتنان بە کۆمەڵ بکات وەك ئەوە وایە هەتا نیوەی شەو شەونوێژ بکات، هەرکەس نوێژی خەوتنان و بەیانی بە کۆمەڵ بکات وەك ئەوە وایە هەموو شەوەکە شەونوێژ بکات).

٢٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ جُنْدَبِ بْنِ سُفْيَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي ذِمَّتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ

واتە: لە جوندوبی کوڕی سوفیانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات ئەوە لە پەناو ئەمانی خوای گەورەدایە، کەواتە ئێوەش ئەمانو پەیمانی خوای گەورە ببەنە سەرو ناپاکی لە موسوڵمانان مەکەن).

٢٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ أَبُو غَسَّانَ

العَنْبَرِيُّ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ الكَحَّالِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَوْسٍ الخُزَاعِيِّ، عَنْ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ ناقص.

**واتە: لە بورەیدەی ئەسلەمیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (مژدە بدەن بەو كەسانەی لە تاریكی شەودا هەنگاو دەنێن بەرەو مزگەوتەكان، بە ڕووناكی تەواو بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا). - مەبەست لە نوێژی بەیانی و عیشایە-.**

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی ریزی یەكەم

١٦٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّفِّ الأَوَّلِ

٢٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأُبَيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَالعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّهُ كَانَ يَسْتَغْفِرُ لِلصَّفِّ الأَوَّلِ ثَلاَثًا، وَلِلثَّانِي مَرَّةً.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (باشترین ریز لە ریزەكانی نوێژ بۆ پیاوان ریزی یەكەمیانە، وە خراپترین ریزیش دوا ریزیانە، وە باشترین ریز لە ریزەكانی ئافرەتان دوا ریزیانە، خراپترین ریزیشیان ریزی یەكەمیانە).**

لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە سێ جار بۆ ریزی یەکەم پاڕاوەتەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوون، بەڵام یەکجار بۆ ریزی دووەم پاڕاوەتەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوون.

٢٢٥ - (صحيح) وقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ أَنَّ النَّاسَ يَعْلَمُونَ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا عَلَيْهِ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ.

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموویت: (ئەگەر خەڵك دەیانزانی خێری بانگدان و ریزی یەکەم چەندە گەورەیە، چاری تریان نەبوایە جگە لەوەی کە تیر و پشکیان بۆ بکردایە، ئەوا تیر و پشکیان بۆ دەکرد).

٢٢٦ - وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، نَحْوَهُ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رێکی ریزەکان.

### ١٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِقَامَةِ الصُّفُوفِ

٢٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَوِّي صُفُوفَنَا، فَخَرَجَ يَوْمًا فَرَأَى رَجُلاً خَارِجًا صَدْرُهُ عَنِ الْقَوْمِ، فَقَالَ: لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ. وَفِي الْبَابِ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَالْبَرَاءِ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مِنْ تَمَامِ الصَّلاَةِ إِقَامَةُ الصَّفِّ. وَرُوِيَ عَنْ عُمَرَ: أَنَّهُ كَانَ

يُوَكِّلُ رِجَالاً بِإِقَامَةِ الصُّفُوفِ، وَلاَ يُكَبِّرُ حَتَّى يُخْبَرَ أَنَّ الصُّفُوفَ قَدِ اسْتَوَتْ. وَرُوِيَ عَنْ عَلِيٍّ، وَعُثْمَانَ، أَنَّهُمَا كَانَا يَتَعَاهَدَانِ ذَلِكَ، وَيَقُولاَنِ: اسْتَوُوا. وَكَانَ عَلِيٌّ يَقُولُ: تَقَدَّمْ يَا فُلاَنُ، تَأَخَّرْ يَا فُلاَنُ.

واتــە: لــە نوعمــانی كــوڕی بەشــیرەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕیزەكـانی بـۆ ڕێـك دەكـردین، ڕۆژێ لـەماڵ دەرچـوو بـۆ نوێـژ پیـاوێكی دی سـنگی خـۆی زۆر دەرپەڕانـدبوو لـە ڕیزەكـەی، فـەرمووی: (یـان ئـەوەتا ڕیزەكانتـان ڕێـك دەخـەن، یـا خـوا ڕووتـان وەردەگێڕێت لەئاستی یەك).

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: (ڕێكی ڕیزەكان لەتەواوی نوێژەوەیە).

لە پێشــەوا عومــەرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە چـەند كەسـێكی ڕاسپاردبوو بۆ ڕێككردنـی ڕیزەكـان، هـەتا هـەواڵی ڕێكـی ڕیزەكانیـان پـێ نەدایـە نوێژی دانەدەبەست.

پێشەوایان عەلی و (عُثْمَان) ڕەزای خوایان لێ بێ پابەندبوون بـەوەوە و دەیـان فەرموو: ڕێك ڕاوەستن و ڕیزەكانتان ڕێك بكەن. پێشەوا عەلی ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەیفەرموو: فلاَن كەس تۆ وەرە پێشەوە، فلاَن كەس تۆ بڕۆ دواوە.

### با هۆشیار و خاوەن ئاوەزەكان لەپێشەوەبن

### ١٦٨ - بَابُ مَا جَاءَ لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى

٢٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَال:

حَدَّثَنَا خَالِدٌ ال حَذَّاءُ، عَنْ أَبِي مَعْشَرٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، وَلاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، وَإِيَّاكُمْ وَهَيْشَاتِ الأَسْوَاقِ. وَفِي البَابِ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَأَبِي مَسْعُودٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَالبَرَاءِ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّهُ كَانَ يُعْجِبُهُ أَنْ يَلِيَهُ الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ، لِيَحْفَظُوا عَنْهُ. وَخَالِدٌ الحَذَّاءُ هُوَ خَالِدُ بْنُ مِهْرَانَ، يُكْنَى أَبَا الْمُنَازِلِ. سَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ: إِنَّ خَالِدًا الحَذَّاءَ مَا حَذَا نَعْلاً قَطُّ، إِنَّمَا كَانَ يَجْلِسُ إِلَى حَذَّاءٍ فَنُسِبَ إِلَيْهِ. وَأَبُو مَعْشَرٍ اسْمُهُ زِيَادُ بْنُ كُلَيْبٍ.

واتە: لە (عبد الله)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (با هۆشیار و خاوەن ئاوەزەکان و ئەوانەی کە لە دین تێگەیشتوون لێم نزیك ببنەوە، پاشان ئەوانی دواتر لەوان، پاشان ئەوانی دواتر لەوان، نارێك و خوار و خێچ رامەوەستن، ئەگینا نارێکی و ناکۆکیتان تێ دەکەوێت، هۆشیاربن و خۆتان بەدوور بگرن لە دەمەقاڵەو چەقەچەقی بازارەکان).

## دەربارەی ریزی نێوان کۆڵەکە و پایەکان باش نیە.

١٦٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّفِّ بَيْنَ السَّوَارِي

٢٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ هَانِئِ بْنِ عُرْوَةَ الْمُرَادِيِّ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ مَحْمُودٍ، قَالَ: صَلَّيْنَا خَلْفَ أَمِيرٍ مِنَ الأُمَرَاءِ، فَاضْطَرَّنَا النَّاسُ فَصَلَّيْنَا بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ فَلَمَّا صَلَّيْنَا، قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: كُنَّا نَتَّقِي هَذَا

عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَابِ عَنْ قُرَّةَ بْنِ إِيَاسٍ الْمُزَنِيِّ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يُصَفَّ بَيْنَ السَّوَارِي. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە (عبد الحميد)ی کوڕی مەحمودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەدوای یەکێ لە فەرمانڕەواکانەوە نوێژمان دەکرد، خەڵك ناچاریان کردین لەنێوان دوو پایەدا نوێژەکەمان کرد، کاتێ کە لێ بووینەوە ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆمان لەوە دەپاراست کە لەنێوان دوو پایەدا نوێژ بکەین.

## دەربارەی نوێژکردن لەدوای ڕیزەوە بە تەنیا.

١٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ

٢٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، قَالَ: أَخَذَ زِيَادُ بْنُ أَبِي الجَعْدِ بِيَدِي وَنَحْنُ بِالرَّقَّةِ، فَقَامَ بِي عَلَى شَيْخٍ يُقَالُ لَهُ: وَابِصَةُ بْنُ مَعْبَدٍ، مِنْ بَنِي أَسَدٍ، فَقَالَ زِيَادٌ: حَدَّثَنِي هَذَا الشَّيْخُ أَنَّ رَجُلاً صَلَّى خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، وَالشَّيْخُ يَسْمَعُ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُعِيدَ الصَّلاَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ وَابِصَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، وَقَالُوا: يُعِيدُ إِذَا صَلَّى خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَدْ قَالَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: يُجْزِئُهُ إِذَا صَلَّى خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ. وَقَدْ ذَهَبَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الكُوفَةِ إِلَى حَدِيثِ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ أَيْضًا، قَالُوا: مَنْ صَلَّى خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ يُعِيدُ. مِنْهُمْ: حَمَّادُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، وَابْنُ أَبِي لَيْلَى،

وَوَكِيعٌ. وَرَوَى حَدِيثَ حُصَيْنٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ غَيْرُ وَاحِدٍ، مِثْلَ رِوَايَةِ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ زِيَادِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ وَابِصَةَ. وَفِي حَدِيثِ حُصَيْنٍ مَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ هِلاَلاً قَدْ أَدْرَكَ وَابِصَةَ. فَاخْتَلَفَ أَهْلُ الحَدِيثِ فِي هَذَا: فَقَالَ بَعْضُهُمْ: حَدِيثُ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ رَاشِدٍ، عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ أَصَحُّ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: حَدِيثُ حُصَيْنٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ زِيَادِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ أَصَحُّ. وَهَذَا عِنْدِي أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، لأَنَّهُ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ حَدِيثِ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ زِيَادِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ.

**واتە: لە هیلالی کوڕی یەسافەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە ڕەققە بووین، زیادی کوڕی ئەبو جەعد دەستی گرتم و بردمی بۆلای شێخێ بەناوی وابیصەی کوڕی مەعبەد لە هۆزی بەنی ئەسەد، زیاد فەرمووی: ئەم شێخە بۆی گێڕامەوە فەرمووی: پیاوێ لەدوای ریزەوە بە تەنیا نوێژی کرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کرد نوێژەکەی بگێڕێتەوە.**

٢٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ رَاشِدٍ، عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ، أَنَّ رَجُلاً صَلَّى خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُعِيدَ الصَّلاَةَ. سَمِعْت الجَارُودَ يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا، يَقُولُ: إِذَا صَلَّى الرَّجُلُ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ فَإِنَّهُ يُعِيدُ.

**واتە: لە وابیصەی کوڕی مەعبەدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لەدوای ریزەوە بە تەنیا نوێژی کرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کرد نوێژەکەی بگێڕێتەوە.**

## دەربارەی پیاوێ نوێژ بکات کەسێکی تری لەگەڵ بێ.

### ١٧١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُصَلِّي وَمَعَهُ رَجُلٌ

٢٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ العَطَّارُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَأْسِي مِنْ وَرَائِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ، قَالُوا: إِذَا كَانَ الرَّجُلُ مَعَ الإِمَامِ يَقُومُ عَنْ يَمِينِ الإِمَامِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژم کرد لەلای چەپیەوە وەستام، ئەویش بەدەستی ڕاستی لەپشتی خۆیەوە هێنامیە لای ڕاستی خۆیەوە، ئینجا نوێژم لەگەڵ کرد.

## دەربارەی پیاوێ لەگەڵ دوو پیاوی تر نوێژ بکات.

### ١٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُصَلِّي مَعَ الرَّجُلَيْنِ

٢٣٣ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عَدِيٍّ، قَالَ: أَنْبَأَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كُنَّا ثَلَاثَةً أَنْ يَتَقَدَّمَنَا أَحَدُنَا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرٍ. وَحَدِيثُ سَمُرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا: إِذَا كَانُوا ثَلَاثَةً قَامَ رَجُلَانِ خَلْفَ الإِمَامِ. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ صَلَّى بِعَلْقَمَةَ، وَالأَسْوَدِ، فَأَقَامَ أَحَدَهُمَا عَنْ يَمِينِهِ، وَالآخَرَ عَنْ يَسَارِهِ، وَرَوَاهُ عَنِ النَّبِيِّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ النَّاسِ فِي إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کردین ئەگەر سێ کەس بووین یەکێکمان پێشکەوێ و بەرنوێژی بکات.

## دەربارەی پیاوێ بەرنوێژی بکات بۆ پیاوان و ژنان

١٧٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُصَلِّي وَمَعَهُ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ

٢٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: قُومُوا فَلْنُصَلِّ بِكُمْ، قَالَ أَنَسٌ: فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدْ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِالمَاءِ، فَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَفَفْتُ عَلَيْهِ أَنَا، وَالْيَتِيمُ وَرَاءَهُ، وَالعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا: إِذَا كَانَ مَعَ الإِمَامِ رَجُلٌ وَامْرَأَةٌ قَامَ الرَّجُلُ عَنْ يَمِينِ الإِمَامِ وَالمرْأَةُ خَلْفَهُمَا.وَقَدْ احْتَجَّ بَعْضُ النَّاسِ بِهَذَا الحَدِيثِ فِي إِجَازَةِ الصَّلاَةِ إِذَا كَانَ الرَّجُلُ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، وَقَالُوا: إِنَّ الصَّبِيَّ لَمْ تَكُنْ لَهُ صَلاَةٌ، وَكَأَنَّ أَنَسًا كَانَ خَلْفَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحْدَهُ فِي الصَّفِّ. وَلَيْسَ الأَمْرُ عَلَى مَا ذَهَبُوا إِلَيْهِ، لأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقَامَهُ مَعَ اليَتِيمِ خَلْفَهُ، فَلَوْلاَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَعَلَ لِلْيَتِيمِ صَلاَةً لَمَا أَقَامَ اليَتِيمَ مَعَهُ، وَلأَقَامَهُ عَنْ يَمِينِهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ مُوسَى بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَقَامَهُ عَنْ يَمِينِهِ. وَفِي هَذَا الحَدِيثِ دَلاَلَةٌ أَنَّهُ إِنَّمَا صَلَّى تَطَوُّعًا أَرَادَ إِدْخَالَ البَرَكَةِ عَلَيْهِمْ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە نەنکی مولەیکە بانگێشتی پێغەمبەری خوای (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کرد بۆ خواردنێ کە دروستی کردبوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێی خوارد، پاشان فەرمووی: (هەستن با بەرنوێژیتان بۆ بکەم). ئەنەس فەرمووی: حەسیرێکمان هەبوو لەبەر کۆنی ڕەش داگەڕابوو هەستام چووم ئاوڕشێنم کردوو هێنام، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەستا چووە سەر حەسیرەکە، مـن و منداڵێکی هەتیو لەدوایەوە ریزبووین، پیرەژنەکەش لە دوامانەوە بوو، جا دوورکات نوێژی بۆ کردین، پاشان سەلامی دایەوەو ڕۆشت.

## دەربارەی کێ شایەنترە پێشنوێژی بکات

### ١٧٤ - بَابُ مَنْ أَحَقُّ بِالْإِمَامَةِ

٢٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، ح: وَحَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، وَابْنُ نُمَيْرٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ رَجَاءٍ الزُّبَيْدِيِّ، عَنْ أَوْسِ بْنِ ضَمْعَجٍ، قَال: سَمِعْتُ أَبَا مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيَّ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَؤُمُّ القَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي القِرَاءَةِ سَوَاءً، فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الهِجْرَةِ سَوَاءً، فَأَكْبَرُهُمْ سِنًّا، وَلاَ يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِي سُلْطَانِهِ، وَلاَ يُجْلَسُ عَلَى تَكْرِمَتِهِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، قَالَ مَحْمُودٌ: قَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ فِي حَدِيثِهِ: أَقْدَمُهُمْ سِنًّا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَمَالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ، وَعَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ. وَحَدِيثُ أَبِي مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ.وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. قَالُوا: أَحَقُّ النَّاسِ بِالإِمَامَةِ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ وَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ. وَقَالُوا: صَاحِبُ الْمَنْزِلِ أَحَقُّ بِالإِمَامَةِ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا أَذِنَ صَاحِبُ الْمَنْزِلِ لَغَيْرِهِ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُصَلِّيَ بِهِ. وَكَرِهَهُ بَعْضُهُمْ، وَقَالُوا: السُّنَّةُ أَنْ يُصَلِّيَ

صَاحِبُ البَيْتِ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: وَقَوْلُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِي سُلْطَانِهِ، وَلاَ يُجْلَسُ عَلَى تَكْرِمَتِهِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، فَإِذَا أَذِنَ فَأَرْجُو أَنَّ الإِذْنَ فِي الكُلِّ، وَلَمْ يَرَ بِهِ بَأْسًا إِذَا أَذِنَ لَهُ أَنْ يُصَلِّيَ بِهِ.

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کێ زیاتر شارەزای قورئان بوو با ئەوە پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، ئەگەر لە شارەزایی قورئاندا وەك یەك بوون، ئەوە با زاناترینیان بەسوننەت پێشنوێژی بکات، جا ئەگەر لە سوننەتیشدا یەکسان بوون کێ زوتر کۆچی کردبێت ئەوە پێشنوێژی بکات، جا ئەگەر لە کۆچکردنیشدا یەکسان بوون کێ بە تەمەنتر بوو با ئەوە پێشنوێژی بکات، هیچ پیاوێ پێشنوێژی لە دەسەڵاتی کەسێکی تردا نەکات و، لەسەر فەرشی هیچ کەسێ دانەنیشێت مەگەر بە پرس و مۆڵەتی خۆی واتە خاوەن ماڵ).

بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرموودە هەندێ لە زانایان دەفەرموون: کێ زیاتر شارەزای قورئان و سوننەت بوو با ئەوە پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات. هەروەها دەفەرموون: خاوەن ماڵ شایەنترە پێشنوێژی بکات. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر خاوەن ماڵ خۆی مۆڵەتی کەسێ بدات دروستە پێشنوێژی بکات، هەندێکیان پێیان باش نیەو دەفەرموون: سوننەتە خاوەن ماڵ خۆی پێشنوێژی بکات.

پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت: بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە دەفەرموێت: (لاَ يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِي سُلْطَانِهِ، وَلاَ يُجْلَسُ عَلَى تَكْرِمَتِهِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ). ئومێد دەکەم مۆڵەتەکە گشتی بێ، ئەگەر مۆڵەتی پێدرا دروستە پێشنوێژی بکات.

## ئەگەر کەسێ پێشنوێژی کرد با درێژەی پێ نەدات

### ١٧٥ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أَمَّ أَحَدُكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ

٢٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَمَّ أَحَدُكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الصَّغِيرَ وَالكَبِيرَ، وَالضَّعِيفَ وَالمرِيضَ، فَإِذَا صَلَّى وَحْدَهُ فَلْيُصَلِّ كَيْفَ شَاءَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، وَأَنَسٍ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَمَالِكِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأَبِي وَاقِدٍ، وَعُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ، وَأَبِي مَسْعُودٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ اخْتَارُوا: أَلاَّ يُطِيلَ الإِمَامُ الصَّلاَةَ مَخَافَةَ الْمَشَقَّةِ عَلَى الضَّعِيفِ وَالكَبِيرِ وَالمرِيضِ. وَأَبُو الزِّنَادِ اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ ذَكْوَانَ. وَالأَعْرَجُ هُوَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ هُرْمُزَ الْمَدِينِيُّ، وَيُكْنَى أَبَا دَاوُدَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ پێشنوێژی کرد بۆ موسوڵمانان با درێژەی پێ نەدات، چونکە ئەوانەی لەدوایەوەن هەیانە لاوازە یان هەیانە نەخۆشە یا منداڵە یان بەساڵاچووە، بەڵام ئەگەر بە تەنیا بوو چەندە توانای هەیە با درێژەی پێ بدات).

٢٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَخَفِّ النَّاسِ صَلاَةً فِي تَمَامٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەهەموو کەس زیاتر درێژەی نەدەدا بە نوێژ و بەتەواویش هەموو روکنەکان و سوننەتەکانی ئەنجام دەداو قورئانی کەمی دەخوێند.

## دەربارەی نوێژ دابەستن و سەلامدانەوە

### ١٧٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَحْرِيمِ الصَّلاَةِ وَتَحْلِيلِهَا

٢٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفُضَيْلِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، طَرِيفٍ السَّعْدِيِّ عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ، وَلاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِالحَمْدُ، وَسُورَةٍ فِي فَرِيضَةٍ أَوْ غَيْرِهَا. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ. وَحَدِيثُ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَجْوَدُ إِسْنَادًا وَأَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ، وَقَدْ كَتَبْنَاهُ فِي أَوَّلِ كِتَابِ الوُضُوءِ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: إِنَّ تَحْرِيمَ الصَّلاَةِ التَّكْبِيرُ، وَلاَ يَكُونُ الرَّجُلُ دَاخِلاً فِي الصَّلاَةِ إِلاَّ بِالتَّكْبِيرِ. سَمِعْت أَبَا بَكْرٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبَانَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ مَهْدِيٍّ، يَقُولُ: لَوِ افْتَتَحَ الرَّجُلُ الصَّلاَةَ بِسَبْعِينَ اسْمًا مِنْ أَسْمَاءِ اللهِ تَعَالَى وَلَمْ يُكَبِّرْ لَمْ يُجْزِهِ، وَإِنْ أَحْدَثَ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ أَمَرْتُهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ، ثُمَّ يَرْجِعَ إِلَى مَكَانِهِ وَيُسَلِّمَ، إِنَّمَا الأَمْرُ عَلَى وَجْهِهِ. وَأَبُو نَضْرَةَ اسْمُهُ الْمُنْذِرُ بْنُ مَالِكِ بْنِ قُطَعَةَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کلیلی کردنەوەی نوێژ

دەستنوێژە، دابەستنیشی بە (الله أكبر)ە، بە سەلامدانەوەش تەواو دەکرێت، هەرکەس سورەتی فاتیحە و سورەتێکی تر نەخوێنێ نوێژی بۆ نییە واتە نوێژەکەی دروست نییە، جا ئیتر نوێژی سوننەت بێ یان نوێژی فەرز).

## دەربارەی بڵاوکردنەوەی پەنجەکان لەکاتی دابەستنی نوێژدا

### ١٧٧ - بَابٌ فِي نَشْرِ الأَصَابِعِ عِنْدَ التَّكْبِيرِ

٢٣٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ اليَمَانِ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ سِمْعَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَبَّرَ لِلصَّلاَةِ نَشَرَ أَصَابِعَهُ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ سِمْعَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ رَفَعَ يَدَيْهِ مَدًّا. وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ رِوَايَةِ يَحْيَى بْنِ اليَمَانِ، وَأَخْطَأَ ابْنُ الْيَمَانِ فِي هَذَا الحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەکاتی دابەستنی نوێژدا پەنجەکانی بڵاودەکردنەوە- هەردوودەستی هەتا ئاستی نەرمایی گوێکانی بەرزدەکردەوە -.

٢٤٠ - (صحيح) وحَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَال: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ الحَنَفِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ سِمْعَانَ، قَال: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ رَفَعَ يَدَيْهِ مَدًّا. قَالَ عَبْدُ اللهِ: وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ اليَمَانِ، وَحَدِيثُ يَحْيَى بْنِ اليَمَانِ خَطَأٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ کە نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزدەکردنەوە بە درێژی.

## گەورەیی (الله أکبر)ی یەکەمی نوێژ

### ۱۷۸ - بَابٌ فِي فَضْلِ التَّكْبِيرَةِ الأُولَى

۲٤۱ - (حسن) حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ مُكْرَمٍ، وَنَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، عَنْ طُعْمَةَ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى كُتِبَ لَهُ بَرَاءَتَانِ: بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ، وَبَرَاءَةٌ مِنَ النِّفَاقِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَنَسٍ مَوْقُوفًا، وَلاَ أَعْلَمُ أَحَدًا رَفَعَهُ إِلاَّ مَا رَوَى سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، عَنْ طُعْمَةَ بْنِ عَمْرٍو. وَإِنَّمَا يُرْوَى هَذَا عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ البَجَلِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَوْلَهُ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ خَالِدِ بْنِ طَهْمَانَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ البَجَلِيِّ، عَنْ أَنَسٍ قَوْلَهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ. وَرَوَى إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا. وَهَذَا حَدِيثٌ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَهُوَ حَدِيثٌ مُرْسَلٌ. عُمَارَةُ بْنُ غَزِيَّةَ لَمْ يُدْرِكْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: حَبِيبُ بْنُ أَبِي حَبِيبٍ يُكْنَى أَبَا الكَشُوثَا، وَيُقَالُ أَبُو عُمَيْرَةَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس چل ڕۆژ بگات بە (الله أکبر)ی یەکەمی پێشنوێژدا واتە نوێژەکانی بە کۆمەڵ بکات

ئەوە دوو رزگاربوونی بۆ دەنوسرێت: رزگـاربوون لـە ئـاگری دۆزەخ، وە رزگـاربوون لەدووڕوویی).

## لەکاتی دابەستنی نوێژدا چی دەوترێت

١٧٩ - بَابُ مَا يَقُولُ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلاَةِ

٢٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى البَصْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الضُّبَعِيُّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَلِيٍّ الرِّفَاعِيِّ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَال: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ بِاللَّيْلِ كَبَّرَ، ثُمَّ يَقُولُ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، ثُمَّ يَقُولُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ العَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرٍ، وَجُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، وَابْنِ عُمَرَ. وَحَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ أَشْهَرُ حَدِيثٍ فِي هَذَا البَابِ. وَقَدْ أَخَذَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ بِهَذَا الحَدِيثِ. وَأَمَّا أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ، فَقَالُوا: إِنَّمَا يُرْوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ، وَغَيْرِهِمْ. وَقَدْ تُكُلِّمَ فِي إِسْنَادِ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ، كَانَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ يَتَكَلَّمُ فِي عَلِيِّ بْنِ عَلِيٍّ الرِّفَاعِيِّ. وقَالَ أَحْمَدُ: لاَ يَصِحُّ هَذَا الحَدِيثُ.

واتـە: لـە ئـەبو سـەعیدی خودریـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەڵئەسا بـۆ شـەونوێژ (اللَّهُ أَكْبَر)ی دەکـردو نوێـژی دادەبەسـت، لەپاشـدا دەیفـەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ). واتـە: خوایـە تـۆ پـاك و

بێگەردی سوپاس و ستایش شایستەی تۆیە، ناوت پیرۆزەو خاوەنی بەرزی و شکۆی، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ. ئینجا دەیفەرموو: (اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا)، لەپاشدا دەیفەرموو: (أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ العَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ) واتە: پەنا دەگرم بە خوای پەروەردگار لە شەیتانی نەفرین لێکراوی دوورخراو لە رەحمەتی خوا، لە شێتی و فیز زلی و هاندانی بۆ وتنی شیعری خراپ.

٢٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، وَيَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ حَارِثَةَ بْنِ أَبِي الرِّجَالِ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ قَالَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَحَارِثَةُ قَدْ تُكُلِّمَ فِيهِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وَأَبُو الرِّجَالِ اسْمُهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَدِينِيُّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەکردو نوێژی دادەبەست دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ). واتە: خوایە تۆ پاك و بێگەردی سوپاس و ستایش شایستەی تۆیە، ناوت پیرۆزەو خاوەنی بەرزی و شکۆی، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ.

## دەربارەی نەخوێندنی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بەدەنگی بەرز

١٨٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الجَهْرِ بِ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

٢٤٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الجُرَيْرِيُّ، عَنْ قَيْسِ بْنِ عَبَايَةَ، عَنِ ابْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ، قَالَ: سَمِعَنِي

أَبِي وَأَنَا فِي الصَّلاَةِ، أَقُولُ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، فَقَالَ لِي: أَيْ بُنَيَّ مُحْدَثٌ إِيَّاكَ وَالحَدَثَ، قَالَ: وَلَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ أَبْغَضَ إِلَيْهِ الحَدَثُ فِي الإِسْلاَمِ، يَعْنِي مِنْهُ، قَالَ: وَقَدْ صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَمَعَ عُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ، فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقُولُهَا، فَلاَ تَقُلْهَا، إِذَا أَنْتَ صَلَّيْتَ فَقُلْ: (الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ). حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، وَعَلِيٌّ، وَغَيْرُهُمْ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: لاَ يَرَوْنَ أَنْ يَجْهَرَ بِـ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، قَالُوا: وَيَقُولُهَا فِي نَفْسِهِ.

واتە: لە کوڕێکی (عبد الله)ی کوڕی مەغەفەلەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەنوێژدا بووم باوکم گوێی لێم بوو بەدەنگی بەرز وتم: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، پێی فەرمووم: کوڕی خۆم وتنی بەدەنگی بەرز بیدعەیە، هۆشیاری بیدعە بەو خۆتی لێ بپارێزە. فەرمووی: لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هیچ کەسێکم نەدیوە هێندەی باوکم ڕقی لە بیدعە بێ لەئیسلامدا، (عبد الله)ی کوڕی موغەفەل فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و (عُثْمَانَ) دا نوێژم کردووە هیچ کەس لەوان بەدەنگی بەرز (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)یان نەدەخوێند. دەی تۆش بەدەنگی بەرز (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) مەیڵێ. کاتێ کە نوێژت کرد بڵێ: (الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ).

## دەربارەی ئەوانەی کە رایان وایە بەدەنگی بەرز بخوێنرێ

١٨١ - بَابُ مَنْ رَأَى الجَهْرَ بِ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

٢٤٥ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ حَمَّادٍ، عَنْ أَبِي خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْتَتِحُ صَلاَتَهُ بِ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ. وَقَدْ قَالَ بِهَذَا عِدَّةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مِنْهُمْ أَبُو هُرَيْرَةَ، وَابْنُ عُمَرَ، وَابْنُ عَبَّاسٍ، وَابْنُ الزُّبَيْرِ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ، رَأَوْا الجَهْرَ بِ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ).وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ. وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ حَمَّادٍ هُوَ ابْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ. وَأَبُو خَالِدٍ، هُوَ أَبُو خَالِدٍ الوَالِبِيُّ وَاسْمُهُ هُرْمُزُ وَهُوَ كُوفِيٌّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە خوێندنی: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) نوێژی دەست پێ دەکرد.

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەمە دەفەرموون: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بەدەنگی بەرز بخوێنرێت لەوانە: ئەبو هورەیرە و ئیبنو عومەر و ئیبنو زوبێر، هەروەها ئەوانەی دوای ئەوانیش لەشوێنکەوتوان. پێشەوا شافیعی و ئیسماعیلی کوڕی حەماد و ئەبو خالیدیش ئەمە دەفەرموون.

## دەربارەی دەست پێ کردنی نوێژ بە (الحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ العَالَمِينَ).

١٨٢ - بَابٌ فِي افْتِتَاحِ القِرَاءَةِ بِـ (الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ)

٢٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَال: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، يَفْتَتِحُونَ القِرَاءَةَ بِالحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ: كَانُوا يَسْتَفْتِحُونَ القِرَاءَةَ بِالحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنَّمَا مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، كَانُوا يَفْتَتِحُونَ القِرَاءَةَ بِالحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ، مَعْنَاهُ: أَنَّهُمْ كَانُوا يَبْدَءُونَ بِقِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ قَبْلَ السُّورَةِ، وَلَيْسَ مَعْنَاهُ: أَنَّهُمْ كَانُوا لاَ يَقْرَءُونَ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). وَكَانَ الشَّافِعِيُّ يَرَى: أَنْ يُبْدَأَ بِـ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، وَأَنْ يُجْهَرَ بِهَا إِذَا جُهِرَ بِالقِرَاءَةِ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و (عُثْمَانَ) رەزای خوایان لێ بێ بە (الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ) نوێژیان دەست پێ دەکرد.

پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: مانای فەرموودەکە ئەمەیە: ئەوانە بە خوێندنی سورەتی فاتیحە نوێژیان دەست پێ دەکرد پێش ئەوەی سورەتێکی تر بخوێنن، ئەوە ناگەیەنێ کە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)یان نەخوێندبێ. پێشەوا شافیعی رای وایە بە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) نوێژی دەست پێ بکرێت و بە دەنگی بەرز بوترێت - لەو نوێژانەدا کە پێشنوێژ بە دەنگی بەرز قورئانیان تێدا دەخوێنێ وەك نوێژی بەیانی و شێوان و خەوتنان - .

وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). واتە: ئەو وشانەی کە واتای سەلام و موڵك و مانەوەیە هەمووی بۆ خوای پەروەردگارە، وە ئەو پاڕانەوانەی کە مەبەست لێی بە گەورە زانینی خوای پەروەردگارە هەر شایستەی ئەوەو، هیچ کەسی تر جگە لەو شایستەی ئەوە نیە، هەروەها کام قسەیە جوان و شیرینە بوترێت شایانی ئەوە، سڵاوت لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر لەگەڵ رەحمەت و میهرو بەرەکاتی خوایی دا، سڵاوی خوا لەسەر ئێمەو لەسەر هەموو بەندە چاك و ساڵحەکانی خوای گەورە، شایەتی دەدەم کە هیچ فریاد رەسێك نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لەو خوایەی کە تاك و تەنیایە، هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فروستادەی خوایە و لەلایەن ئەوەوە رەوانەکراوە.

لە خوصەیفەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەخەودا دی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خەڵك رایان جیاوازە لەسەر تەحیات خوێندن؟ فەرمووی: (پابەندبە بە تەحیاتەکەی (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە).

### باسێکی تر لەوبارەوە

٢١٦ - بَابُ مِنْهُ أَيْضًا

٢٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَطَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا الْقُرْآنَ، فَكَانَ يَقُولُ: التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ، الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، سَلاَمٌ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، سَلاَمٌ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ

صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ حُمَيْدٍ الرُّؤَاسِيُّ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ نَحْوَ حَدِيثِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ. وَرَوَى أَيْمَنُ بْنُ نَابِلٍ الْمَكِّيُّ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ وَهُوَ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَذَهَبَ الشَّافِعِيُّ إِلَى حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي التَّشَهُّدِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەك چۆن قورئانی فێردەکردین بەوشێوەیەش تەحیاتی فێردەکردین، دەیفەرموو: (التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ، الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، سَلاَمٌ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، سَلاَمٌ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ).

## دەربارەی تەحیات خوێندن بەنهێنی

## ٢١٧ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يُخْفِي التَّشَهُّدَ

٢٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُخْفِيَ التَّشَهُّدَ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سوننەت وایە لەنوێژدا بە نهێنی تەحیات بخوێنرێت.

## باسی چۆنیەتی دانیشتن لەتەحیاتدا

### ٢١٨ - بَابٌ كَيْفَ الجُلُوسُ فِي التَّشَهُّدِ

٢٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَال: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، قُلْتُ: لأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلاَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا جَلَسَ، يَعْنِي لِلتَّشَهُّدِ: افْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى، يَعْنِي، عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى، وَنَصَبَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ.وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ.

**واتە: لە وائلی کوڕی حوجرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چووم بۆ مەدینە، وتم: چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەرتان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نیشان بدەم کە چۆن نوێژی دەکرد؟ کاتێ کە دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن ڕانی چەپی ڕادەخست و دادەنیشت، دەستی چەپی لەسەر ڕانی چەپی دائەنا، قاچی ڕاستی دەچەقاند لەزەوی.**

## باسێکی تر لەوبارەوە

### ٢١٩ - بَابٌ مِنْهُ أَيْضًا

٢٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ الْمَدَنِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ سَهْلٍ السَّاعِدِيُّ، قَال: اجْتَمَعَ أَبُو حُمَيْدٍ، وَأَبُو أُسَيْدٍ، وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، فَذَكَرُوا صَلاَةَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِنَّ

رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَلَسَ، يَعْنِي لِلتَّشَهُّدِ، فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ اليُسْرَى، وَأَقْبَلَ بِصَدْرِ اليُمْنَى عَلَى قِبْلَتِهِ، وَوَضَعَ كَفَّهُ اليُمْنَى عَلَى رُكْبَتِهِ اليُمْنَى، وَكَفَّهُ اليُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ اليُسْرَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ، يَعْنِي السَّبَّابَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَبِهِ يَقُولُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. قَالُوا: يَقْعُدُ فِي التَّشَهُّدِ الآخِرِ عَلَى وَرِكِهِ، وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ أَبِي حُمَيْدٍ، وَقَالُوا: يَقْعُدُ فِي التَّشَهُّدِ الأَوَّلِ عَلَى رِجْلِهِ اليُسْرَى وَيَنْصِبُ اليُمْنَى.

واتە: عەباسی کوڕی سەهلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو حومەید و ئەبو ئوسەید و سەهلی کوڕی سەعد و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ڕەزای خوایان لێ بێ کۆبوونەوەو باسی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوایان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەکرد، ئەبو حومەید ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: من لەهەمووتان زیاتر شارەزام بە چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن قاچی چەپی ڕادەخست، وە سنگی پەنجەکانی هەردوو پێی ڕوو دەکردە قیبلە، وە لەپی دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دائەنا، وە لەپی دەستی چەپیشی لەسەر ڕانی چەپی دائەنا، پەنجەی شایەتومانی دەجولاند.

## دەربارەی جولاندنی پەنجەی شایەتومان

٢٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِشَارَةِ

٢٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، وَيَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ وَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى رُكْبَتِهِ، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الَّتِي

تَلِي الإِبْهَامَ يَدْعُو بِهَا، وَيَدُهُ اليُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ بَاسِطَهَا عَلَيْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَنُمَيْرٍ الخُزَاعِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي حُمَيْدٍ، وَوَائِلِ بْنِ حُجْرٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ: يَخْتَارُونَ الإِشَارَةَ فِي التَّشَهُّدِ. وَهُوَ قَوْلُ أَصْحَابِنَا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن لەپی دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەنا، پەنجەی شایەتومانی بەرزدەکردەوەو دەیجولاندو ئامـاژەی پێ دەکرد، وە لەپی دەستی چەپیشی لەسەر ڕانی چەپی دادەناو پەنجەکانی لەسەری بڵاودەکردنەوە.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان جوڵاندنی پەنجەی شایەتومانیان بەلاوە پەسەندە. ئەمەش وتەی هاوەڵانمانە واتە لە فەرموودەناسان.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی سەلامدانەوە.

٢٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ فِي الصَّلاَةِ

٢٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَالبَرَاءِ،

وَعَمَّارٍ، وَوَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، وَعَدِيِّ بْنِ عَمِيرَةَ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە (عبد الله) - ی کوڕی مەسعود — ەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەلای ڕاست و چەپیدا سەلامی دەدایەوە و دەیفەرموو: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).

## باسێکی تر لەوبارەوە

## ٢٢٢ - بَابُ مِنْهُ أَيْضًا

٢٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ زُهَيْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُسَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، ثُمَّ يَمِيلُ إِلَى الشِّقِّ الأَيْمَنِ شَيْئًا. وَفِي البَابِ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ. وَحَدِيثُ عَائِشَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا، إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: زُهَيْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ أَهْلُ الشَّامِ يَرْوُونَ عَنْهُ مَنَاكِيرَ، وَرِوَايَةُ أَهْلِ العِرَاقِ أَشْبَهُ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: كَأَنَّ زُهَيْرَ بْنَ مُحَمَّدٍ الَّذِي كَانَ وَقَعَ عِنْدَهُمْ لَيْسَ هُوَ هَذَا الَّذِي يُرْوَى عَنْهُ بِالعِرَاقِ، كَأَنَّهُ رَجُلٌ آخَرُ، قَلَبُوا اسْمَهُ. وَقَدْ قَالَ بِهِ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي التَّسْلِيمِ فِي الصَّلاَةِ. وَأَصَحُّ الرِّوَايَاتِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَسْلِيمَتَانِ. وَعَلَيْهِ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ. وَرَأَى قَوْمٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ: تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً فِي الْمَكْتُوبَةِ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنْ شَاءَ سَلَّمَ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً، وَإِنْ شَاءَ سَلَّمَ تَسْلِيمَتَيْنِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەکۆتایی نوێژدا یەك سلاوی دەدایەوە کەمێك بەلای ڕاستدا ڕوخساری وەردەگێڕا.

ڕیوایەتی ڕاست و دروست لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەلامدانەوەیە بەلای ڕاست و چەپدا. زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان و جگە لەوانیش لەسەر ئەمەن. هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش لەسەر ئەو رایەن کە لەنوێژی فەرزدا بەس بەلای ڕاستدا سەلام بدرێتەوە. پێشەوایان شافیعی دەفەرموێت: بە ئارەزووی خۆی ئەگەر ویستی بەلای ڕاستدا سەلام بداتەوە، ئەگەر ویستی بەلای ڕاست و چەپدا سەلام بداتەوە.

### درێژنەکردنەوەی سەلامدانەوە سونەتە

٢٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ حَذْفَ السَّلاَمِ سُنَّةٌ

٢٩٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، وَهِقْلُ بْنُ زِيَادٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ قُرَّةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: حَذْفُ السَّلاَمِ سُنَّةٌ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ: وَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: يَعْنِي: أَنْ لاَ تَمُدَّهُ مَدًّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ الَّذِي يَسْتَحِبُّهُ أَهْلُ العِلْمِ. وَرُوِيَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ أَنَّهُ قَالَ: التَّكْبِيرُ جَزْمٌ، وَالسَّلاَمُ جَزْمٌ وَهِقْلٌ يُقَالُ: كَانَ كَاتِبَ

الأَوْزَاعِيِّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: درێژنەکردنەوەی سەلامدانەوە واتە (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) سوننەتە.

## لەدوای سەلامدانەوە چی دەخوێنرێت.

٢٢٤ - بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ

٢٩٨ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَلَّمَ لاَ يَقْعُدُ إِلاَّ مِقْدَارَ مَا يَقُولُ: اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەندێ جار پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە سەلامی دەدایەوە لەشەێنی نوێژەکەیدا هێندە دادەنیشت کە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ). واتە: خودایە تۆ سەلامی و ئاشتی و سەلامەتی، سەلامەتیش لەتۆوەیە، بەڕاستی تۆ زۆر پیرۆز و گەورەیت ئەی گەورەی خاوەن شکۆی خاوەن ڕێز.

٢٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ، وَقَالَ: تَبَارَكْتَ يَا ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ. وَفِي البَابِ عَنْ ثَوْبَانَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَالمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى خَالِدٌ الحَذَّاءُ هَذَا الحَدِيثَ، مِنْ حَدِيثِ

عَائِشَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ نَحْوَ، حَدِيثِ عَاصِمٍ.وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ بَعْدَ التَّسْلِيمِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ. وَرُوِيَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلاَمٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ.

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لەدوای سەلامدانەوە دەیفەرموو: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدّ). واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، خودایە! ڕێگر نیە لەو شتەی کە تۆ دەیبەخشی، بەخشەر نیە بۆ ئەو شتەی کە تۆ دەیگریتەوە، هیچ خاوەن دەسەڵاتێك دەسەڵاتەکەی سودی نیە بۆی لەرۆژی قیامەتدا لەسزای تۆ. هەروەها دەگێڕنەوە، کە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلاَمٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ).

٣٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ مُوسَى قَال: أَخْبَرَنِي ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَال: أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَال: حَدَّثَنِي شَدَّادٌ أَبُو عَمَّارٍ قَال: حَدَّثَنِي أَبُو أَسْمَاءَ الرَّحَبِيُّ، قَال: حَدَّثَنِي ثَوْبَانُ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَال: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنْصَرِفَ مِنْ صَلاَتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَال: اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو عَمَّارٍ، اسْمُهُ شَدَّادُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ.

واتە: لە (ثَوْبَانُ)ی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ کە لەنوێژ دەبووە و سەلامی دەدایەوە سێ جار دەیفەرموو: (استغفر الله)، لەپاشدا دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ).

## لەپاش سەلامدانەوە کەمێ خۆ وەرچەرخان بەلای راست و چەپدا

### ٢٢٥ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الاِنْصِرَافِ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ

٣٠١ – (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَؤُمُّنَا، فَيَنْصَرِفُ عَلَى جَانِبَيْهِ جَمِيعًا: عَلَى يَمِينِهِ وَعَلَى شِمَالِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ هُلْبٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَعَلَيْهِ العَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّهُ يَنْصَرِفُ عَلَى أَيِّ جَانِبَيْهِ شَاءَ، إِنْ شَاءَ عَنْ يَمِينِهِ، وَإِنْ شَاءَ عَنْ يَسَارِهِ. وَقَدْ صَحَّ الأَمْرَانِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.وَيُرْوَى عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّهُ قَالَ: إِنْ كَانَتْ حَاجَتُهُ عَنْ يَمِينِهِ أَخَذَ عَنْ يَمِينِهِ، وَإِنْ كَانَتْ حَاجَتُهُ عَنْ يَسَارِهِ أَخَذَ عَنْ يَسَارِهِ.

واتە: لە قەبیصەی کوری هولبەوە، لەباوکیەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرنوێژی بۆ دەکردین پاش سەلامدانەوە بەلای راست و بەلای چەپیدا کەمێ خۆی وەردەچەرخان.

## سەبارەت بە وەسف و چۆنیەتی نوێژ

### ٢٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وَصْفِ الصَّلاَةِ

٣٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَلِيِّ بْنِ يَحْيَى بْنِ خَلاَّدِ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ يَوْمًا، قَالَ رِفَاعَةُ وَنَحْنُ مَعَهُ: إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ كَالبَدَوِيِّ، فَصَلَّى فَأَخَفَّ صَلاَتَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَعَلَيْكَ، فَارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، فَرَجَعَ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: وَعَلَيْكَ، فَارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، فَفَعَلَ ذَلِكَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، كُلُّ ذَلِكَ يَأْتِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَيَقُولُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَعَلَيْكَ، فَارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، فَخَافَ النَّاسُ وَكَبُرَ عَلَيْهِمْ أَنْ يَكُونَ مَنْ أَخَفَّ صَلاَتَهُ لَمْ يُصَلِّ،فَقَالَ الرَّجُلُ فِي آخِرِ ذَلِكَ: فَأَرِنِي وَعَلِّمْنِي، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أُصِيبُ وَأُخْطِئُ، فَقَالَ: أَجَلْ إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَتَوَضَّأْ كَمَا أَمَرَكَ اللَّهُ، ثُمَّ تَشَهَّدْ فَأَقِمْ أَيْضًا، فَإِنْ كَانَ مَعَكَ قُرْآنٌ فَاقْرَأْ، وَإِلاَّ فَاحْمَدِ اللَّهَ وَكَبِّرْهُ وَهَلِّلْهُ، ثُمَّ ارْكَعْ فَاطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ اعْتَدِلْ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ فَاعْتَدِلْ سَاجِدًا، ثُمَّ اجْلِسْ فَاطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ قُمْ، فَإِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُكَ، وَإِنْ انْتَقَصْتَ مِنْهُ شَيْئًا انْتَقَصْتَ مِنْ صَلاَتِكَ، قَالَ: وَكَانَ هَذَا أَهْوَنَ عَلَيْهِمْ مِنَ الأَوَّلِ، أَنَّهُ مَنْ انْتَقَصَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا انْتَقَصَ مِنْ صَلاَتِهِ، وَلَمْ تَذْهَبْ كُلُّهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ. حَدِيثُ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ رِفَاعَةَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ.

**واتە: لە ریفاعەی کوڕی رافیعەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە**

فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مزگەوت دانیشتبوو، ریفاعە فەرمووی: ئێمە لە خزمەتیدا بووین پیاوێکی دەشتەکی هاتە ناو مزگەوت نوێژێکی کورت و سوکەڵەی کرد، پاشان سەلامی دایەوە و سڵاوی کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (سڵاو لە تۆش، بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد). ئینجا پیاوەکە گەڕایەوە بە هەمان شێوە نوێژەکەی کردەوەو هاتەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و سڵاوی لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوە و فەرمووی: (سڵاو لە تۆش، بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد). دووجار تا سێ جار پیاوەکەی گەراندەوە بەو شێوەیە، هەموو جارێ پیاوەکە دەهاتەوە سڵاوی دەکرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی دەفەرموو: (سڵاو لە تۆش، بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد). خەڵکەکە ترسان بەلایانەوە قورس بوو کەسێ نوێژەکەی کورت بێ نوێژی نەکردووە، پیاوەکە کۆتا جار فەرمووی: دەی تۆ فێرم بکە، من مرۆڤم کاری راست دەکەم و هەڵەش دەکەم، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ، کاتێ کە هەستای بۆ نوێژ وەك چۆن خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردووی دەستنوێژ بگرە، لەپاشدا شایەتومان بێنە یان بانگ و قامەت بکە، نیەت بێنەو (الله أكبر) بکە پاشان چەندت بۆ ئاسان بوو لەو قورئانەی لەبەرتە بیخوێنە، ئەگینا (الحمد لله) و (الله أكبر) و (لا اله الا الله) بکە، پاشان رکوع بەرە و هێندە بوەستە هەتا جەستەت لە جوڵە دەکەوێت و ئارام دەبێتەوە، پاشان بەرزبەرەوە تا بەتەواوی راست دەبیتەوە، پاشان سەجدە ببەو هێندە بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت، پاشان بەرزبەرەوە تا بە دانیشتویی ئارام دەبیت، پاشان هەستە، ئەگەر بەو شێوەیەت کرد ئەوە نوێژەکەت تەواوە، ئەگەر شتێکت لێ کەم کرد ئەوە لەنوێژەکەت کەم

کردووە)، فەرمووی: ئیتر ئەمە ئاسانتر بوو لەسەریان لەوەی یەکەمجار، ئەگەر کەسێ شتێکی لێ کەم کرد ئەوە لەنوێژەکەی کەم کردووە نەك هەموو نوێژەکەی.

٣٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ، فَقَالَ: ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، فَرَجَعَ الرَّجُلُ فَصَلَّى كَمَا كَانَ صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ، فَقَالَ لَهُ: ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَ هَذَا، فَعَلِّمْنِي، فَقَالَ: إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ بِمَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، وَافْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى ابْنُ نُمَيْرٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَرِوَايَةُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، أَصَحُّ. وَسَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، قَدْ سَمِعَ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَرَوَى عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَأَبُو سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيُّ اسْمُهُ كَيْسَانُ. وَسَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ يُكْنَى أَبَا سَعْدٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاتەژوورەوە بۆ مزگەوت، پیاوێکی دەشتەکی هاتە مزگەوت نوێژێکی کورت و سوکەڵەی کرد، پاشان هات سڵاوی کرد لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەڵامی دایەوە و فەرمووی: (بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد). ئینجا پیاوەکە گەڕایەوە بە هەمان شێوە نوێژەکەی کردەوە، لەپاشدا هاتەوە بۆلای

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و سلاَوی لێکرد، ئەویش وەلاَمی دایەوە پێی فەرموو: (بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد). هەتا سێ جار پیاوەکە بەو شێوەیەی کرد، پیاوەکە پێی وت: بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردووە لەوە چاکتر نازانم، دەی تۆ فێرم بکە، فەرمووی: (کاتێ کە هەستای بۆ نوێژ نیەت بێنەو (الله أکبر) بکە پاشان چەندت بۆ ئاسان بوو لەو قورئانەی لەبەرتە بیخوێنە، پاشان بچۆ بەرکوعدا و هێندە بوەستە هەتا جەستەت لە جوڵە دەکەوێت و ئارام دەبێتەوە، پاشان بەرز بەرەوە تا بەتەواوی راست دەبیتەوە، پاشان سەجدە ببەو هێندە بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت، پاشان بەرزبەرەوە تا بە دانیشتویی ئارام دەبیت، پاشان سەجدە بەرەوەو هێندە بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت، جا بەم شێوەیە هەموو نوێژەکەت ئەنجام بدە).

## باسێکی تر لەوبارەوە

### ٢٢٧ - باب مِنْهُ

٣٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُهُ وَهُوَ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدُهُمْ أَبُو قَتَادَةَ بْنُ رِبْعِيٍّ يَقُولُ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالُوا: مَا كُنْتَ أَقْدَمَنَا لَهُ صُحْبَةً، وَلاَ أَكْثَرَنَا لَهُ إِتْيَانًا؟ قَالَ: بَلَى، قَالُوا: فَاعْرِضْ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ اعْتَدَلَ قَائِمًا، وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، وَرَكَعَ، ثُمَّ اعْتَدَلَ، فَلَمْ يُصَوِّبْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُقْنِعْ، وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَاعْتَدَلَ، حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ

عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ هَوَى إِلَى الأَرْضِ سَاجِدًا، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ جَافَى عَضُدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ وَفَتَخَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَقَعَدَ عَلَيْهَا، ثُمَّ اعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ هَوَى سَاجِدًا، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ وَقَعَدَ وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ نَهَضَ ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى إِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، كَمَا صَنَعَ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلاَةَ، ثُمَّ صَنَعَ كَذَلِكَ، حَتَّى كَانَتِ الرَّكْعَةُ الَّتِي تَنْقَضِي فِيهَا صَلاَتُهُ أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَقَعَدَ عَلَى شِقِّهِ مُتَوَرِّكًا، ثُمَّ سَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.وَمَعْنَى قَوْلِهِ: إِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ، يَعْنِي: إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ.

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ڕەزای خوای لێ بێ لەناو دە کەس لەهاوەڵاندا کە یەکێکیان قەتادەی کوڕی ڕیبعی بوو فەرمووی: من لەهەمووتان زیاتر شارەزام بە نوێژکردنی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وتیان: لەبەرچی سوێند بە خوا نە لە ئێمە زیاتر شوێنکەوتەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وە نە لە ئێمەش لەپێش تری بۆ هاوەڵێتی، فەرمووی: بەڵێ وایە - بەڵام من زیاتر سەرنجی چۆنیەتی نوێژکردنی پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) داوە - وتیان: ئادەی ئەوەی دەیزانی بۆمان باس بکەو نیشانمانی بدە؟ فەرمووی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەڵئەسا بۆ نوێژکردن هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی، پاشان (الله اکبر)ی دەکردو ڕێک ڕادەوەستا هەتا هەموو جومگەکانی دەچوونەوە جێگای خۆیان، ئینجا دەستی دەکرد بە خوێندن — واتە دوعای نوێژ دابەستن و خوێندنی سورەتی فاتیحەو خوێندنی سورەت و ئایەتی تریش ، پاشان (الله اکبر)ی دەکردو هەردوو دەستی

بەرزکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی، ئینجا دەچووە رکوعەوەو هەردوو لەپی دەستی لەسەر ئەژنۆی دائەنا، پاشان سەر و پشتی رێك دەکرد نە سەری بەرزدەکردەوە لە ئاستی پشتی وە نە سەری شۆڕی دەکردەوە بەرەو زەوی، ئینجا سەری بەرزدەکردەوەو دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). واتە: خوای گەورە بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەکەن. پاشان هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی و رێك دەوەستا، ئینجا دەیفەرموو: (الله اکبر)، پاشان دادەبەزی بۆ سەر زەوی - و سەجدەی دەبرد - ، هەردوو دەستی لە لاتەنیشتەکانی دووردەخستەوە، ئینجا سەری بەرزدەکردەوەو قاچی چەپی رادەخست و لەسەری دادەنیشت، کاتێ کە سەجدەی دەبرد پەنجەکانی هەردوو قاچی دەکردنەوە، هەتا هەموو جومگەکانی دەچوونەوە جێگای خۆیان، پاشان بە هەمان شێوە دەچووەوە سەجدەوە، ئینجا دەیفەرموو: (الله اکبر)، پاشان سەری بەرزدەکردەوەو قاچی چەپی رادەخست و لەسەری دادەنیشت هەتا هەموو جومگەکانی دەچوونەوە جێگای خۆیان، پاشان لەرکاتی دووەهەمیشدا بە هەمان شێوەی دەکرد، ئینجا کاتێ کە لەرکاتی دووەهەم هەڵئەسایەوە (الله اکبر)ی دەکردو هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی وەك چۆن لەکاتی نوێژ دابەستندا (الله اکبر)ی دەکرد، پاشان لە باقی نوێژەکەیدا بە هەمان شێوەی دەکرد هەتا دەگەیشتە ئەو سەجدەیەی کە سەلامی تێدا دەدایەوە واتە تەحیاتی کۆتایی جا قاچی چەپی دەبردە پێشەوە بۆ ژێر قاچی راستی و ئەوی تریانی هەڵدەنا و لەسەر سمتی دادەنیشت، لەپاشدا سەلامی دەدایەوە . - وتیان: راست دەکەیت، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەو شێوەیە نوێژی دەکرد وەك لەفەرموودەی دواتردا هاتووە - .

٣٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الحُلْوَانِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حُمَيْدٍ السَّاعِدِيَّ، فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهِمْ: أَبُو قَتَادَةَ بْنُ رِبْعِيٍّ، فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ بِمَعْنَاهُ، وَزَادَ فِيهِ أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ، هَذَا الحَرْفَ، قَالُوا: صَدَقْتَ، هَكَذَا صَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

فەرموویان: ڕاست دەکەیت، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەو شێوەیە نوێژی دەکرد.

## دەربارەی قورئان خوێندن لەنوێژی بەیانیدا

٢٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القِرَاءَةِ فِي الصُّبْحِ

٣٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ مِسْعَرٍ، وَسُفْيَانَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلَاقَةَ، عَنْ عَمِّهِ قُطْبَةَ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الفَجْرِ: وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى. وَفِي البَابِ عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ، وَأَبِي بَرْزَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ قُطْبَةَ بْنِ مَالِكٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَرَأَ فِي الصُّبْحِ بِالوَاقِعَةِ. وَرُوِيَ عَنْهُ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي الفَجْرِ مِنْ سِتِّينَ آيَةً إِلَى مِائَةٍ. وَرُوِيَ عَنْهُ أَنَّهُ قَرَأَ: (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ). وَرُوِيَ عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى أَبِي مُوسَى: أَنْ اقْرَأْ فِي الصُّبْحِ بِطِوَالِ الْمُفَصَّلِ. وَعَلَى هَذَا العَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ.

واتە: لە (قُطْبَة)ی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو لە ركاتی یەكەمی نوێژی بەیانیدا: (وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ)ی دەخوێند.

وە لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، كە نوێژی بەیانیدا: سورەتی (الْوَاقِعَة)ی دەخوێند.

هەروەها لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، كە نوێژی بەیانیدا: شەست هەتا سەد ئایەتی دەخوێند.

وە لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، كە نوێژی بەیانیدا: (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ)ی دەخوێند.

هەروەها دەگێڕنەوە، كە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ نامەی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری ڕەزای خوای لێ بێ كە نوێژی بەیانیدا سورەتە (طِوَالِ الْمُفَصَّلِ)ەكان بخوێنێ.

## دەربارەی قورئان خوێندن لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسردا

٢٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القِرَاءَةِ فِي الظُّهر والعَصر

٣٠٧ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالعَصْرِ بِالسَّمَاءِ ذَاتِ البُرُوجِ، وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ، وَشِبْهِهِمَا. وَفِي البَابِ عَنْ خَبَّابٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي قَتَادَةَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَالبَرَاءِ. حَدِيثُ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَرَأَ فِي الظُّهْرِ قَدْرَ تَنْزِيلِ السَّجْدَةِ. وَرُوِيَ عَنْهُ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مِنَ الظُّهْرِ قَدْرَ ثَلاَثِينَ آيَةً، وَفِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً. وَرُوِي عَنْ عُمَرَ، أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى أَبِي

مُوسَى: أَنْ اقْـرَأْ فِي الظُّهْـرِ بِأَوْسَـاطِ الْمُفَصَّـلِ. وَرَأَى بَعْـضُ أَهْـلِ العِلْـمِ أَنَّ القِـرَاءَةَ فِي صَـلاَةِ العَصْـرِ كَنَحْـوِ القِـرَاءَةِ فِي صَـلاَةِ الْمَغْـرِبِ: يَقْـرَأُ بِقِصَـارِ الْمُفَصَّـلِ. وَرُوِي عَـنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ أَنَّهُ قَالَ: تَعْدِلُ صَلاَةُ العَصْرِ بِصَلاَةِ الْمَغْرِبِ فِي القِرَاءَةِ. وقَالَ إِبْرَاهِيمُ: تُضَاعَفُ صَلاَةُ الظُّهْرِ عَلَى صَلاَةِ العَصْرِ فِي القِرَاءَةِ أَرْبَعَ مِرَارٍ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو لە نوێژی لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسردا: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ البُرُوجِ)، (وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ) و وێنەی ئەوانەی دەخوێند.

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لەنوێژی نیوەڕۆدا بە ئەندازەی خوێندنی: (الم تَنْزِيلُ)ی سورەتی (السَّجْدَة)ی دەخوێند.

وە لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە رکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا سی ئایەت و لە رکاتی دووەمدا پانزە ئایەتی دەخوێند.

هەروەها دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ نامەی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری ڕەزای خوای لێ بێ کە نوێژی لەنوێژی نیوەڕۆدا سورەتە (أَوْسَاطِ الْمُفَصَّلِ)ەکان بخوێنێ.

هەندێ لە زانایان ڕایان وایە قورئان خوێندنی نوێژی عەسر هێندەی قورئان خوێندنی نوێژی شێوان بێت (قِصَارِ الْمُفَصَّلِ)ەکان بخوێنرێن. لە ئیبراهیمی نەخەعیەوە دەگێڕنەوە، کە قورئان خوێندنی نوێژی عەسر وەك قورئان خوێندنی نوێژی شێوان بێت. ئیبراهیم دەفەرموێت: قورئان خوێندنی نوێژی نیوەڕۆ چوار ئەوەندەی قورئان خوێندنی نوێژی عەسرە.

## دەربارەی قورئان خوێندنی نوێژی شێوان

## ٢٣٠ - بَابٌ فِي القِرَاءَةِ فِي الْمَغْرِبِ

٣٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أُمِّهِ أُمِّ الفَضْلِ، قَالَتْ: خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَاصِبٌ رَأْسَهُ فِي مَرَضِهِ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ، فَقَرَأَ: بِالمُرْسَلاَتِ، فَمَا صَلاَّهَا بَعْدُ حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ. وَفِي البَابِ عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ. حَدِيثُ أُمِّ الفَضْلِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَرَأَ فِي الْمَغْرِبِ بِالأَعْرَافِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا. وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَرَأَ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ. وَرُوِيَ عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى أَبِي مُوسَى: أَنْ اقْرَأْ فِي الْمَغْرِبِ بِقِصَارِ الْمُفَصَّلِ. وَرُوِيَ عَنْ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّهُ قَرَأَ فِي الْمَغْرِبِ بِقِصَارِ الْمُفَصَّلِ. وَعَلَى هَذَا العَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ ابْنُ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: وَذَكَرَ عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ: كَرِهَ أَنْ يُقْرَأَ فِي صَلاَةِ الْمَغْرِبِ بِالسُّوَرِ الطِّوَالِ نَحْوَ الطُّورِ، وَالمُرْسَلاَتِ، قَالَ الشَّافِعِيُّ: لاَ أَكْرَهُ ذَلِكَ بَلْ أَسْتَحِبُّ أَنْ يُقْرَأَ بِهَذِهِ السُّوَرِ فِي صَلاَةِ الْمَغْرِبِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە، لە دایکیەوە (أُمِّ الفَضْلِ) ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە کاتی نەخۆشیەکەیدا هات بۆ لامان سەری پێچابوو، نوێژی شێوانی کرد سورەتی (المُرْسَلاَتِ)ی دەخوێند، (أُمِّ الفَضْلِ) فەرمووی: ئیتر نوێژی تری نەکرد هەتا گەیشتەوە بە خوای پەروەردگاری خۆی.

لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لەدوو ڕکاتی نوێژی

شێواندا سورەتی (الأَعْرَافِ)ی دەخوێند. وە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لەدوو رکاتی نوێژی شێواندا سورەتی (الطُّورِ)ی دەخوێند.

هەروەها لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە نامەی نووسیوە بۆ ئەبو موسای ئەشعەری رەزای خوای لێ بێ کە نوێژی لەنوێژی شێواندا سورەتە (قِصَارِ الْمُفَصَّلِ)ەکان بخوێنێ.

پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: دەگێڕنەوە کە پێشەوا مالیك خوێندنی سورەتەکانی وەك سورەتی (الطُّورِ) و (المُرْسَلاَتِ)ی پێ باش نەبووە لەنوێژی شێواندا بخوێنرێن. پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: پێم باشە لەنوێژی شێواندا بخوێنرێن.

## دەربارەی قورئان خوێندن لەنوێژی خەوتناندا

### ٢٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقِرَاءَةِ فِي صَلاَةِ الْعِشَاءِ

٣٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الْخُزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ الْحُبَابِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ وَاقِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الْعِشَاءِ الآخِرَةِ بِالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَنَحْوِهَا مِنَ السُّوَرِ. وَفِي الْبَابِ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ. حَدِيثُ بُرَيْدَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَرَأَ فِي الْعِشَاءِ الآخِرَةِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ. وَرُوِيَ عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْعِشَاءِ بِسُوَرٍ مِنْ أَوْسَاطِ الْمُفَصَّلِ نَحْوِ سُورَةِ الْمُنَافِقِينَ، وَأَشْبَاهِهَا. وَرُوِيَ عَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ: أَنَّهُمْ قَرَأُوا بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا وَأَقَلَّ، كَأَنَّ الأَمْرَ عِنْدَهُمْ وَاسِعٌ فِي هَذَا. وَأَحْسَنُ شَيْءٍ فِي ذَلِكَ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَرَأَ بِالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ.

واتە: لە بورەیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی خەوتناندا سورەتی (وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا) و وێنەی ئەو سورەتەی دەخوێند. لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لە نوێژی خەوتناندا سورەتی (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی دەخوێند.

دەگێڕنەوە، کە پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففان رەزای خوای لێ بێ لەنوێژی خەوتناندا سورەتە (أَوْسَاطِ الْمُفَصَّلِ)ەکانی وەك سورەتی (الْمُنَافِقِين) و وێنەی ئەوی دەخوێند.

باشترین شت لەوبارەوە ئەمەیە لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لە نوێژی خەوتناندا سورەتی: (وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا) و (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی دەخوێند.

٣١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ فِي الْعِشَاءِ الآخِرَةِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی خەوتناندا سورەتی: (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی دەخوێند.

## دەربارەی قورئان خوێندن لەدوای پێشنوێژەوە.

٢٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القِرَاءَةِ خَلْفَ الإِمَامِ

٣١١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصُّبْحَ، فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ القِرَاءَةُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنِّي أَرَاكُمْ تَقْرَءُونَ وَرَاءَ إِمَامِكُمْ، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِي وَاللهِ، قَالَ: لاَ تَفْعَلُوا إِلاَّ بِأُمِّ القُرْآنِ، فَإِنَّهُ لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي قَتَادَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ عُبَادَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَرَوَى هَذَا الحَدِيثَ الزُّهْرِيُّ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ. وَهَذَا أَصَحُّ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ فِي القِرَاءَةِ خَلْفَ الإِمَامِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالتَّابِعِينَ. وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ: يَرَوْنَ القِرَاءَةَ خَلْفَ الإِمَامِ.

واتە: لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی بەیانی كرد قورئان خوێندنەكەی بەلاوە قورس بوو، كاتێ كە سەلامی دایەوەو لەنوێژ بوویەوە فەرمووی: (دەتانبینم لەدوای پێشنوێژەوە قورئان دەخوێنن). عوبادە فەرمووی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بەڵێ سوێند بە (الله). فەرمووی: (ئیتر ئەو كارە مەكەن هیچ سورەتێكی تر مەخوێنن جگە لە سورەتی فاتیحە(أُمِّ

القُرْآنِ)، لەبەرئەوەی هەركەس سورەتی فاتیحە نەخوێنێ نوێژەكەی دروست نییە).

## قورئان نەخوێندن لەدوای پێشنوێژەوە كاتێ بەدەنگی بەرز قورئانی بخوێنێ

## ٢٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ القِرَاءَةِ خَلْفَ الإِمَامِ إِذَا جَهَرَ الإِمَامُ بِالقِرَاءَةِ

٣١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ أُكَيْمَةَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ مِنْ صَلاَةٍ جَهَرَ فِيهَا بِالقِرَاءَةِ، فَقَالَ: هَلْ قَرَأَ مَعِي أَحَدٌ مِنْكُمْ آنِفًا؟، فَقَالَ رَجُلٌ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ القُرْآنَ؟، قَالَ: فَانْتَهَى النَّاسُ عَنِ القِرَاءَةِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا جَهَرَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الصَّلَوَاتِ بِالقِرَاءَةِ حِينَ سَمِعُوا ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَابْنُ أُكَيْمَةَ اللَّيْثِيُّ اسْمُهُ عُمَارَةُ، وَيُقَالُ: عَمْرُو بْنُ أُكَيْمَةَ. وَرَوَى بَعْضُ أَصْحَابِ الزُّهْرِيِّ هَذَا الحَدِيثَ، وَذَكَرُوا هَذَا الحَرْفَ: قَالَ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَانْتَهَى النَّاسُ عَنِ القِرَاءَةِ حِينَ سَمِعُوا ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَلَيْسَ فِي هَذَا الحَدِيثِ مَا يَدْخُلُ عَلَى مَنْ رَأَى القِرَاءَةَ خَلْفَ الإِمَامِ، لأَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ هُوَ الَّذِي رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الحَدِيثَ، وَرَوَى أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ، فَهِيَ خِدَاجٌ، هِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تَمَامٍ، فَقَالَ لَهُ حَامِلُ الحَدِيثِ: إِنِّي أَكُونُ أَحْيَانًا وَرَاءَ الإِمَامِ، قَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ، وَرَوَى أَبُو عُثْمَانَ النَّهْدِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَمَرَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أُنَادِيَ أَنْ لاَ صَلاَةَ إِلاَّ بِقِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ. وَاخْتَارَ أَكْثَرُ أَصْحَابِ الحَدِيثِ أَنْ لاَ يَقْرَأَ الرَّجُلُ إِذَا جَهَرَ الإِمَامُ بِالقِرَاءَةِ، وَقَالُوا: يَتَّبِعُ سَكَتَاتِ الإِمَامِ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي القِرَاءَةِ خَلْفَ الإِمَامِ.فَرَأَى أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،

وَالتَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ: القِرَاءَةَ خَلْفَ الإِمَامِ. وَبِهِ يَقُولُ مَالِكٌ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَرُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ قَالَ: أَنَا أَقْرَأُ خَلْفَ الإِمَامِ وَالنَّاسُ يَقْرَءُونَ، إِلاَّ قَوْمًا مِنَ الكُوفِيِّينَ، وَأَرَى أَنَّ مَنْ لَمْ يَقْرَأْ صَلاَتُهُ جَائِزَةٌ. وَشَدَّدَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ فِي تَرْكِ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ، وَإِنْ كَانَ خَلْفَ الإِمَامِ، فَقَالُوا: لاَ تُجْزِئُ صَلاَةٌ إِلاَّ بِقِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ وَحْدَهُ كَانَ أَوْ خَلْفَ الإِمَامِ. وَذَهَبُوا إِلَى مَا رَوَى عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَرَأَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ بَعْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَلْفَ الإِمَامِ، وَتَأَوَّلَ قَوْلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ صَلاَةَ إِلاَّ بِقِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَإِسْحَاقُ، وَغَيْرُهُمَا. وَأَمَّا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ فَقَالَ: مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ، إِذَا كَانَ وَحْدَهُ. وَاحْتَجَّ بِحَدِيثِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ حَيْثُ قَالَ: مَنْ صَلَّى رَكْعَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ، فَلَمْ يُصَلِّ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ وَرَاءَ الإِمَامِ.قَالَ أَحْمَدُ: فَهَذَا رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَأَوَّلَ قَوْلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ، أَنَّ هَذَا إِذَا كَانَ وَحْدَهُ. وَاخْتَارَ أَحْمَدُ مَعَ هَذَا القِرَاءَةَ خَلْفَ الإِمَامِ، وَأَنْ لاَ يَتْرُكَ الرَّجُلُ فَاتِحَةَ الكِتَابِ وَإِنْ كَانَ خَلْفَ الإِمَامِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە یەكێك لە نوێژە ئاشكراكاندا قورئانی دەخوێند كاتێ كە تەواو بوو فەرمووی: (ئایا كەس لەگەڵ مندا قورئانی خوێند؟) پیاوێك فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! فەرمووی: (منیش دەڵێم ئەوە بۆچی بەربەرەكانێ و دژایەتیم دەكەن لە قورئان خوێندندا؟). راوی فەرمووی: كە خەڵكەكە ئەوەیان بیست لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئیتر وازیانهێنا لە قورئان خوێندن لەگەڵ پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژە ئاشكراكاندا.

لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس نوێژ بکات و سورەتی فاتیحە نەخوێنێ ئەوە نوێژەکەی تەواو نییە، نوێژەکەی تەواو نییە).

٣١٣ - (صحيح موقوف) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي نُعَيْمٍ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى رَكْعَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ فَلَمْ يُصَلِّ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ وَرَاءَ الإِمَامِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو نوعەیم وەهەبی کوڕی کەیسانەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە گوێی لە جابری کوڕی (عبد الله) بووە دەیفەرموو: هەرکەس رکاتێ نوێژ بکات و سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ ئەوە نوێژی نەکردووە، مەگەر لەدوای پێشنوێژەوە بێت.

## دەربارەی لەکاتی چوونە مزگەوت چی دەخوێنرێت

### ٢٣٤ - بَابُ مَا يَقُولُ عِنْدَ دُخُولِهِ الْمَسْجِدِ

٣١٤ - (صحيح دون جملة المغفرة) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَسَنِ، عَنْ أُمِّهِ فَاطِمَةَ بِنْتِ الحُسَيْنِ، عَنْ جَدَّتِهَا فَاطِمَةَ الكُبْرَى قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ صَلَّى عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلَّمَ، وَقَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ صَلَّى عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلَّمَ، وَقَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ فَضْلِكَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی حەسەنەوە، لەدایکیەوە (فَاطِمَةَ)ی کچی حوسەین، لە نەنکیەوە (فَاطِمَةَ الكُبْرَى)ی کچی پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رەزای

خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ کە دەچووە مزگەوتەوە سەڵاواتی دەدا لەسەر موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و دەیفەرموو: (رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ). واتە: ئەی پەروەرگارم لەگوناهەکانم خۆش ببە، خودایە دەرگاکانی رەحمەت و میهرەبانی خۆتم بۆ بکەرەوە. کاتێکیش کە دەهاتەدەرەوە سەڵاواتی دەدا لەسەر موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و دەیفەرموو: (رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ). واتە: ئەی پەروەرگارم لەگوناهەکانم خۆش ببە، خودایە داوای بەخشش و بەهرەی خۆتت لێ دەکەم.

٣١٥ - (صحيح) وقَالَ عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ: قَالَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: فَلَقِيتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الحَسَنِ بِمَكَّةَ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذَا الحَدِيثِ فَحَدَّثَنِي بِهِ، قَالَ: كَانَ إِذَا دَخَلَ قَالَ: رَبِّ افْتَحْ لِي بَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ قَالَ: رَبِّ افْتَحْ لِي بَابَ فَضْلِكَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ، وَأَبِي أُسَيْدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ فَاطِمَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ. وَفَاطِمَةُ بِنْتُ الحُسَيْنِ لَمْ تُدْرِكْ فَاطِمَةَ الكُبْرَى إِنَّمَا عَاشَتْ فَاطِمَةُ بَعْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَشْهُرًا.

واتە: ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم دەفەرموێت: لە مەککە گەیشتم بە (عبد الله)ی کوڕی حوسەین رەزای خوایان لێ بێ لەبارەی ئەو فەرموودەوە لێم پرسی؟ فەرمووی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەچووە مزگەوتەوە دەیفەرموو: (رَبِّ افْتَحْ لِي بَابَ رَحْمَتِكَ). واتە: ئەی پەروەرگارم دەرگاکانی رەحمەت و میهرەبانی خۆتم بۆ بکەرەوە. کاتێکیش کە دەهاتەدەرەوە دەیفەرموو: (رَبِّ افْتَحْ لِي بَابَ فَضْلِكَ). واتە: ئەی پەروەرگارم دەرگاکانی بەخشش و بەهرەی خۆتم بۆ بکەرەوە.

سەنەدی فەرموودەکە یەك لەدوای یەك بەرزنەکراوەتەوە هەتا دەگاتەوە بە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەبەرئەوەی (فَاطِمَةَ)ی کچی حوسەین (فَاطِمَةَ)ی کچی پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەدیوە، بەڵکو شەش مانگ لەدوای باوکی وەفاتی کردووە.

## هەرکەسێ لەئێوە چووە مزگەوتەوە دوو رکات نوێژ بکات

### ٢٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ

٣١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ، وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ. وَحَدِيثُ أَبِي قَتَادَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ مُحَمَّدُ بْنُ عَجْلاَنَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، نَحْوَ رِوَايَةِ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ. وَرَوَى سُهَيْلُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَالصَّحِيحُ حَدِيثُ أَبِي قَتَادَةَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَصْحَابِنَا: اسْتَحَبُّوا إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ الْمَسْجِدَ أَنْ لاَ يَجْلِسَ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ عُذْرٌ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: وَحَدِيثُ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ خَطَأٌ أَخْبَرَنِي بِذَلِكَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس لەئێوە هات بۆ مزگەوت با دوو رکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێ).

## سەرجەم سەر زەوی مزگەوتە جگە لە گۆڕستان و گەرماو

### ٢٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الأَرْضَ كُلَّهَا مَسْجِدٌ إِلاَّ الْمَقْبَرَةَ وَالحَمَّامَ

٣١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، وَأَبُو عَمَّارٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلاَّ الْمَقْبَرَةَ وَالحَمَّامَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي ذَرٍّ قَالُوا: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: جُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا وَطَهُورًا. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ قَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ مُحَمَّدٍ رِوَايَتَيْنِ: مِنْهُمْ مَنْ ذَكَرَهُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يَذْكُرْهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ فِيهِ اضْطِرَابٌ. رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلٌ. وَرَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرَوَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، قَال: وَكَانَ عَامَّةُ رِوَايَتِهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. وَكَأَنَّ رِوَايَةَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَثْبَتُ وَأَصَحُّ.

**واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (سەر زەوی سەرجەم مزگەوتە — پاك و خاوێنەو نوێژی تێدا بكەن - جگە لە گۆڕستان و گەرماو). هەروەها پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (سەر زەویم سەرجەم بۆكراوە بە مزگەوت).**

## دەربارەی گەورەیی دروستکردنی مزگەوت.

## ٢٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ بُنْيَانِ الْمَسْجِدِ

٣١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ الحَنَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِدًا بَنَى اللَّهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الجَنَّةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَعَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ، وَوَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ. حَدِيثُ عُثْمَانَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَحْمُودُ بْنُ لَبِيدٍ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَمَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ، قَدْ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُمَا غُلاَمَانِ صَغِيرَانِ مَدَنِيَّانِ.

واتە: لە پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عەفانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (هەرکەس مزگەوتێ دروست بکات بۆ خوا، خوای گەورە لەبەهەشتدا ماڵێکی لەو شێوە بۆ دروست دەکات).

٣١٩ - (ضعيف) وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِدًا صَغِيرًا كَانَ أَوْ كَبِيرًا بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الجَنَّةِ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا نُوحُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، مَوْلَى قَيْسٍ، عَنْ زِيَادٍ النُّمَيْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهَذَا.

واتە: لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە بوو دەیفەرموو: (هەرکەس مزگەوتێ دروست بکات بۆ خوا ئیتر

مزگەوتەکە بچوك بێ یان گەورە، خوای گەورە لەبەهەشتدا ماڵێکی لەو شێوە بۆ دروست دەکات).

## دەربارەی دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ باش نیە

٢٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يَتَّخِذَ عَلَى القَبْرِ مَسْجِدًا

٣٢٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُحَادَةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَائِرَاتِ القُبُورِ، وَالمتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَسَاجِدَ وَالسُّرُجَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە سەردانی گۆڕستان دەکەن، هەروەها لەوانەش کە مزگەوتی لەسەر دروست دەکەن و چرای لەسەر دادەگرسێنن.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خەوتن لەمزگەوتدا.

٢٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّوْمِ فِي الْمَسْجِدِ

٣٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَال: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَال: كُنَّا نَنَامُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ وَنَحْنُ شَبَابٌ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ فِي النَّوْمِ فِي الْمَسْجِدِ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لاَ يَتَّخِذُهُ مَبِيتًا

وَمَقِيلاً. وَقَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ ذَهَبُوا إِلَى قَوْلِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە کۆمەڵێ گەنج بووین لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەمزگەوت دەخەوتین. هەندێ لە زانایان رێگەیانداوە بە خەوتن لەمزگەوتدا. ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەفەرمووێت: نابێ مزگەوت بکرێتە جێگەی شەومانەوە و خەوی قەیلولەی نیوەڕوان.

## مامەڵەو بانگەواز بۆ شتی ونبوو هۆنراوە خوێندنەوە لەمزگەوت باش نیە

### ٢٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ البَيْعِ وَالشِّرَاءِ وَإِنْشَادِ الضَّالَّةِ وَالشِّعْرِ فِي الْمَسْجِدِ

٣٢٢ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ نَهَى عَنْ تَنَاشُدِ الأَشْعَارِ فِي الْمَسْجِدِ، وَعَنِ البَيْعِ وَالاِشْتِرَاءِ فِيهِ، وَأَنْ يَتَحَلَّقَ النَّاسُ فِيهِ يَوْمَ الجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلاَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ بُرَيْدَةَ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَعَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ هُوَ ابْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: رَأَيْتُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَذَكَرَ غَيْرَهُمَا يَحْتَجُّونَ بِحَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَقَدْ سَمِعَ شُعَيْبُ بْنُ مُحَمَّدٍ، مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَمَنْ تَكَلَّمَ فِي حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ إِنَّمَا ضَعَّفَهُ، لأَنَّهُ يُحَدِّثُ عَنْ صَحِيفَةِ جَدِّهِ، كَأَنَّهُمْ رَأَوْا أَنَّهُ لَمْ يَسْمَعْ هَذِهِ الأَحَادِيثَ مِنْ جَدِّهِ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ: وَذُكِرَ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ أَنَّهُ قَالَ: حَدِيثُ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عِنْدَنَا وَاهٍ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ البَيْعَ وَالشِّرَاءَ فِي الْمَسْجِدِ.وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ

التَّابِعِينَ: رُخْصَةٌ فِي البَيْعِ وَالشِّرَاءِ فِي الْمَسْجِدِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَيْرِ حَدِيثٍ رُخْصَةٌ فِي إِنْشَادِ الشِّعْرِ فِي الْمَسْجِدِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم شتانەی قەدەغەکردوە لەمزگەوتدا: مامەڵەو کڕین و فرۆشتن، بانگەواز بۆ شتی ونبوو، خوێندنەوەی شیعر. هەروەها حەلەقاتی دەرس و دەور و وانە وتنەوە لەپێش نوێژی هەینی.

هەندێ لە زانایان مامەڵەو کڕین و فرۆشتنیان لەمزگەوتدا بەلاوە باش نیە، پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون. لە هەندێ لە زانایان لە شوێنکەوتوانەوە دەگێڕنەوە، کە روخستەتیان داوە بەوە مامەڵەو کڕین و فرۆشتن لەمزگەوتدا. چەند فەرموودەیە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە ڕێگە دراوە بە خوێندنەوەی شیعر و هۆنراوە لەمزگەوتدا.

## دەربارەی مزگەوتێ بناغەی لەسەر تەقوا دامەزرابێ

## ٢٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى

٣٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أُنَيْسِ بْنِ أَبِي يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: امْتَرَى رَجُلٌ مِنْ بَنِي خُدْرَةَ وَرَجُلٌ مِنْ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى، فَقَالَ الخُدْرِيُّ: هُوَ مَسْجِدُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ الآخَرُ: هُوَ مَسْجِدُ قُبَاءٍ، فَأَتَيَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ فَقَالَ: هُوَ هَذَا، يَعْنِي مَسْجِدَهُ، وَفِي ذَلِكَ خَيْرٌ كَثِيرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَأَلْتُ يَحْيَى بْنَ

سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي يَحْيَى الأَسْلَمِيِّ، فَقَالَ: لَمْ يَكُنْ بِهِ بَأْسٌ، وَأَخُوهُ أُنَيْسُ بْنُ أَبِي يَحْيَى أَثْبَتُ مِنْهُ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پیاوێکی هۆزی خودرە و پیاوێکی هۆزی عــەمری کــوڕی عــەوف بــوو بە دەمەقاڵەیان لەسەر مزگەوتێ بناغەی لەسەر تەقواو لــەخوا ترسان دامــەزرابێ، پیاوە خودریەکە فەرمووی: مەبەست مزگەوتەکــەی پێغەمبــەری خوایــە (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەوی تر فەرمووی: مەبەست مزگەوتی قوبایە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هات فەرمووی: ئەم مزگەوتەیە خێری زۆر زۆرە.

## دەربارەی نوێژکردن لە مزگەوتی قوبا

٢٤٢ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ

٣٢٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ أَبُو كُرَيْبٍ، وَسُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو الأَبْرَدِ، مَوْلَى بَنِي خَطْمَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أُسَيْدَ بْنَ ظُهَيْرٍ الأَنْصَارِيَّ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: الصَّلاَةُ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ كَعُمْرَةٍ. وَفِي البَابِ عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ. حَدِيثُ أُسَيْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَلاَ نَعْرِفُ لأُسَيْدِ بْنِ ظُهَيْرٍ شَيْئًا يَصِحُّ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ، وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ. وَأَبُو الأَبْرَدِ اسْمُهُ زِيَادٌ مَدِينِيٌّ.

واتە: ئوسەیدی کوڕی (ظُهَيْر)ی ئەنصاری ڕەزای خوای لێ بێ کە یەکێ بووە لــە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەم فــەرمودەی لــە پێغەمبــەرەوە (صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گێڕایەوەتەوە، فەرمووی: نوێژکردن لە مزگەوتی قوبا وەك عومرە وایە، واتە خێری یەك نوێژی بەقەد خێری عومرەیەکە.

## نوێژی کام لە مزگەوتەکانە گەورەترین خێری هەیە

٢٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَيِّ الْمَسَاجِدِ أَفْضَلُ

٣٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ رَبَاحٍ، وَعُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي عَبْدِ اللهِ الأَغَرِّ، عَنْ أَبِي عَبْدِ اللهِ الأَغَرِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ. وَلَمْ يَذْكُرْ قُتَيْبَةُ فِي حَدِيثِهِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، إِنَّمَا ذَكَرَ عَنْ زَيْدِ بْنِ رَبَاحٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ اللهِ الأَغَرِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو عَبْدِ اللهِ الأَغَرُّ اسْمُهُ سَلْمَانُ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَمَيْمُونَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَجُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَأَبِي ذَرٍّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نوێژکردن لەم مزگەوتەی مندا خێری هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تری هەیە، جگە لە مزگەوتی حەرام.

٣٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ قَزَعَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِي هَذَا، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویــەتی: (بنــەو بارگــە مەپێچنەوە و سەفەر نەکەن بۆ ئــەم ســێ مزگەوتــە نــەبێ: مزگــەوتی حــەرام و ئــەم مزگەتەی من و مزگەوتی ئەقصا.

## دەربارەی ڕۆشتن بۆ مزگەوت بەپێ.

## ٢٤٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَشْيِ إِلَى الْمَسْجِدِ

٣٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلاَ تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وَلَكِنِ ائْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَمْشُونَ، وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ. اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الْمَشْيِ إِلَى الْمَسْجِدِ: فَمِنْهُمْ مَنْ رَأَى الإِسْرَاعَ إِذَا خَافَ فَوْتَ التَّكْبِيرَةِ الأُولَى، حَتَّى ذُكِرَ عَنْ بَعْضِهِمْ أَنَّهُ كَانَ يُهَرْوِلُ إِلَى الصَّلاَةِ. وَمِنْهُمْ مَنْ كَرِهَ الإِسْرَاعَ، وَاخْتَارَ أَنْ يَمْشِيَ عَلَى تُؤَدَةٍ وَوَقَارٍ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَقَالاَ: العَمَلُ عَلَى حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ. وقَالَ إِسْحَاقُ: إِنْ خَافَ فَوْتَ التَّكْبِيرَةِ الأُولَى فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُسْرِعَ فِي الْمَشْيِ.

واتە: لە ئــەبو هــورەیرەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکاتێك قامەت کرا بۆ نوێژ بە هەڵەداوان مەیەن بۆ نوێژ و پەلە مەکەن، بــەڵکو هــێمن و لەســەرخۆ بــن و پەلــە نەکەن، فریای هەرچی کەوتن لەگەڵ پێشنوێژدا بەکۆمــەڵ ئــەنجامی بــدەن، ئەوەشــی

كە لە دەستان چوو لەدوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ هەستنەوە تەواوی بكەن).

٣٢٨ - حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيّ الخَلاَّلُ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَال: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحَدِيثِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، بِمَعْنَاهُ. هَكَذَا قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ يَزِيدَ بْنِ زُرَيْعٍ.

٣٢٩ - حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

## دەربارەی گەورەیی خێری دانیشتن لە مزگەوت و چاوەڕوانی نوێژ

## ٢٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقُعُودِ فِي الْمَسْجِدِ وَانْتِظَارِ الصَّلاَةِ مِنَ الفَضْلِ

٣٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَال: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا دَامَ يَنْتَظِرُهَا، وَلاَ تَزَالُ الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي الْمَسْجِدِ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يُحْدِثْ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ: وَمَا الحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَال: فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بەردەوام كەسێ لەئێوە لەنوێژدایە مادەم چاوەڕوانی نوێژ بكات، وە بەردەوام مەلائیكە داوای لێخۆشبوون

بۆ کەسێ لە ئێوە دەکەن مادەم لە مزگەوت لەشوێنی نوێژەکەی بمێنێتەوەو دەسنوێژەکەی بمێنێ و پووچەڵ نەبێتەوە، دەفەرموون: خودایە لێی خۆشبە، خودایە رەحمەت بڕێژە بەسەریدا). پیاوێکی خەڵکی (حَضْرَمَوْتَ) فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە مەبەست لە (الحَدَث) چییە؟ فەرمووی: مەبەست لە تڕ و تسە.

## دەربارەی نوێژکردن لەسەر (خُمْرَةِ) بەرماڵ

٢٤٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الخُمْرَةِ

٣٣١ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي عَلَى الخُمْرَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَعَائِشَةَ، وَمَيْمُونَةَ، وَأُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الأَسَدِ وَلَمْ تَسْمَعْ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَبِهِ يَقُولُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: قَدْ ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلاَةُ عَلَى الخُمْرَةِ. وَالخُمْرَةُ: هُوَ حَصِيرٌ قَصِيرٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر حەسیر(خُمْرَة) بەرماڵ نوێژی دەکرد.

## دەربارەی نوێژكردن لەسەر حەسیر.

٢٤٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الحَصِيرِ

٣٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى عَلَى حَصِيرٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَالمغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ. وَحَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ. إِلاَّ أَنَّ قَوْمًا مِنْ أَهْلِ العِلْمِ اخْتَارُوا الصَّلاَةَ عَلَى الأَرْضِ اسْتِحْبَابًا. وَأَبُو سُفْيَانَ اسْمُهُ طَلْحَةُ بْنُ نَافِعٍ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر حەسیر نوێژی كردووە.

زۆربەی زانایان پەیڕەوی ئەم فەرموودە دەكەن. ئەوەندە نەبێ كە هەندێ لە زانایان نوێژكردنیان لەسەر زەوی بەلاوە پەسەند و باشترە.

## دەربارەی نوێژكردن لەناو باخ و باخاتدا.

٢٤٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ فِي الحِيطَانِ

٣٣٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ أَبِي جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَسْتَحِبُّ الصَّلاَةَ فِي الحِيطَانِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي البَسَاتِينَ. حَدِيثُ مُعَاذٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الحَسَنِ بْنِ أَبِي جَعْفَرٍ. وَالحَسَنُ بْنُ أَبِي جَعْفَرٍ قَدْ ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ وَغَيْرُهُ.

وَأَبُو الزُّبَيْرِ اسْمُهُ مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمِ بْنِ تَدْرُسَ. وَأَبُو الطُّفَيْلِ اسْمُهُ عَامِرُ بْنُ وَاثِلَةَ.

واتـە: لـە (مُعَاذ)ی کـوڕی جەبەلـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێـژکردنی لـەناو بـاخ و باخاتـدا پـێ خـۆش بووە.

**دەربارەی دانانی بەربەست(سوترە).**

٢٥٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سُتْرَةِ الْمُصَلِّي

٣٣٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلَ مُؤَخَّرَةِ الرَّحْلِ فَلْيُصَلِّ، وَلاَ يُبَالِي مَنْ مَرَّ وَرَاءَ ذَلِكَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَسَبْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ طَلْحَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَقَالُوا: سُتْرَةُ الإِمَامِ سُتْرَةٌ لِمَنْ خَلْفَهُ.

واتـە: لـە موسـای کـوڕی (طَلْحَة)وە، لـە باوکیـەوە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: (ئەگـەر لـەکاتی نوێژکردنـدا لەبـەردەم جێگـە سەجدەکەتدا شتێکت دانا بە ئەندازەی قوتکەی دواوەی کۆپانـە وشـترێ بـەرز بـوو، ئیتر هەرچی بە بەردەم نوێژەکەتدا تێپەڕێ زیانی نیە).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان دەفەرموون: بەربەستی پێشـنوێژ بەربەستە بۆ ئەوانەی کە لەدوایەوە نوێژ دەکەن.

## دەربارەی باش نیە ڕۆشتن بەبەردەم نوێژخوێندا

## ٢٥١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي

٣٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الجُهَنِيَّ، أَرْسَلَ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ يَسْأَلُهُ مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي؟ فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ. قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي قَالَ: أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ أَرْبَعِينَ شَهْرًا، أَوْ أَرْبَعِينَ سَنَةً. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَحَدِيثُ أَبِي جُهَيْمٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: لأَنْ يَقِفَ أَحَدُكُمْ مِائَةَ عَامٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْ أَخِيهِ وَهُوَ يُصَلِّي. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: كَرِهُوا الْمُرُورَ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، وَلَمْ يَرَوْا أَنَّ ذَلِكَ يَقْطَعُ صَلاَةَ الرَّجُلِ. وَاسْمُ أَبِي النَّضْرِ، سَالِمٌ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ الْمَدِينِيِّ.

واتە: لە بوسری کوڕی سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ناردویەتی بۆ لای ئەبو جوهەیم کە لێی بپرسێ: لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی ئەو کەسەی دەدات بە بەردەم نوێژخوێندا ئایا چی بیستووە؟ ئەبو جوهەیم ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەو کەسەی بە بەردەم نوێژخوێندا تێپەڕ دەبێت ئەگەر بزانێ بەوە چەند گوناهو تاوانی تووش دەبێ، ئەوا چل بە پێوە ڕابوەستایە زۆر باشتر بوو بۆی لەوەی کە بە بەردەمیدا بڕوات). (أَبُو النَّضْر) فەرمووی: نازانم فەرمووی: چل ڕۆژ، یان چل مانگ، یا چل ساڵ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی هیچ شتێ نوێژ نابڕێت.

## ٢٥٢ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ

٣٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ الفَضْلِ عَلَى أَتَانٍ، فَجِئْنَا وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ بِمِنًى، قَالَ: فَنَزَلْنَا عَنْهَا فَوَصَلْنَا الصَّفَّ، فَمَرَّتْ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ، فَلَمْ تَقْطَعْ صَلاَتَهُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَالفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ. وَحَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ، قَالُوا: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ، وَالشَّافِعِيُّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەپشکۆی (فَضْل)دا بووم بەسواری گوێدرێژێکەوە هاتین بۆ مونا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرنوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد، ئیبنو عەباس فەرمووی: لەسواری گوێدرێژەکە دابەزین، گەیشتینە ڕیزەکان گوێدرێژەکە بە بەردەمیاندا تێپەڕی و نوێژەکەی نەبڕین.

## جگە لە سەگ و گوێدرێژ و ئافرەت هیچ شتێ نوێژ نابڕێت

## ٢٥٣ - بَابُ مَا جَاءَ: أَنَّهُ لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ إِلاَّ الكَلْبُ وَالحِمَارُ وَالمَرْأَةُ

٣٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ،

وَمَنْصُورُ بْنُ زَاذَانَ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا صَلَّى الرَّجُلُ وَلَيْسَ بَيْنَ يَدَيْهِ كَآخِرَةِ الرَّحْلِ، أَوْ كَوَاسِطَةِ الرَّحْلِ: قَطَعَ صَلاَتَهُ الكَلْبُ الأَسْوَدُ وَالمرْأَةُ وَالحِمَارُ، فَقُلْتُ لأَبِي ذَرٍّ: مَا بَالُ الأَسْوَدِ مِنَ الأَحْمَرِ مِنَ الأَبْيَضِ؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي سَأَلْتَنِي كَمَا سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: الكَلْبُ الأَسْوَدُ شَيْطَانٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَالحَكَمِ الغِفَارِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي ذَرٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَيْهِ قَالُوا: يَقْطَعُ الصَّلاَةَ الحِمَارُ وَالمرْأَةُ وَالكَلْبُ الأَسْوَدُ. قَالَ أَحْمَدُ: الَّذِي لاَ أَشُكُّ فِيهِ أَنَّ الكَلْبَ الأَسْوَدَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ، وَفِي نَفْسِي مِنَ الحِمَارِ وَالمرْأَةِ شَيْءٌ. قَالَ إِسْحَاقُ: لاَ يَقْطَعُهَا شَيْءٌ إِلاَّ الكَلْبُ الأَسْوَدُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی صامیتەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئەبو (ذَرّ) بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ نوێژی کرد بەربەستێکی دانەنا بە ئەندازەی قوتکەی دواوەی کۆپانە وشترێ بەرز بێ، ئەگەر سەگی ڕەش و گوێدرێژ و ئافرەت بدەن بە بەردەمیدا نوێژەکەی دەبڕن). بە ئەبو (ذَرّ)م وت: سەگی ڕەش بۆ؟ فەرمووی: ئەی برازا خۆشەویستەکەم پرسیارێکت لێ کردم کاتی خۆی منیش هەمان پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەویش فەرمووی: (سەگی ڕەش شەیتانە).

هەندێ لە زانایان دەفەرموون: سەگی ڕەش و گوێدرێژ و ئافرەت نوێژ دەبڕن. پێشەوا ئەحمەد دەفەرمووێت: گومانی تێدا نییە سەگی ڕەش نوێژ دەبڕێت بەڵام بۆ گوێدرێژ و ئافرەت شتێ لەدەروونمدایە. پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێت: جگە لە سەگی ڕەش هیچ شتێ نوێژ نابڕێت.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لە پۆشاکێکدا

### ٢٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ

٣٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ هِشَامٍ هُوَ ابْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُ، رَأَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ مُشْتَمِلاً فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ، وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَأَنَسٍ، وَعَمْرِو بْنِ أَبِي أَسِيدٍ، وَعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَكَيْسَانَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ، وَأُمِّ هَانِئٍ، وَعَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، وَطَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ، وَصَامِتٍ الأَنْصَارِيِّ. حَدِيثُ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ، وَغَيْرِهِمْ قَالُوا: لاَ بَأْسَ بِالصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ. وَقَدْ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: يُصَلِّي الرَّجُلُ فِي ثَوْبَيْنِ.

**واتە: لە عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەماڵی ئومو سەلەمە پێغەمبەری خوای (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە بە پۆشاکێ خۆی پێچابووەوەو نوێژی دەکرد.**

## دەربارەی سەرەتای ڕووکردنە قیبلە

### ٢٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي ابْتِدَاءِ القِبْلَةِ

٣٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ صَلَّى نَحْوَ

بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ، أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الكَعْبَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الحَرَامِ)، فَوَجَّهَ نَحْوَ الكَعْبَةِ، وَكَانَ يُحِبُّ ذَلِكَ، فَصَلَّى رَجُلٌ مَعَهُ العَصْرَ، ثُمَّ مَرَّ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُمْ رُكُوعٌ فِي صَلاَةِ العَصْرِ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَقَالَ: هُوَ يَشْهَدُ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَنَّهُ قَدْ وَجَّهَ إِلَى الكَعْبَةِ، قَالَ: فَانْحَرَفُوا وَهُمْ رُكُوعٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعُمَارَةَ بْنِ أَوْسٍ، وَعَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ البَرَاءِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گەیشتە شاری مەدینە شەش تا حەوت مانگ بەرەو (بيت المقدس) نوێژی دەکرد، بەڵام پێی خۆش بوو ڕوویکاتە کەعبە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الحَرَامِ). سورة البقرة: ١٤٤.

واتە: بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕوخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین، دەی سوێند بەخوا ڕووت دەکەینە ڕووگەیەك کە پەسەندت بێ، ئیتر ڕووت وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە - ئێوەش ئەی موسوڵمانان لەهەر لایەك بوون (لەنوێژدا) ڕووتان بکەنە ئەویەوە — ئیتر ڕووی وەرچەرخاند بەرەو لای کەعبە، ئەوەی پێی خۆش بوو، پیاوێ لە خزمەتیدا نوێژی عەسری کرد، لەپاشدا بەلای کۆمەڵێ ئەنصاردا تێپەڕی نوێژی عەسریان دەکرد لەرکوعدا بوون بەرەو (بيت المقدس)، پیاوەکە شایەتی دا کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرەو کەعبە نوێژی عەسری کردووە، فەرمووی: ڕووتان وەرچەرخێنن بەرەو کەعبە لەکاتێکدا کە لەرکوعدا بوون.

٣٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانُوا رُكُوعًا فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ. وَحَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە نوێژی بەیانیدا لەركوعدا بوون.

## دەربارەی نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا قیبلەیە

٢٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ قِبْلَةٌ

٣٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي مَعْشَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ قِبْلَةٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا قیبلەیە).

٣٤٣ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي مَعْشَرٍ، مِثْلَهُ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ قَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي أَبِي مَعْشَرٍ مِنْ قِبَلِ حفْظِهِ، وَاسْمُهُ نَجِيحٌ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ، قَالَ مُحَمَّدٌ: لاَ أَرْوِي عَنْهُ شَيْئًا، وَقَدْ رَوَى عَنْهُ النَّاسُ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَحَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ الْمَخْرَمِيِّ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مُحَمَّدٍ الأَخْنَسِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَقْوَى مِنْ حَدِيثِ أَبِي مَعْشَرٍ وَأَصَحُّ.

٣٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ بَكْرٍ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعَلَّى بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ الْمَخْرَمِيُّ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مُحَمَّدٍ الأَخْنَسِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ قِبْلَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَإِنَّمَا قِيلَ عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ الْمَخْرَمِيُّ لأَنَّهُ مِنْ وَلَدِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ قِبْلَةٌ، مِنْهُمْ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، وَعَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَابْنُ عَبَّاسٍ. وقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِذَا جَعَلْتَ الْمَغْرِبَ عَنْ يَمِينِكَ، وَالمشْرِقَ عَنْ يَسَارِكَ فَمَا بَيْنَهُمَا قِبْلَةٌ، إِذَا اسْتَقْبَلْتَ القِبْلَةَ. وقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ قِبْلَةٌ، هَذَا لأَهْلِ الْمَشْرِقِ. وَاخْتَارَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ التَّيَاسُرَ لأَهْلِ مَرْوٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا قیبلەیە).

## کەسێ نوێژ بکات لەکاتی هەوردا رووی لە قیبلە نەبێ

## ٢٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُصَلِّي لِغَيْرِ القِبْلَةِ فِي الغَيْمِ

٣٤٥ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَشْعَثُ بْنُ سَعِيدٍ السَّمَّانُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، فَلَمْ نَدْرِ أَيْنَ القِبْلَةُ، فَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا عَلَى حِيَالِهِ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا ذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَ: (فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ). هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَشْعَثَ السَّمَّانِ. وَأَشْعَثُ بْنُ سَعِيدٍ أَبُو الرَّبِيعِ السَّمَّانُ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ. وَقَدْ ذَهَبَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا. قَالُوا: إِذَا صَلَّى فِي الغَيْمِ لِغَيْرِ القِبْلَةِ ثُمَّ اسْتَبَانَ لَهُ

بَعْدَ مَا صَلَّى أَنَّهُ صَلَّى لِغَيْرِ القِبْلَةِ فَإِنَّ صَلاَتَهُ جَائِزَةٌ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە عامیری کوڕی رەبیعەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: شەوێکی تاریك و شەوەزەنگ لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووین، نەماندەزانی قیبلە لەکوێوەیە، هەرکەس رووی لەکوێوە بوو رووی دەکردە ئەو شوێنەو نوێژی خۆی دەکرد، کاتێ کە رۆژبوویەوە بەسەرهاتەکەمان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەم ئایەتە دابەزی: (فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ). سورة البقرة: ١١٥. واتە: روو بکەنە هەر لایەك (لەنوێژکردندا) ئەوە رووگەی خوایە.

## لەناو کەعبە و لەسەربانی کەعبە نوێژکردن باش نیە

٢٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ مَا يُصَلَّى إِلَيْهِ وَفِيهِ

٣٤٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا الْمُقْرِئُ، قَال: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ جَبِيرَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ الْحُصَيْنِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُصَلَّى فِي سَبْعَةِ مَوَاطِنَ: فِي الْمَزْبَلَةِ، وَالمجْزَرَةِ، وَالمقْبَرَةِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَفِي الحَمَّامِ، وَفِي مَعَاطِنِ الإِبِلِ، وَفَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِ اللَّهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رێگری کردووە لەنوێژکردن لەم حەوت شوێنەدا: سەرەنوێلك ئەو شوێنەی پیسی تێ فڕێ دەدرێت، شوێنی سەربڕینی ئاژەڵان، گۆڕستان، سەرەڕێگە، گەرماو، شوێنی مۆڵدانی وشتر لەدەوروبەری ئاو، سەربانی ماڵی خوا واتە کەعبە.

٣٤٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ جَبِيرَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَاهُ نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ إِسْنَادُهُ لَيْسَ بِذَاكَ القَوِيِّ، وَقَدْ تُكُلِّمَ فِي زَيْدِ بْنِ جَبِيرَةَ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وَقَدْ رَوَى اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ العُمَرِيِّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ. وَحَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَشْبَهُ وَأَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ العُمَرِيُّ ضَعَّفَهُ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ مِنْهُمْ: يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ.

## نوێژکردن لە پەچەی مەڕو ماڵات و شوێنی مۆڵدانی وشتردا

### ٢٥٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، وَأَعْطَانِ الإِبِلِ

٣٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَلُّوا فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، وَلاَ تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الإِبِلِ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لە پەچەی مەڕو ماڵاتدا نوێژ بکەن، بەڵام لە شوێنی مۆڵدانی وشتر لەدەوروبەری ئاو نوێژ مەکەن).**

٣٤٩ - حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِهِ، أَوْ بِنَحْوِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَالبَرَاءِ، وَسَبْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ الجُهَنِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ

مُغَفَّلٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَعَلَيْهِ العَمَلُ عِنْدَ أَصْحَابِنَا، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَحَدِيثُ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَرَوَاهُ إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، مَوْقُوفًا وَلَمْ يَرْفَعْهُ.وَاسْمُ أَبِي حَصِينٍ: عُثْمَانُ بْنُ عَاصِمٍ الأَسَدِيُّ.

٣٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ الضُّبَعِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ.هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو التَّيَّاحِ الضُّبَعِيُّ اسْمُهُ يَزِيدُ بْنُ حُمَيْدٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە پەچەی مەڕو ماڵاتدا نوێژی دەکرد.

## نوێژکردن بەسەر وڵاخەوە ڕووەو ئەو شوێنەی بۆی دەڕوات

٢٦٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الدَّابَّةِ حَيْثُ مَا تَوَجَّهَتْ بِهِ

٣٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَيَحْيَى بْنُ آدَمَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَاجَةٍ فَجِئْتُهُ وَهُوَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالسُّجُودُ أَخْفَضُ مِنَ الرُّكُوعِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَعَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ جَابِرٍ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ لاَ نَعْلَمُ بَيْنَهُمْ اخْتِلاَفًا: لاَ يَرَوْنَ بَأْسًا أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ عَلَى رَاحِلَتِهِ تَطَوُّعًا حَيْثُ مَا كَانَ وَجْهُهُ إِلَى القِبْلَةِ أَوْ غَيْرِهَا.

واتە: لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ناردمی بۆ کارێکی پێویست، کاتێ کە هاتمەوە بەسەر وڵاخەکەیەوە بەرەو خۆرهەڵات نوێژی سوننەتی دەکرد، بۆ سەجدە زیاتر سەری نەوی دەکرد لەرکوع.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە لای سەرجەم زانایان بەبێ جیاوازی رایان وایە: کەسێ بەسەر وڵاخەکەیەوە نوێژی سوننەت بکات دروستە ئیتر رووی لە قیبلە بێ یان نا.

## دەربارەی نوێژکردن بەرە و وڵاخی سواری.

٢٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ إِلَى الرَّاحِلَةِ

٣٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى إِلَى بَعِيرِهِ، أَوْ رَاحِلَتِهِ، وَكَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ مَا تَوَجَّهَتْ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ بِالصَّلاَةِ إِلَى البَعِيرِ بَأْسًا أَنْ يَسْتَتِرَ بِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرەر وشترەکەی یان بەرەو وڵاخەکەی نوێژی دەکرد، هەروەها بەسەر وڵاخەکەیەوە نوێژی سوننەتی دەکرد رووەو ئەو شوێنەی کە بۆی دەڕۆشت.

ئەمەش وتەی هەندێ لە زانایانە و رایان وایە: نوێژکردن دروستە بەرەر وشتر و وشترەکە بکرێتە سوترە.

## ئەگەر خواردن ئامادەکراو قامەت کرا بۆ نوێژ دەست بکەن بە خواردن

### ٢٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا حَضَرَ العَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَابْدَءُوا بِالعَشَاءِ

٣٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا حَضَرَ العَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَابْدَءُوا بِالعَشَاءِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَأُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَعَلَيْهِ العَمَلُ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَابْنُ عُمَرَ.وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ يَقُولاَنِ: يَبْدَأُ بِالعَشَاءِ وَإِنْ فَاتَتْهُ الصَّلاَةُ فِي الجَمَاعَةِ. سَمِعْتُ الجَارُودَ يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا يَقُولُ فِي هَذَا الحَدِيثِ: يَبْدَأُ بِالعَشَاءِ إِذَا كَانَ طَعَامًا يَخَافُ فَسَادَهُ.وَالَّذِي ذَهَبَ إِلَيْهِ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ، أَشْبَهُ بِالاِتِّبَاعِ.وَإِنَّمَا أَرَادُوا أَنْ لاَ يَقُومَ الرَّجُلُ إِلَى الصَّلاَةِ وَقَلْبُهُ مَشْغُولٌ بِسَبَبِ شَيْءٍ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: لاَ نَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ وَفِي أَنْفُسِنَا شَيْءٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر خواردن ئامادەکراو قامەت کرا بۆ نوێژ دەست بکەن بە خواردن).

لای هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وایە کار بەمە بکرێت لەوانە پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و ئیبنو عومەر. پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون، دەفەرموون: دەست بکات بە خواردن و خواردنەکەی بخوات ئەگەر نوێژەکەشی بە کۆمەڵ بفەوتێ. پێشەوا وەکیع دەفەرمووێ: ئەگەر خواردنێ بوو مەترسی ئەوەی لێ بکرێ خراپ ببێ ئەوە با

خواردنەکەی بخوات. ئەوەی کە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رایان لەسەریەتی لەپێشترە بۆ شوێنکەوتنی، مەبەستیان لەوەیە پیاو هەڵنەسێ بۆ نوێژ و دڵی سەرقاڵ بێ بەهۆی شتێکەوە. لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە هەڵناسین بۆ نوێژ لەکاتێکدا کە شتێ لەدڵماندا بێ.

٣٥٤ - (صحيح) وَرُوِي عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا وُضِعَ العَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَابْدَءُوا بِالعَشَاءِ. وَتَعَشَّى ابْنُ عُمَرَ وَهُوَ يَسْمَعُ قِرَاءَةَ الإِمَامِ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر خواردن دانراو قامەت کرا بۆ نوێژ دەست بکەن بە خواردن).

ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ خەریکی نان خواردنی خۆی بوو لەکاتێکدا کە گوێی لە قورئان خوێندنی پێشنوێژ بوو.

## دەربارەی کەسێ لە نوێژدا وەنەوس بدات

٢٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ عِنْدَ النُّعَاسِ

٣٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ الكِلاَبِيُّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ،

فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ يَنْعَسُ، فَلَعَلَّهُ يَذْهَبُ لِيَسْتَغْفِرَ فَيَسُبَّ نَفْسَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی دەکرد لەو کاتەدا خەوی دەهات وەنەوسیدا و خەو بردیەوە ئەوا با ڕاکشێ و بخەوێ هەتا خەوەکەی دەڕوات، لەوانەیە کەسێك لە ئێوە بەدەم خەوەوە باوێشك بدات و نوێژ بکات بیەوێت بپاڕێتەوە بۆ خۆی بەڵام لەجیاتی پاڕانەوە جنێو بەخۆی بدات).

## کەسێ سەربدات لە قەومێ و بەرنوێژیان بۆ نەکات

### ٢٦٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ زَارَ قَوْمًا فَلاَ يُصَلِّ بِهِمْ

٣٥٦ - (صحيح دون قصة مالك) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ أَبَانَ بْنِ يَزِيدَ العَطَّارِ، عَنْ بُدَيْلِ بْنِ مَيْسَرَةَ العُقَيْلِيِّ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، رَجُلٍ مِنْهُمْ قَالَ: كَانَ مَالِكُ بْنُ الحُوَيْرِثِ يَأْتِينَا فِي مُصَلاَّنَا يَتَحَدَّثُ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ يَوْمًا، فَقُلْنَا لَهُ: تَقَدَّمْ، فَقَالَ: لِيَتَقَدَّمْ بَعْضُكُمْ حَتَّى أُحَدِّثَكُمْ لِمَ لاَ أَتَقَدَّمُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ زَارَ قَوْمًا فَلاَ يَؤُمَّهُمْ، وَلْيَؤُمَّهُمْ رَجُلٌ مِنْهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ قَالُوا: صَاحِبُ المَنْزِلِ أَحَقُّ بِالإِمَامَةِ مِنَ الزَّائِرِ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا أَذِنَ لَهُ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُصَلِّيَ بِهِ. وَقَالَ إِسْحَاقُ بِحَدِيثِ مَالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ، وَشَدَّدَ فِي أَنْ لاَ يُصَلِّيَ أَحَدٌ بِصَاحِبِ المَنْزِلِ، وَإِنْ أَذِنَ لَهُ صَاحِبُ المَنْزِلِ. قَالَ: وَكَذَلِكَ فِي المَسْجِدِ، لاَ يُصَلِّي بِهِمْ فِي المَسْجِدِ إِذَا زَارَهُمْ، يَقُولُ: يُصَلِّي بِهِمْ رَجُلٌ مِنْهُمْ.

واتە: لە ئیبنـو (عَطِيَّة)وە کـە یـەکێ بـووە لـە هـۆزی عـەقیل دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: مالیکی کوڕی (حُوَيْرِث) رەزای خـوای لـێ بـێ سـەردانی نوێژگاکـەی دەکردین و قسـەی بۆ دەکردین رۆژێ کاتی نوێژ هاتەپێشـەوە پێمـان وت: پێشـکەوە بەرنوێژمان بۆ بکە. ئەویش پێی وتین: با پیاوێ لـەخۆتان بەرنوێـژیتان بـۆ بکـات — لەکاتێکدا کە ئەو لەوان شـایەنتر بـوو چـونکە یـەکێ بـوو لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پیاوێکی زاناش بوو - ، پێتان دەڵێم کە بۆچـی بەرنوێـژیتان بۆ ناکەم؟ چونکە لە پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بیسـتووە دەفـەرموو: (ئەوەی سەردانی قەومێك بکات نابێت بەرنوێژییان بۆ بکات، بـەڵکو دەبـێ پیـاوێ لەخۆیان بەرنوێژییان بۆ بکات).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش دەفەرموون: خاوەن ماڵ شایەنترە بە پێشـنوێژی لـە میوان. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر خاوەن ماڵ خۆی مۆڵەتی کەسـێ بـدات دروستە پێشنوێژی بکات. دەفەرموێت: لە مزگەوتیش هەروەها کەسێ لە خۆیـان پێشنوێژیان بۆ بکات.

## دەربارەی باش نیە پێشنوێژ بۆ خۆی بپاڕێتەوەو بەس

٢٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يَخُصَّ الإِمَامُ نَفْسَهُ بِالدُّعَاءِ

٣٥٧ - (ضعيف الا جملة: (وَلاَ يَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ وَهُوَ حَقِنٌ)؛ فصحيحة) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ قَالَ: حَدَّثَنِي حَبِيبُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِي حَيٍّ الْمُؤَذِّنِ الحِمْصِيِّ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: لاَ يَحِلُّ لِامْرِئٍ أَنْ يَنْظُرَ فِي جَوْفِ بَيْتِ امْرِئٍ حَتَّى يَسْتَأْذِنَ، فَإِنْ نَظَرَ فَقَدْ دَخَلَ، وَلاَ يَؤُمَّ قَوْمًا فَيَخُصَّ نَفْسَهُ بِدَعْوَةٍ دُونَهُمْ، فَإِنْ فَعَلَ فَقَدْ خَانَهُمْ، وَلاَ يَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ وَهُوَ حَقِنٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ. حَدِيثُ ثَوْبَانَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنِ السَّفْرِ بْنِ نُسَيْرٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ يَزِيدَ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَكَأَنَّ حَدِيثَ يَزِيدَ بْنِ شُرَيْحٍ عَنْ أَبِي حَيٍّ الْمُؤَذِّنِ، عَنْ ثَوْبَانَ فِي هَذَا أَجْوَدُ إِسْنَادًا وَأَشْهَرُ.

واتە: لە (ثَوْبَان)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (سێ شت ڕەوا نیە بکرێت لەلایەن هیچ کەسێکەوە: نابێت کەس سەیری ناوماڵی کەسێکی تر بکات پێش ئەوەی داوای مۆڵەت بکات و ڕێی پێ بدەن، ئەگەر کردی ئەوە بەبێ پرس چووەتە ماڵەکەیەوە، نابێت پیاوێك بەرنوێژی بۆ کۆمەڵێ بکات و تەنها بۆ خۆی بپاڕێتەوە، ئەگەر کردی ئەوە خیانەتی لێ کردوون، هەروەها کەسێك تەنگاو بێ و دەستی ئاوی هەبێت نابێ نوێژ بکات هەتا خۆی خاڵی نەکاتەوە).

## پێشنوێژی کەسێ بۆ کۆمەڵێ ئەوان ڕقیان لێی بێ

٢٦٦ – بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ أَمَّ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ

٣٥٨ – (ضعيف الإسناد جدا) حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ وَاصِلٍ الكُوفِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ القَاسِمِ الأَسَدِيُّ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ دَلْهَمٍ، عَنِ الحَسَنِ، قَال: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، قَال: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثَةً: رَجُلٌ أَمَّ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، وَامْرَأَةٌ بَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَلَيْهَا سَاخِطٌ، وَرَجُلٌ سَمِعَ حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ ثُمَّ لَمْ يُجِبْ. وَفِي

البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَطَلْحَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي أُمَامَةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ لاَ يَصِحُّ، لأَنَّهُ قَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ الحَسَنِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلٌ. وَمُحَمَّدُ بْنُ القَاسِمِ تَكَلَّمَ فِيهِ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ وَضَعَّفَهُ، وَلَيْسَ بِالحَافِظِ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يَؤُمَّ الرَّجُلُ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ فَإِذَا كَانَ الإِمَامُ غَيْرَ ظَالِمٍ فَإِنَّمَا الإِثْمُ عَلَى مَنْ كَرِهَهُ. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ فِي هَذَا: إِذَا كَرِهَ وَاحِدٌ أَوْ اثْنَانِ أَوْ ثَلاَثَةٌ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُصَلِّيَ بِهِمْ حَتَّى يَكْرَهَهُ أَكْثَرُ القَوْمِ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نـەفرەتی کـردووە لـەم سـێ کەسە: پیاوێ بەرنوێژی بکات بۆ کۆمەڵێ ئەوان رقیان لێی بێت، ژنـێ شـەو و ڕۆژ بکاتەوەو پیاوەکەی لێی زویر بێت، پیاوێ گـوێی لـە (حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ)بـانگ بـێ لەپاشدا نەچێت بەدەمیەوە واتـە نـەڕوات بـۆ نوێژی جەماعـەت بـەبێ بەهانـەی شەرعی).

هەندێ لە زانایان بەلایانەوە باش نیە پیاوێ بەرنوێژی بکات بۆ کۆمـەڵێ ئـەوان رقیان لێی بێت، ئەگەر پێشنوێژ ستەمکار نەبوو ئەوە گونـاهو تـاوانی لەسـەر ئـەو کەسەیە کە رقی لێیەتی. پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق دەفـەرموون: ئەگـەر یـەکێ یان دوان یا سیان رقیان لێی بوو ئەوە دروستە پێشنوێژیان بۆ بکات.

٣٥٩ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ زِيَادِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ بْنِ الْمُصْطَلِقِ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا اثْنَانِ: امْرَأَةٌ عَصَتْ زَوْجَهَا، وَإِمَامُ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ. قَالَ جَرِيرٌ: قَالَ مَنْصُورٌ: فَسَأَلْنَا عَنْ أَمْرِ الإِمَامِ؟ فَقِيلَ لَنَا: إِنَّمَا عَنَى بِهَذَا الأَئِمَّةَ الظَّلَمَةَ، فَأَمَّا مَنْ أَقَامَ السُّنَّةَ فَإِنَّمَا الإِثْمُ عَلَى مَنْ كَرِهَهُ.

واتـە: لـە عـەمری کـوڕی (حَارِث)ی کـوڕی (مُصْطَلِق)ەوە دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: فەرموویانە: توندترین سزا لـەڕۆژی قیامەتـدا بـۆ ئـەم دوانەیـە: ژنـیّ یاخی بیّ لە مێردەکەی و بەگوێی نەکات، پیاویّ بەرنوێژی بکات بۆ کۆمەڵیّ ئەوان رقیان لێی بێت. هەناد فەرمووی: جەریر فەرمووی: مەنصـور فـەرمووی: دەربـارەی کاروباری پێشنوێژ پرسیارمان کرد؟ پێمان وترا: مەبەست لەمـە پێشـنوێژە تاوانبـار و ستەمکارەکانە، بەڵام ئەو کەسەی لەسەر سوننەت بـڕوات و بـیّ تـاوان بـیّ ئـەوە گوناهو تاوانی لەسەر ئەو کەسەیە کە رقی لێیەتی. — قسـەکەر پێغەمبـەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەك لە (تحفة الأحوذي)دا هاتووە-.

٣٦٠ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَال: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحَسَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ وَاقِدٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو غَالِبٍ، قَال: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثَةٌ لاَ تُجَاوِزُ صَلاَتُهُمْ آذَانَهُمْ: العَبْدُ الآبِقُ حَتَّى يَرْجِعَ، وَامْرَأَةٌ بَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَلَيْهَا سَاخِطٌ، وَإِمَامُ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَأَبُو غَالِبٍ اسْمُهُ حَزَوَّرٌ.

واتە: لـە ئـەبو ئومامـەوە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویـەتی: (سـیّ کـەس نوێـژەکانیان لـە ئاست گوێیان بەرز نابێتەوە واتە بەتەواوی لێیان وەرناگیرێت: بەندەیەکی هـەڵهاتوو هەتا دەگەڕێتەوە ژێر رکێفی گەورەکەی، ژنیّ شەو و رۆژ بکاتـەوەو پیاوەکـەی لێـی زویر بێت، کەسیّ پێشنوێژی بکات بۆ قەومیّ ئەوان رقیان لێی بێت).

## ئەگەر پێشنوێژ بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش بە هەمان شێوە

## ٢٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا صَلَّى الإِمَامُ قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا

٣٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَال: خَرَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ فَرَسٍ، فَجُحِشَ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا، فَصَلَّيْنَا مَعَهُ قُعُودًا، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَال: إِنَّمَا الإِمَامُ، أَوْ إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ، لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَال: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعُونَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَمُعَاوِيَةَ. وَحَدِيثُ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَّ عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ مِنْهُمْ: جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، وَأُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ، وَغَيْرُهُمْ. وَبِهَذَا الحَدِيثِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا صَلَّى الإِمَامُ جَالِسًا لَمْ يُصَلِّ مَنْ خَلْفَهُ إِلاَّ قِيَامًا، فَإِنْ صَلَّوْا قُعُودًا لَمْ تُجْزِهِمْ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سواری ئەسپێ بوو لەسەری کەوتەخوارەوەو، لەبەر ئازار توانای نەبوو نوێژەکانی بەپێوە بکات، بەدانیشتنەوە پێشنوێژی یەکێ لە نوێژە فەرزەکانی بۆ کردین، ئێمەش بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژمان کرد، لەپاشدا کە لەنوێژ بوویەوە فەرمووی: (بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بکەون، جا ئەگەر (الله أكبر)ی کرد ئێوەش (الله أكبر) بکەن، کاتێ

کە چووە رکوعەوە ئێوەش رکوع بەرن، کاتێ کە سەری بەرزکردەوە ئێوەش بەدوایدا سەرتان بەرزکەنەوە، ئەگەر فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). واتە: خوای گەورە بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە کە سوپاسی دەکەن. ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). واتە: پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ. هەروەها ئەگەر پێشنوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بکەن).

## باسێکی تر لەوبارەوە

٢٦٨ - بَابٌ مِنْهُ

٣٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ نُعَيْمِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ قَاعِدًا. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا صَلَّى الإِمَامُ جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا. وَرُوِيَ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ فِي مَرَضِهِ وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَصَلَّى إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ، وَالنَّاسُ يَأْتَمُّونَ بِأَبِي بَكْرٍ، وَأَبُو بَكْرٍ يَأْتَمُّ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرُوِيَ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ قَاعِدًا. وَرُوِي عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ وَهُوَ قَاعِدٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەکاتی نەخۆشیەکەیدا کە بەهۆیەوە وەفاتی کرد بە دانیشتنەوە لەدوای پێشەوا ئەبو بەکرەوە رەزای خوای لێ بێ نوێژی کرد.

لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی:

(ئەگەر پێشنوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەروەها بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بکەن).

هەر لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەکاتی نەخۆشیەکەیدا کە بەهۆیەوە وەفاتی کرد دەرچوو بۆ نوێژ لەوکاتەدا پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەتەنیشت پێشەوا ئەبو بەکرەوە نوێژی کرد، خەڵکەکە ئیقتیدایان کرد بە پێشەوا ئەبو بەکرەوە و کردبوویان بە پێشنوێژی خۆیان، پێشەوا ئەبو بەکریش ئیقتیدای کرد بە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە دانیشتنەوە لەدوای پێشەوا ئەبو بەکرەوە نوێژی کرد.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە دانیشتنەوە لەدوای پێشەوا ئەبو بەکرەوە نوێژی کرد.

٣٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ طَلْحَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَرَضِهِ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ قَاعِدًا فِي ثَوْبٍ مُتَوَشِّحًا بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَكَذَا رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ. وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ ثَابِتٍ. وَمَنْ ذَكَرَ فِيهِ عَنْ ثَابِتٍ فَهُوَ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەکاتی نەخۆشیەکەیدا کە بەهۆیەوە وەفاتی کرد پۆشاکێکی پێچابوو بەخۆیەوەو بە دانیشتنەوە لەدوای پێشەوا ئەبو بەکرەوە نوێژی کرد.

## ئەگەر پێشنوێژ لەیادی چوو لەدوای دوو رکات هەستایەوە

٢٦٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِمَامِ يَنْهَضُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ نَاسِيًا

٣٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: صَلَّى بِنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فَنَهَضَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، فَسَبَّحَ بِهِ الْقَوْمُ وَسَبَّحَ بِهِمْ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ سَلَّمَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ وَهُوَ جَالِسٌ، ثُمَّ حَدَّثَهُمْ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ بِهِمْ مِثْلَ الَّذِي فَعَلَ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَسَعْدٍ، وَعَبْدِ اللهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ. حَدِيثُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي ابْنِ أَبِي لَيْلَى مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. قَالَ أَحْمَدُ: لاَ يُحْتَجُّ بِحَدِيثِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى. وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: ابْنُ أَبِي لَيْلَى هُوَ صَدُوقٌ، وَلاَ أَرْوِي عَنْهُ لأَنَّهُ لاَ يَدْرِي صَحِيحَ حَدِيثِهِ مِنْ سَقِيمِهِ، وَكُلُّ مَنْ كَانَ مِثْلَ هَذَا فَلاَ أَرْوِي عَنْهُ شَيْئًا. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ. وَرَوَى سُفْيَانُ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُبَيْلٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ. وَجَابِرٌ الْجُعْفِيُّ قَدْ ضَعَّفَهُ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ؛ تَرَكَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ وَغَيْرُهُمَا. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: عَلَى أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا قَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مَضَى فِي صَلاَتِهِ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ مِنْهُمْ مَنْ رَأَى قَبْلَ التَّسْلِيمِ. وَمِنْهُمْ مَنْ رَأَى بَعْدَ التَّسْلِيمِ، وَمَنْ رَأَى قَبْلَ التَّسْلِيمِ فَحَدِيثُهُ أَصَحُّ لِمَا رَوَى الزُّهْرِيُّ، وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ.

واتـە: لـە پێشـەوا شـەعبیەوە دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: مـوغیرەی کـوڕی شوعبە ڕەزای خـوای لـێ بـێ بەرنوێـژی بـۆ کـردین لـە ڕکـاتی دووەمـدا تـەحیاتی نەخوێند و هەستایەوە، وتمـان: (سُبْحَانَ اللّـه) واتـە: پـاك و بێگـەردی بـۆ خـوا، - ئاماژەمان بۆ کرد کە دانیشێتەوە - ئەویش فـەرمووی: (سُبْحَانَ اللّـه) و بـەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی - ئاماژەی بۆ کردین کە هەستین - کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد سەلامی دایەوەو دوو سەجدەی سەهوی برد، لەپاشـدا فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەی منی کرد بۆمان.

٣٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَال: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنِ الْمَسْعُودِيِّ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، قَال: صَلَّى بِنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فَلَمَّا صَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَامَ وَلَمْ يَجْلِسْ، فَسَبَّحَ بِهِ مَنْ خَلْفَهُ، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنْ قُومُوا، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ سَلَّمَ وَسَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ وَسَلَّمَ، وَقَال: هَكَذَا صَنَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە زیادی کوڕی عیەلاقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: مـوغیرەی کـوڕی شوعبە ڕەزای خـوای لـێ بـێ بەرنوێـژی بـۆ کـردین لـە ڕکـاتی دووەمـدا تـەحیاتی نەخوێند و هەستایەوە، ئەوانەی لەدوایەوە بوون ئاماژەیان بۆ کـرد کـە دانیشـێتەوە وتیان: (سُبْحَانَ اللَّه) ئەویش بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی و ئاماژەی بۆ کـردن کـە هەستن، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد سـەلامی دایـەوەو دوو سـەجدەی سـەهوی بـردو فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەی کرد کە من کردم.

## دەربارەی ماوەی دانیشتنی نێوان دوو ڕکاتی یەکەم

٢٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِقْدَارِ القُعُودِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ.

٣٦٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ هُوَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعْدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ كَأَنَّهُ عَلَى الرَّضْفِ، قَالَ شُعْبَةُ: ثُمَّ حَرَّكَ سَعْدٌ شَفَتَيْهِ بِشَيْءٍ، فَأَقُولُ: حَتَّى يَقُومَ؟، فَيَقُولُ: حَتَّى يَقُومَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، إِلاَّ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: يَخْتَارُونَ أَنْ لاَ يُطِيلَ الرَّجُلُ القُعُودَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، وَلاَ يَزِيدَ عَلَى التَّشَهُّدِ شَيْئًا فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ ، وَقَالُوا: إِنْ زَادَ عَلَى التَّشَهُّدِ فَعَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ. هَكَذَا رُوِيَ عَنِ الشَّعْبِيِّ وَغَيْرِهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ تەحیاتی یەکەم دادەنیشت دەتوت لەسەر بەردی سورۆکراوە ئەوەندە بە پەلە بوو، ڕاوی فەرمودەکە شوعبە فەرمووی: سەعد لێوەکانی جولاند واتە شتێکی وت بەنهێنی، وتمان: هەتا هەڵئەسایەوە؟ فەرمووی: هەتا هەڵئەسایەوە.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان ئەمەیان بەلاوە پەسەندە پیاو درێژە نەدات بەدانیشتنی نێوان دوو ڕکاتی یەکەم لە تەحیات خوێندن زیاتر. دەڵێن: ئەگەر لە تەحیات خوێندن زیاتر بوو ئەوە دەبێ دوو سەجدەی سەهوو بەرێت.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاماژەکردن لەنوێژدا

### ٢٧١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِشَارَةِ فِي الصَّلاَةِ

٣٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَشَجِّ، عَنْ نَابِلٍ صَاحِبِ العَبَاءِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ صُهَيْبٍ، قَالَ: مَرَرْتُ بِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ إِلَيَّ إِشَارَةً، وَقَالَ: لاَ أَعْلَمُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: إِشَارَةً بِإِصْبَعِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ بِلاَلٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَعَائِشَةَ.

واتە: لە نابیلەوە، لە ئیبنو عومەرەوە، لە (صُهَيْب)ەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دام بەلای پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی دەکرد، سەلامم لێ کرد، بە ئیشارەت وەڵامی دامەوە. نابل فەرمووی: وابزانم ئیبنو عومەر فەرمووی: بە پەنجە ئیشارەتی کرد.

٣٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قُلْتُ لِبِلاَلٍ: كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرُدُّ عَلَيْهِمْ حِينَ كَانُوا يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ؟ قَالَ: كَانَ يُشِيرُ بِيَدِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَحَدِيثُ صُهَيْبٍ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ اللَّيْثِ عَنْ بُكَيْرٍ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قُلْتُ لِبِلاَلٍ: كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرُدُّ عَلَيْهِمْ حَيْثُ كَانُوا يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ فِي مَسْجِدِ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، قَالَ: كَانَ يَرُدُّ إِشَارَةً. وَكِلاَ الحَدِيثَيْنِ عِنْدِي صَحِيحٌ، لأَنَّ قِصَّةَ حَدِيثِ صُهَيْبٍ غَيْرُ قِصَّةِ حَدِيثِ بِلاَلٍ. وَإِنْ كَانَ ابْنُ عُمَرَ رَوَى عَنْهُمَا فَاحْتَمَلَ أَنْ يَكُونَ سَمِعَ مِنْهُمَا جَمِيعًا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە

بیلالٍ وت: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ کە سەلامیان لێ دەکرد لەنوێژدا چۆن وەڵامی ئەدانەوە؟ فەرمووی: بەدەستی ئیشارەتی دەکرد.

## وتنی (سبحان الله) بۆ پیاوان و بە بەری دەست دان لە پشتی دەست بۆ ئافرەتان

٢٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ التَّسْبِيحَ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقَ لِلنِّسَاءِ

٣٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ عُمَرَ. قَالَ عَلِيٌّ: كُنْتُ إِذَا اسْتَأْذَنْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي سَبَّحَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (وتنی: (سبحان الله) بۆ پیاوانەو، بە بەری دەست دان لە پشتی دەست بۆ ئافرەتانە). - واتە ئەگەر شتێ رویدا لەناو نوێژدا ئەوا بۆ ئاگادارکردنەوە سوننەتە: پیاوان بڵێن: (سبحان الله)، وە ئافرەتانیش بە بەری دەستیان بدەن لە پشتی دەستیان - .

پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی دەکرد داوای مۆڵەتم لێ بکردایە دەیفەرموو: (سبحان الله).

دەربارەی باش نیە باوێشکدان لەنوێژدا.

٢٧٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّثَاؤُبِ فِي الصَّلَاةِ

٣٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ العَلَاءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: التَّثَاؤُبُ فِي الصَّلَاةِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، وَجَدِّ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ التَّثَاؤُبَ فِي الصَّلَاةِ. قَالَ إِبْرَاهِيمُ: إِنِّي لَأَرُدُّ التَّثَاؤُبَ بِالتَّنَحْنُحِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (باوێشکدان لەنوێژدا لە شەیتانەوەیە، ئەگەر کەسێ لەئێوە باوێشکی هات با هەتا دەتوانێ بەری بگرێ).

پاداشتی نوێژی بەدانیشتنەوە نیوەی پاداشتی نوێژی بەپێوەیە

٢٧٤ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ صَلَاةَ القَاعِدِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاةِ القَائِمِ

٣٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْمُعَلِّمُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ وَهُوَ قَاعِدٌ؟ فَقَالَ: مَنْ صَلَّى قَائِمًا فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّاهَا قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ القَائِمِ، وَمَنْ صَلَّاهَا نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ القَاعِدِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَنَسٍ، وَالسَّائِبِ. حَدِيثُ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە عیمرانــی كــوڕی حوصــەینەوە ڕەزای خــوای لــیَ بــیَ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: دەربارەی كەسێك كە بە دانیشتنەوە نوێژ ئەنجام بدات لە پێغەمبــەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی؟ فــەرمووی: (ئــەوەی بــە پێــوە نوێــژ بكــات ئــەوە چــاكترە و خێــر و پاداشــتی زیــاترە، هەركــەس بەدانیشــتنەوە نوێــژ ئــەنجام بــدات پاداشتەكەی نیوەی پاداشتی نوێژی كەسێكە كە به پێوە نوێژ بكـات، ئەوەشــی بــە ڕاكشانەوە نوێــژ ئــەنجام بــدات پاداشــتەكەی نیــوەی پاداشــتی نوێــژی كەســێكە كــە بەدانیشتنەوە نوێژ بكات).

٣٧٢ - (صحيح) وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ طَهْمَانَ بِهَذَا الإِسْنَادِ، إِلاَّ أَنَّهُ يَقُولُ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَلاَةِ الْمَرِيضِ؟ فَقَالَ: صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ طَهْمَانَ، عَنْ حُسَيْنٍ الْمُعَلِّمِ، بِهَذَا الحَدِيثِ. لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَوَى عَنْ حُسَيْنٍ الْمُعَلِّمِ نَحْوَ رِوَايَةِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ طَهْمَانَ. وَقَدْ رَوَى أَبُو أُسَامَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ حُسَيْنٍ الْمُعَلِّمِ نَحْوَ رِوَايَةِ عِيسَى بْنِ يُونُسَ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ فِي صَلاَةِ التَّطَوُّعِ.

واتــە: لــە عیمرانــی كــوڕی حوصــەینەوە ڕەزای خــوای لــیَ بــیَ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: دەربارەی نوێژی نەخۆش لە پێغەمبەری خــوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرســی؟ فــەرمووی: (بــە پێــوە نوێــژەكانت ئــەنجام بــدە، ئەگــەر توانــات نــەبوو بــە دانیشتنەوە ئەنجامیان بدە، دیسان ئەگەر هەر توانات نــەبوو لەســەر لا — ی ڕاســت - ئەنجامیان بدە). لای هەندیَ لە زانایان مانای فەرموودەكە بۆ نوێژی سوننەتە.

٣٧٢م- (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنِ الحَسَنِ، قَالَ: إِنْ شَاءَ الرَّجُلُ صَلَّى صَلاَةَ التَّطَوُّعِ قَائِمًا،

وَجَالِسًا، وَمُضْطَجِعًا، وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي صَلاَةِ الْمَرِيضِ إِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُصَلِّيَ جَالِسًا. فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِنَّهُ يُصَلِّي عَلَى جَنْبِهِ الأَيْمَنِ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُصَلِّي مُسْتَلْقِيًا عَلَى قَفَاهُ وَرِجْلاَهُ إِلَى القِبْلَةِ. وَقَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: فِي هَذَا الحَدِيثِ: مَنْ صَلَّى جَالِسًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ القَائِمِ قَال: هَذَا لِلصَّحِيحِ وَلِمَنْ لَيْسَ لَهُ عُذْرٌ، فَأَمَّا مَنْ كَانَ لَهُ عُذْرٌ مِنْ مَرَضٍ أَوْ غَيْرِهِ فَصَلَّى جَالِسًا فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ القَائِمِ. وَقَدْ رُوِيَ فِي بَعْضِ هَذَا الحَدِيثِ مِثْلُ قَوْلِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ.

واتە: لە حەسەنی بەصریەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاو بە ویستی خۆیەتی چۆن نوێژی سوننەت ئەنجام بدات ئیتر بە پێوەبێت یان بە دانیشتنەوە یا بە پالكەوتنەوە بێ هەر دروستە. زانایان رایان جیاوازە لەبارەی نوێژی نەخۆشەوە ئەگەر توانای نەبوو بەپێوە نوێژەكانی بكات. هەندێ لە زانایان دەفەرموون: لەسەر لای راست نوێژەكانی ئەنجام بدات. هەندێكی تریان دەفەرموون: لەسەر پشت راكشێ و قاچەكانی بەرەو قیبلە.

سوفیانی (ثوري) دەربارەی ئەم فەرموودە دەڵێ: ئەوەی بەدانیشتنەوە نوێژ ئەنجام بدات پاداشتەكەی نیوەی پاداشتی نوێژی كەسێكە بە پێوە نوێژ ئەنجام دەدات، دەفەرمووێت: ئەمە راست و دروستە بۆ كەسێ بەهانەی شەرعی نەبێ و لەش ساغ بێ

ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژێكی سوننەت بكات پاداشتەكەی نیوەی پاداشتی نوێژێكە بە پێوە بكرێت، بەڵام ئەگەر كەسێ بەهانەی شەرعی هەبێ وەك نەخۆشی و جگە لە نەخۆشی بەدانیشتنەوە نوێژ بكات پاداشتەكەی وەك پاداشتی نوێژی كەسێكە بە پێوە ئەنجامی بدات. هەندێ لە فەرموودەناسان رایان لەسەر وتەكەی سوفیانی (ثوري)ە.

**ئەنجامدانی نوێژی سوننەت بەدانیشتنەوە**

## ٢٧٥ - بَابٌ فِيمَنْ يَتَطَوَّعُ جَالِسًا

٣٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ السَّهْمِيِّ، عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي سُبْحَتِهِ قَاعِدًا، حَتَّى كَانَ قَبْلَ وَفَاتِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَامٍ، فَإِنَّهُ كَانَ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ قَاعِدًا، وَيَقْرَأُ بِالسُّورَةِ وَيُرَتِّلُهَا، حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. حَدِيثُ حَفْصَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ جَالِسًا، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ قَدْرُ ثَلاَثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ. وَرُوِيَ عَنْهُ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي قَاعِدًا، فَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَاعِدٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ. قَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: وَالعَمَلُ عَلَى كِلاَ الحَدِيثَيْنِ. كَأَنَّهُمَا رَأَيَا كِلاَ الحَدِيثَيْنِ صَحِيحًا مَعْمُولاً بِهِمَا.

واتە: لە حەفصەی هاوسەری پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەدیوە بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەت ئەنجام بدات هەتا ساڵێ پێش وەفاتی، بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەتی ئەنجام دەدا سورەتێکی بە تیلاوەتەوە دەخوێندەوە ماوەی خوێندنەکەی زیاتر بوو لەسورەتێکی تر کە لەو سورەتە درێژتر بوو کە بە تیلاوەتەوە نەخوێنرێت.

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە بە دانیشتنەوە

شەونوێژی دەکرد، ئەگەر سی تا چل ئایـەتی بمایـە هەڵەسـایەوە دەیخوێنـدن، ئینجـا رکوعی دەبرد، لەرکاتی دووەمیشدا بەهەمان شێوەی دەکرد.

هەروەها لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنـەوە، کـە بـە دانیشـتنەوە نوێژی دەکرد، ئەگەر بەپێوە قورئانی بخوێندایە بەپێوە رکـوعی دەبـرد، جـا دەچـووە سەجدەوە، خۆ ئەگەر بە دانیشتنەوە قورئانی بخوێندایە هەر بە دانیشتنەوە رکـوع و سەجدەی دەبرد.

٣٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَال: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي جَالِسًا فَيَقْرَأُ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ قَدْرُ مَا يَكُونُ ثَلاَثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ رَكَعَ وَسَجَدَ، ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کـاتێ کـە پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە دانیشـتنەوە نوێـژی دەکـرد هـەر بـە دانیشـتنەوە قورئـانی دەخوێند، ئەگەر سی تا چل ئایەتی بمایە هەڵەسایەوە دەیخوێنـدن، ئینجـاع هـەر بـە پێوە رکوعی دەبرد جا دەچووە سەجدەوە، لەپاشـدا لـەرکاتی دووەمیشـدا بەهـەمان شێوەی دەکرد.

٣٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَال: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَال: أَخْبَرَنَا خَالِدٌ وَهُوَ الْحَذَّاءُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَال: سَأَلْتُهَا عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ تَطَوُّعِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي لَيْلاً طَوِيلاً قَائِمًا، وَلَيْلاً طَوِيلاً قَاعِدًا، فَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ جَالِسٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ جَالِسٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: (عبد الله)ی کوڕی شەقیق ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەفـەرمووێت: دەربـارەی

ئەنجامدانی نوێـژی سـوننەتی پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لـە خـاتوو عائیشەم رەزای خوای لێ بێ پرسـی؟ ئـەویش لەوەڵامـدا فـەرمووی: هەنـدێ جـار شەوگارێکی درێژ بە پێوە شەونوێژی دەکرد، هەندێ جاریش شـەوگارێکی درێـژ بـە دانیشتنەوە شەونوێژی دەکرد، ئەگەر بە پێوە قورئـانی بخوێندایـە بـە پێـوە رکـوعی دەبرد جا دەچووە سەجدەوە، هەروەها ئەگەر بە دانیشتنەوە قورئانی بخوێندایە هـەر بە دانیشتنەوە رکوع و سەجدەی دەبرد.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت: (کە گوێم لـە دەنگی گریانی منداڵ دەبێ نوێژەکەم کورت دەکەمەوە).

٢٧٦ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:

(إِنِّي لأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فِي الصَّلاَةِ، فَأُخَفِّفُ)،

٣٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ الفَزَارِيُّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَاللهِ إِنِّي لأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ وَأَنَا فِي الصَّلاَةِ فَأُخَفِّفُ، مَخَافَةَ أَنْ تُفْتَتَنَ أُمُّهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (سوێند بـە (الله) لەناو نوێژدا کە گوێم لە دەنگی گریـانی منـداڵ دەبـێ نوێژەکـەم کـورت دەکەمـەوە لەترسی ئەوەی نەوەکا دایکەکەی دڵی سەرقاڵ بـبێ پێیـەوەو تووشـی بـەڵاو فیتنـە ببێ بەهۆیەوە).

## نوێژی ئافرەتی باڵغ بە سەرپۆشەوە نەبێ وەرناگیرێ

### ٢٧٧ - بَابٌ: مَا جَاءَ لاَ تُقْبَلُ صَلاَةُ الْحَائِضِ إِلاَّ بِخِمَارٍ

٣٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ الحَارِثِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُقْبَلُ صَلاَةُ الحَائِضِ إِلاَّ بِخِمَارٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا أَدْرَكَتْ فَصَلَّتْ وَشَيْءٌ مِنْ شَعْرِهَا مَكْشُوفٌ لاَ تَجُوزُ صَلاَتُهَا. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ قَال: لاَ تَجُوزُ صَلاَةُ الْمَرْأَةِ وَشَيْءٌ مِنْ جَسَدِهَا مَكْشُوفٌ، قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَقَدْ قِيلَ: إِنْ كَانَ ظَهْرُ قَدَمَيْهَا مَكْشُوفًا فَصَلاَتُهَا جَائِزَةٌ.

واتــە: لــە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نوێـژی ئـافرەتی بـاڵغ دروسـت نییە ئیللا بە سەرپۆشەوە نەبێت). واتە خوای گەورە لێی وەرناگرێت

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لـە زانایـان دەفـەرموون: ئەگـەر ئـافرەت باڵغ بوو نوێژی کرد شتێ لەقژی بـەدەرەوە بـوو نوێژەکـەی دروسـت نییـە. ئەمـەش وتەی پێشەوا **شافیعییە**، دەفەرمووێت: نوێژی ئافرەت دروست نییە ئەگەر هەندێ لە جەستەی بەدەرەوە بـێ. پێشـەوا شـافیعی دەفـەرمووێت: بێگومـان وتـراوە: ئەگـەر پشتی پێی بەدەرەوە بوو نوێژەکەی دروستە.

## دەربارەی (سدل) لە نوێژدا باش نیە

### ٢٧٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ

٣٧٨ - (حسن) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عِسْلِ بْنِ سُفْيَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِسْلِ بْنِ سُفْيَانَ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ. فَكَرِهَ بَعْضُهُمُ السَّدْلَ فِي الصَّلاَةِ، وَقَالُوا: هَكَذَا تَصْنَعُ اليَهُودُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا كُرِهَ السَّدْلُ فِي الصَّلاَةِ إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ، فَأَمَّا إِذَا سَدَلَ عَلَى القَمِيصِ فَلاَ بَأْسَ وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ. وَكَرِهَ ابْنُ الْمُبَارَكِ السَّدْلَ فِي الصَّلاَةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (سدل)ی قەدەغەکردووە لە نوێژدا. (سدل) واتە: شۆڕکردنەوەو خشاندنی جل و بەرگ بەسەر زەویدا، یان ئەوەیە چاکەت یان پاڵتۆ بکرێتە سەرشان، بەبێ ئەوەی دەست لە قۆڵەکانیەوە دەربکرێت.

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر (سدل) لە نوێژدا: هەندێکیان بەلایانەوە باش نیە، دەفەرموون: جولەکەکانە بەو شێوەیان دەکرد. ئیبنو موبارەك (سدل)ی لە نوێژدا بەلاوە باش نەبووە. هەندێکیان دەفەرموون: ئەگەر یەك پۆشاکی لەبەردا بوو باش نیە، بەڵام بەسەر پۆشاکێکدا دروستەەمەش وتەی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە.

## پاك كردنەوەو سڕینی بەردو چەو لە نوێژدا باش نیە

## ٢٧٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ مَسْحِ الحَصَى فِي الصَّلاَةِ

٣٧٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلاَةِ فَلاَ يَمْسَحِ الحَصَى، فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ. وَفِي البَابِ عَنْ مُعَيْقِيبٍ، وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. حَدِيثُ أَبِي ذَرٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَرِهَ الْمَسْحَ فِي الصَّلاَةِ، وَقَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً فَمَرَّةً وَاحِدَةً. كَأَنَّهُ رُوِيَ عَنْهُ رُخْصَةٌ فِي الْمَرَّةِ الوَاحِدَةِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ یەکێ لە ئێوە هەستا بۆ نوێژ میهرەبانی خوا ڕووی تێ دەکات، با بەردو چەو پاك نەکاتەوە).

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە سڕینی بەردو چەوی لە نوێژدا پێ ناخۆش بووەو فەرموویەتی: (بەردو چەوی بەردەمت مەسڕە کاتێ کە نوێژ دەکەیت، ئەگەر هەر پێویست بوو یەکجار پاکی بکەرەوە).

٣٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُعَيْقِيبٍ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ مَسْحِ الحَصَى فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً فَمَرَّةً وَاحِدَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە موعەیقیبــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: دەربارەی پاککردنەوەی بەردو چەو لە نوێژدا پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فەرمووی: (کاتێ کـە نوێـژ دەکـەیت بـەردو چـەوی بـەردەمت پـاك مەکەرەوە، ئەگەر هەر پێویست بوو یەکجار پاکی بکەرەوە).

## دەربارەی فووکردن لە نوێژدا باش نیە.

٢٨٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النَّفْخِ فِي الصَّلاَةِ

٣٨١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ العَوَّامِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَيْمُونٌ أَبُو حَمْزَةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، مَوْلَى طَلْحَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: رَأَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غُلاَمًا لَنَا يُقَالُ لَهُ أَفْلَحُ إِذَا سَجَدَ نَفَخَ، فَقَالَ: يَا أَفْلَحُ، تَرِّبْ وَجْهَكَ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ: وَكَرِهَ عَبَّادٌ النَّفْخَ فِي الصَّلاَةِ، وَقَالَ: إِنْ نَفَخَ لَمْ يَقْطَعْ صَلاَتَهُ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ: وَبِهِ نَأْخُذُ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ هَذَا الحَدِيثَ، وَقَالَ: مَوْلًى لَنَا يُقَالُ لَهُ رَبَاحٌ.

واتە: لە ئومو سـەلەمەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غولامێکی دی ناوی ئەفلەح بـوو کـاتێ کـە سەجدەی دەبرد فووی دەکرد لەزەوی بـۆ ئـەوەی پـاکی بکاتـەوە، فـەرمووی: (ئـەی ئەفلەح لەبەر خوای گەورە ڕووی خۆت خۆڵاوی بکە).

ئەحمەدی کوڕی مونیع ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێت: عـەبادی کـوڕی عـەوام ڕەزای خوای لێ بێ فـووکردنی لـەزەوی لـە نوێـژدا بـەلاوە بـاش نـەبووە، هـەروەها فەرموویەتی: ئەگەر فووی کرد نوێژەکەی نابڕێت و دروستە.

٣٨٢ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَال: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ مَيْمُونٍ أَبِي حَمْزَةَ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ، وَقَال: غُلاَمٌ لَنَا يُقَالُ لَهُ رَبَاحٌ. وَحَدِيثُ أُمِّ سَلَمَةَ إِسْنَادُهُ لَيْسَ بِذَاكَ. وَمَيْمُونٌ أَبُو حَمْزَةَ قَدْ ضَعَّفَهُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي النَّفْخِ فِي الصَّلاَةِ: فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنْ نَفَخَ فِي الصَّلاَةِ اسْتَقْبَلَ الصَّلاَةَ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُكْرَهُ النَّفْخُ فِي الصَّلاَةِ وَإِنْ نَفَخَ فِي صَلاَتِهِ لَمْ تَفْسُدْ صَلاَتُهُ. وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

زانایان رایان جیاوازە لەسەر فووکردن لە نوێژدا: هەندێکیان دەفەرموون: ئەگەر لە نوێژدا فووی کرد دەبێ نوێژەکەی دەست پێ بکاتەوە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و خەڵکی کوفەیە. هەندێکی تریان دەفەرموون: باش نیە، بەڵام نوێژەکەی دروستە، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاقە.

## قەدەغەکردنی دەست دانان لەسەر کەلەکە لەنوێژدا

### ٢٨١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ الاِخْتِصَارِ فِي الصَّلاَةِ

٣٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ كَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ الاِخْتِصَارَ فِي الصَّلاَةِ. وَكَرِهَ بَعْضُهُمْ أَنْ يَمْشِيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا. وَالاِخْتِصَارُ: هُوَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ يَدَهُ عَلَى خَاصِرَتِهِ فِي الصَّلاَةِ، وَيُرْوَى أَنَّ إِبْلِيسَ إِذَا مَشَى مَشَى مُخْتَصِرًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قەدەغەیکردوە کەسێ دەستی لەسەر کەلەکەی دابنێ و نوێژ بکات.

هەندێ لە زانایـان دەسـت دانـان لەسـەر کەلەکـەیان لـە نوێـژدا پـێ بـاش نیـە. (الإِخْتِصَارِ) بریتیە لەوەی نوێژخوێن دەستی یان هەردوو دەسـتی لەسـەر کەلەکـەی دابـنێ لەنوێـژدا، تەنانـەت هەنـدێکیان لـەکاتی رۆشـتندا دەسـت دانـان لەسـەر کەلەکەیان پێ باش نیـە. دەگێڕنـەوە کـاتێ کـە شـەیتان بیـەوێ رێ بکـات دەسـت دەخاتە سەر کەلەکەی.

## دەربارەی قژ کۆکردنەوە لەنوێژدا باش نیە.

٢٨٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ كَفِّ الشَّعْرِ فِي الصَّلاَةِ

٣٨٤ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ مُوسَى، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، أَنَّهُ مَرَّ بِالحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ وَهُوَ يُصَلِّي، وَقَدْ عَقَصَ ضَفِرَتَهُ فِي قَفَاهُ، فَحَلَّهَا، فَالتَفَتَ إِلَيْهِ الحَسَنُ مُغْضَبًا، فَقَالَ: أَقْبِلْ عَلَى صَلاَتِكَ وَلاَ تَغْضَبْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ذَلِكَ كِفْلُ الشَّيْطَانِ. وَفِي البَابِ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ أَبِي رَافِعٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: كَرِهُوا أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ وَهُوَ مَعْقُوصٌ شَعْرُهُ. وَعِمْرَانُ بْنُ مُوسَى هُوَ القُرَشِيُّ الْمَكِّيُّ وَهُوَ أَخُو أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى.

واتە: لە ئەبو رافیعـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە داویـەتی بـەلای حەسـەنی کـوڕی عەلیـدا رەزای خوایـان لـێ بـێ نوێـژی دەکـرد، پەلکـەکانی کۆکردبووەوەو گرێیدابوون بە پشت سەریەوە، ئەبو رافع پەلکەکانی کردەوە، حەسەن بەتوڕەییـەوە ئـاوڕی لـێ دایـەوە، ئـەبو رافـع فـەرمووی: خـەریکی نوێـژی خۆتبـەو توڕەمەبـە، چـونکە مـن لـە پێغەمبـەری خـوام (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) بیسـتووە

دەیفەرموو: (ئەوە شوێنی دانیشتنی شەیتانە).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە بەلای زانایانەوە باش نیە پیاو نوێژ بکات پەلکەکانی کۆکاتەوەو گرێیان بدات بە پشت سەریەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خشوع لەنوێژدا.

٢٨٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّخَشُّعِ فِي الصَّلاَةِ

٣٨٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَال: أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ رَبِّهِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ نَافِعِ ابْنِ الْعَمْيَاءِ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ الحَارِثِ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الصَّلاَةُ مَثْنَى مَثْنَى، تَشَهَّدُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، وَتَخَشَّعُ، وَتَضَرَّعُ، وَتَمَسْكَنُ، وَتُقْنِعُ يَدَيْكَ، يَقُولُ: تَرْفَعُهُمَا إِلَى رَبِّكَ، مُسْتَقْبِلاً بِبُطُونِهِمَا وَجْهَكَ، وَتَقُولُ: يَا رَبِّ يَا رَبِّ، وَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَهُوَ كَذَا وَكَذَا. وقَالَ غَيْرُ ابْنِ الْمُبَارَكِ فِي هَذَا الحَدِيثِ: مَنْ لَمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَهِيَ خِدَاجٌ. سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ: رَوَى شُعْبَةُ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ فَأَخْطَأَ فِي مَوَاضِعَ، فَقَال: عَنْ أَنَسِ بْنِ أَبِي أَنَسٍ، وَهُوَ عِمْرَانُ بْنُ أَبِي أَنَسٍ، وَقَال: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، وَإِنَّمَا هُوَ عَبْدُ اللهِ بْنُ نَافِعِ ابْنِ الْعَمْيَاءِ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ الحَارِثِ، وَقَالَ شُعْبَةُ: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنِ الْمُطَّلِبِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِنَّمَا هُوَ عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَحَدِيثُ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ شُعْبَةَ.

واتە: لە (فَضْل)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نوێژ دوو ڕکات

دوو رکاتە، لەهەموو دوو رکاتێکدا تەحیات دەخوێنرێت، نوێژخوێن هەژاری و گەردن کەچی و ئارامی خۆی دەردەخات بۆ خوای گەورە و پەروەرگاری، دەفەرموێت: دەستەکانی بەرز بکاتەوە و لەپی دەستی بکاتە رووی خۆی و بڵێ: خودایە ئەی پەروەردگارم، خودایە ئەی پەروەردگارم - واتە بڵێ خودایە ئەوەو ئەوەم پێم ببەخشە، خودایە لێم ببورە - هەرکەس ئەوە نەکات ئەوە نوێژەکەی کامڵ و تەواو نییە — واتە پاداشتی لەسەر وەرناگرێت).

**دەربارەی پەنجەکان کردن بەناویەکدا لەنوێژدا باش نیە.**

٢٨٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّشْبِيكِ بَيْنَ الأَصَابِعِ فِي الصَّلاَةِ

٣٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الْمَسْجِدِ فَلاَ يُشَبِّكَنَّ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، فَإِنَّهُ فِي صَلاَةٍ. حَدِيثُ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ مِثْلَ حَدِيثِ اللَّيْثِ. وَرَوَى شَرِيكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ. وَحَدِيثُ شَرِيكٍ غَيْرُ مَحْفُوظٍ.

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ کەسێکتان بەچاکی دەستنوێژ دەگرێ، پاشان بە نیەتێکی پاکەوە دەچێ بەرەو مزگەوت، با پەنجەکانی نەکات بەناو پەنجەکانیدا، چونکە ئەو کەسە لە نوێژدایە).

## سەبارەت بە زۆر وەستان بە پێوە لەنوێژدا

### ٢٨٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طُولِ القِيَامِ فِي الصَّلاَةِ

٣٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الصَّلاَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: طُولُ القُنُوتِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُبْشِيٍّ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ.

واتە: لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وترا: کام نوێژ گەورەترەو خێری زۆرترە؟ فەرمووی: (ئەو نوێژەی کە نوێژخوێن زیاتر بەپێوە بێ بۆ قورئان خوێندن). - وەستان بەپێوە لەنوێژدا بۆ قورئان خوێندن خێری زیاترە لە رکوع و سەجدەی زۆر-.

## سەبارەت بە رکوع و سەجدە بردنی زۆر

### ٢٨٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَثْرَةِ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

٣٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي الوَلِيدُ بْنُ هِشَامٍ الْمُعَيْطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَعْدَانُ بْنُ طَلْحَةَ اليَعْمَرِيُّ، قَالَ: لَقِيتُ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ لَهُ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَنْفَعُنِي اللَّهُ بِهِ وَيُدْخِلُنِي اللَّهُ الجَنَّةَ؟ فَسَكَتَ عَنِّي مَلِيًّا، ثُمَّ التَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً.

واتە: لە مەعدانی کوڕی (طَلْحَة)ی یەعمەریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

گەیشتم بە (ثَوْبَان)ی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پێم وت: کردەوەیەکم نیشان بدە سوودی هەبێ بۆم لای خوای پەروەردگار و بەهۆیەوە بمخاتە بەهەشتەوە؟ ماوەیەك بێدەنگ بوو، لەپاشدا ئاوڕی دایەوە بەلامدا فەرمووی: سەجدەی زۆر بەرە واتە نوێژی زۆر بکە، چونکە من بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (هەر بەندەیە سەجدەیە بەرێ بۆ خوای گەورە ئیللا پلەیە پێی بەرزدەبێتەوەو گوناهێکی پێی هەڵدەوەرێ).

٣٨٩ - (صحيح) قَالَ مَعْدَانُ: فَلَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَسَأَلْتُهُ عَمَّا سَأَلْتُ عَنْهُ ثَوْبَانَ؟ فَقَالَ: عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي فَاطِمَةَ. حَدِيثُ ثَوْبَانَ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ فِي كَثْرَةِ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا: فَقَالَ بَعْضُهُمْ: طُولُ القِيَامِ فِي الصَّلاَةِ أَفْضَلُ مِنْ كَثْرَةِ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: كَثْرَةُ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ أَفْضَلُ مِنْ طُولِ القِيَامِ. وقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: قَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا حَدِيثَانِ وَلَمْ يَقْضِ فِيهِ بِشَيْءٍ. وقَالَ إِسْحَاقُ: أَمَّا بِالنَّهَارِ فَكَثْرَةُ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، وَأَمَّا بِاللَّيْلِ فَطُولُ القِيَامِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ لَهُ جُزْءٌ بِاللَّيْلِ يَأْتِي عَلَيْهِ، فَكَثْرَةُ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ فِي هَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ، لأَنَّهُ يَأْتِي عَلَى جُزْئِهِ وَقَدْ رَبِحَ كَثْرَةَ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ. وَإِنَّمَا قَالَ إِسْحَاقُ هَذَا لأَنَّهُ كَذَا وُصِفَ صَلاَةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ، وَوُصِفَ طُولُ القِيَامِ، وَأَمَّا بِالنَّهَارِ فَلَمْ يُوصَفْ مِنْ صَلاَتِهِ مِنْ طُولِ القِيَامِ مَا وُصِفَ بِاللَّيْلِ.

واتە: مەعدانی کوڕی (طَلْحَة) دەفەرموێت: گەیشتم بە ئەبو (درداء) ڕەزای خوای لێ بێ ئەو پرسیارەی کە کردم لە (ثَوْبَان) لەویشم کرد، فەرمووی: سەجدەی زۆر بەرە واتە نوێژی زۆر بکە، چونکە من بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (هەر بەندەیە سەجدەیە بەرێ بۆ خوای گەورە ئیللا پلەیە پێی بەرزدەبێتەوەو گوناهێکی پێی هەڵدەوەرێ).

زانایان رایان جیاوازە لەویارەوە، هەندێکیان دەفەرموون: وەستان بەپێوە لەنوێژدا بۆ قورئان خوێندن خێری زیاترە لە رکوع و سەجدەی زۆر. هەندێکی تریان دەفەرموون: رکوع و سەجدەی زۆر خێری زیاترە. پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێت: لەشەودا وەستان بەپێوە لەنوێژدا بۆ قورئان خوێندن خێری زیاترە لە رکوع و سەجدەی زۆر، لەرۆژدا بە پێچەوانەوە.

## سەبارەت بە کوشتنی مار و دووپشك لەنوێژدا

٢٨٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَتْلِ الأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلاَةِ

٣٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ ضَمْضَمِ بْنِ جَوْسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِ الأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلاَةِ الحَيَّةُ وَالعَقْرَبُ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي رَافِعٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ وَإِسْحَاقُ. وَكَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ قَتْلَ الحَيَّةِ وَالعَقْرَبِ فِي الصَّلاَةِ. قَالَ إِبْرَاهِيمُ: إِنَّ فِي الصَّلاَةِ لَشُغْلاً. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی کرد بە کوشتنی مار و دووپشك لەنوێژدا.

## دەربارەی سەجدەی سەهو لەپێش سەلامدانەوە

## ٢٨٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ قَبْلَ السَّلاَمِ

٣٩١ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ الأَسَدِيِّ حَلِيفِ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ فِي صَلاَةِ الظُّهْرِ وَعَلَيْهِ جُلُوسٌ، فَلَمَّا أَتَمَّ صَلاَتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، يُكَبِّرُ فِي كُلِّ سَجْدَةٍ وَهُوَ جَالِسٌ، قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، وَسَجَدَهُمَا النَّاسُ مَعَهُ، مَكَانَ مَا نَسِيَ مِنَ الجُلُوسِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، وَأَبُو دَاوُدَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَالسَّائِبَ القَارِئَ، كَانَا يَسْجُدَانِ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ قَبْلَ التَّسْلِيمِ. حَدِيثُ ابْنِ بُحَيْنَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ يَرَى سَجْدَتَيِ السَّهْوِ كُلِّهِ قَبْلَ السَّلاَمِ، وَيَقُولُ هَذَا النَّاسِخُ لِغَيْرِهِ مِنَ الأَحَادِيثِ، وَيَذْكُرُ أَنَّ آخِرَ فِعْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عَلَى هَذَا. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: إِذَا قَامَ الرَّجُلُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ فَإِنَّهُ يَسْجُدُ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ قَبْلَ السَّلاَمِ، عَلَى حَدِيثِ ابْنِ بُحَيْنَةَ. وَعَبْدُ اللهِ ابْنُ بُحَيْنَةَ هُوَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَالِكٍ ابْنُ بُحَيْنَةَ مَالِكٌ أَبُوهُ، وَبُحَيْنَةُ أُمُّهُ. هَكَذَا أَخْبَرَنِي إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ مَتَى يَسْجُدُهُمَا الرَّجُلُ قَبْلَ السَّلاَمِ أَوْ بَعْدَهُ؟ فَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنْ يَسْجُدَهُمَا بَعْدَ السَّلاَمِ وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: يَسْجُدُهُمَا قَبْلَ السَّلاَمِ وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ الفُقَهَاءِ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، مِثْلِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، وَرَبِيعَةَ، وَغَيْرِهِمَا. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَتْ زِيَادَةً فِي الصَّلاَةِ فَبَعْدَ السَّلاَمِ، وَإِذَا كَانَ نُقْصَانًا فَقَبْلَ السَّلاَمِ. وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ. وقَالَ أَحْمَدُ: مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ

فَيُسْتَعْمَلُ كُلٌّ عَلَى جِهَتِهِ، يَرَى إِذَا قَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ عَلَى حَدِيثِ ابْنِ بُحَيْنَةَ فَإِنَّهُ يَسْجُدُهُمَا قَبْلَ السَّلاَمِ، وَإِذَا صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا فَإِنَّهُ يَسْجُدُهُمَا بَعْدَ السَّلاَمِ، وَإِذَا سَلَّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ فَإِنَّهُ يَسْجُدُهُمَا بَعْدَ السَّلاَمِ، وَكُلٌّ يُسْتَعْمَلُ عَلَى جِهَتِهِ، وَكُلُّ سَهْوٍ لَيْسَ فِيهِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذِكْرٌ فَإِنَّ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ فِيهِ قَبْلَ السَّلاَمِ. وَقَالَ إِسْحَاقُ نَحْوَ قَوْلِ أَحْمَدَ فِي هَذَا كُلِّهِ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: كُلُّ سَهْوٍ لَيْسَ فِيهِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذِكْرٌ فَإِنْ كَانَتْ زِيَادَةً فِي الصَّلاَةِ يَسْجُدُهُمَا بَعْدَ السَّلاَمِ، وَإِنْ كَانَ نُقْصَانًا يَسْجُدُهُمَا قَبْلَ السَّلاَمِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بوحەینەی ئەسەدیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەنوێژی نیوەڕۆدا هەستایەوە کە ئەبوایە دانیشتایە — لە ریوایەتی پێشەوا بوخاریدا هاتووە: لەدووەم رکاتدا هەستایەوە و تەحیاتی یەکەمی نەخوێند — کاتێ کە نوێژەکەی تەواو کرد دوو سەجدەی برد، لەهەموو سەجدەیەکدا (الله أكبر)ی دەکرد لەکاتێکدا کە دانیشتبوو، لەپێش سەلامدانەوەدا، خەڵکەکەش لەخزمەتیدا ئەو دوو سەجدەیان برد، لەجیاتی ئەو دانیشتنەی کە لەیادی چوو.

ئەبو هورەیرە و (عبد الله)ی کوڕی سائیب ڕەزای خوایان لێ بێ لەپێش سەلامدانەوەدا سەجدەی سەهویان دەبرد. هەندێ لە زانایان پەیڕەوی فەرموودەکە دەکەن. ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیەیە پێی وایە بۆ هەموو سەهویەك لەپێش سەلامدانەوەدا سەجدەی سەهو ببردرێ، پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: ئەمەش بە فەرمودەکانی تر نەسخ بۆتەوە. گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە کۆتایی تەمەنیەوە لەسەر ئەمە بووە.

پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق دەفەرموون: ئەگەر پیاو لەدووەم رکاتدا

هەستایەوە و تـەحیاتی یەکـەمی نەخوێنـد لـەپێش سـەلامدانەوە سـەجدەی سـەهو ببـات بـە پێـی فەرموودەکـەی ئیبنـو بوحەینـەی ئەسـەدی. پێشـەوا (ترمـذی) دەفـەرمووێت: زانایـان رایـان جیـاوازە لـەوبارەوە هەنـدێکیان دەفـەرموون: لـەدوای سەلامدانەوە سەجدەی سەهو ببردرێ. ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثـوري) و خەڵکی کوفەیە. هەندێکی تریان دەفەرموون: لەپێش سەلامدانەوە، ئەمـەش وتـەی زۆربەی زانایانی خەڵکی مەدینەیە وەك: یـەحیای کـوڕی سـەعید و رەبیعـەو جگـە لەوانیش، پێشەوا شافیعی ئەمە دەفەرمووێت. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگـەر نوێژ لێی زیاد کرا لەدوای سەلامدانەوە، ئەگەر لێی کەم کرا لـەپێش سـەلامدانەوە، ئەمەش وتەی پێشەوا مالیکە.

### دەربارەی سەجدەی سەهو لەدوای سەلامدانەوەو قسەکردن

٢٨٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سَجْدَتِيِ السَّهْوِ بَعْدَ السَّلاَمِ وَالكَلاَمِ

٣٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَال: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَال: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلاَةِ أَمْ نَسِيتَ؟ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَمَا سَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسـعودەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی نیوەڕۆ پێنج رکـاتی کـرد، پێـی واتـرا: ئـەوە نوێژ زیادی کردووە یان لەیادت چوو؟ دوو سەجدەی برد لەدوای ئەوەی کە سـەلامی دایەوە.

٣٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ الكَلاَمِ. وَفِي البَابِ عَنْ مُعَاوِيَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای قسەکردن دوو سەجدەی سەهوی برد.

٣٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَجَدَهُمَا بَعْدَ السَّلاَمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ أَيُّوبُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ. وَحَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. قَالُوا: إِذَا صَلَّى الرَّجُلُ الظُّهْرَ خَمْسًا فَصَلاَتُهُ جَائِزَةٌ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، وَإِنْ لَمْ يَجْلِسْ فِي الرَّابِعَةِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا وَلَمْ يَقْعُدْ فِي الرَّابِعَةِ مِقْدَارَ التَّشَهُّدِ فَسَدَتْ صَلاَتُهُ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَبَعْضِ أَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای سەلامدانەوە سەجدەی سەهوی دەبرد.

هەندێ لە زانایان پەیڕەوی ئەم فەرموودە دەکەن. دەفەرموون: ئەگەر کەسێ نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکات بکات نوێژەکەی دروستە، بەمەرجێ دوو سەجدەی سەهو بەرێ ئەگەر تەحیاتی کۆتایش نەخوێنێ. ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر کەسێ نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکاتی کرد لەرکاتی چوارەمدا ئەوەندەی ماوەی تەحیات خوێندن دانەنیشێت ئەوە

*نوێژەکەی بەتاڵەو دروست نییە. ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوری) و*
**هەندێ لە خەڵکی کوفەیە.**

## دەربارەی تەحیات خوێندن لەدوای سەجدەی سەهو

## ٢٩٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشَهُّدِ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ

| ٣٩٥ - (شاذ بذكر التشهد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، قَال: أَخْبَرَنِي أَشْعَثُ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ فَسَهَا، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ، ثُمَّ سَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى ابْنُ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ، وَهُوَ عَمُّ أَبِي قِلاَبَةَ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ. وَرَوَى مُحَمَّدٌ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ. وَأَبُو الْمُهَلَّبِ اسمه عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَمْرٍو، وَيُقَالُ أَيْضًا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، وَهُشَيْمٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ بِطُولِهِ وَهُوَ حَدِيثُ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَلَّمَ فِي ثَلاَثِ رَكَعَاتٍ مِنَ العَصْرِ، فَقَامَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: الخِرْبَاقُ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي التَّشَهُّدِ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ: فَقَالَ بَعْضُهُمْ: يَتَشَهَّدُ فِيهِمَا وَيُسَلِّمُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ فِيهِمَا تَشَهُّدٌ وَتَسْلِيمٌ وَإِذَا سَجَدَهُمَا قَبْلَ السَّلاَمِ لَمْ يَتَشَهَّدْ. وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ قَالاَ: إِذَا سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ قَبْلَ السَّلاَمِ لَمْ يَتَشَهَّدْ. |
|---|

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرنوێژی بۆ کردن، سەهوی کرد، دوو سەجدەی سەهوی برد، لەپاشدا تەحیاتی خوێند، ئینجا سەلامی دایەوە.

زانایان لەبارەی سەجدەی سەهوەوە رایان جیاوازە، هەندێکیان دەفەرموون: تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە. هەندێکی تریان دەفەرموون: تەحیات خوێندن و سەلامدانەوە پێویست ناکات، ئەگەر لەپێش سەلامدانەوە سەجدەی سەهوی برد با تەحیات نەخوێنێت، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاقە، دەفەرموون: ئەگەر لەپێش سەلامدانەوە سەجدەی سەهوی برد با تەحیات نەخوێنێ.

## دەربارەی ئەوەی گومانی هەبێ زیاد و کەمی کردبێ.

٢٩١ - بَابٌ فِيمَنْ يَشُكُّ فِي الزِّيَادَةِ وَالنُّقْصَانِ

٣٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ هِلاَلٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي سَعِيدٍ: أَحَدُنَا يُصَلِّي فَلاَ يَدْرِي كَيْفَ صَلَّى؟ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلَمْ يَدْرِ كَيْفَ صَلَّى فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ. وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي الوَاحِدَةِ وَالثِّنْتَيْنِ فَلْيَجْعَلْهُمَا وَاحِدَةً، وَإِذَا شَكَّ فِي الاِثْنَتَيْنِ وَالثَّلاَثِ فَلْيَجْعَلْهُمَا اثْنَتَيْنِ، وَلْيَسْجُدْ فِي ذَلِكَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَصْحَابِنَا. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا شَكَّ فِي صَلاَتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى فَلْيُعِدْ.

واتە: لە (عِيَاض)ی کوڕی هیلالەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە ئەبو سەعیدم رەزای خوای لێ بێ وت: جاری وا هەیە یەکێ لە ئێمە کاتێ نوێژ دەکات نازانێ چەند رکاتی کردووە؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە نوێژی کرد نەیزانی چەند رکاتی کردووە سەجدەی سەهو بەرێ لەکاتێکدا کە دانیشتووە).

بێگومان لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە گومانی بۆ دروستبوو یەك رکاتی کردووە یان دوو رکاتی کردووە با یەك رکات حساب بکات، هەروەها ئەگەر یەکێ لە ئێوە گومانی بۆ دروستبوو دوو رکاتی کردووە یان سێ رکاتی کردووە با دوو رکات حساب بکات، پێش ئەوەی سەلام بداتەوە سەجدەی سەهو بەرێ. هاوەڵانمان لە فەرموودەناسان پەیڕەوی ئەمە دەکەن.

هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەگەر کەسێ نوێژی کرد گومانی بۆ دروستبوو نەیزانی چەند رکاتی کردووە با نوێژەکەی بکاتەوە.

٣٩٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ فِي صَلاَتِهِ فَيَلْبِسُ عَلَيْهِ، حَتَّى لاَ يَدْرِيَ كَمْ صَلَّى، فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بێگومان ئەگەر یەکێ لەئێوە هەستا بۆ نوێژ، شەیتان وەسوەسەی خستە دڵیەوە و لێی تێکدا، بەشێوەیە کە نەیدەزانی چەند رکاتی کردوە، ئەگەر ئەوە لە کەسێ لەئێوە روویدا، با دوو سەجدەی سەهو بەرێت لەکاتێکدا کە دانیشتووە).

٣٩٨ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ ابْنُ عَثْمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِذَا سَهَا أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ وَاحِدَةً صَلَّى أَوْ ثِنْتَيْنِ فَلْيَبْنِ عَلَى وَاحِدَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثِنْتَيْنِ صَلَّى أَوْ ثَلَاثًا فَلْيَبْنِ عَلَى ثِنْتَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثَلَاثًا صَلَّى أَوْ أَرْبَعًا فَلْيَبْنِ عَلَى ثَلَاثٍ، وَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ. رَوَاهُ الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوفەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (ئەگەر کەسێکتان لەنوێژەکەیدا سەهوی کرد نەیدەزانی یەك ڕکاتی کردووە یان دوو ڕکات با گومانەکەی لەدڵ دەرکات و بونیاد لەسەر یەك ڕکات بکات، وە ئەگەر نەیدەزانی دوو ڕکاتی کردووە یان سێ ڕکات با بونیاد لەسەر دوو ڕکات بکات، هەروەها ئەگەر نەیدەزانی سێ ڕکاتی کردووە یان چوار ڕکات با بونیاد لەسەر سێ ڕکات بکات، لەپێش سەلامدانەوەدا دوو سەجدەی سەهو بەرێ.

## کەسێ لەدوای دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆ و عەسرەوە سەلام بداتەوە

## ٢٩٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُسَلِّمُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ

٣٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ أَبِي تَمِيمَةَ وَهُوَ السَّخْتِيَانِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ مِنْ اثْنَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو اليَدَيْنِ: أَقُصِرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصَدَقَ ذُو اليَدَيْنِ؟ فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَصَلَّى اثْنَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ

كَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَرَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ. وَفِي البَابِ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَذِي اليَدَيْنِ. وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا الحَدِيثِ: فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الكُوفَةِ: إِذَا تَكَلَّمَ فِي الصَّلاَةِ نَاسِيًا أَوْ جَاهِلاً أَوْ مَا كَانَ فَإِنَّهُ يُعِيدُ الصَّلاَةَ، وَاعْتَلُّوا بِأَنَّ هَذَا الحَدِيثَ كَانَ قَبْلَ تَحْرِيمِ الكَلاَمِ فِي الصَّلاَةِ. وَأَمَّا الشَّافِعِيُّ فَرَأَى هَذَا حَدِيثًا صَحِيحًا فَقَالَ بِهِ. وقَالَ: هَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الَّذِي رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّائِمِ إِذَا أَكَلَ نَاسِيًا فَإِنَّهُ لاَ يَقْضِي وَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ. قَالَ الشَّافِعِيُّ وَفَرَّقَ هَؤُلاَءِ بَيْنَ العَمْدِ وَالنِّسْيَانِ فِي أَكْلِ الصَّائِمِ، لِحَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ. وقَالَ أَحْمَدُ فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ: إِنْ تَكَلَّمَ الإِمَامُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَتِهِ وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ قَدْ أَكْمَلَهَا ثُمَّ عَلِمَ أَنَّهُ لَمْ يُكْمِلْهَا يُتِمُّ صَلاَتَهُ وَمَنْ تَكَلَّمَ خَلْفَ الإِمَامِ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّ عَلَيْهِ بَقِيَّةً مِنَ الصَّلاَةِ فَعَلَيْهِ أَنْ يَسْتَقْبِلَهَا، وَاحْتَجَّ بِأَنَّ الفَرَائِضَ كَانَتْ تُزَادُ وَتُنْقَصُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنَّمَا تَكَلَّمَ ذُو اليَدَيْنِ، وَهُوَ عَلَى يَقِينٍ مِنْ صَلاَتِهِ أَنَّهَا تَمَّتْ وَلَيْسَ هَكَذَا اليَوْمَ لَيْسَ لأَحَدٍ أَنْ يَتَكَلَّمَ عَلَى مَعْنَى مَا تَكَلَّمَ ذُو اليَدَيْنِ لأَنَّ الفَرَائِضَ اليَوْمَ لاَ يُزَادُ فِيهَا وَلاَ يُنْقَصُ، قَالَ أَحْمَدُ نَحْوًا مِنْ هَذَا الكَلاَمِ. وقَالَ إِسْحَاقُ نَحْوَ قَوْلِ أَحْمَدَ فِي هَذَا البَابِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆ یان نوێژی عەسری بۆ کردین، دوو ڕکات نوێژی کرد و سەلامی دایەوە، (ذُو اليَدَيْنِ) پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە، یان تۆ لەیادت نەبوو؟ فەرمووی: (نە نوێژ کورتکراوەتەوەو نە لەیادیشم چووە)، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەڵکو لەیادت چوو، پێغەمبەری خوا (صَلَّى

اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) رووی کـردە خەڵکەکـەو فـەرمووی: (ئایـا (ذُو اليَدَيْن) راسـت دەکات؟). خەڵکەکە وتیان: بەڵێ راست دەکـات، جـا پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەستایەوە دوو ڕکاتەکەی تری کردوو، پاشـان سـەلامی دایـەوە، ئینجـا (الله اکبر)ی کردو سەجدەی برد وەك چۆن پێشتر سەجدەی بـرد یـان کـەمێ درێـژتر، پاشان سەری بەرزکردەوەو (الله اکبر)ی کرد، پاشان سـەجدەی بـرد وەك چـۆن پێشـتر سەجدەی برد یان کەمێ درێژتر.

## دەربارەی نوێژکردن بە پێلاو و نەعلەوە.

٢٩٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ فِي النِّعَالِ

٤٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ أَبِي مَسْلَمَةَ، قَالَ: قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي، حَبِيبَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، وَشَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، وَأَوْسٍ الثَّقَفِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَطَاءٍ، رَجُلٍ مِنْ بَنِي شَيْبَةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی زیدی ئەبو مەسلەمەوە دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: وتم بە ئەنەسی کوڕی مالیك: ئایا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە پـێلاو و نەعلەوە نوێژی دەکرد؟ فەرمووی: بەڵێ.

## سەبارەت بە قنوتی نوێژی بەیانی.

### ٢٩٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقُنُوتِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ

٤٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْنُتُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ وَالْمَغْرِبِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَخُفَافِ بْنِ إِيمَاءَ بْنِ رَحْضَةَ الْغِفَارِيِّ. حَدِيثُ الْبَرَاءِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الْقُنُوتِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ: فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: الْقُنُوتَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. وَقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: لاَ يُقْنَتُ فِي الْفَجْرِ إِلاَّ عِنْدَ نَازِلَةٍ تَنْزِلُ بِالْمُسْلِمِينَ، فَإِذَا نَزَلَتْ نَازِلَةٌ فَلِلإِمَامِ أَنْ يَدْعُوَ لِجُيُوشِ الْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی بەیانی و شێواندا قنوتی دەخوێند.

- وەك لە (تحفة الأحوذی)دا هاتوە ئیبنو حەجەر و جگە لەویش دەڵێن لەسەرەتاوە لە نوێژی بەیانی و شێواندا قنوتی دەخوێند.

زانایان دەربارەی قنوتی نوێژی بەیانی رایان جیاوازە: هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان لەسەریەتی. ئەمەش وتەی پێشەوایان: شافیعی و مالیکە.

پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق دەفەرموون: لەنوێژی بەیانی‌دا قنوت ناخوێنرێت مەگەر لەکاتێکدا کە موسوڵمانان تووشی جەنگ و بەڵاو کارەسات بن، لەوکاتەدا دەبێ پێشنوێژ بپاڕێتەوە بۆ لەشکر و سەربازە موسوڵمانەکان.

دەربارەی تەرککردنی قنوتی نوێژی بەیانی.

٢٩٥ - بَابٌ فِي تَرْكِ القُنُوتِ

٤٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي: يَا أَبَةِ، إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، هَاهُنَا بِالكُوفَةِ نَحْوًا مِنْ خَمْسِ سِنِينَ، أَكَانُوا يَقْنُتُونَ؟، قَالَ: أَيْ بُنَيَّ مُحْدَثٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ. وقَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: إِنْ قَنَتَ فِي الفَجْرِ فَحَسَنٌ، وَإِنْ لَمْ يَقْنُتْ فَحَسَنٌ، وَاخْتَارَ أَنْ لاَ يَقْنُتَ. وَلَمْ يَرَ ابْنُ الْمُبَارَكِ القُنُوتَ فِي الفَجْرِ. وَأَبُو مَالِكٍ الأَشْجَعِيُّ اسْمُهُ سَعْدُ بْنُ طَارِقِ بْنِ أَشْيَمَ.

واتە: لە ئەبو مالیکی ئەشجەعیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم بە باوکم: باوکە گیان، تۆ لە مەدینە لەدوای پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و (عثمان)ەوە ڕەزای خوایان لێ بێ، هەروەها لەکوفەش لەدوای پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ نزیکەی پێنج ساڵ نوێژت کردووە، ئایا لە نوێژی بەیانیدا قنوتیان دەخوێند؟ فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم شتێکی تازە داهێنراوە.

زۆربەی زانایان پەیڕەوی فەرموودەکە دەکەن. پێشەوا سوفیانی (ثوري) دەفەرمووێ: ئەگەر خوێنرا باشە، ئەگەر نەخوێنرا هەر باشە، بەڵام نەخوێندنی بەلاوە پەسەندە. پێشەوا ئیبنو موبارەك رای لەسەری نیە بخوێنرێت.

٤٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ.

## سەبارەت بە کەسێ لەنوێژدا بپژمێ

## ٢٩٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَعْطِسُ فِي الصَّلاَةِ

٤٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِفَاعَةُ بْنُ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيُّ، عَنْ عَمِّ أَبِيهِ مُعَاذِ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَطَسْتُ، فَقُلْتُ: الحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، مُبَارَكًا عَلَيْهِ، كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ، فَقَالَ: مَنِ الْمُتَكَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ؟، فَلَمْ يَتَكَلَّمْ أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَهَا الثَّانِيَةَ: مَنِ الْمُتَكَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ؟، فَلَمْ يَتَكَلَّمْ أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَهَا الثَّالِثَةَ: مَنِ الْمُتَكَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ رِفَاعَةُ بْنُ رَافِعٍ ابْنُ عَفْرَاءَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: كَيْفَ قُلْتَ؟، قَالَ: قُلْتُ: الحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ مُبَارَكًا عَلَيْهِ، كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ ابْتَدَرَهَا بِضْعَةٌ وَثَلاَثُونَ مَلَكًا، أَيُّهُمْ يَصْعَدُ بِهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَوَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، وَعَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ. حَدِيثُ رِفَاعَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَكَأَنَّ هَذَا الحَدِيثَ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ فِي التَّطَوُّعِ. لأَنَّ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنَ التَّابِعِينَ قَالُوا: إِذَا عَطَسَ الرَّجُلُ فِي الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ إِنَّمَا يَحْمَدُ اللَّهَ فِي نَفْسِهِ وَلَمْ يُوَسِّعُوا بِأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ.

واتە: لە ریفاعەی کوڕی رافیعەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ لەدوای پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژم دەکرد پـژمیم وتم: (الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، مُبَارَكًا عَلَيْهِ، كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى). واتە: خودایە! ئەی پەروەردگارا سوپاس و ستایش هەر شایستەی تۆیە، سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێ، پیرۆزبێ لەسەری بەو شێوەیەی کە خوای گەورە پێی خۆشەو پێی رازییە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەلامی

دایەوە فەرمووی: (کێ بوو لەنوێژدا ئەو قسەیەی کرد؟) کەس قسەی نەکرد، دووبارە فەرمووی: (کێ بوو لەنوێژدا ئەو قسەیەی کرد؟) کەس قسەی نەکرد، سێیەم جار فەرمووی: (کێ بوو لەنوێژدا ئەو قسەیەی کرد؟) ریفاعەی کوڕی رافیع فەرمووی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: (چیت وت؟) فەرمووی: وتم: (الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، مُبَارَكًا عَلَيْهِ، كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى). پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (سوێند بە (الله) سی و ئەوەندە مەلائیکە پێشبڕکێیان بوو کە کامیان بەرزی بکەنەوە).

وەك بڵێی ئەم فەرموودە لای هەندێ لەزانایان لەنوێژی سوننەتدا بووە. چونکە جگە لەیەکێ لە شوێنکەوتوان دەفەرموون: ئەگەر کەسێ لەنوێژی فەرزدا پژمی لە دڵی خۆیدا بڵێ: (الحمد لله). ئیتر لەوە زیاتر هیچی تر نەڵێ.

## دەربارەی نەسخی قسەکردن لەنوێژدا

٢٩٧ – بَابٌ فِي نَسْخِ الكَلاَمِ فِي الصَّلاَةِ

٤٠٥ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ شُبَيْلٍ، عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، قَالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّلاَةِ، يُكَلِّمُ الرَّجُلُ مِنَّا صَاحِبَهُ إِلَى جَنْبِهِ، حَتَّى نَزَلَتْ: (وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ)، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ، وَنُهِينَا عَنِ الكَلاَمِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَمُعَاوِيَةَ بْنِ الحَكَمِ. حَدِيثُ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ. قَالُوا: إِذَا تَكَلَّمَ الرَّجُلُ عَامِدًا فِي الصَّلاَةِ أَوْ نَاسِيًا أَعَادَ الصَّلاَةَ. وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا تَكَلَّمَ

عَامِدًا فِي الصَّلاَةِ أَعَادَ الصَّلاَةَ، وَإِنْ كَانَ نَاسِيًا أَوْ جَاهِلاً أَجْزَأَهُ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە لەدوای پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەنوێژدا قسەمان دەکرد، هەریەکێ لە ئێمە قسەی لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی خۆی دەکرد ئەگەر پێویست بوایە هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: (وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ). واتە: وە لەنوێژدا بوەستن بۆ خوا بەگەردن کەچی (بێ قسەکردن). لەپاش ئەمە فەرمانمان پێدرا بێدەنگ بین و قسەکردنمان لێ قەدەغەکرا.

هەندێ لە زانایان پەیڕەوی ئەمە دەکەن. دەفەرموون: ئەگەر کەسێ بە ئەنقەست یان لەیادی چوو قسەی کرد دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە. ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و خەڵکی کوفەیە. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر بە ئەنقەست قسەی کرد دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە. ئەگەر لەیادی چوو یان بە نەزانی قسەی کرد ئەوە نوێژەکەی دروستە. پێشەوا شافیعی ئەمە دەفەرمووێ.

## دەربارەی نوێژکردن لەکاتی تەوبەکردندا

٢٩٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ عِنْدَ التَّوْبَةِ

٤٠٦ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ بْنِ الحَكَمِ الفَزَارِيِّ، قَال: سَمِعْتُ عَلِيًّا، يَقُولُ: إِنِّي كُنْتُ رَجُلاً إِذَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثًا نَفَعَنِي اللَّهُ مِنْهُ بِمَا شَاءَ أَنْ يَنْفَعَنِي بِهِ، وَإِذَا حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ اسْتَحْلَفْتُهُ فَإِذَا حَلَفَ لِي صَدَّقْتُهُ، وَإِنَّهُ حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ، وَصَدَقَ أَبُو بَكْرٍ، قَال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ

رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا، ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ، إِلاَّ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: (وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ). وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَمُعَاذٍ، وَوَاثِلَةَ، وَأَبِي اليَسَرِ وَاسْمُهُ كَعْبُ بْنُ عَمْرٍو. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ عُثْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ. وَرَوَى عَنْهُ شُعْبَةُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، فَرَفَعُوهُ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي عَوَانَةَ.وَرَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمِسْعَرٌ، فَأَوْقَفَاهُ، وَلَمْ يَرْفَعَاهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ مِسْعَرٍ هَذَا الحَدِيثُ مَرْفُوعًا أَيْضًا.

واتە: لە ئەسمائی کچی حەکەمی فەزارییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عەلی بوو ڕەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: من کەسێ بووم کاتێ کە فەرموودەیەکم دەبیست لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەندەی خوا بیەوێ سودی پێ دەگەیاندم بەکردەوە، ئەگەر یەکێ لە یارانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموودەیەکی بۆ بگێڕامایەتەوە سوێندم دەدا ئەگەر سوێندی بۆ بخواردمایە باوەڕم پێ دەکردو لێم وەردەگرت — ئەمە بۆ زیاتر دڵنیا بوون بووە ئەگینا یارانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر هەموویان ڕاستگۆ بوون — پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە، بێگومان ڕاستی فەرموو، - پێشەوا عەلی پێشەوا ئەبو بەکری سوێند نەدا ئەمەش بۆ گەورەیی پلەو پایەی ئەبو بەکر دەگەڕێتەوە - پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: (هەر بەندەیەك تاوانێ یان خراپەیە بکات دەستنوێژێکی چاك بگرێ، لەپاشدا هەستێ دوو ڕکات نوێژ بکات، ئینجا (استغفر الله) بکات و داوای لێ خۆشبوون لە خوای گەورە بکات، خوای گەورەش لێی خۆشدەبێ، لەپاشدا ئەم ئایەتەی تا کۆتایی

خوێندەوە: (وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ).آل عمران: ١٣٥. واتە: وە ئەوانەی کاتێك کە کردەوەیەکی ناشیرین دەکەن یان ستەم لە خۆیان دەکەن، کە یادی خوایان کردەوە ئینجا داوای لێ بووردن دەکەن بۆ گوناهەکانیان، ئایا کێ دەبووریٚ لە گوناهەکان بێجگە لە خوا؟ وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کە کردویانە لە کاتێکدا بزانن گوناهە.

## منداڵ کەی فەرمانی پێ دەکرێت بە نوێژکردن

### ٢٩٩ - بَابُ مَا جَاءَ مَتَى يُؤْمَرُ الصَّبِيُّ بِالصَّلاَةِ

٤٠٧ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَرْمَلَةُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ الجُهَنِيُّ، عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَلِّمُوا الصَّبِيَّ الصَّلاَةَ ابْنَ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا ابْنَ عَشْرٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ سَبْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ الجُهَنِيِّ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَعَلَيْهِ العَمَلُ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالاَ: مَا تَرَكَ الغُلاَمُ بَعْدَ العَشْرِ مِنَ الصَّلاَةِ فَإِنَّهُ يُعِيدُ. وَسَبْرَةُ هُوَ ابْنُ مَعْبَدٍ الجُهَنِيُّ، وَيُقَالُ: هُوَ ابْنُ عَوْسَجَةَ.

واتە: لە سەبرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لە حەوت ساڵیدا منداڵ فێری نوێژکردن بکەن، لە دە ساڵیدا لەسەر نوێژ نەکردن لێیان بدەن).

هەندێ لە زانایان پەیڕەوی ئەمە دەکەن. پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە

دەفەرموون، دەڵێن: ئەگەر منداڵ لەدوای دە ساڵی نوێژی تەرك كرد دەبێ بیگێڕێتەوە.

## کەسێ لە تەحیاتدا دەستنوێژەکەی پوچەڵ بێتەوە

### ٣٠٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُحْدِثُ فِي التَّشَهُّدِ

٤٠٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَال: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَال: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زِيَادِ بْنِ أَنْعُمٍ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ رَافِعٍ، وَبَكْرَ بْنَ سَوَادَةَ، أَخْبَرَاهُ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَحْدَثَ، يَعْنِي الرَّجُلَ، وَقَدْ جَلَسَ فِي آخِرِ صَلاَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ فَقَدْ جَازَتْ صَلاَتُهُ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ، وَقَدْ اضْطَرَبُوا فِي إِسْنَادِهِ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا. قَالُوا: إِذَا جَلَسَ مِقْدَارَ التَّشَهُّدِ وَأَحْدَثَ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُهُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا أَحْدَثَ قَبْلَ أَنْ يَتَشَهَّدَ وَقَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ أَعَادَ الصَّلاَةَ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. وقَالَ أَحْمَدُ: إِذَا لَمْ يَتَشَهَّدْ وَسَلَّمَ أَجْزَأَهُ لِقَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ وَالتَّشَهُّدُ أَهْوَنُ، قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي اثْنَتَيْنِ فَمَضَى فِي صَلاَتِهِ، وَلَمْ يَتَشَهَّدْ. وقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: إِذَا تَشَهَّدَ وَلَمْ يُسَلِّمْ أَجْزَأَهُ. وَاحْتَجَّ بِحَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ حِينَ عَلَّمَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ التَّشَهُّدَ، فَقَال: إِذَا فَرَغْتَ مِنْ هَذَا فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ. وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زِيَادٍ، هُوَ الإِفْرِيقِيُّ، وَقَدْ ضَعَّفَهُ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ مِنْهُمْ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، وَأَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێ دانیشتبوو بۆ تەحیات خوێندنی كۆتایی لەپێش ئەوەی سەلام بداتەوە

دەستنوێژەکەی پوچەڵ بێتەوە ئەوە نوێژەکەی دروستە).

هەندێ لە زانایان دەفەرموون: دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعییە.

## ئەگەر باران بوو هەرکەس لەشوێنی خۆی نوێژ بکات

٣٠١ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا كَانَ الْمَطَرُ فَالصَّلاَةُ فِي الرِّحَالِ

٤٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَأَصَابَنَا مَطَرٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ شَاءَ فَلْيُصَلِّ فِي رَحْلِهِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَسَمُرَةَ، وَأَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَخَّصَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الْقُعُودِ عَنِ الجَمَاعَةِ وَالجُمُعَةِ فِي الْمَطَرِ وَالطِّينِ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. سَمِعْتُ أَبَا زُرْعَةَ، يَقُولُ: رَوَى عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَلِيٍّ حَدِيثًا. وَقَالَ أَبُو زُرْعَةَ: لَمْ نَرَ بِالبَصْرَةِ أَحْفَظَ مِنْ هَؤُلاَءِ الثَّلاَثَةِ: عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ، وَابْنِ الشَّاذَكُونِيِّ، وَعَمْرِو بْنِ عَلِيٍّ. وَأَبُو الْمَلِيحِ اسْمُهُ عَامِرٌ، وَيُقَالُ: زَيْدُ بْنُ أُسَامَةَ بْنِ عُمَيْرٍ الهُذَلِيُّ.

واتە: لە جابرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا بووین (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باران باری، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەوەی دەیەوێ با لەشوێن و بنەوبارگەی خۆی نوێژ بکات).

## دەربارەی تەسبیحات لەدوای نوێژەکان.

## ٣٠٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْبِيحِ فِي أَدْبَارِ الصَّلاَةِ

٤١٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَتَّابُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ خُصَيْفٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، وَعِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: جَاءَ الفُقَرَاءُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ الأَغْنِيَاءَ يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَلَهُمْ أَمْوَالٌ يُعْتِقُونَ وَيَتَصَدَّقُونَ، قَالَ: فَإِذَا صَلَّيْتُمْ، فَقُولُوا: سُبْحَانَ اللهِ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ مَرَّةً، وَالحَمْدُ لِلَّهِ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ مَرَّةً، وَاللَّهُ أَكْبَرُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ مَرَّةً، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ عَشْرَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّكُمْ تُدْرِكُونَ بِهِ مَنْ سَبَقَكُمْ، وَلاَ يَسْبِقُكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي ذَرٍّ. وَحَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: خَصْلَتَانِ لاَ يُحْصِيهِمَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ إِلاَّ دَخَلَ الجَنَّةَ: يُسَبِّحُ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ عَشْرًا، وَيَحْمَدُهُ عَشْرًا، وَيُكَبِّرُهُ عَشْرًا، وَيُسَبِّحُ اللَّهَ عِنْدَ مَنَامِهِ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَيَحْمَدُهُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَيُكَبِّرُهُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەژارەکان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! دەوڵەمەند و خاوەن ماڵ و سامانە زۆرەکان وەك ئێمە نوێژ دەکەن و رۆژوو دەگرن، بە زیادەی ماڵ و سامانەکانیشیان بەندە ئازاد دەکەن و خێر و سەدەقە دەکەن، ئێمەش ماڵ و سامانمان نیە ببیەخشین؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە: سی و سێ جار بڵێن: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێن: (الحَمْدُ لِلَّهِ)، سی و چوار

جار بڵێن: (اللَّهُ أَكْبَر)، دە جاریش بڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، ئیتر ئێوە بەمانە دەگەن بەوانەدا کە پێشتان کەوتوون، ئەوانەی دوای ئێوە پێشتان ناکەون).

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەر کەسێکی موسوڵمان ئەم دوو کارە بکات ئیللا پێیان دەچێتە بەهەشتەوە: (لەدوای هەموو نوێژێکەوە دە جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّه)، دە جار بڵێ: (الحَمْدُ لِلَّهِ)، دە جار بڵێ: (اللَّهُ أَكْبَر)، هەروەها لەکاتی خەوتنیشدا سی و سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێ: (الحَمْدُ لِلَّهِ)، سی و چوار جار بڵێ: (اللَّهُ أَكْبَر)).

## دەربارەی نوێژکردن بەسواری وڵاخەوە لەکاتی قوڕ و باراندا.

### ٣٠٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الدَّابَّةِ فِي الطِّينِ وَالمطَرِ

٤١١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ الرَّمَّاحِ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ بْنِ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّهُمْ كَانُوا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَانْتَهَوْا إِلَى مَضِيقٍ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَمُطِرُوا، السَّمَاءُ مِنْ فَوْقِهِمْ، وَالبِلَّةُ مِنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ، فَأَذَّنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَأَقَامَ، فَتَقَدَّمَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَصَلَّى بِهِمْ يُومِئُ إِيمَاءً: يَجْعَلُ السُّجُودَ أَخْفَضَ مِنَ الرُّكُوعِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، تَفَرَّدَ بِهِ عُمَرُ بْنُ الرَّمَّاحِ البَلْخِيُّ لاَ يُعْرَفُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِهِ. وَقَدْ رَوَى عَنْهُ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ. وَكَذَلِكَ رُوِيَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ صَلَّى فِي مَاءٍ وَطِينٍ عَلَى دَابَّتِهِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە یەعلای کوڕی مورڕەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوون کاتی نوێژ

گەیشتنە شوێنێکی تەنگەلان و بێ دەرەتان باران دەباری بە سەریاندا، ژێریشیان تەڕ و قوڕاوی بوو، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بانگی فەرموو قامەتی کرد، بەسەر ولاخەکەیەوە بەرنوێژی بۆ کردن، بۆ سەجدە لە رکوع زیاتر سەری دائەنەواند).

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر شوێنەکەی ئاو و قوڕ و لیتاو بوایە بەسەر ولاخەکەیەوە نوێژی دەکرد.

## دەربارەی هەوڵدان و خۆماندووکردن لە نوێژدا

٣٠٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الاِجْتِهَادِ فِي الصَّلاَةِ

٤١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَبِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَتَتَكَلَّفُ هَذَا وَقَدْ غُفِرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەندە نوێژی کردبوو قاچەکانی قڵیشیان بردبوو، پێی وترا: بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەیت لەکاتێکدا کە خوای گەورە لە گوناهی رابردوو داهاتوشت خۆش بووە؟ فەرمووی: (ئەی ئایا بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم).

## یەکەم کردەوە کە خوا بەندەی لەسەر موحاسەبە دەکات نوێژە

### ٣٠٥ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ الصَّلاَةُ

٤١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، قَالَ: حَدَّثَنِي قَتَادَةُ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ حُرَيْثِ بْنِ قَبِيصَةَ، قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ يَسِّرْ لِي جَلِيسًا صَالِحًا، قَالَ فَجَلَسْتُ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، فَقُلْتُ: إِنِّي سَأَلْتُ اللَّهَ أَنْ يَرْزُقَنِي جَلِيسًا صَالِحًا، فَحَدِّثْنِي بِحَدِيثٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَنْفَعَنِي بِهِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاَتُهُ، فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ، فَإِنْ انْتَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ شَيْءٌ، قَالَ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَيُكَمَّلَ بِهَا مَا انْتَقَصَ مِنَ الفَرِيضَةِ، ثُمَّ يَكُونُ سَائِرُ عَمَلِهِ عَلَى ذَلِكَ. وَفِي البَابِ عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُ أَصْحَابِ الحَسَنِ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ حُرَيْثٍ، غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ. وَالمشْهُورُ هُوَ قَبِيصَةُ بْنُ حُرَيْثٍ، وَرُوِي عَنْ أَنَسِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوُ هَذَا.

واتە: لە (حُرَيْث)ی کوڕی قەبیصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە شاری مەدینە وتم: خوایە کۆڕ و دانیشتنێکی باش و ئاسانم بەنسیب بکەی و ئامادەی کۆڕی پیاوچاکان بم، فەرمووی: لە کۆڕی ئەبو هورەیرەدا دانیشتم، وتم: من داوام کردووە لە خوای گەورە کۆڕ و دانیشتنی پیاوچاکانم پێ ببەخشێت، فەرموودەیەکم بۆ بگێڕیتەوە لە پێغەمبەری خوای (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیستبێ بەلکو ئەو فەرموودە سوودم پێ بگەیەنێت، جا ئەبو هورەیرە فەرمووی:

بۆ خۆم گوێم لـە پێغەمبـەری خـوای (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفـەرموو: (یەکـەم کردەوەیە کە خوای گەورە بەندەی لەسەر موحاسەبە دەکات لەرۆژی قیامەتدا نوێژە فەرزەکانیەتی، ئەگەر نوێژە فەرزەکانی بە تەواوی و بە رێك و پێکـی کردبـوو ئـەوە سەرکەوتوو سەرفراز و رزگاربووە، خۆ ئەگەر نوێژەکانی بە تـەواوی و رێـك و پێکـی نـەکردبوو ئـەوە پەشـیمان و رەنـج بـە خەسـار و مالوێرانـە، جا ئەگـەر لـە نوێـژە فەرزەکانی کەم و کورِی هەبوو، پەروەردگار دەفەرمووێت: بروانن ئاخۆ ئەم بەندەیەم نوێژی سـوننەتی هەیـە؟ ئەگـەر هـەیبوو ئـەوە کـەم و کـورِی نوێـژە فـەرزەکانی لـە سوننەتەکان بۆ تەواو دەکرێت، لەپاشدا باقی کردەوەکانی تریشی بە هەمان شێوە).

## ئەوانەی لە شەو و رۆژێکدا دوانزە رکات سوننەت دەکەن.

٣٠٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ

ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ، مَا لَهُ فِيهِ مِنَ الفَضْلِ

٤١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سُلَيْمَانَ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ ثَابَرَ عَلَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الجَنَّةِ: أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الفَجْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي مُوسَى، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَمُغِيرَةُ بْنُ زِيَادٍ قَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتـە: لـە عائیشـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەوەی بەردەوام بێ لەسەر ئەنجامدانی دوانزە رکات نوێژی سوننەت لە شەو و رۆژێکدا خوای گەورە لە بەهەشتداماڵێکی بۆ دروست دەکات: چوار رکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات لەدوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات لەدوای نوێژی شێوان، دوو رکات لەدوای نوێژی خەوتنان، دوو رکات لەپێش نوێژی بەیانی).

٤١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْمُسَيَّبِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الجَنَّةِ: أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ صَلاَةِ الْغَدَاةِ. وَحَدِيثُ عَنْبَسَةَ عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ فِي هَذَا البَابِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَنْبَسَةَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ.

واتە: لە ئوممو حەبیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەوەی لە شەو و رۆژێکدا دوانزە رکات نوێژی سوننەت بکات خوای گەورە لە بەهەشتدا ماڵێکی بۆ دروست دەکات: چوار رکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات لەدوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات لەدوای نوێژی شێوان، دوو رکات لەدوای نوێژی خەوتنان، دوو رکات لەپێش نوێژی بەیانی).

## دەربارەی گەورەیی دوو رکات سوننەتی پێش بەیانی

٣٠٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رَكْعَتَيِ الفَجْرِ مِنَ الفَضْلِ

٤١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ التِّرْمِذِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَكْعَتَا الفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ عَبْدِ اللهِ التِّرْمِذِيِّ حَدِيثًا.

**واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (دوو رکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی لە هەموو دونیاو ئەوەی لەناو دونیادا هەیە چاکترە).**

## دەربارەی دوو رکات نوێژی سوننەتی سوکەڵەی بەیانی و ئەو سورەتانەی کە لەو دوو رکاتەدا دەخوێنرێن.

٣٠٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَخْفِيفِ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ وَالْقِرَاءَةِ فِيهَا

٤١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَأَبُو عَمَّارٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَال: رَمَقْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا فَكَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الفَجْرِ، بِ (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ)، وَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ). وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَحَفْصَةَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَلاَ نَعْرِفُهُ مِنْ

حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أَحْمَدَ وَالمَعْرُوفُ عِنْدَ النَّاسِ حَدِيثُ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ. وَقَدْ رَوَى عَنْ أَبِي أَحْمَدَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا. وَأَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ ثِقَةٌ حَافِظٌ، سَمِعْتُ بُنْدَارًا، يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ حِفْظًا مِنْ أَبِي أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيِّ. وَاسْمُهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ الأَسَدِيُّ الكُوفِيُّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: یەك مانگ سەرنجی پێغەمبەرم دا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لـە دوو ركـات سـوننەتی پێش نوێژی بەیانیدا: (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ) و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی دەخوێند.

## قسەكردن لەدوای دوو ركات نوێژی بەیانی

٣٠٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَلاَمِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ

٤١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، قَالَ: سَمِعْتُ مَالِكَ بْنَ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيِ الفَجْرِ فَإِنْ كَانَتْ لَهُ إِلَيَّ حَاجَةٌ كَلَّمَنِي، وَإِلاَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ كَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمُ الكَلاَمَ بَعْدَ طُلُوعِ الفَجْرِ حَتَّى يُصَلِّيَ صَلاَةَ الفَجْرِ، إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ ذِكْرِ اللهِ أَوْ مِمَّا لاَ بُدَّ مِنْهُ. وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتـە: لـە عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوو ركـات سـوننەتی پـێش نوێـژی بـەیانی دەكرد، ئەگەر كارێكی پێویستی پـێم هەبوایـە گفتوگـۆی لەگـەڵ دەكـردم، ئـەگینا دەردەچوو بۆ نوێژی بەیانی.

## دوای دەرکەوتنی فەجر نوێژی سوننەت نییە جگە لەدوو رکات

٣١٠ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ صَلاَةَ بَعْدَ طُلُوعِ الفَجْرِ إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ

٤١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ قُدَامَةَ بْنِ مُوسَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الحُصَيْنِ، عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ، عَنْ يَسَارٍ، مَوْلَى ابْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ صَلاَةَ بَعْدَ الفَجْرِ إِلاَّ سَجْدَتَيْنِ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: إِنَّمَا يَقُولُ: لاَ صَلاَةَ بَعْدَ طُلُوعِ الفَجْرِ، إِلاَّ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَحَفْصَةَ.حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ قُدَامَةَ بْنِ مُوسَى، وَرَوَى عَنْهُ غَيْرُ وَاحِدٍ.وَهُوَ مَا اجْتَمَعَ عَلَيْهِ أَهْلُ العِلْمِ: كَرِهُوا أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ بَعْدَ طُلُوعِ الفَجْرِ إِلاَّ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (دوای هەڵهاتنی فەجر نوێژ نییە جگە لەدوو رکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی).**

## راکشان لەدوای دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی

٣١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الاِضْطِجَاعِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ

٤٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى يَمِينِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيِ الفَجْرِ فِي بَيْتِهِ اضْطَجَعَ عَلَى يَمِينِهِ. وَقَدْ رَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ أَنْ يُفْعَلَ هَذَا اسْتِحْبَابًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس لە ئێوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی کرد با لەسەر لای ڕاست ڕاکشێ).

لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر لەماڵەکەی ئەودا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی بکردایە لەسەر لای ڕاست ڕادەکشا.

## کە قامەت کرا بۆ نوێژ جگە لە نوێژە فەرزەکە نوێژی تر نیە

٣١٢ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ

٤٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ. وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَهَكَذَا رَوَى أَيُّوبُ، وَوَرْقَاءُ بْنُ عُمَرَ، وَزِيَادُ بْنُ سَعْدٍ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ جُحَادَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرَوَى حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، وَسُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، وَلَمْ يَرْفَعَاهُ. وَالْحَدِيثُ الْمَرْفُوعُ أَصَحُّ عِنْدَنَا. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ أَنْ لاَ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ. رَوَاهُ عَيَّاشُ بْنُ عَبَّاسٍ الْقِتْبَانِيُّ

الْمِصْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ کە قامەت کرا بۆ نوێژی فەرز، جگە لە نوێژە فەرزەکە نابێ هیچ نوێژێکی تر بکرێت).

## ئەوەی ئەو دوو ڕکاتەی لەدەست چوو لەدوای نوێژی بەیانی بیانکات.

٣١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ تَفُوتُهُ الرَّكْعَتَانِ قَبْلَ الفَجْرِ يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ صَلاَةِ الفَجْرِ

٤٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو السَّوَّاقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ جَدِّهِ قَيْسٍ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ الصُّبْحَ، ثُمَّ انْصَرَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَنِي أُصَلِّي، فَقَالَ: مَهْلاً يَا قَيْسُ، أَصَلاَتَانِ مَعًا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي لَمْ أَكُنْ رَكَعْتُ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ، قَالَ: فَلاَ إِذَنْ. حَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، لاَ نَعْرِفُهُ مِثْلَ هَذَا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ. وقَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ: سَمِعَ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، مِنْ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ هَذَا الحَدِيثَ. وَإِنَّمَا يُرْوَى هَذَا الحَدِيثُ مُرْسَلاً. وَقَدْ قَالَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ بِهَذَا الحَدِيثِ، لَمْ يَرَوْا بَأْسًا أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ. وَسَعْدُ بْنُ سَعِيدٍ هُوَ أَخُو يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ. وَقَيْسٌ هُوَ جَدُّ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ، وَيُقَالُ: هُوَ قَيْسُ بْنُ عَمْرٍو، وَيُقَالُ: ابْنُ قَهْدٍ. وَإِسْنَادُ هَذَا الحَدِيثِ لَيْسَ بِمُتَّصِلٍ مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيُّ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ قَيْسٍ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ فَرَأَى قَيْسًا. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ.

واتە: لە قەیسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەماڵ دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی قامەت کرا منیش نوێژی بەیانم لەگەڵ کرد، کاتێ کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەنوێژ بوویەوە بینی من نوێژ دەکەم ئینکاری کردوو فەرمووی: (ئەی قەیس ئەوە دوو نوێژی فەرز لەکاتی یەك نوێژی فەرزدا پێکەوە دەکەیت؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوە دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانیم لەدەست چوو، فەرمووی: (دەی ئەوە دروستە قەیدی نییە).

## گێڕانەوەی دوو ڕکات سوننەتی بەیانی لەدوای هەڵهاتنی خۆر.

### ٣١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِعَادَتِهِمَا بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ

٤٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ مُكْرَمٍ العَمِّيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ لَمْ يُصَلِّ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ فَلْيُصَلِّهِمَا بَعْدَ مَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ فَعَلَهُ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَوَى هَذَا الحَدِيثَ عَنْ هَمَّامٍ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَ هَذَا إِلاَّ عَمْرَو بْنَ عَاصِمٍ الكِلاَبِيَّ. وَالمعْرُوفُ مِنْ حَدِيثِ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەوەی دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی نەکرد با لەدوای هەڵهاتنی خۆر ئەنجامیان بدات).

لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەوەی لەپێش هەڵهاتنی خۆردا بگات بە رکاتێکی نوێژی بەیانیدا ئەوە گەیشتوە بە نوێژی بەیانیدا).

## دەربارەی چوار رکات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ.

### ٣١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الأَرْبَعِ قَبْلَ الظُّهْرِ

٤٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ. حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ العَطَّارُ قَالَ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: كُنَّا نَعْرِفُ فَضْلَ حَدِيثِ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ عَلَى حَدِيثِ الحَارِثِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ: يَخْتَارُونَ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: صَلاَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى يَرَوْنَ الفَصْلَ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەپێش نوێژی نیوەڕۆ چوار رکات نوێژی سوننەتی دەکرد و لەدوای نوێژی نیوەڕۆش دوو رکات.

زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان و ئەوانەی دوای ئەوانیش ئەمەیان بەلاوە پەسەندە پیاو لەپێش نوێژی نیوەڕۆدا چوار رکات نوێژی سوننەت بکات، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و ئیسحاقە و خەڵکی کوفەیە. هەندێ لە زانایان دەفەرموون: نوێژی سوننەتی شەو و رۆژ دوو رکات دوو رکاتە، رایان وایە جیابکرێنەوە دوو رکات دوو رکات ئەنجام بدرێن، پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد ئەمە دەفەرموون.

## دوو رکات سوننەت لەدوای نوێژی نیوەڕۆ

٣١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ

٤٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەپێش نوێژی نیوەڕۆ دوو رکات نوێژی سوننەتم کردوەو لەدوای نوێژی نیوەڕۆش دوو رکات).

## باسێکی تر لەوبارەوە

٣١٧ - بَابٌ آخَرُ

٤٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ العَتَكِيُّ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا

عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا لَمْ يُصَلِّ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ صَلاَّهُنَّ بَعْدَهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ الْمُبَارَكِ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَرَوَاهُ قَيْسُ بْنُ الرَّبِيعِ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ نَحْوَ هَذَا. وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَوَاهُ عَنْ شُعْبَةَ غَيْرَ قَيْسِ بْنِ الرَّبِيعِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوُ هَذَا.

**واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەپێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ركات سوننەتی نەکردایە ئەوا لەدوای نوێژی نیوەڕۆ چوار ركاتی دەکرد).**

٤٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الشُّعَيْثِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَلَّى قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا وَبَعْدَهَا أَرْبَعًا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

**واتە: لە ئوممو حەبیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێك چوار ركات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ركاتی پاش نیوەڕۆ ئەنجام بدات و بەردەوام بێت لەسەریان، ئەوە جەستەی لە ئاگری دۆزەخ پارێزراو دەبێت و ناچێتە دۆزەخەوە).**

٤٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ التِّنِّيسِيُّ الشَّامِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الهَيْثَمُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي العَلاَءُ بْنُ الحَارِثِ، عَنِ القَاسِمِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ أُخْتِي أُمَّ

حَبِيبَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَالقَاسِمُ هُوَ ابْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يُكْنَى أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَهُوَ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ وَهُوَ ثِقَةٌ شَامِيٌّ، وَهُوَ صَاحِبُ أَبِي أُمَامَةَ.

واتە: لە عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم بیستم لە خوشکەکەم ئومی حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەموو: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: (هەرکەسێك پارێزگاری بکات لە چوار ڕکات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ڕکاتی پاش نیوەڕۆ و بەردەوام بێت لەسەریان، ئەوە جەستەی لە ئاگری دۆزەخ پارێزراو دەبێت و ناچێتە دۆزەخەوە).

## دەربارەی چوار ڕکات سوننەتی پێش نوێژی عەسر.

### ٣١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الأَرْبَعِ قَبْلَ العَصْرِ

٤٢٩ - (حسن) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي قَبْلَ العَصْرِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ يَفْصِلُ بَيْنَهُنَّ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالمؤْمِنِينَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَاخْتَارَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ أَنْ لاَ يُفْصَلَ فِي الأَرْبَعِ قَبْلَ العَصْرِ وَاحْتَجَّ بِهَذَا الحَدِيثِ. وقَال: وَمَعْنَى أَنَّهُ يَفْصِلُ بَيْنَهُنَّ بِالتَّسْلِيمِ، يَعْنِي: التَّشَهُّدَ. وَرَأَى الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ: صَلاَةَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى يَخْتَارَانِ الفَصْلَ

واتە: لە پێشەوا عەلیـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لـەپێش نوێـژی عەسـر چـوار رکـات نوێـژی سوننەتی بە دوو سەلام دانەوە دەکرد واتە دوو رکات دوو رکات، سلاوی دەکـرد لـە مەلائیکە نزیکەکان، هەروەها لە هەموو موسوڵمان و باوەڕداری کە پەیڕەوی ئەوان دەکات.

پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد رایان وایە نوێژی سوننەتی شـەو و رۆژ دوو رکـات دوو رکاتە، ئەو چوار رکات سـوننەتەی پـێش نوێـژی عەسـر دوو رکـات دوو رکـات بکرێت.

٤٣٠ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَأَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمِ بْنِ مِهْرَانَ، سَمِعَ جَدَّهُ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: (رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ العَصْرِ أَرْبَعًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (رەحمەتی خـوا لـەو کەسـە بـێ لەپێش نوێژی عەسر چوار رکات نوێژی سوننەت دەکات).

## دوو رکات لەدوای نوێژی شێوان و ئەو قورئانەی دەخوێنرێت

٣١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ وَالقِرَاءَةِ فِيهِمَا

٤٣١ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَال: حَدَّثَنَا بَدَلُ بْنُ الْمُحَبَّرِ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَعْدَانَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ بَهْدَلَةَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّهُ قَال: مَا أُحْصِي مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي

الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ وَفِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الفَجْرِ بِ (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ)، وَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ). وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ عَاصِمٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆم هەژمار ناکرێ کە چەند جارم بیستووە لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە دوو ڕکاتی دوای نوێژی شێوان و دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی هەردوو سورەتی: (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ) و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی دەخوێند.

## دەربارەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ماڵەوە دوو ڕکات سوننەتی دوای نوێژی شێوانی دەکرد.

٣٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يُصَلِّيهِمَا فِي البَيْتِ

٤٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، وَكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوو ڕکات نوێژی سوننەتم کردووە لەدوای نوێژی شێوان لە ماڵی خۆیدا.

٤٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الحُلْوَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: حَفِظْتُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشْرَ رَكَعَاتٍ كَانَ يُصَلِّيهَا بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ: رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ الآخِرَةِ. قَالَ: وَحَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ: أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الفَجْرِ رَكْعَتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم فەرموودەم لەبەرکردووە لە شەو و رۆژێکدا ئەم دە رکات نوێژە سوننەتەی دەکرد: دوو رکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو رکات لەدوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات لەدوای نوێژی شێوان، دوو رکات لەدوای نوێژی خەوتنان. هەروەها فەرمووی: حەفصەش بۆی باس کردم کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەپێش نوێژی بەیانی دوو رکات نوێژی سوننەتی دەکرد.**

٤٣٤ - حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

## فەزڵی نوێژی سوننەت و شەش رکات لەدوای نوێژی شێوان

٣٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ التَّطَوُّعِ وَسِتِّ رَكَعَاتٍ بَعْدَ الْمَغْرِبِ

٤٣٥ - (ضعيف جداً) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ يَعْنِي مُحَمَّدَ بْنَ الْعَلَاءِ الْهَمْدَانِيَّ الْكُوفِيَّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ الحُبَابِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ أَبِي خَثْعَمٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَلَّى بَعْدَ الْمَغْرِبِ سِتَّ رَكَعَاتٍ لَمْ يَتَكَلَّمْ فِيمَا بَيْنَهُنَّ بِسُوءٍ عُدِلْنَ لَهُ بِعِبَادَةِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ

سَنَةً. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ صَلَّى بَعْدَ الْمَغْرِبِ عِشْرِينَ رَكْعَةً بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الجَنَّةِ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ زَيْدِ بْنِ الحُبَابِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي خَثْعَمٍ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ: يَقُولُ: عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي خَثْعَمٍ مُنْكَرُ الحَدِيثِ وَضَعَّفَهُ جِدًّا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەدوای نوێژی شێوان شەش رکات نوێژ بکات لەنێوانیاندا قسەی خراپ نەکات وەك ئەوە وایە دە ساڵ پەرستش بکات).

هەروەها لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەدوای نوێژی شێوان بیست رکات نوێژ بکات خوای گەورە لە هەشتدا ماڵێکی بۆ دروست دەکات).

## دەربارەی دوو رکات سوننەتی پاش نوێژی خەوتنان

### ٣٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ

٤٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ ثِنْتَيْنِ، وَبَعْدَ العِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَ الفَجْرِ ثِنْتَيْنِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ عَنْ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شەقیقەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت بەنوێژە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە عائیشەم پرسی؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد، لەپاشدا دوو ڕکات سوننەتی پاش نیوەڕۆی دەکرد، لەدوای نوێژی شێوان دوو ڕکات سوننەتی پاش نوێژی شێوانی دەکرد، لەدوای نوێژی خەوتنان دوو ڕکات سوننەتی پاش نوێژی خەوتنانی دەکرد، لەپێش نوێژی بەیانی دوو ڕکاتی دەکرد.

## دەربارەی شەونوێژ کە دوو ڕکات دوو ڕکاتە.

٣٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ صَلاَةَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى

٤٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ، وَاجْعَلْ آخِرَ صَلاَتِكَ وِتْرًا. وَفِي البَابِ عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ: حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ صَلاَةَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر یەکێ لەئێوە ترسی ئەوەی هەبوو نوێژە ویترەکەی بکەوێتە کاتی بەیانی با ڕکاتێ نوێژی ویتر بکات و بەوە کۆتایی بە شەونوێژەکەی بێنێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی شەونوێژ.

### ٣٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ صَلاَةِ اللَّيْلِ

٤٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحِمْيَرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَبِلاَلٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو بِشْرٍ اسْمُهُ جَعْفَرُ بْنُ إِيَاسٍ، وَهُوَ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي وَحْشِيَّةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (باشترین و چاكترین رۆژوو لەدوای رۆژووی مانگی رەمەزان رۆژووی مانگی موحەرەمە، هەروەها باشترین و چاكترین نوێژیش لەدوای نوێژە فەرزەكان شەونوێژە).

## دەربارەی چۆنیەتی شەونوێژی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

### ٣٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وَصْفِ صَلاَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ

٤٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَال: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ، كَيْفَ كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلاَ فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلاَثًا، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ

تُوتِرَ؟ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە سەبارەت بە شەونوێژی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كە چۆن بووە لە مانگی رەمەزاندا لە عائیشەم پرسی؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مانگی رەمەزان و غەیری مانگی رەمەزان یانزە ركات زیاتری نەدەكرد، چوار ركاتی دەكرد، پرسیاری جوانی و درێژیان مەكە، لەپاشدا چوار ركاتی تریشی دەكرد، پرسیاری جوانی و درێژیان مەكە، لەپاشدا سێ ركاتی دەكرد، عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جار بە جاری دەخەوی پێش ئەوەی نوێژی ویتر بكەی؟ فەرمووی: ئەی عائیشە چاوەكانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ.

٤٤٠ - (صحيح الا اضطجاع فإنه شاذ) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، فَإِذَا فَرَغَ مِنْهَا اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یانزە ركات شەونوێژی دەكرد بە ركاتێ نوێژی ویتر كۆتایی پێ دەهێنا، كاتێ كە لێ دەبوەوە لەسەر لای راستی رادەكشا.

## باسێكی تر لەوبارەوە

٣٢٦ - بَابٌ مِنْهُ

٤٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ،

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو جَمْرَةَ اسْمُهُ نَصْرُ بْنُ عِمْرَانَ الضُّبَعِيُّ

**واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یانزە ڕکات شەونوێژی دەکرد.**

## باسێکی تر لەوبارەوە

**٣٢٧ - بَابٌ مِنْهُ**

٤٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَالفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

**واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نۆ ڕکات شەونوێژی دەکرد.**

٤٤٤ - وَرَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَ هَذَا، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ. وَأَكْثَرُ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلاَةِ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً مَعَ الوِتْرِ، وَأَقَلُّ مَا وُصِفَ مِنْ صَلاَتِهِ بِاللَّيْلِ تِسْعُ رَكَعَاتٍ.

**واتە: لە ئەعمەشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە زۆرترین ڕیوایەتێ هاتووە دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەمەیە کە سیانزە ڕکاتی دەکرد لەگەڵ نوێژی ویتر، لای کەمی نۆ ڕکاتی دەکرد.**

ئەگەر شەونوێژی نەکردایە بەرۆژا دەیکرد.

٣٢٨ - باب إذا نام عن صلاته بالليل صلى بالنهار

٤٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا لَمْ يُصَلِّ مِنَ اللَّيْلِ، مَنَعَهُ مِنْ ذَلِكَ النَّوْمُ، أَوْ غَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ، صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَسَعْدُ بْنُ هِشَامٍ هُوَ ابْنُ عَامِرٍ الأَنْصَارِيُّ، وَهِشَامُ بْنُ عَامِرٍ هُوَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر خەو زۆری بۆ بهێنایەو شەونوێژی نەکردایە، ئەوا ڕۆژەکەی لەنێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا دوانزە ڕکات نوێژی دەکرد.

٤٤٥ (م) - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ هُوَ ابْنُ عَبْدِ العَظِيمِ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَتَّابُ بْنُ الْمُثَنَّى، عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، قَالَ: كَانَ زُرَارَةُ بْنُ أَوْفَى قَاضِيَ البَصْرَةِ، فَكَانَ يَؤُمُّ فِي بَنِي قُشَيْرٍ، فَقَرَأَ يَوْمًا فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ: (فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ)، خَرَّ مَيِّتًا، فَكُنْتُ فِيمَنْ احْتَمَلَهُ إِلَى دَارِهِ.

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەو ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: قازی بەصرە زوورارەی کوڕی ئەوفا پێشنوێژی بۆ بەنی قوشەیر دەکرد، ڕۆژێ لەنوێژی بەیانیدا ئەم ئایەی خوێندەوە کەوت و مرد، بۆ خۆم یەکێ بووم لەوانەی کە هەڵمگرت و بردمانەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئەمەش ئایەتەکەیە: (فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ) سورة المدثر: ٧-٨. واتە: هەرکاتێ کە فوو کرا بە کەڕەنادا، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەخت و گرانە.

## دەربارەی دابەزینی پەروەردگار بۆ ئاسمانی دونیا هەموو شەوێ.

### ٣٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نُزُولِ الرَّبِّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ

٤٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الإِسْكَنْدَرَانِيُّ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَنْزِلُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ حِينَ يَمْضِي ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ، فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ ذَا الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ ذَا الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ، فَلاَ يَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُضِيءَ الفَجْرُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَرِفَاعَةَ الجُهَنِيِّ، وَجُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، وَعُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ أَوْجُهٍ كَثِيرَةٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. أَنَّهُ قَالَ: يَنْزِلُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ. وَهُوَ أَصَحُّ الرِّوَايَاتِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (خوای گەورەو پەروەردگار هەموو شەوێ لەسێیەکی دوایی شەودا دێتەخوارەوە[1] بۆ ئاسمانی دونیا، دەفەرموێت: من پاشاو خاوەن دەسەلاتم، کێ لێم دەپاڕێتەوەو هاناو هاوارم بۆ دێنێ هەتا بێم بەهاواریەو نزاکانی گیرا بکەم، کێ داوام لێ دەکات هەتا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبونم لێ دەکات تا لێی خۆش ببم، بەردەوام بەو شێوەیە هەتا شەبەق دەدات).

[1] دابەزینێ کە شایەنی گەورەیی شکۆمەندی و کەمالی ئەو بێت بەبێ ئەوەی بچوێنرێت بە دروستکراوەکانی, ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین خوای گەورە بۆ خۆی دەیزانێ.

## چۆنیەتی قورئان خوێندن لە شەونوێژدا.

٣٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقِرَاءَةِ بِاللَّيْلِ

٤٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَبَاحٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأَبِي بَكْرٍ: مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تَقْرَأُ وَأَنْتَ تَخْفِضُ مِنْ صَوْتِكَ، فَقَالَ: إِنِّي أَسْمَعْتُ مَنْ نَاجَيْتُ، قَالَ: ارْفَعْ قَلِيلاً، وَقَالَ لِعُمَرَ: مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تَقْرَأُ وَأَنْتَ تَرْفَعُ صَوْتَكَ، قَالَ: إِنِّي أُوقِظُ الوَسْنَانَ، وَأَطْرُدُ الشَّيْطَانَ، قَالَ: اخْفِضْ قَلِيلاً. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأُمِّ هَانِئٍ، وَأَنَسٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَإِنَّمَا أَسْنَدَهُ يَحْيَى بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، وَأَكْثَرُ النَّاسِ إِنَّمَا رَوَوْا هَذَا الحَدِيثَ عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَبَاحٍ مُرْسَلاً.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە ئەبو بەکری فەرموو: بەلاتدا تێپەڕیم شەونوێژت دەکرد بە دەنگی نزم قورئانت دەخوێند، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەو کەسەی کە من گفتوگۆم لەگەڵی دەکردو لێی دەپاڕامەوە گوێی لێم بوو، فەرمووی: (کەمێ دەنگت بەرزکەرەوە!). بە پێشەوا عومەریشی فەرموو: (ئەی عومەر بەلاتدا تێپەڕیم شەونوێژت دەکرد بە دەنگی بەرز قورئانت دەخوێند!). پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بەوە خەو لەچاوی خەواڵوەکان دەتۆرێنم و خەبەریان دەکەمەوە، هەروەها شەیتانیش ڕاودەنێم و دووری دەخەمەوە! فەرمووی: (تۆش کەمێ دەنگت نزم بکەرەوە).

٤٤٨ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ نَافِعٍ البَصْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ العَبْدِيِّ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ النَّاجِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِآيَةٍ مِنَ القُرْآنِ لَيْلَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتــە: لــە عائیشـــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شـەوێ هەسـتا بـۆ شـەونوێژی یـەك ئایـەتی قورئانی خوێند.

٤٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ، قَال: سَأَلْتُ عَائِشَةَ كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ؟ أَكَانَ يُسِرُّ بِالْقِرَاءَةِ أَمْ يَجْهَرُ؟ فَقَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا أَسَرَّ بِالْقِرَاءَةِ، وَرُبَّمَا جَهَرَ، فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربـارەی چـۆنیـەتی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە شـەونوێژدا لـە عائیشـەم پرسی؟ ئایا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە بێ دەنگی قورئـانی دەخوێنـد یان بەدەنگەوە؟ فەرمووی: بە هەردوو شێوەکە قورئانی دەخوێند، هەندێ جار بـەبێ دەنگی قورئانی دەخوێند، هەندێ جاریش بەدەنگەوە. وتم: سوپاس بۆ خوای گـەورە چەندە ئاسانکاری بـۆ کـردووین لەشـەرعەکەیدا بـواری کـار و فەرمانەکـەی فـراوان کردووە بۆمان.

**دەربارەی فەزڵی نوێژی سوننەت لەماڵەوە.**

٣٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ صَلاَةِ التَّطَوُّعِ فِي البَيْتِ

٤٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَفْضَلُ صَلاَتِكُمْ فِي بُيُوتِكُمْ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدٍ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ. حَدِيثُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ اخْتَلَفُوا فِي رِوَايَةِ هَذَا الحَدِيثِ: فَرَوَى مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ مَرْفُوعًا. وَرَوَاهُ مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَأَوْقَفَهُ بَعْضُهُمْ، وَالحَدِيثُ الْمَرْفُوعُ أَصَحُّ.

**واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (جگە لە نوێژە فەرزەکان باشترین و چاکترین نوێژ ئەو نوێژەیە کە لەماڵەوە دەکرێت).**

٤٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ وَلاَ تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لەماڵەکانی خۆتاندا نوێژە سوننەتەکان ئەنجام بدەن، ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان).**

# باسەکانی نوێژی ویتر.

## ٣ - أَبْوَابُ الوِتْرِ

### فەزڵ و گەورەیی نوێژی ویتر

### ٣٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الوِتْرِ

٤٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَاشِدٍ الزَّوْفِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُرَّةَ الزَّوْفِيِّ، عَنْ خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَمَدَّكُمْ بِصَلاَةٍ هِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ: الوِتْرُ، جَعَلَهُ اللَّهُ لَكُمْ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ العِشَاءِ إِلَى أَنْ يَطْلُعَ الفَجْرُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَبُرَيْدَةَ، وَأَبِي بَصْرَةَ الغِفَارِيِّ صَاحِبِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدِيثُ خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ. وَقَدْ وَهِمَ بَعْضُ الْمُحَدِّثِينَ فِي هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَاشِدٍ الزُّرَقِيُّ، وَهُوَ وَهَمٌ. وَأَبُو بَصْرَةَ الغِفَارِيُّ اسْمُهُ حُمَيْلُ بْنُ بَصْرَةَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: جَمِيلُ بْنُ بَصْرَةَ، وَلاَ يَصِحُّ. وَأَبُو بَصْرَةَ الغِفَارِيُّ رَجُلٌ آخَرُ يَرْوِي عَنْ أَبِي ذَرٍّ وَهُوَ ابْنُ أَخِي أَبِي ذَرٍّ.

واتــە: لــە خاریجــەی کــوڕی (حُذَافَــة)ەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەماڵ دەرچوو هات بۆ لامان و فەرمووی: (خوای گەورە سەرەڕای نوێژە فەرزەکان نوێژی تـری بـۆ زیـادکردون، ئـەو نوێژەش لە گەلە وشتری سور چاکترە بۆتـان، ئـەویش نوێـژی ویـترە، لـەدوای نوێـژی عیشاوە دەست پێ دەکات هەتا ئەو کاتەی کە شەبەق دەدات).

## دەربارەی نوێژی ویتر كە واجب نیە

٣٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الوِتْرَ لَيْسَ بِحَتْمٍ

٤٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: الوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَصَلَاتِكُمُ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنْ سَنَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ: إِنَّ اللهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الوِتْرَ، فَأَوْتِرُوا يَا أَهْلَ القُرْآنِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ.

**واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: نوێژی ویتر واجب نیە وەك نوێژە فەرزەكانتان، بەڵكو سوننەتی پێغەمبەری خوایە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرموویەتی: (ئەی ئەهلی قورئان! - شەونوێژ و - نوێژی ویتر بكەن كە ژمارەی ركاتەكانی تاكە، چونكە خوای گەورە خۆی تاك و تەنیایە — لە زات و لە سیفاتەكانی و لە ناوەكانیدا، لە (ألوهية) و لە (ربوبية)دا - ، تاكیشی خۆشدەوێت).**

٤٥٤ - (صحيح) وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُهُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: الوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَهَيْئَةِ الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنْ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ. وَقَدْ رَوَى مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ نَحْوَ رِوَايَةِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ.

**واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: نوێژی ویتر واجب نیە وەك نوێژە فەرزەكانتان، بەڵكو سوننەتی پێغەمبەری خوایە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).**

## دەربارەی خەوتن پێش نوێژی ویتر باش نیە

### ٣٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النَّوْمِ قَبْلَ الوِتْرِ

٤٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ عِيسَى بْنِ أَبِي عَزَّةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي ثَوْرٍ الأَزْدِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ، قَالَ عِيسَى بْنُ أَبِي عَزَّةَ: وَكَانَ الشَّعْبِيُّ يُوتِرُ أَوَّلَ اللَّيْلِ ثُمَّ يَنَامُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي ذَرٍّ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَأَبُو ثَوْرٍ الأَزْدِيُّ اسْمُهُ حَبِيبُ بْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ. وَقَدْ اخْتَارَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ أَنْ لاَ يَنَامَ الرَّجُلُ حَتَّى يُوتِرَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کردم: پێش ئەوەی بخەوم نوێژی ویتر بکەم.

پێشەوا شەعبی لەسەرەتای شەوەوە نوێژی ویتری دەکرد، لەپاشدا دەخەوت. هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و ئەوانەی دوای ئەوانیش ئەمەیان بەلاوە پەسەندە کە پیاو هەتا نوێژی ویتر نەکات نەخەوێت.

٤٥٦ - (صحيح) وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ خَشِيَ مِنْكُمْ أَنْ لاَ يَسْتَيْقِظَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ مِنْ أَوَّلِهِ، وَمَنْ طَمِعَ مِنْكُمْ أَنْ يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَإِنَّ قِرَاءَةَ القُرْآنِ فِي آخِرِ اللَّيْلِ مَحْضُورَةٌ، وَهِيَ أَفْضَلُ). حَدَّثَنَا بِذَلِكَ هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ.

واتە: لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە ترسی ئەوەی هەبوو خەبەری نەبێتەوە با لەسەرەتای شەوەوە نوێژی ویتر بکات، ئەگەر یەکێ لەئێوە دەیزانی و بەهیوای ئەوە بوو کە خەبەری دەبێتەوە ئەوە با لە کۆتایی شەودا نوێژی ویتر بکات، لەبەرئەوەی قورئان خوێندنی کۆتایی شەو مەلائیکەی رەحمەت ئامادەی دەبن و دەینوسن، چاکتریشە).

## ئەنجامدانی نوێژی ویتر لەسەرەتاو کۆتایی شەودا

٣٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الوِتْرِ مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ وَآخِرِهِ

٤٥٧ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو حَصِينٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ وَثَّابٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَتْ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ أَوَّلَهُ، وَأَوْسَطَهُ، وَآخِرَهُ، فَانْتَهَى وِتْرُهُ حِينَ مَاتَ إِلَى السَّحَرِ. أَبُو حَصِينٍ اسْمُهُ عُثْمَانُ بْنُ عَاصِمٍ الأَسَدِيُّ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ، وَأَبِي قَتَادَةَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ الَّذِي اخْتَارَهُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ الوِتْرُ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ.

واتە: لە مەسروقەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی چۆنیەتی نوێژی ویتری پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە عائیشەی پرسیوە؟ ئەویش فەرموویەتی: لەهەموو کاتێکی شەودا نوێژی ویتری دەکرد: لەسەرەتای شەودا، لە ناوەڕاستی شەودا، لە کۆتایی شەودا، بەڵام لەپێش مردنیدا هەر بەرەبەیان نوێژی وەتری دەکرد واتە لەپێش نوێژی بەیانیدا.

## دەربارەی نوێژی ویتر بە حەوت ركات.

## ٣٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الوِتْرِ بِسَبْعٍ

٤٥٨ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ الجَزَّارِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُوتِرُ بِثَلاَثَ عَشْرَةَ، فَلَمَّا كَبِرَ وَضَعُفَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. حَدِيثُ أُمِّ سَلَمَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الوَتْرُ بِثَلاَثَ عَشْرَةَ، وَإِحْدَى عَشْرَةَ، وَتِسْعٍ، وَسَبْعٍ، وَخَمْسٍ، وَثَلاَثٍ، وَوَاحِدَةٍ. قَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: مَعْنَى مَا رُوِيَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُوتِرُ بِثَلاَثَ عَشْرَةَ، قَالَ: إِنَّمَا مَعْنَاهُ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً مَعَ الوِتْرِ، فَنُسِبَتْ صَلاَةُ اللَّيْلِ إِلَى الوِتْرِ، وَرَوَى فِي ذَلِكَ حَدِيثًا عَنْ عَائِشَةَ. وَاحْتَجَّ بِمَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَوْتِرُوا يَا أَهْلَ القُرْآنِ، قَالَ: إِنَّمَا عَنَى بِهِ قِيَامَ اللَّيْلِ، يَقُولُ: إِنَّمَا قِيَامُ اللَّيْلِ عَلَى أَصْحَابِ القُرْآنِ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە سیانزە ركات نوێژی ویتری دەکرد، بەڵام کاتێ کە پیر و بێ هێز بوو حەوت ركات نوێژی ویتری دەکرد.

بێگومان لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە نوێژی ویتری کردووە بە سیانزە ركات و یانزە ركات و نۆ ركات و حەوت ركات و پێنج ركات و سێ ركات و یەك ركاتیش.

ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم دەفەرموێت: مانای دەگێڕنەوە، لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە نوێژی ویتری کردووە بە سیانزە ركات ئەمەیە: سیانزە ركات شەونوێژی کردووە لەگەڵ نوێژی ویتر، نیسبەتی شەونوێژیان داوەتە پاڵ نوێژی ویتر.

لەوبارەوە فەرموودەیە لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، ئەم فەرموودەش دەكەنە بەڵگە لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەی ئەهلی قورئان! شەونوێژ و نوێژی ویتر بكەن).

## دەربارەی نوێژی ویتر بە پێنج ركات.

### ٣٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الوِتْرِ بِخَمْسٍ

٤٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَتْ صَلاَةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ مِنْ ذَلِكَ بِخَمْسٍ، لاَ يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ إِلاَّ فِي آخِرِهِنَّ، فَإِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمُ الوِتْرَ بِخَمْسٍ، وَقَالُوا: لاَ يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ إِلاَّ فِي آخِرِهِنَّ. وَسَأَلْتُ أَبَا مُصْعَبٍ الْمَدِينِيَّ، عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُوتِرُ بِالتِّسْعِ وَالسَّبْعِ، قُلْتُ: كَيْفَ يُوتِرُ بِالتِّسْعِ وَالسَّبْعِ؟ قَالَ: يُصَلِّي مَثْنَى مَثْنَى، وَيُسَلِّمُ، وَيُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: شەونوێژی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سیانزە ركات بوو، بە پێنج ركات نوێژی ویتری دەكرد، لەنێوان هیچ كامیاندا دانەدەنیشت لە كۆتایی دا نەبێت، كاتێ كە بانگبێژ بانگی بەیانی دەدا هەڵەسایەوە دوو ركات نوێژی سوكەڵەی دەكرد.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە نۆ ركات و حەوت ركات نوێژی ویتری

دەکرد، وتم: چۆن چۆنی بە نۆ ركات و حەوت ركات نوێژی ویتری دەکرد، فەرمووی: دوو ركات دوو ركات و سەلامی دەدایەوە، بە یەك ركات كۆتایی پێ دەهێنا.

## دەربارەی نوێژی ویتر بە سێ ركات.

### ٣٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الوِتْرِ بِثَلاَثٍ

٤٦٠ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُوتِرُ بِثَلاَثٍ، يَقْرَأُ فِيهِنَّ بِتِسْعِ سُوَرٍ مِنَ الْمُفَصَّلِ، يَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِثَلاَثِ سُوَرٍ آخِرُهُنَّ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ). وَفِي البَابِ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. وَيُرْوَى أَيْضًا عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَكَذَا رَوَى بَعْضُهُمْ فَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أُبَيٍّ، وَذَكَرَ بَعْضُهُمْ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أُبَيٍّ. وَقَدْ ذَهَبَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ إِلَى هَذَا، وَرَأَوْا: أَنْ يُوتِرَ الرَّجُلُ بِثَلاَثٍ. قَالَ سُفْيَانُ: إِنْ شِئْتَ أَوْتَرْتَ بِخَمْسٍ، وَإِنْ شِئْتَ أَوْتَرْتَ بِثَلاَثٍ، وَإِنْ شِئْتَ أَوْتَرْتَ بِرَكْعَةٍ. قَالَ سُفْيَانُ: وَالَّذِي أَسْتَحِبُّ أَنْ أُوتِرَ بِثَلاَثِ رَكَعَاتٍ. وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ الْمُبَارَكِ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ. حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَعْقُوبَ الطَّالَقَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كَانُوا يُوتِرُونَ بِخَمْسٍ، وَبِثَلاَثٍ، وَبِرَكْعَةٍ، وَيَرَوْنَ كُلَّ ذَلِكَ حَسَنًا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە سێ ركات نوێژی ویتری دەکرد، حەوت سورەتی لە سورەتە (مفصل)ەکان دەخوێند، لەهەموو ركاتێکدا سێ سورەتی دەخوێند، کۆتاییەکەی سورەتی: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی دەخوێند.

**دەربارەی نوێژی ویتر بە یەك ركات.**

٣٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الوِتْرِ بِرَكْعَةٍ

٤٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ، فَقُلْتُ: أُطِيلُ فِي رَكْعَتَيِ الفَجْرِ؟ فَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، وَكَانَ يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ وَالأَذَانُ فِي أُذُنِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَجَابِرٍ، وَالفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالتَّابِعِينَ: رَأَوْا أَنْ يَفْصِلَ الرَّجُلُ بَيْنَ الرَّكْعَتَيْنِ وَالثَّالِثَةِ يُوتِرُ بِرَكْعَةٍ. وَبِهِ يَقُولُ مَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی سیرینەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە ئیبنو عومەرم ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی وتم: من درێژە دەدەم بە دوو ركات سوونەتی پێش نوێژی بەیانی؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوو ركات دوو ركات شەونوێژی دەكردو سەلامی دەدایەوەو بە یەك ركاتیش كۆتایی پێ دەهێنا، جا دوو ركات نوێژی سوكەڵەی پێش نوێژی بەیانی بە خێرایی دەكرد.

**لە نوێژی ویتردا چ سورەتێ دەخوێنرێت.**

٣٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُقْرَأُ فِي الوِتْرِ

٤٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الوِتْرِ:

بِ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) وَ (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ، وَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) فِي رَكْعَةٍ رَكْعَةٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. وَيُرْوَى عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَرَأَ فِي الوِتْرِ فِي الرَّكْعَةِ الثَّالِثَةِ بِالمعَوِّذَتَيْنِ، وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَالَّذِي اخْتَارَهُ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ أَنْ يَقْرَأَ: بِ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)، وَ (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ)، وَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)، يَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ مِنْ ذَلِكَ بِسُورَةٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی ویتردا ئەم سورەتانەی دەخوێند: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) و (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ) و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) لەهەر رکاتێکدا سورەتێکیانی دەخوێند.

ئەبو عیسا واتە پێشەوا (ترمذي) دەفەرموێت: لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لە رکاتی سێیەمی نوێژی ویتردا (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی دەخوێند.

ئەوەی کە زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوانیان رایان لەسەریەتی ئەمەیە: لەرکاتی یەکەمدا سورەتی: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) دەخوێنرێت، لەرکاتی دووەمدا: (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ) دەخوێنرێت، لەرکاتی سێهەمدا: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) دەخوێنرێت.

٤٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ الحَرَّانِيُّ، عَنْ خُصَيْفٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: سَأَلْنَا

عَائِشَةَ، بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقْرَأُ فِي الأُولَى: بِ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)، وَفِي الثَّانِيَةِ بِ (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ)، وَفِي الثَّالِثَةِ بِ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)، وَالمعَوِّذَتَيْنِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَعَبْدُ العَزِيزِ هَذَا هُوَ وَالِدُ ابْنِ جُرَيْجٍ صَاحِبِ عَطَاءٍ، وَابْنُ جُرَيْجٍ اسْمُهُ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ جُرَيْجٍ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عبد العزیز)ی کوڕی جورەیجەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئەو سورەتانەی کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە سێ ڕکاتی کۆتایی نوێژی ویتردا دەیخوێندن لە عائیشەمان ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەرکاتی یەکەمدا سورەتی: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)ی دەخوێند، لەرکاتی دووەمدا: (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ)ی دەخوێند، لەرکاتی سێهەمدا: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)ی دەخوێند.

## دەربارەی قنوت خوێندن لە نوێژی ویتردا

### ٣٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القُنُوتِ فِي الوِتْرِ

٤٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ أَبِي الحَوْرَاءِ، قَال: قَالَ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الوِتْرِ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ وَفِي البَابِ

عَنْ عَلِيٍّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ وَاسْمُهُ رَبِيعَةُ بْنُ شَيْبَانَ. وَلاَ نَعْرِفُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي القُنُوتِ فِي الوِتْرِ شَيْئًا أَحْسَنَ مِنْ هَذَا. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي القُنُوتِ فِي الوِتْرِ: فَرَأَى عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ القُنُوتَ فِي الوِتْرِ فِي السَّنَةِ كُلِّهَا، وَاخْتَارَ القُنُوتَ قَبْلَ الرُّكُوعِ. وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَإِسْحَاقُ، وَأَهْلُ الكُوفَةِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّهُ كَانَ لاَ يَقْنُتُ إِلاَّ فِي النِّصْفِ الآخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، وَكَانَ يَقْنُتُ بَعْدَ الرُّكُوعِ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ.

واتە: حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چەند وشەیەکی فێرکردوم لە نوێژی وەتردا بیانڵێم: (اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ) واتە: خودایە! ڕێنمونیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا ڕێنمونیت کردون، پارێزراو و لەش ساغم بکە لەگەڵ پارێزراواندا، پشتم بگرە لەگەڵ پشتگیری لێکراواندا، لەوەی کە دەیبەخشیت پێم بەرەکەتی تێبخە، لەخراپەی ئەوەی بڕیارت لەسەری داوە بمپارێزە، بەڕاستی تۆ بڕیار دەدەیت و کەس بڕیار نادات بەسەرتدا، ئەوەی تۆ پشتگیری بکەیت هەرگیز ریسواو زەبون نابێت، ئەوەی تۆ دوژمنایەتی بکەیت هەرگیز بە عیزەت و بەدەسەڵات نابێ، پاکی و بێگەردی و بەرزی و بڵندی بۆ تۆیە پەروەردگارمان.

زانایان رایان جیاوازە لەسەر قنوت خوێندن لە نوێژی ویتردا. (عبد الله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ پێی وایە بەدرێژایی ساڵ بخوێنرێت، هەروەها ئەمەی

هەڵبژاردووە لەپێش رکوع بردندا بخوێنرێت. ئەمەش وتەی هەندێ لە زانایانە، پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارك و ئیسحاق و خەڵکی کوفە ئەمە دەفەرموون.

لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قنوتی نەدەخوێند هەتا نیوەی کۆتایی مانگی رەمەزان، لەدوای رکوع بردن قنوتی دەخوێند. هەندێ لە زانایان راو بۆچونیان لەسەر ئەمەیە. پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد ئەمە دەفەرموون.

## کەسێ بخەوێ نوێژی ویتر نەکات یا لەیادی بچێت.

٣٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَنَامُ عَنِ الوِتْرِ، أَوْ يَنْسَاهُ

٤٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ نَامَ عَنِ الوِتْرِ أَوْ نَسِيَهُ فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَ وَإِذَا اسْتَيْقَظَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ بخەوێ و نوێژی ویتر نەکات یان لەیادی بچێت کاتێ کە خەبەری بوویەوە یان یادی کەوتەوە ئەوکاتە ئەنجامی بدات).

٤٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ نَامَ عَنْ وِتْرِهِ فَلْيُصَلِّ إِذَا أَصْبَحَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ

الحَدِيثِ الأَوَّلِ. سَمِعْتُ أَبَا دَاوُدَ السِّجْزِيَّ يَعْنِي سُلَيْمَانَ بْنَ الأَشْعَثِ يَقُولُ: سَأَلْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، فَقَالَ: أَخُوهُ عَبْدُ اللهِ لاَ بَأْسَ بِهِ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَذْكُرُ عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ أَنَّهُ ضَعَّفَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ وقَالَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ثِقَةٌ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ الْكُوفَةِ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ، وَقَالُوا: يُوتِرُ الرَّجُلُ إِذَا ذَكَرَ، وَإِنْ كَانَ بَعْدَ مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبــەری خــوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویــەتی: (هەرکەســێ بخەوێ و نوێژی ویتر نەکات کاتێ کە ڕۆژی کردەوە ئەنجامی بدات).

## دەستپێشخەری لەئەنجامدانی نوێژی ویتر پێش شەبەق

### ٣٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مُبَادَرَةِ الصُّبْحِ بِالوِتْرِ

٤٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُاللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَادِرُوا الصُّبْحَ بِالوِتْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پەلە بکەن لەپێش شەبەقدا نوێژی ویتر بکەن).

٤٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا.

لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ مەسافەی ماڵەکەی ئەوەندە دوور بێ لەدوای نوێژی هەینی بڕواتەوە شەو بگاتە ماڵەوە نوێژی هەینی لەسەر واجبە).

زانایان رایان جیاوازە لەسەر ئەوەی مەسافەی دووری چەند بێ موسوڵمان نوێژی هەینی لەسەر واجبە: هەندێکیان دەفەرموون: ئەگەر کەسێ مەسافەی ماڵەکەی ئەوەندە دوور بێ لەدوای نوێژی هەینی بڕواتەوە شەو بگاتە ماڵەوە ئەوە نوێژی هەینی لەسەر واجبە. هەندێکی تریان دەفەرموون: کەسێ گوێی لەبانگی نوێژی هەینی بێ ئەوە واجبە لەسەری، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

٥٠٢ - (ضعيف جدا) سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ الحَسَنِ يَقُولُ: كُنَّا عِنْدَ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ فَذَكَرُوا عَلَى مَنْ تَجِبُ الجُمُعَةُ، فَلَمْ يَذْكُرْ أَحْمَدُ فِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا قَالَ أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ: فَقُلْتُ لأَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ فِيهِ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ أَحْمَدُ: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ: حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ نُصَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَارِكُ بْنُ عَبَّادٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الجُمُعَةُ عَلَى مَنْ آوَاهُ اللَّيْلُ إِلَى أَهْلِهِ قَالَ: فَغَضِبَ عَلَيَّ أَحْمَدُ وَقَالَ: اسْتَغْفِرْ رَبَّكَ اسْتَغْفِرْ رَبَّكَ. إِنَّمَا فَعَلَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ هَذَا لأَنَّهُ لَمْ يَعُدَّ هَذَا الحَدِيثَ شَيْئًا وَضَعَّفَهُ لِحَالِ إِسْنَادِهِ.

پێشەوا (الترمذي)ی دەفەرمووێت: بۆ خۆم گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەسەن بوو دەیفەرموو: لە خزمەت پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا دانیشتبووین، باسی

ئـەوەیان دەکـرد نوێـژی هـەینی لەسـەر کـێ واجبـە، پێشـەوا ئەحمـەد هـیچ فەرمودەیەکی لـەوبارەوە لـە پێغەمبـەرەوە (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) نەگێڕایـەوە، ئەحمەدی کوڕی حەسـەن فـەرمووی: وتم بـە پێشـەوا ئەحمـەد فەرموودەیـە لـە ئـەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ، لە پێغەمبـەرەوە (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) لـەوبارەوە دەگێڕنەوە، پێشەوا ئەحمەد فەرمووی: لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)؟ وتم: بەڵێ، ئەحمەدی کوڕی حەسەن فەرمووی: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەر (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرموویـەتی: (ئەگـەر کەسـێ مەسافەی ماڵەکەی ئەوەندە دوور بێ لەدوای نوێـژی هـەینی بڕواتـەوە شـەو بگاتـە ماڵەوە ئەوە نوێژی هـەینی لەسـەر واجبـە). ئەحمـەدی کـوڕی حەسـەن فـەرمووی: پێشەوا ئەحمەد لێم توڕە بوو پێی فەرمووم: داوا بکە لە پـەروەردگارت لێـت خـۆش ببێ، داوا بکە لە پەروەردگارت لێت خۆش ببێ. پێشەوا (الترمذي)ی دەفەرموێت: بۆیە لێی توڕە بوو چونکە بە هیچ شێوەیە بە فەرموودەی دانەنا، لەرووی سەنەدەوە بە لاوازی دانا.

### سەبارەت بە کاتی نوێژی هەینی

٣٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وَقْتِ الجُمُعَةِ

٥٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُرَيْجُ بْنُ النُّعْمَانِ، قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي الجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا ئەوکاتە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) نوێـژی هەینی دەکرد.

## دەربارەی كاتی ئەنجامدانی نوێژی هەینی

### ٣٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وَقْتِ الجُمُعَةِ

٥٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُرَيْجُ بْنُ النُّعْمَانِ، قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي الجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كاتێ خۆر لاردەبووەوە بەلای خۆرئاوادا ئەو كاتە نوێژی هەینی ئەنجام دەدا.

٥٠٤ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَنَسٍ، نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَجَابِرٍ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ الَّذِي أَجْمَعَ عَلَيْهِ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ وَقْتَ الجُمُعَةِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ كَوَقْتِ الظُّهْرِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنَّ صَلَاةَ الجُمُعَةِ إِذَا صُلِّيَتْ قَبْلَ الزَّوَالِ أَنَّهَا تَجُوزُ أَيْضًا. وقَالَ أَحْمَدُ: وَمَنْ صَلَّاهَا قَبْلَ الزَّوَالِ فَإِنَّهُ لَمْ يَرَ عَلَيْهِ إِعَادَةً.

زۆربەی زانایان كۆدەنگن و ڕایان لەسەر ئەمەیە: كاتێ خۆر لاربووەوە بەلای خۆرئاوادا كاتی نوێژی هەینییە وەك نوێژی نیوەڕۆ، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێكی تریان ڕایان وایە: ئەگەر نوێژی هەینی پێش ئەوەی خۆر لادا ئەنجام بدرێت هەر دروستە. پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت:

ئەگەر کەسێ پێش ئەوەی خۆر لادا نوێژی هەینی ئەنجام بدا دروستەو، گێڕانەوەی لەسەر نیە.

## دەربارەی وتاردان لەسەر مینبەر

### ٣٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُطْبَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ

٥٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ الفَلاَّسُ، قَال: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، وَيَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ أَبُو غَسَّانَ العَنْبَرِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ العَلاَءِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ، فَلَمَّا اتَّخَذَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمِنْبَرَ حَنَّ الجِذْعُ حَتَّى أَتَاهُ فَالتَزَمَهُ فَسَكَنَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَجَابِرٍ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ. وَمُعَاذُ بْنُ العَلاَءِ هُوَ بَصْرِيٌّ، وَهُوَ أَخُو أَبِي عَمْرِو بْنِ العَلاَءِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەتەنیشت قەدی دار خورمایە وتاری دەدا، کاتێ کە مینبەری بۆ دانرا قەدە دارخورماکە نالآندی و گریا زۆر بە پەرۆش بوو بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەتا رۆشت بۆ لای و لە ئامێزی گرت ئەوکاتە ئەهوەن بووەوە و بێ دەنگ بوو.

دەربارەی دانیشتنی نێوان دوو وتارەكە.

٣٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الجُلُوسِ بَيْنَ الخُطْبَتَيْنِ

٥٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ، ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ، فَيَخْطُبُ، قَالَ: مِثْلَ مَا تَفْعَلُونَ اليَوْمَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ الَّذِي رَآهُ أَهْلُ العِلْمِ أَنْ يَفْصِلَ بَيْنَ الخُطْبَتَيْنِ بِجُلُوسٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رۆژی هەینی وتاری دەدا، لەپاشدا دادەنیشت، ئینجا هەڵەسایەوە وتاری دەدا، فەرمووی: وەك ئەوەی كە ئەمڕۆ دەیكەن.

پێشەوا (ترمذی) دەفەرموێت: زۆربەی زانایان رایان لەسەر دانیشتنی نێوان دوو وتارەكەیە.

دەربارەی وتاری كورت و پوخت.

٣٦٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَصْرِ الخُطْبَةِ

٥٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانَتْ صَلاَتُهُ قَصْدًا، وَخُطْبَتُهُ قَصْدًا. وَفِي البَابِ عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، وَابْنِ أَبِي أَوْفَى. حَدِيثُ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە جـابیری کــوڕی ســەمورەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەرا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نویـژم کـردووە، بێگومـان نوێژکردن و وتاردانی مام ناوەند و کورت و پوخت بوو.

## دەربارەی قورئان خوێندن لەسەر مینبەر

## ٣٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القِرَاءَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ

٥٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ عَلَى الْمِنْبَرِ: (وَنَادَوْا يَا مَالِكُ). وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ. حَدِيثُ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَهُوَ حَدِيثُ ابْنِ عُيَيْنَةَ. وَقَدْ اخْتَارَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يَقْرَأَ الإِمَامُ فِي الخُطْبَةِ آيًا مِنَ القُرْآنِ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَإِذَا خَطَبَ الإِمَامُ فَلَمْ يَقْرَأْ فِي خُطْبَتِهِ شَيْئًا مِنَ القُرْآنِ أَعَادَ الخُطْبَةَ.

واتە: لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خـۆم گـوێم لـە پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بـوو لەسـەر مینبــەر ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: (وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ) سورة الزخرف: ٧٧. واتــە: (دۆزەخیـەکان) هـاوار دەکـەن ئـەی مالیك(سەرپەرشتیاری دۆزەخ)، با پەروەردگارت بمانمرێنێ (تا ڕزگاربین). بێگومـان ئەویش دەفەرموێت: دەمێننەوە.

هەندێ لـە زانایـان ئـەمـەیان هەلبـژاردووە: دەبـێ وتاربێـژ ئایـەتێ بخوێنێتـەوە. پێشـەوا شـافیعی دەفـەرموێت: ئەگـەر وتاربێـژ لەوتارەکەیـدا شـتێ لـە قورئـانی نەخوێندەوە با وتارەکەی دووبارە بکاتەوە.

## دەربارەی رووکردنە وتاربێژ لەکاتی وتارداندا

### ٣٦٦ - بَابٌ فِي اسْتِقْبَالِ الْإِمَامِ إِذَا خَطَبَ

٥٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ يَعْقُوبَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفَضْلِ بْنِ عَطِيَّةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى الْمِنْبَرِ اسْتَقْبَلْنَاهُ بِوُجُوهِنَا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. وَحَدِيثُ مَنْصُورٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ الفَضْلِ بْنِ عَطِيَّةَ. وَمُحَمَّدُ بْنُ الفَضْلِ بْنِ عَطِيَّةَ ضَعِيفٌ ذَاهِبُ الحَدِيثِ عِنْدَ أَصْحَابِنَا. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: يَسْتَحِبُّونَ اسْتِقْبَالَ الإِمَامِ إِذَا خَطَبَ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَلاَ يَصِحُّ فِي هَذَا البَابِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْءٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەچووە سەر مینبەر روومان تێ دەکرد.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش، رووکردنە وتاربێژیان پێ باشە لەکاتی وتارداندا، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## دەربارەی دوو ركات نوێژی كەسێ كە هات لەكاتی وتاردانداا

## ٣٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ

٥١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصَلَّيْتَ؟، قَالَ: لاَ، قَالَ: قُمْ فَارْكَعْ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیری كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ڕۆژێكی هەینی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتاری دەدا، لەوكاتەدا پیاوێ هاتە ژوورەوە دانیشت، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرموو: (ئەی فلان كەس ئایا كە هاتیتە ژوورەوە دوو ركات نوێژی سوننەتت كرد؟). وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی هەستە دوو ركات نوێژ بكە).

٥١١ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ، دَخَلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَمَرْوَانُ يَخْطُبُ، فَقَامَ يُصَلِّي، فَجَاءَ الحَرَسُ لِيُجْلِسُوهُ، فَأَبَى حَتَّى صَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَتَيْنَاهُ، فَقُلْنَا: رَحِمَكَ اللَّهُ، إِنْ كَادُوا لَيَقَعُوا بِكَ، فَقَالَ: مَا كُنْتُ لأَتْرُكَهُمَا بَعْدَ شَيْءٍ رَأَيْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ ذَكَرَ أَنَّ رَجُلاً جَاءَ يَوْمَ الجُمُعَةِ فِي هَيْئَةٍ بَذَّةٍ، وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَأَمَرَهُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ. قَالَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: كَانَ ابْنُ عُيَيْنَةَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ إِذَا جَاءَ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ وَيَأْمُرُ بِهِ وَكَانَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُقْرِئُ يَرَاهُ. وَسَمِعْتُ ابْنَ أَبِي عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: كَانَ مُحَمَّدُ بْنُ عَجْلاَنَ ثِقَةً مَأْمُونًا فِي

الحَدِيثِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا دَخَلَ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَإِنَّهُ يَجْلِسُ وَلاَ يُصَلِّي. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا العَلاَءُ بْنُ خَالِدٍ القُرَشِيُّ، قَالَ: رَأَيْتُ الحَسَنَ البَصْرِيَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ. إِنَّمَا فَعَلَ الحَسَنُ اتِّبَاعًا لِلْحَدِيثِ، وَهُوَ رَوَى عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الحَدِيثَ.

واتە: لە (عیاض)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی ئەبو سەرحەوە دەگێڕنەوە، کە رۆژی هەینی مەروان وتاری دەدا ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێ هاتە مزگەوت دوو رکات نوێژی کرد، پاسەوان هات بۆ ئەوەی داینیشێنێ، ئەویش نکولی کرد و لەسەر نوێژی خۆی بەردەوام بوو، کاتێ کە لێ بوویەوە چوینە خزمەتی وتمان: رەحمەتی خوات لێ بێ، خەریك بوو لێت بدەن و جنێوت پێ بدەن، ئەبو سەعیدی خودری فەرمووی: من تەرکی ئەو دوو رکاتە ناکەم لەدوای ئەوەی لە پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە، لەپاشدا فەرمووی: رۆژێکی هەینی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتاری دەدا، لەوکاتەدا پیاوێ حاڵی خراپ بوو لە هەژار دەچوو هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کرد دوو رکات نوێژی کرد.

ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: سوفیانی کوڕی عویەینە کاتێ کە دەهات بۆ مزگەوت وتاربێژ وتاری دەدا دوو رکات نوێژی دەکرد، فەرمانی بەوەش دەکرد، حەسەنی بەصریش کاتێ کە دەهات بۆ مزگەوت وتاربێژ وتاری دەدا دوو رکات نوێژی دەکرد.

## ئەوەی هاتووە قسەکردن دروست نیە لەکاتی وتارداندا.

٣٦٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الكَلاَمِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ

٥١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ: أَنْصِتْ، فَقَدْ لَغَا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. كَرِهُوا لِلرَّجُلِ أَنْ يَتَكَلَّمَ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَالُوا: إِنْ تَكَلَّمَ غَيْرُهُ فَلاَ يُنْكِرْ عَلَيْهِ إِلاَّ بِالإِشَارَةِ. وَاخْتَلَفُوا فِي رَدِّ السَّلاَمِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ. فَرَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي رَدِّ السَّلاَمِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ. وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَكَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ وَغَيْرِهِمْ ذَلِكَ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لەکاتی وتاری هەینی دا هەرکەسێ بە هاوەڵەکەی بڵێ بێدەنگ بە ئەوە قسەی نابەجێ و پڕوپوچی کردوە و خێری نوێژەکەی نامێنێ).

بەکارکردن بەم فەرموودە زانایان دەفەرموون: لەکاتێکدا کە وتاربێژ وتار دەدات قسەکردن دروست نیە، دەفەرموون: ئەگەر کەسێ قسەی کرد ئینکاری کرد با ئاماژەی بۆ بکات کە بێ دەنگ بێ، زانایان رایان جیاوازە لەسەر وەڵامدانەوەی سەلام لەکاتی وتارداندا، هەروەها کەسێ بپژمێ و بڵێ: (الحمد لله) پێی بڵێن: (يرحمك الله)، هەندێ لە زانایان رێگەیان پێ داوە، ئەمەش وتەی: پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێکی تر لە شوێنکەوتوان و جگە لەوانیش دەفەرموون: باش نیە، ئەمەش وتەی: پێشەوا شافیعیە.

## دەربارەی هەنگاونان بەسەر خەڵکدا باش نیە.

٣٦٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّخَطِّي يَوْمَ الجُمُعَةِ

٥١٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَال: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ زَبَّانَ بْنِ فَائِدٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الجُمُعَةِ اتَّخَذَ جِسْرًا إِلَى جَهَنَّمَ. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ. حَدِيثُ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الجُهَنِيِّ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ رِشْدِينَ بْنِ سَعْدٍ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: كَرِهُوا أَنْ يَتَخَطَّى الرَّجُلُ يَوْمَ الجُمُعَةِ رِقَابَ النَّاسِ، وَشَدَّدُوا فِي ذَلِكَ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي رِشْدِينَ بْنِ سَعْدٍ وَضَعَّفُوهُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)ی کوڕی ئەنەسی جوهەنیەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ لە ڕۆژی هەینیدا هەنگاو بنێ بەسەر خەڵکدا وەك ئەوە وایە پردێ دروست بکات و بەسەریدا هەنگاو بنێ بەرەو دۆزەخ). هەندێ لە زانایان هەنگاونانیان بەسەر خەڵکدا پێ باش نیە و توندبوون لەسەری.

## دەربارەی دانیشتنی (حبوة) لەکاتی وتارداندا باش نیە

٣٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الاِحْتِبَاءِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ

٥١٤ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، وَالْعَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُقْرِئُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي أَيُّوبَ قَال: حَدَّثَنِي أَبُو مَرْحُومٍ، عَنْ

سَهْلِ بْنِ مُعَاذٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الحِبْوَةَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَأَبُو مَرْحُومٍ اسْمُهُ عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ مَيْمُونٍ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ الحِبْوَةَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ. وَرَخَّصَ فِي ذَلِكَ بَعْضُهُمْ. مِنْهُمْ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَغَيْرُهُ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ لاَ يَرَيَانِ بِالحِبْوَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ بَأْسًا.

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)ی جوهەنیەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قەدەغەیکردوە لەوکاتەدا کە پێشنوێژ وتاری هەینی دەدات کەسێ هەردوو لاقی بلکێنێ بە سکیەوەو شەتەکیان بدات بەخۆیەوە.

هەندێ لە زانایان دانیشتنی (حبوة)یان بەلاوە باش نیە لەکاتێکدا کە وتاربێژ وتاری هەینی دەدات. بەڵام هەندێکیان رێگەیان پێ داوە، لەوانە: (عبد الله)ی کوڕی عومەر و جگە لەویش. پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون: رایان وایە کە دروستە.

## دەربارەی دەست بەرزکردنەوە لەسەر مینبەر باش نیە.

٣٧١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ رَفْعِ الأَيْدِي عَلَى الْمِنْبَرِ

٥١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُصَيْنٌ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَارَةَ بْنَ رُوَيْبَةَ، وَبِشْرُ بْنُ مَرْوَانَ يَخْطُبُ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ فِي الدُّعَاءِ، فَقَالَ عُمَارَةُ: قَبَّحَ اللَّهُ هَاتَيْنِ اليُدَيَّتَيْنِ القُصَيِّرَتَيْنِ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَا يَزِيدُ عَلَى أَنْ يَقُولَ هَكَذَا، وَأَشَارَ هُشَيْمٌ بِالسَّبَّابَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عومارەی کوڕی روەیبەوە دەگێڕنەوە، کە جارێ بیشری کوڕی مەروان لەسەر مینبەر وتاری دەدا لەکاتی پاڕانەوەدا هەردوو دەستی بەرزکردەوە، عومارە وتی: خوای گەورە ئەو دوو دەستە کورتانەی ناشیرین بکات، بۆ خۆم پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە لەمە زیاتری نەدەکرد لەکاتی پاڕانەوەدا لەسەر مینبەر تەنها پەنجەی شایەتومانی بەرزدەکردەوە. هوشەیم ئاماژەی دا بە پەنجەی شایەتومانی.

## سەبارەت بە بانگدانی نوێژی هەینی

### ٣٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَذَانِ الجُمُعَةِ

٥١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ خَالِدٍ الخَيَّاطُ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: كَانَ الأَذَانُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، إِذَا خَرَجَ الإِمَامُ، وَإِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ زَادَ النِّدَاءَ الثَّالِثَ عَلَى الزَّوْرَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و ئەبو بەکر و عەمەردا رەزای خوایان لێ بێ کاتێ کە وتاربێژ دەچووە سەر مینبەر و دادەنیشت ئەوکاتە بانگ دەدرا، کاتێکیش کە لەوتارەکەی دەبوەوە قامەت دەکرا واتە ئەوە دوو بانگ، بەڵام کاتێ کە پێشەوا (عُثْمَان) رەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفەو خەڵك زۆر بوون بانگی سێهەمی زیاد کرد، لەسەر (زَّوْرَاء)[1] بانگ دەدرا.

(١) شوێنێك بووە لەبازاڕی مەدینە لەنزیك مزگەوتەوە.

## دەربارەی قسەکردن لەدوای دابەزینی پێشنوێژ لەسەر مینبەر

## ٣٧٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَلاَمِ بَعْدَ نُزُولِ الإِمَامِ مِنَ الْمِنْبَرِ

٥١٧ - (شاذ) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكَلَّمُ بِالحَاجَةِ إِذَا نَزَلَ عَنِ الْمِنْبَرِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ. سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: وَهِمَ جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ فِي هَذَا الحَدِيثِ، وَالصَّحِيحُ مَا رُوِيَ عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَال: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَأَخَذَ رَجُلٌ بِيَدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَا زَالَ يُكَلِّمُهُ حَتَّى نَعَسَ بَعْضُ القَوْمِ. وَالحَدِيثُ هُوَ هَذَا. وَجَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ رُبَّمَا يَهِمُ فِي الشَّيْءِ، وَهُوَ صَدُوقٌ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَهِمَ جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ فِي حَدِيثِ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَيُرْوَى عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، قَال: كُنَّا عِنْدَ ثَابِتٍ البُنَانِيِّ، فَحَدَّثَ حَجَّاجٌ الصَّوَّافُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي فَوَهِمَ جَرِيرٌ، فَظَنَّ أَنَّ ثَابِتًا حَدَّثَهُمْ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ لەسەر مینبەر دادەبەزی ئەگەر پێویستی بکردایە قسەی دەکرد.

لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: قامەت کرا بۆ نوێژ پیاوێ دەستی پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گرت بەردەوام قسەی لەگەڵ دەکرد هەتا هەندێ لە خەڵکەکە وەنەوزیان دەدا و خەو دەیبردنەوە.

لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کە قامەت کرا هەڵمەسن هەتا دەمبینن دێم بۆ نوێژ).

لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبو قەتادەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کە قامەت کرا هەڵمەسن هەتا دەمبینن دێم بۆ نوێژ).

٥١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ مَا تُقَامُ الصَّلَاةُ يُكَلِّمُهُ الرَّجُلُ، يَقُومُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ فَمَا يَزَالُ يُكَلِّمُهُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ بَعْضَهُمْ يَنْعَسُ مِنْ طُولِ قِيَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دوای ئەوەی قامەت کرا بۆ نوێژ بەچاوی خۆم پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی پیاوێ قسەی لەگەڵ دەکرد، لەنیوان ئەو و قیبلەدا ڕاوەستابوو ئەوەندە قسەی لەگەڵ کرد، هەندێکیانم دی خەو دەیبردنەوە.

## دەربارەی قورئان خوێندن لەنوێژی هەینیدا

### ٣٧٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الجُمُعَةِ

٥١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اسْتَخْلَفَ مَرْوَانُ أَبَا هُرَيْرَةَ عَلَى الْمَدِينَةِ، وَخَرَجَ إِلَى مَكَّةَ، فَصَلَّى بِنَا أَبُو هُرَيْرَةَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَقَرَأَ سُورَةَ الجُمُعَةِ، وَفِي السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ: إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ، قَالَ عُبَيْدُ اللهِ: فَأَدْرَكْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ فَقُلْتُ لَهُ: تَقْرَأُ بِسُورَتَيْنِ كَانَ عَلِيٌّ يَقْرَأُ بِهِمَا بِالكُوفَةِ؟ قَالَ أَبُو

هُرَيْرَةَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ بِهِمَا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، وَأَبِي عِنَبَةَ الخَوْلاَنِيِّ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِي عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلاَةِ الجُمُعَةِ بِ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)، وَ (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الغَاشِيَةِ).

واتە: لە (عُبَيْدِ الله)ی کوڕی ئیبنو ئەبی رافیعی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: مەروان رۆشت بۆ شاری مەککە و ئەبو هورەیرەی لە شاری مەدینە لە جێگەی خۆی دانا، رۆژی هەینی ئەبو هورەیرە بەرنوێژی بۆ کردین، لە رکاتی یەکەمدا سورەتی: جومعەی خوێند؟ وە لە رکاتی دووەمدا: (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ)ی واتە سورەتی مونافقینی خوێند. (عُبَيْدِ الله) فەرمووی: گەیشتم بە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ پێم وت: تۆ ئەم دوو سورەتەت خوێند کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ لە کوفە خوێندنی! ئەبو هورەیرە فەرمووی: بەگوێی خۆم بیستم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی هەینیدا دەخوێندن.

لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لە رکاتی یەکەمی نوێژی هەینیدا سورەتی: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)ی خوێند؟ لە رکاتی دووەمیشدا سورەتی: (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الغَاشِيَةِ)ی خوێند.

## دەربارەی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی رۆژی هەینی

## ٣٧٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَا يَقْرَأُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

٥٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ مُخَوَّلِ بْنِ رَاشِدٍ،

عَنْ مُسْلِمٍ البَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ يَوْمَ الجُمُعَةِ فِي صَلاَةِ الفَجْرِ: تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الإِنْسَانِ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ مُخَوَّلٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی بەیانی رۆژی هەینیدا: (الم، تَنْزِيلُ ...) واتە سورەتی سەجدە و (هَلْ أَتَى عَلَى الإِنْسَانِ ...) واتە سورەتی (الإنسان)ی دەخوێند.

## دەربارەی نوێژكردن لە پێش و دوای نوێژی هەینی

٣٧٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ قَبْلَ الجُمُعَةِ وَبَعْدَهَا

٥٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَيْضًا. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوكیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە دوای نوێژی هەینی دوو ركات نوێژی دەكرد.

٥٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا صَلَّى الجُمُعَةَ انْصَرَفَ فَصَلَّى سَجْدَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**واته: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە نوێژی هەینی دەکرد دەچوەوە لەماڵەکەی خۆی دوو رکات نوێژی دەکرد، لەپاشدا فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەی دەکرد.**

٥٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُصَلِّيًا بَعْدَ الجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ أَرْبَعًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ سُهَيْلَ بْنَ أَبِي صَالِحٍ ثَبْتًا فِي الحَدِيثِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. وَرُوِي عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الجُمُعَةِ أَرْبَعًا، وَبَعْدَهَا أَرْبَعًا. وَرُوِيَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّهُ: أَمَرَ أَنْ يُصَلَّى بَعْدَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَرْبَعًا. وَذَهَبَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ إِلَى قَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ. وقَالَ إِسْحَاقُ: إِنْ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ يَوْمَ الجُمُعَةِ صَلَّى أَرْبَعًا، وَإِنْ صَلَّى فِي بَيْتِهِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. وَاحْتَجَّ بِأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَلِحَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُصَلِّيًا بَعْدَ الجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ أَرْبَعًا. وَابْنُ عُمَرَ هُوَ الَّذِي رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَابْنُ عُمَرَ بَعْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ بَعْدَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّى بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ أَرْبَعًا. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ صَلَّى بَعْدَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ صَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ أَرْبَعًا. حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَنَصَّ لِلْحَدِيثِ مِنَ الزُّهْرِيِّ، وَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا الدَّنَانِيرُ وَالدَّرَاهِمُ أَهْوَنُ عَلَيْهِ

مِنْهُ إِنْ كَانَتِ الدَّنَانِيرُ وَالدَّرَاهِمُ عِنْدَهُ بِمَنْزِلَةِ البَعْرِ. سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي عُمَرَ، قَال: سَمِعْتُ سُفْيَانَ بْنَ عُيَيْنَةَ يَقُولُ: كَانَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ أَسَنَّ مِنَ الزُّهْرِيِّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس لەدوای نوێژی هەینی ویستی نوێژ بکات، با چوار ڕکات نوێژ بکات).

لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەپێش نوێژی هەینی چوار ڕکاتی کردووە و لەدوای نوێژی هەینیش چوار ڕکات. پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك لەسەر قسەی (عبد الله)ی کوڕی مەسعودن.

لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرمانی کردووە لەدوای نوێژی هەینی دوو ڕکات نوێژ بکرێت، لەپاشدا چوار کات.

پێشەوا ئیسحاق دەفەرموێت: ئەگەر لەمزگەوت کردی با چوار کات بکات، ئەگەر لەماڵەوەش کردی با دوو ڕکات نوێژ بکات. بە بەڵگەی ئەم دوو فەرموودە:

یەکەم: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ).
واتە: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای نوێژی هەینی لە ماڵەکەی خۆی دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

دووەم: (مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُصَلِّيًا بَعْدَ الجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ أَرْبَعًا). واتە: ئەو کەسەی لەدوای نوێژی هەینی نوێژ دەکات با چوار ڕکات نوێژ بکات).

(عطاء) دەفەرموێت: بە چاوی خۆم ئیبنو عومەرم ڕەزای خوایان لێ بێ دی لەدوای نوێژی هەینی لەمزگەوت دوو ڕکات نوێژی کرد، لەپاشدا چوار ڕکات.

## دەربارەی ئەوەی بگات بە ركاتێ نوێژی هەینیدا

### ٣٧٧ - بَابٌ فِيمَنْ أَدْرَكَ مِنَ الجُمُعَةِ رَكْعَةً

٥٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، وَسَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلاَةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. قَالُوا: مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الجُمُعَةِ صَلَّى إِلَيْهَا أُخْرَى، وَمَنْ أَدْرَكَهُمْ جُلُوسًا صَلَّى أَرْبَعًا. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەوەی بگات بە ركاتێ نوێـژدا ئەوە گەیشتووە بە نوێژدا). وەك ئەوەش وایە بەتەواوی نوێژەكەی بە كۆمەڵ كردبێ.

بە پەیڕەوكردنی ئەم فەرمودە زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش دەفەرموون: هەركەسێ بگات بە ركاتێ نوێژی هەینیدا با خۆی ركاتەكەی تر بكات، ئەگەر كاتێ تەحیاتیان دەخوێنند گەیشت با چوار ركات بكات. پێشەوایان سوفیان و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

## دەربارەی (قەیلولـە)ی لـە رۆژی هەینیدا

٣٧٨ - بَابٌ فِي القَائِلَةِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

٥٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: مَا كُنَّا نَتَغَدَّى فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ نَقِيلُ إِلاَّ بَعْدَ الجُمُعَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. حَدِيثُ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە سـەهلی کـوڕی سـەعدەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لـەپێش نوێـژی هەینی نە نانمان دەخـواردو نـە (قەیلولە)سەرخەوشـکاندنی نیـوەی رۆژمـان دەکـرد، بەڵکو لەدوای نوێژ هەردووکیانمان ئەنجام دەدا.

## ئەوەی لە رۆژی هەینیدا وەنەوزی دا با جێگەکەی بگۆڕێت

٣٧٩ - بَابٌ فِيمَنْ يَنْعَسُ يَوْمَ الجُمُعَةِ أَنَّهُ يَتَحَوَّلُ مِنْ مَجْلِسِهِ

٥٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، وَأَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الجُمُعَةِ فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە رۆژی هەینیدا وەنەوزی دا و خەوبریەوە با جێگەکەی بگۆڕێ و بچێتە شوێنێکی کەوە).

## سەبارەت بە سەفەر لە رۆژی هەینیدا

٣٨٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّفَرِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

٥٢٧ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدَ اللهِ بْنَ رَوَاحَةَ فِي سَرِيَّةٍ، فَوَافَقَ ذَلِكَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَغَدَا أَصْحَابُهُ، فَقَالَ: أَتَخَلَّفُ فَأُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ أَلْحَقُهُمْ، فَلَمَّا صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَآهُ، فَقَالَ لَهُ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَغْدُوَ مَعَ أَصْحَابِكَ؟، فَقَالَ: أَرَدْتُ أَنْ أُصَلِّيَ مَعَكَ ثُمَّ أَلْحَقَهُمْ، فَقَالَ: لَوْ أَنْفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ مَا أَدْرَكْتَ فَضْلَ غَدْوَتِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: قَالَ شُعْبَةُ: لَمْ يَسْمَعِ الحَكَمُ مِنْ مِقْسَمٍ إِلاَّ خَمْسَةَ أَحَادِيثَ، وَعَدَّهَا شُعْبَةُ، وَلَيْسَ هَذَا

الحَدِيثُ فِيمَا عَدَّ شُعْبَةُ. وَكَأَنَّ هَذَا الحَدِيثَ لَمْ يَسْمَعْهُ الحَكَمُ مِنْ مِقْسَمٍ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي السَّفَرِ يَوْمَ الجُمُعَةِ: فَلَمْ يَرَ بَعْضُهُمْ بَأْسًا بِأَنْ يَخْرُجَ يَوْمَ الجُمُعَةِ فِي السَّفَرِ مَا لَمْ تَحْضُرِ الصَّلاَةُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا أَصْبَحَ فَلاَ يَخْرُجْ حَتَّى يُصَلِّيَ الجُمُعَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە رۆژی هەینیدا (عبد الله)ی کوڕی رەواحەی لەگەڵ کۆمەڵێ سەربازدا بەرێ کرد، لەسەرەتای رۆژەوە هاوەڵە سەربازەکانی رۆشتن فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی هەینی دەکەم، لەپاشدا خۆم دەگەیەنمە هاوەڵەکانم، کاتێ کە لەخزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی هەینی کرد بینی، پێی فەرموو: (ئەوە چی رێگری لێ کردی دواکەوتی و لەسەرەتای رۆژەوە لەگەڵ هاوەڵەکانت نەرۆشتی؟). فەرمووی: ویستم لەخزمەت تۆدا نوێژی هەینی بکەم، لەپاشدا خۆم بگەیەنمە هاوەڵەکانم، فەرمووی: (ئەگەر هەرچی لەسەر زەویدایە بیبەخشی ناگەی بەوان و فەزڵی رۆشتنی سەرەتای رۆژت دەست ناکەوێ)

زانایان رایان جیاوازە لەسەر سەفەرکردن لە رۆژی هەینیدا، هەندێکیان بەلایانەوە دروستە و هیچی تێدا نیە ئەگەر کاتی نوێژ نەهاتبوو. هەندێکیان دەفەرموون: ئەگەر رۆژی کردەوە با دەرنەچێ هەتا نوێژی هەینی دەکات.

## بەکارهێنانی سیواك و بۆنی خۆش لە رۆژی هەینیدا

### ٣٨١ - بَابٌ فِي السِّوَاكِ وَالطِّيبِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

٥٢٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحَسَنِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو يَحْيَى إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيُّ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: حَقٌّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ أَنْ يَغْتَسِلُوا يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَلْيَمَسَّ أَحَدُهُمْ مِنْ طِيبِ أَهْلِهِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَالمَاءُ لَهُ طِيبٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَشَيْخٍ مِنَ الأَنْصَارِ.

واتــە: لــە بــەرائى كــورِی عازیبــەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پێویستە لەسـەر سەرجەم موسوڵمانان هەفتەی جارێ خۆیان بشۆن، وە هەر یەکێ لەوان بۆنی خۆشی ماڵەوەیان لەخۆی بدات، ئەگەر دەستی نەکەوت ئەوە لـەجیاتی بـۆنی خـۆش ئـاو بەسە بۆی واتە خۆشتنەکە بەسە بۆی).

٥٢٩ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. حَدِيثُ البَرَاءِ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَرِوَايَةُ هُشَيْمٍ أَحْسَنُ مِنْ رِوَايَةِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ. وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيُّ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ.

# دەربارەی باسەکانی جەژنی رەمەزان و قوربان

## أَبْوَابُ العِيدَيْنِ

### دەربارەی بەپێ رۆشتن بۆ نوێژی جەژن

### ٣٨٢ - بَابٌ فِي الْمَشْيِ يَوْمَ العِيدِ

٥٣٠ - (حسن) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ تَخْرُجَ إِلَى العِيدِ مَاشِيًا، وَأَنْ تَأْكُلَ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ. هَـذَا حَـدِيثٌ حَسَنٌ. وَالعَمَـلُ عَلَـى هَـذَا الحَـدِيثِ عِنْـدَ أَكْثَـرِ أَهْـلِ العِلْـمِ: يَسْتَحِبُّونَ أَنْ يَخْرُجَ الرَّجُلُ إِلَى العِيدِ مَاشِيًا. وَأَنْ لاَ يَرْكَبَ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سوننەت وەهایە موسوڵمان بەپێ بڕوات بۆ نوێژی جەژن، پێش دەرچوونیش شتێ بخوات.

بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرموودە زۆربەی زانایان پێیان باشە: پیاو بەپێ بڕوات بۆ نوێژی جەژن، پێش دەرچوونیش بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان شتێ بخوات. پێشەوا (ترمذی) دەفەرموێت: ئەگەر بەهانەی شەرعی نەبێ بەسواری نەڕوات.

## ئەنجامدانی نوێژی هەردوو جەژنەکە پێش وتاردان.

### ٣٨٣ - بَابٌ فِي صَلاَةِ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ

٥٣١ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ يُصَلُّونَ فِي العِيدَيْنِ قَبْلَ الخُطْبَةِ ثُمَّ يَخْطُبُونَ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ صَلاَةَ العِيدَيْنِ قَبْلَ الخُطْبَةِ. وَيُقَالُ إِنَّ أَوَّلَ مَنْ خَطَبَ قَبْلَ الصَّلاَةِ مَرْوَانُ بْنُ الحَكَمِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوا ئەبو بەکر و پێشەوا عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ لەپێش وتارخوێندنەوە نوێژی هەردوو جەژنەکەیان دەکرد، لەپاشدا وتاریان دەدا.

بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرموودە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان لەسەر ئەمەیە: نوێژی هەردوو جەژنەکە لەپێش وتاردان دەکرێت.

دەوترێ: مەروانی کوڕی حەکەم یەکەم کەس بووە لەپێش نوێژی جەژندا وتاری داوە.

## ئەنجامدانی نوێژی هەردوو جەژنەكە بەبێ بانگ و قامەت

### ٣٨٤ - بَابُ أَنَّ صَلاَةَ الْعِيدَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ

٥٣٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ العِيدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَحَدِيثُ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ أَنَّهُ: لاَ يُؤَذَّنُ لِصَلاَةِ العِيدَيْنِ وَلاَ لِشَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ.

واتە: لە جابیری كوڕی سەمورەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: چەند جار لەگەڵ پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی هەردوو جەژنەكەم كردووە بەبێ بانگ و قامەت.

بە پەیڕەوكردنی ئەم فەرموودە رای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش ئەمەیە: بەبێ بانگ و قامەت نوێژی هەردوو جەژنەكە و سەجەم نوێژە سوننەتەكان ئەنجام دەدرێن.

## دەربارەی قورئان خوێندن لەنوێژی هەردوو جەژنەكەدا

### ٣٨٥ - بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي الْعِيدَيْنِ

٥٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي العِيدَيْنِ وَفِي الجُمُعَةِ: بِ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)، وَ (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الغَاشِيَةِ)، وَرُبَّمَا اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ فَيَقْرَأُ بِهِمَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي

وَاقِدٍ، وَسَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَكَذَا رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمِسْعَرٌ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي عَوَانَةَ. وَأَمَّا ابْنُ عُيَيْنَةَ فَيُخْتَلَفُ عَلَيْهِ فِي الرِّوَايَةِ: يُرْوَى عَنْهُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ. وَلاَ يُعْرَفُ لِحَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ رِوَايَةٌ عَنْ أَبِيهِ. وَحَبِيبُ بْنُ سَالِمٍ هُوَ مَوْلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، وَرَوَى عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ أَحَادِيثَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ نَحْوُ رِوَايَةِ هَؤُلاَءِ. وَرُوِي عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلاَةِ العِيدَيْنِ بِقَافٍ وَاقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ.

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لە نوێـژی هەینی و هەردوو جەژنەكەدا ئەم دوو سورەتەی دەخوێند: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)، وَ (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الغَاشِيَةِ)، هەندێ جار رێك دەكەوت رۆژی جەژن دەكەوتە رۆژی هەینی هەر ئەم دوو سورەتەی دەخوێند.

لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، كە لە نوێـژی هەردوو جەژنەكەدا ئەم دوو سورەتەی دەخوێند: (ق وَالقُرْآنِ الْمَجِيدِ) و (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ). پێشەوا شافیعی ئەمە دەفەرمووێت.

٥٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ ضَمْرَةَ بْنِ سَعِيدٍ الْمَازِنِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، سَأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ: مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ بِهِ فِي الفِطْرِ وَالأَضْحَى؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ بِـ (ق وَالقُرْآنِ الْمَجِيدِ)، وَ (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ القَمَرُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ لە ئەبا واقیدی (لیثـي)ی پرسـی: ئایـا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی هـەردوو جەژنەکـەدا چ سـورەتێکی دەخوێند؟ ئەبا واقید فەرمووی: لە نوێـژی هـەردوو جەژنەکـەدا ئـەم دوو سـورەتەی دەخوێند: (ق وَالقُرْآنِ الْمَجِيدِ) و (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ القَمَرُ).

٥٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ ضَمْرَةَ بْنِ سَعِيدٍ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَأَبُو وَاقِدٍ اللَّيْثِيُّ اسْمُهُ الحَارِثُ بْنُ عَوْفٍ.

## دەربارەی (الله أكبر)کردن لە دوو جەژنەکەدا

### ٣٨٦ - بَابٌ فِي التَّكْبِيرِ فِي العِيدَيْنِ

٥٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ عَمْرٍو أَبُو عَمْرٍو الحَذَّاءُ الْمَدِينِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نَافِعٍ الصَّائِغُ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَبَّرَ فِي العِيدَيْنِ فِي الأُولَى سَبْعًا قَبْلَ القِرَاءَةِ، وَفِي الآخِرَةِ خَمْسًا قَبْلَ القِرَاءَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ جَدِّ كَثِيرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَهُوَ أَحْسَنُ شَيْءٍ رُوِيَ فِي هَذَا البَابِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَاسْمُهُ عَمْرُو بْنُ عَوْفٍ الْمُزَنِيُّ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ. وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ صَلَّى بِالمَدِينَةِ نَحْوَ هَذِهِ الصَّلَاةِ. وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ. وَبِهِ يَقُولُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَرُوِي عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّهُ قَالَ فِي التَّكْبِيرِ فِي العِيدَيْنِ: تِسْعَ تَكْبِيرَاتٍ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى: خَمْسًا قَبْلَ القِرَاءَةِ، وَفِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ يَبْدَأُ بِالقِرَاءَةِ ثُمَّ يُكَبِّرُ أَرْبَعًا مَعَ تَكْبِيرَةِ الرُّكُوعِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوُ هَذَا. وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الكُوفَةِ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ.

واتە: لە (کثیر)ی کوری (عبد الله)وە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەرکاتی یەکەمی نوێژی جەژندا لەپێش خوێندنی سورەتی فاتیحەوە حەوت جار (الله أکبر)ی دەکرد، هەروەها لەرکاتی دووەمدا لەپێش خوێندنی سورەتی فاتیحەوە پێنج جار (الله أکبر)ی دەکرد.

## لەپێش و لەپاش نوێژی هەردوو جەژنەکەوە نوێژی تر ناکرێت

٣٨٧ - بَابٌ لاَ صَلاَةَ قَبْلَ الْعِيدَيْنِ وَلاَ بَعْدَهَا

٥٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ يَوْمَ الفِطْرِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي سَعِيدٍ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَدْ رَأَى طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: الصَّلاَةَ بَعْدَ صَلاَةِ العِيدَيْنِ وَقَبْلَهَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: رۆژی جەژن پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەرچوو بۆ نوێژ دوو رکات نوێژی کرد، لەپاشدا نە لەپێش و نە لەدوای نوێژ هیچ نوێژێکی تری نەکرد.

٥٣٨ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ أَبَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ البَجَلِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَفْصٍ وَهُوَ ابْنُ عُمَرَ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ خَرَجَ يَوْمَ عِيدٍ فَلَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، وَذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ دەرچوو بۆ نوێژی جەژن دوو رکات نوێژی جەژنی کرد، لەپێش نوێژ و لەدوای نوێژ هیچ نوێژێکی تری نەکرد. گێڕایەوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەیەی دەکرد.

## دەربارەی دەرچوونی ئافرەتان بۆ نوێژی هەردوو جەژنەکە

٣٨٨ - بَابٌ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي العِيدَيْنِ

٥٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَنْصُورٌ وَهُوَ ابْنُ زَاذَانَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُخْرِجُ الأَبْكَارَ، وَالعَوَاتِقَ، وَذَوَاتِ الخُدُورِ، وَالحُيَّضَ فِي العِيدَيْنِ، فَأَمَّا الحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الْمُصَلَّى، وَيَشْهَدْنَ دَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَتْ إِحْدَاهُنَّ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا جِلْبَابٌ، قَالَ: فَلْتُعِرْهَا أُخْتُهَا مِنْ جَلاَبِيبِهَا.

واتە: لە ئوممو (عطية)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە رۆژی هەردوو جەژنەکەدا فەرمانی پێ دەکردین: کە ئافرەتانی بێنوێژ و کەیبانوی ناومال و کەژاوەنشین لەگەڵ خۆمان ببەین بۆ نوێژگاکە لە دەرەوەی شار بۆ نوێژی جەژن، ئافرەتانی بێنوێژ کە نوێژ ناکەن خۆیان کەنار دەگرن لە نوێژگاکە، تەنها ئامادەی کۆڕی پڕ خێر و نزاو پاڕانەوەی

موسوڵمانان دەبن، ئافرەتێکیان فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! ئەگەر وا رێکەوت یەکێکیان چارشێو و پۆشاکی نەبوو خۆی پێ داپۆشێت چی بکات؟ فەرمووی: (با خوشکەکەی هەندێ لەپۆشاکەکەی خۆی پێ بدات بۆ ئەوەی خۆی پێ داپۆشێ).

٥٤٠ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ، بِنَحْوِهِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ أُمِّ عَطِيَّةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ، وَرَخَّصَ لِلنِّسَاءِ فِي الخُرُوجِ إِلَى العِيدَيْنِ. وَكَرِهَهُ بَعْضُهُمْ. وَرُوِي عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ قَالَ: أَكْرَهُ اليَوْمَ الخُرُوجَ لِلنِّسَاءِ فِي العِيدَيْنِ، فَإِنْ أَبَتِ الْمَرْأَةُ إِلاَّ أَنْ تَخْرُجَ فَلْيَأْذَنْ لَهَا زَوْجُهَا أَنْ تَخْرُجَ فِي أَطْمَارِهَا وَلاَ تَتَزَيَّنْ، فَإِنْ أَبَتْ أَنْ تَخْرُجَ كَذَلِكَ فَلِلزَّوْجِ أَنْ يَمْنَعَهَا عَنِ الخُرُوجِ. وَيُرْوَى عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: لَوْ رَأَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسْجِدَ كَمَا مُنِعَتْ نِسَاءُ بني إسرائيل. وَيُرْوَى عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ: أَنَّهُ كَرِهَ اليَوْمَ الخُرُوجَ لِلنِّسَاءِ إِلَى العِيدِ.

لە ئوممو (عطیـة)وە رەزای خوای لێ بێ فەرموودەی پێشو بەهەمان شێوە هاتووە. بەپێی ئەم فەرموودە هەندێ لە زانایان رێگەیان داوە بە ئافرەتان بڕۆن بۆ نوێژی هەردوو جەژنەکە، بەڵام هەندێکیان بەلایانەوە باش نیە.

لە (عبداللە)ی کوڕی موبارەکەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: باش نیە بۆ ئافرەتان بڕۆن بۆ نوێژی هەردوو جەژنەکە، ئەگەر ژنێ ئینکاری کرد بۆ رۆشتن دەبێ مێردەکەی مۆڵەتی بدات، بەمەرجێ داپۆشراو بێت و خۆی نەڕازێنێتەوە، ئەگەر ئینکاری کرد بەوشێوەیە دەرچێت بۆ نوێژی جەژن ئەوە با مێردەکەی رێگری لێ بکات.

لـە عائیشــەوە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیبینـی ئافرەتـان چـی دەکـەن ئـەوا رێگـری چـوون بـۆ مزگەوتیشـی لـیّ دەکـردن وەك چـۆن بـەنی ئیسـرائیل رێگـری چـوون بـۆ مزگەوتی لیّ دەکردن. لە سوفیانی (ثوري)ەوە دەگێڕنەوە، کە دەرچـوونی ئافرەتـانی بۆ نوێژی جەژن پیّ باش نەبووە.

## دەرچوونی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ نوێژی جەژن لە رێگەیەکەوەو گەڕانەوەی لە رێگەیەکی ترەوە

٣٨٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي خُرُوجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى العِيدِ فِي طَرِيقٍ، وَرُجُوعِهِ مِنْ طَرِيقٍ آخَرَ

٥٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ وَاصِلِ بْنِ عَبْدِ الأَعْلَى الكُوفِيُّ، وَأَبُو زُرْعَةَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّلْتِ، عَنْ فُلَيْحِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ العِيدِ فِي طَرِيقٍ رَجَعَ فِي غَيْرِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، وَأَبِي رَافِعٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى أَبُو تُمَيْلَةَ، وَيُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ فُلَيْحِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ. وَقَدْ اسْتَحَبَّ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ لِلإِمَامِ إِذَا خَرَجَ فِي طَرِيقٍ أَنْ يَرْجِعَ فِي غَيْرِهِ اتِّبَاعًا لِهَذَا الحَدِيثِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. وَحَدِيثُ جَابِرٍ كَأَنَّهُ أَصَحُّ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە رێگەیەکەوە بڕۆشتایە بۆ نوێژی جەژن، لـە رێگەیەکی ترەوە دەگەڕایەوە.

بە شوێنکەوتنی ئەم فەرموودە هەندێ لە زانایان پێیان باشە ئەگەر پێشنوێژ لە ڕێگەیەکەوە ڕۆشت بۆ نوێژی جەژن، لە ڕێگەیەکی ترەوە بگەڕێتەوە. ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیە.

## خواردن لەپێش ڕۆشتن بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان.

### ٣٩٠ - بَابٌ فِي الأَكْلِ يَوْمَ الفِطْرِ قَبْلَ الخُرُوجِ

٥٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَزَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، عَنْ ثَوَابِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَخْرُجُ يَوْمَ الفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ، وَلاَ يَطْعَمُ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ بُرَيْدَةَ بْنِ حُصَيْبٍ الأَسْلَمِيِّ حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وقَالَ مُحَمَّدٌ: لاَ أَعْرِفُ لِثَوَابِ بْنِ عُتْبَةَ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ. وَقَدْ اسْتَحَبَّ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ لاَ يَخْرُجَ يَوْمَ الفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ شَيْئًا، وَيُسْتَحَبُّ لَهُ أَنْ يُفْطِرَ عَلَى تَمْرٍ، وَلاَ يَطْعَمَ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يَرْجِعَ.

واتە: لە بورەیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەتا خواردنی نەخواردایە دەرنەنەچوو بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان، بەڵام بۆ جەژنی قوربان هەتا نوێژی نەکردایە نانی نەئەخوارد.

هەندێ لە زانایان پێیان باشە موسوڵمان دەرنەچێ بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان هەتا شتێ نەخوات، پێشیان باشە خورما بخوات، بەڵام بۆ جەژنی قوربان هەتا نوێژ نەکات و نەگەڕێتەوە خواردن نەخوات.

٥٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ

حَفْصِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُفْطِرُ عَلَى تَمَرَاتٍ يَوْمَ الفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الْمُصَلَّى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لـەپێش ئـەوەی دەرچـێت بـۆ نوێژگاکە بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد.

# باسەکانی نوێژی سەفەر

## أَبْوَابُ السَّفَرِ

### کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا

٣٩١ - بَابُ التَّقْصِيرِ فِي السَّفَرِ

٥٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ بْنُ عَبْدِ الحَكَمِ الوَرَّاقُ البَغْدَادِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَال: سَافَرْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ فَكَانُوا يُصَلُّونَ الظُّهْرَ وَالعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، لاَ يُصَلُّونَ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، وقَالَ عَبْدُ اللهِ: لَوْ كُنْتُ مُصَلِّيًا قَبْلَهَا أَوْ بَعْدَهَا لأَتْمَمْتُهَا. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَنَسٍ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سُلَيْمٍ، مِثْلَ هَذَا. وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ آلِ سُرَاقَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَطِيَّةَ العَوْفِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَطَوَّعُ فِي السَّفَرِ قَبْلَ الصَّلاَةِ وَبَعْدَهَا. وَقَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقْصُرُ فِي السَّفَرِ وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، صَدْرًا مِنْ خِلاَفَتِهِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا كَانَتْ تُتِمُّ الصَّلاَةَ فِي السَّفَرِ. وَالعَمَلُ عَلَى مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابِهِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، إِلاَّ أَنَّ الشَّافِعِيَّ يَقُولُ: التَّقْصِيرُ رُخْصَةٌ لَهُ فِي السَّفَرِ فَإِنْ أَتَمَّ الصَّلاَةَ أَجْزَأَ عَنْهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هەردوو پێشەوا ئەبو بەكر و عومەردا رەزای خوایان لێ بێ سەفەرم كردووە دوو ركات دوو ركات نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەصریان دەكرد، نە لەپێش و نە لەدوایانەوە هیچ نوێژێكی تریان نەدەكرد. (عبد الله) فەرمووی: ئەگەر لەپێش و لەدوایانەوە نوێژی تر بكەم ئەوا بە تەواوی دەمكردن واتە چوار ركات چوار ركات.

لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەپێش نوێژ و لەدوای نوێژ نوێژی سوننەتی دەكرد لەسەفەردا.

لە فەرموودەی صەحیح دا هاتووە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە سەفەردا نوێژی كورتكردۆتەوە، هەروەها هەردوو پێشەوا ئەبو بەكر و عومەریش رەزای خوایان لێ بێ بەهەمان شێوە، پێشەوا (عثمان)یش رەزای خوای لێ بێ لەسەرەتای بوون بە خەلیفەیەوە بەهەمان شێوە.

زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش پەیڕەوی ئەم فەرموودە دەكەن. لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە لە سەفەردا نوێژەكانی بە تەواوی دەكرد. پەیڕەوی ئەوە دەكرێ لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هاوەڵانیەوە هاتووە. ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. ئەوە نەبێ كە پیشەوا شافیعی دەفەرمووێت: روخسەتی بۆ هەیە نوێژەكانی كورت بكاتەوە لە سەفەردا، ئەگەر بە تەواویش ئەنجامیان بدات هەر دروستە.

٥٤٥ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا

عَلِيُّ بْنُ زَيْدِ بْنِ جُدْعَانَ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، قَالَ: سُئِلَ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ عَنْ صَلاَةِ الْمُسَافِرِ، فَقَالَ: حَجَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَحَجَجْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ عُمَرَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ عُثْمَانَ سِتَّ سِنِينَ مِنْ خِلاَفَتِهِ، أَوْ ثَمَانِيَ سِنِينَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو (نَضْرَةَ)وە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت بە نوێژی موسافیر لە عیمرانی کوڕی حوصەنیان ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حەجم کردووە دوو رکات نوێژی دەکرد، لە خزمەت هەردوو پێشەوا ئەبو بەکر و عومەردا ڕەزای خوایان لێ بێ حەجم کردووە دوو رکات نوێژیان دەکرد، لەگەڵ پێشەوا (عثمان)یش ڕەزای خوای لێ بێ حەجم کردووە لەشەش ساڵ یان هەشت ساڵی سەرەتای خەلیفایەتیەوە دوو رکات نوێژی دەکرد.

٥٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، وَإِبْرَاهِيمَ بْنِ مَيْسَرَةَ، سَمِعَا أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ بِالمدِينَةِ، أَرْبَعًا وَبِذِي الحُلَيْفَةِ العَصْرَ رَكْعَتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مەدینە چوار رکات نوێژی نیوەڕۆمان کرد، کە دەرچووین بەرەو مەککە لە (ذي الحليفة) دوو رکات نوێژی عەصرمان لەگەڵ کرد.

٥٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ مَنْصُورِ بْنِ زَاذَانَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ لاَ يَخَافُ إِلاَّ رَبَّ العَالَمِينَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مەدینەوە دەرچوو بەرەو مەککە لە پەروەردگاری جیهانیان نەبێ ترسی لەکەس نەبوو، دوو ڕکات نوێژی کرد.

## ماوەی چەند ڕۆژ نوێژ کورت دەکرێتەوە.

٣٩٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَمْ تُقْصَرُ الصَّلَاةُ

٥٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ الحَضْرَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: كَمْ أَقَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: عَشْرًا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ أَقَامَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ تِسْعَ عَشْرَةَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَنَحْنُ إِذَا أَقَمْنَا مَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ تِسْعَ عَشْرَةَ، صَلَّيْنَا رَكْعَتَيْنِ، وَإِنْ زِدْنَا عَلَى ذَلِكَ أَتْمَمْنَا الصَّلَاةَ. وَرُوِي عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَقَامَ عَشَرَةَ أَيَّامٍ أَتَمَّ الصَّلَاةَ. وَرُوِي عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَقَامَ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا أَتَمَّ الصَّلَاةَ. وَرُوِيَ عَنْهُ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ. وَرُوِي عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّهُ قَالَ: إِذَا أَقَامَ أَرْبَعًا صَلَّى أَرْبَعًا، وَرَوَى عَنْهُ ذَلِكَ قَتَادَةُ، وَعَطَاءٌ الخُرَاسَانِيُّ. وَرَوَى عَنْهُ دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ خِلَافَ هَذَا. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ بَعْدُ فِي ذَلِكَ: فَأَمَّا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَأَهْلُ الكُوفَةِ فَذَهَبُوا إِلَى تَوْقِيتِ خَمْسَ عَشْرَةَ، وَقَالُوا: إِذَا أَجْمَعَ عَلَى إِقَامَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ أَتَمَّ الصَّلَاةَ. وَقَالَ الأَوْزَاعِيُّ: إِذَا أَجْمَعَ عَلَى إِقَامَةِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أَتَمَّ الصَّلَاةَ. وَقَالَ مَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ: إِذَا أَجْمَعَ عَلَى إِقَامَةِ أَرْبَعَةٍ أَتَمَّ

الصَّلاَةَ. وَأَمَّا إِسْحَاقُ فَرَأَى أَقْوَى الْمَذَاهِبِ فِيهِ حَدِيثَ ابْنِ عَبَّاسٍ. قَالَ: لأَنَّهُ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ تَأَوَّلَهُ بَعْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِذَا أَجْمَعَ عَلَى إِقَامَةِ تِسْعَ عَشْرَةَ أَتَمَّ الصَّلاَةَ. ثُمَّ أَجْمَعَ أَهْلُ العِلْمِ عَلَى أَنَّ الْمُسَافِرَ يَقْصُرُ مَا لَمْ يُجْمِعْ إِقَامَةً، وَإِنْ أَتَى عَلَيْهِ سِنُونَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مەدینەوە دەرچووین بەرەو مەککە دوو رکات نوێژی کرد. فەرمووی: وتم بە ئەنەس: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چەند ڕۆژ لە مەککە مایەوە؟ فەرمووی: دە ڕۆژ مایەوە.

لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەهەندێ لە سەفەرەکانیدا هەتا نۆزدە ڕۆژ دوو رکات نوێژی دەکرد.

ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێت: ئێمەش ئەگەر هەتا نۆزدە ڕۆژ بمانایەتەوە دوو رکات نوێژمان دەکرد، ئەگەر زیاتر بمانایەتەوە نوێژەکانمان بە تەواوی دەکرد.

لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەوەی دە ڕۆژ مایەوە با نوێژەکانی بە تەواوی بکات.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەوەی پانزە ڕۆژ مایەوە با نوێژەکانی بە تەواوی بکات. هەتا دوانزە ڕۆژیشیان لێ گێڕاوەتەوە.

لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەوەی چوار ڕۆژ مایەوە چوار رکات بکات.

پێشەوا سوفیانی (ثوري) و خەڵکی کوفە رایان لەسەر ئەمەیە: ئەگەر سور بوو لەسەر پانزە رۆژ مانەوە ئەوە با نوێژەکانی بە تەواوی بکات. پێشەوا ئەوزاعی رای لەسەر دوانزە رۆژە. پێشەوایان مالیك و شافیعی و ئەحمەد رایان لەسەر ئەمەیە: ئەگەر چوار رۆژ مایەوە نوێژەکانی بە تەواوی بکات.

پێشەوا ئیسحاق پێی وایە بەهێزترین مەزهەبیان فەرموودەکەی ئیبنو عەباسە رەزای خوایان لێ بێ. لەسەر ئەوەش دەڕۆشت. ئەگەر سور بوو لەسەر نۆزدە رۆژ مانەوە ئەوە با نوێژەکانی بە تەواوی بکات. لەپاشدا زانایان لەسەر ئەم رایەن ئەگەر موسافیر سوور نەبوو لەسەر مانەوە ئەوە بۆ ماوەی چەند ساڵی بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە.

٥٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَال: سَافَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَفَرًا، فَصَلَّى تِسْعَةَ عَشَرَ يَوْمًا رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَنَحْنُ نُصَلِّي فِيمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ تِسْعَ عَشْرَةَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَإِذَا أَقَمْنَا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ صَلَّيْنَا أَرْبَعًا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەفەرێکی کرد نۆزدە رۆژ دوو رکات دوو رکات نوێژی دەکرد.

ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێت: ئێمەش هەتا هەژدە رۆژ دوو رکات دوو رکات نوێژمان دەکرد، ئەگەر زیاتر بمانایەتەوە چوار رکاتمان دەکرد.

٥٥٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ،

عَنْ أَبِي بُسْرَةَ الغِفَارِيِّ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سَفَرًا، فَمَا رَأَيْتُهُ تَرَكَ الرَّكْعَتَيْنِ إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ الظُّهْرِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ البَرَاءِ حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْهُ فَلَمْ يَعْرِفْهُ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ، وَلَمْ يَعْرِفْ اسْمَ أَبِي بُسْرَةَ الغِفَارِيِّ وَرَآهُ حَسَنًا. وَرُوِي عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَتَطَوَّعُ فِي السَّفَرِ قَبْلَ الصَّلاَةِ وَلاَ بَعْدَهَا. وَرُوِيَ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَتَطَوَّعُ فِي السَّفَرِ. ثُمَّ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ بَعْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَرَأَى بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنْ يَتَطَوَّعَ الرَّجُلُ فِي السَّفَرِ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَلَمْ تَرَ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ أَنْ يُصَلَّى قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا. وَمَعْنَى مَنْ لَمْ يَتَطَوَّعْ فِي السَّفَرِ قَبُولُ الرُّخْصَةِ، وَمَنْ تَطَوَّعَ فَلَهُ فِي ذَلِكَ فَضْلٌ كَثِيرٌ. وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ يَخْتَارُونَ التَّطَوُّعَ فِي السَّفَرِ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەژدە سەفەر لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووم، هەرگیز نەمدیوە دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ تەرک بکات.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەفەردا نە لەپێش و نە لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە نوێژی سوننەتی نەدەکرد.

لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە لەسەفەردا نوێژی سوننەتی دەکرد.

لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زانایان جیاوازی کەوتە

نێوانیانەوە: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رایان وابوو پیاو لەسەفەردا نوێژی سوننەت بکات. پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

هەندێ تر لە زانایان پێیان وایە نە لەپێش و نە لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە نوێژی سوننەت نەکرێت. مانای ئەوەی لەسەفەردا نوێژی سوننەت نەکرێت روخسەت وەرگرتنە، ئەگینا ئەوەی نوێژی سوننەتی بکات خێرێکی زۆر گەورەی دەست دەکەوێت. ئەمەش وتەی زۆربەی زانایانە، ئەمەشیان هەڵبژاردووە لەسەفەردا نوێژی سوننەت بکرێت.

### سەبارەت بە نوێژی سوننەت لەسەفەردا

٣٩٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ

٥٥١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ فِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَاهُ ابْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطِيَّةَ، وَنَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوو رکات نوێژی نیوەڕۆم دەکرد لەسەفەردا، لە دوای نوێژیش دوو رکاتی تر.

٥٥٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ الْمُحَارِبِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ هَاشِمٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطِيَّةَ، وَنَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ فِي الحَضَرِ الظُّهْرَ أَرْبَعًا وَبَعْدَهَا

رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَهُ فِي السَّفَرِ الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَالعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ وَلَمْ يُصَلِّ بَعْدَهَا شَيْئًا، وَالمغْرِبَ فِي الحَضَرِ وَالسَّفَرِ سَوَاءٌ، ثَلاَثَ رَكَعَاتٍ، لاَ يُنْقِصُ فِي حَضَرٍ وَلاَ سَفَرٍ، وَهِيَ وِتْرُ النَّهَارِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. سَمِعْتُ مُحَمَّدًا، يَقُولُ: مَا رَوَى ابْنُ أَبِي لَيْلَى حَدِيثًا أَعْجَبَ إِلَيَّ مِنْ هَذَا، وَلاَ أَرْوِي عَنْهُ شَيْئًا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەشوێنی نیشتەجێ و لەسەفەردا لەخزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژم كردووە، لەشوێنی نیشتەجێدا چوار ركات نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵ كردووە، لەدوای نوێژیش دوو ركات، لەسەفەردا دوو ركات نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵ كردووە، لەدوای نوێژیش دوو ركات، هەروەها دوو ركات نوێژی عەصریشم لەگەڵ كردووە لەدوای نوێژی عەصر هیچ نوێژێكی تری نەدەكرد، نوێژی شێوان لەشوێنی نیشتەجێ و لەسەفەردا وەك یەكە هەر سێ ركاتە، كورت ناكرێتەوە، چونكە نوێژی تاكی ڕۆژە، لەدوای نوێژی شێوان دوو ركات نوێژی سوننەتی دەكرد.

## سەبارەت بە كۆكردنەوەی دوو نوێژ.

٣٩٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الجَمْعِ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ

٥٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ زَيْغِ الشَّمْسِ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى أَنْ يَجْمَعَهَا إِلَى العَصْرِ فَيُصَلِّيَهُمَا جَمِيعًا، وَإِذَا ارْتَحَلَ بَعْدَ زَيْغِ الشَّمْسِ عَجَّلَ العَصْرَ إِلَى الظُّهْرِ وَصَلَّى الظُّهْرَ وَالعَصْرَ جَمِيعًا ثُمَّ سَارَ، وَكَانَ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ الْمَغْرِبِ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ العِشَاءِ، وَإِذَا ارْتَحَلَ بَعْدَ الْمَغْرِبِ عَجَّلَ العِشَاءَ فَصَلاَّهَا مَعَ الْمَغْرِبِ. وَفِي البَابِ عَنْ

عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَجَابِرٍ. وَرَوَى عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، عَنْ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ، عَنْ قُتَيْبَةَ، هَذَا الحَدِيثَ.

واتە: لە (معاذ)ی كوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە غەزای تەبوكدا پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لابیدایە بكەوتایەتەڕێ نوێژی نیوەڕۆ و عەصری كۆدەكردەوە، ئەگەر دوای ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لابیدایە بكەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست هەتا دادەبەزی بۆ نوێژی عەصر جا هەردووكیانی كۆدەكردەوە، لەپاشدا دەكەوتە ڕێ، لە نوێژی شێوانیشدا بە هەمان شێوە ئەگەر پێش خۆر ئاوا بوون بكەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی شێوانی دوادەخست و لەگەڵ نوێژی عیشا كۆیدەكردنەوە، بەڵام ئەگەر بیویستایە لەدوای نوێژی شێوان بكەوێتەڕێ نوێژی شێوان و نوێژی عیشای كۆدەكردەوە.

٥٥٤ - حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا اللُّؤْلُؤِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ الأَعْيَنُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بِهَذَا. وَحَدِيثُ مُعَاذٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، تَفَرَّدَ بِهِ قُتَيْبَةُ لاَ نَعْرِفُ أَحَدًا رَوَاهُ عَنِ اللَّيْثِ غَيْرَهُ. وَحَدِيثُ اللَّيْثِ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، عَنْ مُعَاذٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَالمَعْرُوفُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ حَدِيثُ مُعَاذٍ، مِنْ حَدِيثِ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، عَنْ مُعَاذٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَمَعَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ، وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالعِشَاءِ. رَوَاهُ قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ. وَبِهَذَا الحَدِيثِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، يَقُولاَنِ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ فِي السَّفَرِ فِي وَقْتِ إِحْدَاهُمَا.

واتە: لە (معاذ)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە غەزای تەبوکدا نوێژی نیوەڕۆ و عەصری کۆکردەوە، هەروەها نوێژی شێوان و عیشاشی کۆکردەوە.

بە پێی ئەم فەرموودە پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق دەفەرموون: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەسەفەردا دروستە ئەگەر کاتی یەکێکیان بوو.

٥٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ اسْتُغِيثَ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ، فَجَدَّ بِهِ السَّيْرُ، فَأَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى غَابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ أَخْبَرَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە کاتی نوێژی شێوان بوو داوایان لێ کردبوو بچێت بەدەم یەکێ لە خزمەکانیەوە، کارێکی گرنگی هەبوو بۆیە کەوتەڕێ نوێژی شێوانی دواخست و بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن هەتا سورایی ئاسمان نەماو ئەستێرەکان دەرکەوتن، لەپاشدا دابەزی نوێژی شێوان و عیشای پێکەوە کۆکردەوە، ئینجا پێی ڕاگەیاندن کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە سەفەردا ئەگەر کارێکی گرنگی ببوایە بەم شێوەیەی دەکرد.

## ئەوەی هاتووە سەبارەت بە نوێژە بارانە

٣٩٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلاَةِ الإِسْتِسْقَاءِ

٥٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا

مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ بِالنَّاسِ يَسْتَسْقِي، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ بِالقِرَاءَةِ فِيهِمَا، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَاسْتَسْقَى، وَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَآبِي اللَّحْمِ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَعَلَى هَذَا العَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَعَمُّ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ هُوَ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الْمَازِنِيُّ.

واتە: لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە، لە مامیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە جارێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەگەڵ خەڵکەکە دەرچوو بۆ نوێژگاکە بۆ نوێژە بارانە، دوو ڕکات نوێژی بۆکردن لەهەردوو ڕکاتەکەدا بەدەنگی بەرز سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری خوێند خوێند، لەپاشدا ڕووی کردە قیبلەو پۆشاکەکەی ڕاست و چەپ کرد واتە لای ڕاستی دا بەسەر لای چەپدا لای چەپیشی دا بەسەر لای ڕاستی دا، هەردوو دەستی بەرزکردەوەو دەستی کرد بە پاڕانەوەو داوای باران بارینی کرد.

٥٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ، عَنْ آبِي اللَّحْمِ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ أَحْجَارِ الزَّيْتِ يَسْتَسْقِي، وَهُوَ مُقْنِعٌ بِكَفَّيْهِ يَدْعُو. كَذَا قَالَ قُتَيْبَةُ فِي هَذَا الحَدِيثِ، عَنْ آبِي اللَّحْمِ وَلاَ نَعْرِفُ لَهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ هَذَا الحَدِيثَ الوَاحِدَ. وَعُمَيْرٌ مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ قَدْ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَادِيثَ وَلَهُ صُحْبَةٌ.

واتە: لە (آبی اللّحْم)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە جارێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی لەلای (أَحْجَارِ الزَّيْت) لە نزیک (زَوْرَاء)ەوە کە دوو

شوێنن لە مەدینە، بە پێوە دەپاڕایەوەو داوای باران بارینی دەکرد- هەردوو دەستی بەرزکردبوەوە بەرامبەر بە روخساری و دەستەکانی لەئاست سەری تێ نەدەپەڕاند (رواه أبو داود)- .

٥٥٨ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ إِسْحَاقَ وَهُوَ ابْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ كِنَانَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَرْسَلَنِي الوَلِيدُ بْنُ عُقْبَةَ وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَسْأَلُهُ عَنْ اسْتِسْقَاءِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ مُتَبَذِّلاً مُتَوَاضِعًا مُتَضَرِّعًا، حَتَّى أَتَى الْمُصَلَّى، فَلَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا كَانَ يُصَلِّي فِي العِيدِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیسحاقی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی کینانەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وەلیدی کوڕی عوقبە کە ئەمیر و کاربەدەستی مەدینە بوو، ناردمی بۆ خزمەت ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ کە سەبارەت بە نوێژە بارانەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێی بپرسم؟ منیش رۆشتم بۆ خزمەتی، ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ نوێژە بارانە بە جل و بەرگی ئاساییەوەو بەبێ خۆ جوانکردن بە ملکەچی و لەسەرخۆ بەدەم پاڕانەوەوە دەردەچوو هەتا دەگەیشتە نوێژگاکە، جا وتاری دەخوێندەوە بەڵام نەك وەك ئەم وتارەی ئێوە، بەڵکو بەردەوام بەبێ فیزی و بە ملکەچی دەپاڕایەوەو (الله أكبر)ی دەکرد، لەپاشدا دوو رکات نوێژی دەکرد وەك چۆن دوو رکات نوێژی جەژنی دەکرد.

٥٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ كِنَانَةَ، عَنْ أَبِيهِ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَزَادَ فِيهِ: مُتَخَشِّعًا.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ قَالَ: يُصَلِّي صَلاَةَ الاِسْتِسْقَاءِ نَحْوَ صَلاَةِ العِيدَيْنِ يُكَبِّرُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى سَبْعًا، وَفِي الثَّانِيَةِ خَمْسًا، وَاحْتَجَّ بِحَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَرُوِيَ عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، أَنَّهُ قَالَ: لاَ يُكَبِّرُ فِي صَلاَةِ الاِسْتِسْقَاءِ كَمَا يُكَبِّرُ فِي صَلاَةِ العِيدَيْنِ.

واتە: لە ئیسحاقی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی کینانەوە فەرموودەی پێشوو بەهەمان شێوە هاتووە، بەلاّم وشەی(مُتَخَشِّعًا)ی بۆ زیاد کرد. ئەمە وتەی پێشەوا شافیعی‌یە دەفەرمووێت: نوێژە بارانە وەك نوێژی جەژن دەکرێت، لەرکاتی یەکەمدا حەوت (الله أکبر) دەوترێت، لەرکاتی دووەمدا پێنج (الله أکبر) دەوترێت. بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ.

ئەبو عیسا واتە (ترمذی) دەفەرمووێت: لە پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەنوێژە بارانەدا (الله أکبر) ناوترێ وەك نوێژی جەژندا دەوترێت. پێشەوا نوعمان ئەبو حەنیفە دەفەرمووێت: نوێژە بارانە ناکرێت و فەرمانیان پێ نەکرابوو بە ڕاست و چەپ کردنی پۆشاك، بەڵکو هەر هەموویان بە هیوای باران بارین دەپاڕانەوە. ئەبو عیسا(ترمذی) دەفەرمووێت: ئەمە پێچەوانەی سوننەتە.

## سەبارەت بە نوێژی خۆرگیران

### ٣٩٦ - بَابٌ فِي صَلاَةِ الْكُسُوفِ

٥٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفٍ، فَقَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، وَالأُخْرَى مِثْلُهَا. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، وَالمغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، وَأَبِي مَسْعُودٍ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَسَمُرَةَ، وَأَبِي مُوسَى، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَقَبِيصَةَ الهِلاَلِيِّ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفٍ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي القِرَاءَةِ فِي صَلاَةِ الكُسُوفِ: فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يُسِرَّ بِالقِرَاءَةِ فِيهَا بِالنَّهَارِ. وَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنْ يَجْهَرَ بِالقِرَاءَةِ فِيهَا، كَنَحْوِ صَلاَةِ العِيدَيْنِ وَالجُمُعَةِ. وَبِهِ يَقُولُ مَالِكٌ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: يَرَوْنَ الجَهْرَ فِيهَا. قَالَ الشَّافِعِيُّ: لاَ يَجْهَرُ فِيهَا. وَقَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِلْتَا الرِّوَايَتَيْنِ: صَحَّ عَنْهُ أَنَّهُ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ. وَصَحَّ عَنْهُ أَنَّهُ صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ. وَهَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ جَائِزٌ عَلَى قَدْرِ الكُسُوفِ، إِنْ تَطَاوَلَ الكُسُوفُ فَصَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، فَهُوَ جَائِزٌ، وَإِنْ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ وَأَطَالَ القِرَاءَةَ فَهُوَ جَائِزٌ. وَيَرَى أَصْحَابُنَا، أَنْ تُصَلَّى صَلاَةُ الكُسُوفِ فِي جَمَاعَةٍ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ وَالقَمَرِ.

**واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەیە نوێژی خۆرگیرانی دەکرد: قورئانی دەخوێند، لەپاشدا رکوعی دەبرد، سەری بەرزدەکردەوە لە رکوع نەئەچوە سەجدەوە و قورئانی دەخوێند جارێکی تر رکوعی دەبرد واتە رکوعی دووەمی دەبرد، سەری بەرزدەکردەوە لە رکوع نەئەچوە سەجدەوە و قورئانی دەخوێند جارێکی تر رکوعی دەبرد واتە رکوعی**

سێیەمی دەبرد، ئینجا دەچووە سەجدەوە، رکاتی دووەمیشی بەو شێوەیە ئەنجام دەدا. — واتە بۆ هەموو رکاتێ سێ جار رکوعی دەبرد و دوو جار دەچووە سەجدەوە-.

لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چوار رکات نوێژی خۆرگیرانی بە چوار سەجدەوە ئەنجامداوە وەك عادەتی بۆ هەموو رکاتێ دەچووە رکوعەوە و دوو جار دەچوە سەجدەوە. پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

ئیبنو عەباس فەرمووی: زانایان رایان جیاوازە دەربارەی قورئان خوێندنی نوێژی خۆرگیران: هەندێکیان رایان وایە لەرۆژدا بە بێ دەنگ بەرزکردنەوە قورئان بخوێنرێت. هەندێکی تریان رایان وایە بەدەنگەوە قورئان بخوێنرێت وەك نوێژی هەینی و هەردوو جەژنەکە. پێشەوایان مالیك و ئەحمەد و ئیسحاق رایان وایە. پێشەوا شافیعی دەفەرموێت: بە بێ دەنگ بەرزکردنەوە قورئان بخوێنرێت.

هەردوو راو بۆچونەکەش بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاتووە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چوار رکاتی نوێژی خۆرگیرانی دەکرد بە چوار سەجدەوە. هەروەها شەش رکات نوێژی خۆرگیرانی دەکرد بە چوار سەجدەوە.

ئەمەش لەلای زانایان دروستە بە پێی ماوەی خۆرگیرانەکە، ئەگەر ماوەکەی زۆر بوو شەش رکات بە چوار سەجدەوە ئەنجام بدرێت ئەوە دروستە، ئەگەر چوار رکات نوێژی کرا بە چوار سەجدەوە، قورئان خوێندنەکە درێژەی پێ بدرێ ئەوەش هەر دروستە. هاوەڵانمان واتە فەرموودەناسان پێیان وایە نوێژی خۆرگیران و مانگ

گیران بە کۆمەڵ بکرێت.

٥٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: خَسَفَتْ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالنَّاسِ، فَأَطَالَ القِرَاءَةَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ القِرَاءَةَ، وَهِيَ دُونَ الأُولَى، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَسَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَبِهَذَا الحَدِيثِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، يَرَوْنَ صَلاَةَ الكُسُوفِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى بِأُمِّ القُرْآنِ، وَنَحْوًا مِنْ سُورَةِ البَقَرَةِ سِرًّا إِنْ كَانَ بِالنَّهَارِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً نَحْوًا مِنْ قِرَاءَتِهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ بِتَكْبِيرٍ وَثَبَتَ قَائِمًا كَمَا هُوَ، وَقَرَأَ أَيْضًا بِأُمِّ القُرْآنِ وَنَحْوًا مِنْ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً نَحْوًا مِنْ قِرَاءَتِهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ تَامَّتَيْنِ، وَيُقِيمُ فِي كُلِّ سَجْدَةٍ نَحْوًا مِمَّا أَقَامَ فِي رُكُوعِهِ، ثُمَّ قَامَ فَقَرَأَ بِأُمِّ القُرْآنِ، وَنَحْوًا مِنْ سُورَةِ النِّسَاءِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً نَحْوًا مِنْ قِرَاءَتِهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ بِتَكْبِيرٍ وَثَبَتَ قَائِمًا، ثُمَّ قَرَأَ نَحْوًا مِنْ سُورَةِ الْمَائِدَةِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً نَحْوًا مِنْ قِرَاءَتِهِ، ثُمَّ رَفَعَ، فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە ژیانی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەستا چوو بۆ مزگەوت، (الله أكبر)ی کردو خەڵکی لەدوایەوە ڕیزیان بەست قورئانێکی زۆری خوێند، لەپاشدا (الله أكبر)ی کرد، ئینجا ڕکوعی بردو ڕکوعەکەی درێژکردەوە، لەپاشدا سەری بەرزکردەوەو قورئانێکی زۆری خوێند،

بەڵام وەك ركاتی یەکەم نا، ئینجا ركوعی بردو ركوعەکەی درێژکردەوە، بەڵام وەك ركوعی یەکەم نا، لەپاشدا سەری بەرزکردەوەو چووە سەجدەوە، لەپاشدا ركاتی دووەمی هەروەك ركاتی یەکەم ئەنجامدا.

بە پێی ئەم فەرموودە پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون و پێیان وایە نوێژی خۆرگیران دوو ركاتە لەهەر ركاتێدا دوو ركوع دەبرێت لەگەڵ دوو سەجدە.

پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: ئەگەر لەرۆژدا بوو لە ركاتی یەکەمدا بەبێ دەنگی سورەتی فاتیحە لەگەڵ هێندەی سورەتی (البقرة) قورئان دەخوێنێ، ئینجا ركوعێکی درێژ دەبات هێندەی قورئان خوێندنەکەی، لەپاشدا (الله أكبر) دەکات و سەری بەرزدەکاتەوە و بەپێوە دەمێنێتەوە دیسانەوە سورەتی فاتیحە لەگەڵ هێندەی سورەتی (آل عمران) قورئان دەخوێنێ، ئینجا ركوعێکی درێژ دەبات هێندەی قورئان خوێندنەکەی، لەپاشدا سەری بەرزکردەکاتەوەو دەفەرمووێت: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). لەپاشدا دوو سەجدە دەبات بەتەواوی، لەدوای هەر سەجدەیە سەری بەرز دەکاتەوە ئەوەندەی ركوعەکەی دەمێنێتەوە، لەپاش دوو سەجدەکە هەڵەسێتەوەو بەبێ دەنگی سورەتی فاتیحە لەگەڵ هێندەی سورەتی (النساء) قورئان دەخوێنێ، ئینجا ركوعێکی درێژ دەبات هێندەی قورئان خوێندنەکەی، لەپاشدا (الله أكبر) دەکات و سەری بەرزدەکاتەوە و بە پێوە دەمێنێتەوەو هێندەی خوێندنی سورەتی (المائدة) قورئان دەخوێنێ، ئینجا ركوعێکی درێژ دەبات هێندەی قورئان خوێندنەکەی، لەپاشدا سەری بەرزکردەکاتەوەو دەفەرمووێت: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). لەپاشدا دوو سەجدە دەبات، ئینجا تەحیات دەخوێنێ و لەدوای تەحیات خوێندن سەلام

دەداتەوە.

## چۆنیەتی قورئان خوێندن لە نوێژی خۆرگیراندا

### ٣٩٧ - بَابٌ: كَيْفَ الْقِرَاءَةُ فِي الْكُسُوفِ

٥٦٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ عِبَادٍ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي كُسُوفٍ لاَ نَسْمَعُ لَهُ صَوْتًا. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. حَدِيثُ سَمُرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەبێ دەنگی نوێژی خۆرگیرانی بۆکردین، بە هیچ شێوەیە گوێمان لەدەنگی نەبوو. زانایان پەیڕەوی ئەم فەرموودە دەکەن. ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعییە.

٥٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ أَبَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ صَدَقَةَ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى صَلاَةَ الكُسُوفِ وَجَهَرَ بِالقِرَاءَةِ فِيهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى أَبُو إِسْحَاقَ الفَزَارِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ حُسَيْنٍ، نَحْوَهُ. وَبِهَذَا الحَدِيثِ، يَقُولُ مَالِكٌ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی خۆرگیرانی کرد بە دەنگەوە قورئانی خوێند. پێشەوایان مالیك و ئەحمەد و ئیسحاق پەیڕەوی ئەم فەرموودە دەکەن.

## ئەوەی هاتووە سەبارەت بە نوێژی ترس

### ٣٩٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ

٥٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَال: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَال: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى صَلَاةَ الْخَوْفِ بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً، وَالطَّائِفَةُ الأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَقَامُوا فِي مَقَامِ أُولَئِكَ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً أُخْرَى، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ، فَقَامَ هَؤُلَاءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ، وَقَامَ هَؤُلَاءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَى مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، مِثْلَ هَذَا. وَفِي الْبَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَسَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، وَأَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ وَاسْمُهُ زَيْدُ بْنُ صَامِتٍ، وَأَبِي بَكْرَةَ. وَقَدْ ذَهَبَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ إِلَى حَدِيثِ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. وَقَالَ أَحْمَدُ: قَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةُ الْخَوْفِ عَلَى أَوْجُهٍ، وَمَا أَعْلَمُ فِي هَذَا الْبَابِ إِلاَّ حَدِيثًا صَحِيحًا، وَأَخْتَارُ حَدِيثَ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ. وَهَكَذَا قَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: ثَبَتَتِ الرِّوَايَاتُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ، وَرَأَى أَنَّ كُلَّ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ فَهُوَ جَائِزٌ، وَهَذَا عَلَى قَدْرِ الْخَوْفِ. قَالَ إِسْحَاقُ: وَلَسْنَا نَخْتَارُ حَدِيثَ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ عَلَى غَيْرِهِ مِنَ الرِّوَايَاتِ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕکاتێ نوێژی ترسی بە کۆمەڵ و دەستەیەك لە هاوەڵان کردو دەستەکەی تریان بە چەکەوە بەرامبەر بە دوژمن ڕاوەستابوون، لەپاشدا دەستەی یەکەم بۆ خۆیان ڕکاتەکەی تریان کردوو سەلامیان دایەوەو ڕۆشتن

لـە جێگـای ئەوانـدا بەرامبـەر بـە دوژمـن راوەسـتان، جـا دەسـتەی دووەم هـاتن رکاتێکی بەوانیش کرد، ئینجا سەلامی دایەوە، لەپاشدا دەستەی دووەم بـۆ خۆیـان رکاتەکەی تریان کرد.

پێشەوایان مالیك و شافیعی و ئەحمەد فەرموودەکەی سەهلی کوڕی (حثمـة)یـان بەلاوە پەسەندە. پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێت: چەند فەرموودەیـە لـەبارەی نوێـژی ترسەوە هاتووە، پێـی وایـە پـەیڕەوی هـەر کامیـان بکرێـت هـەر دروسـتە، بـەپێی حاڵەتی ترسەکە.

٥٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، أَنَّهُ قَالَ فِي صَلاَةِ الخَوْفِ، قَالَ: يَقُومُ الإِمَامُ مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ، وَتَقُومُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَهُ، وَطَائِفَةٌ مِنْ قِبَلِ العَدُوِّ، وَوُجُوهُهُمْ إِلَى العَدُوِّ، فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً، وَيَرْكَعُونَ لأَنْفُسِهِمْ، وَيَسْجُدُونَ لأَنْفُسِهِمْ سَجْدَتَيْنِ فِي مَكَانِهِمْ، ثُمَّ يَذْهَبُونَ إِلَى مَقَامِ أُولَئِكَ، وَيَجِيءُ أُولَئِكَ، فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً وَيَسْجُدُ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، فَهِيَ لَهُ ثِنْتَانِ وَلَهُمْ وَاحِدَةٌ، ثُمَّ يَرْكَعُونَ رَكْعَةً وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ.

واتـە: لـە سـەهلی کـوڕی (حثمـة)وە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە دەربارەی چۆنیەتی نوێژی ترس فەرموویەتی: پێشـنوێژ هەسـتێ ڕوو بکاتـە قیبلـەو نوێژ دابەستێ، دەستەیەك لەگەڵی نوێژ بکەن و دەستەکەی تریان ڕوویان لە دوژمـن بێ و بە چەکەوە بەرامبەریان راوەستن، جا رکاتێ بکـات بـە دەسـتەی یەکـەم و بـۆ خۆشیان رکاتەکەی تر بکەن، هـەر لەشـوێنی خۆیـان دوو سـەجدە بـەرن و تـەحیات بخوێنن و سەلام بدەنەوەو بڕۆن بۆ شوێنی دەستەی دووەم، جا دەستەی دووەم بـێن و رکاتێك نوێژیان پێ بکات و دوو سەجدەیان پێ بـەرێت، ئـەوە بـۆ پێشـنوێژ دەکاتـە

دوو رکات نوێژ، بۆ ئەوانیش دەکاتە رکاتێك، لەپاشدا بۆ خۆیان رکاتەکەی تر بکەن و دوو سەجدە بەرن و تەحیات بخوێنن سەلام بدەنەوە.

٥٦٦ - قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ: سَأَلْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ عَنْ هَذَا الحَدِيثِ؟ فَحَدَّثَنِي عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ، وقَالَ لِي يَحْيَى: اكْتُبْهُ إِلَى جَنْبِهِ، وَلَسْتُ أَحْفَظُ الحَدِيثَ، وَلَكِنَّهُ مِثْلُ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ.

وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. لَمْ يَرْفَعْهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَهَكَذَا رَوَى أَصْحَابُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ مَوْقُوفًا، وَرَفَعَهُ شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ.

٥٦٧ - وَرَوَى مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ، عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَنْ مَنْ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الخَوْفِ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

وَبِهِ يَقُولُ مَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَرُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً رَكْعَةً، فَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَانِ، وَلَهُمْ رَكْعَةٌ رَكْعَةٌ. أَبُو عَيَّاشٍ الزُّرَقِيُّ اسْمُهُ زَيْدُ بْنُ صَامِتٍ.

واتە: چەند کەسێ لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێرنەوە، کە هەر دەستەو رکاتێ نوێژی ترسی پێ دەکردن ئەمەش بۆ خۆی دەکاتە دوو رکات و بۆ هەر دەستەیەکیش یەك رکات. — بۆ خۆشیان رکاتەکەی تریان دەکرد -.

## سەبارەت بە سەجدەكانی قورئان خوێندن

### ٣٩٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ

٥٦٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ عُمَرَ الدِّمَشْقِيِّ، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، قَالَ: سَجَدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِحْدَى عَشْرَةَ سَجْدَةً مِنْهَا الَّتِي فِي النَّجْمِ.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یانزە سەجدەی قورئان خوێندنم بردووە یەكێكیان لە سورەتی (النَّجْمِ)دا بوو.

٥٦٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ عُمَرَ وَهُوَ ابْنُ حَيَّانَ الدِّمَشْقِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ مُخْبِرًا يُخْبِرُ، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِلَفْظِهِ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ بْنِ وَكِيعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ وَهْبٍ. حَدِيثُ أَبِي الدَّرْدَاءِ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ عُمَرَ الدِّمَشْقِيِّ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَعَمْرِو بْنِ العَاصِ.

## دەربارەی رۆشتنی ئافرەتان بۆ مزگەوتەكان.

### ٤٠٠ - بَابٌ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ إِلَى الْمَسَاجِدِ

٥٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ

الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ائْذَنُوا لِلنِّسَاءِ بِاللَّيْلِ إِلَى الْمَسَاجِدِ، فَقَالَ ابْنُهُ: وَاللَّهِ لاَ نَأْذَنُ لَهُنَّ يَتَّخِذْنَهُ دَغَلاً فَقَالَ: فَعَلَ اللَّهُ بِكَ وَفَعَلَ، أَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَتَقُولُ: لاَ نَأْذَنُ لَهُنَّ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت ئیبنو عومەردا بووین ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ڕێگە بدەن بە ئافرەتانتان بەشەوا بچن بۆ مزگەوتەکان)، کوڕێکی ئیبنو عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ڕێگەیان پێ نادەم، چونکە ئامادەبوونیان لە مزگەوت دەبێتە هۆی خراپەکاری و فڕوفێڵ، ئیبنو عومەر قسەی پێ وت و لێی تورەبوو فەرمووی: خوای گەورە ئاواو ئاوات پێ بکات، من دەڵێم پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ڕێگەیان پێ بدەن). تۆ دەڵێی: (ڕێگەیان پێ نادەم).

## دەربارەی دروست نیە تف رۆکردنە مزگەوت.

### ٤٠١ - بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ البُزَاقِ فِي الْمَسْجِدِ

٥٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُحَارِبِيِّ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا كُنْتَ فِي الصَّلاَةِ فَلاَ تَبْزُقْ عَنْ يَمِينِكَ، وَلَكِنْ خَلْفَكَ، أَوْ تِلْقَاءَ شِمَالِكَ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِكَ اليُسْرَى. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ طَارِقٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَسَمِعْتُ الجَارُودَ يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا يَقُولُ: لَمْ يَكْذِبْ رِبْعِيُّ بْنُ حِرَاشٍ فِي الإِسْلاَمِ كَذْبَةً. وقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ: أَثْبَتُ أَهْلِ الكُوفَةِ مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ.

واتە: لە (طَارِقِ)ی کوڕی (عَبْدِ اللهِ الْمُحَارِبِيِّ)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر لە نوێژدا بووی تف مەکە لای ڕاستت، بەڵکو بۆ دواوە یان بەلای چەپدا ڕۆی بکە ئەگەر چۆڵ و شیاو بوو، یان لەژێر پێی چەپدا ڕۆی بکە). — و پێی پێدا بهێنە. وەك لە فەرموودەی تردا هاتووە بە ڕیوایەتی ئەبو داود - .

٥٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: البُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (تف ڕۆکردنە

مزگەوت هەڵەیەو گوناهە، کەفارەتی ئەو گوناهەش تەنها شاردنەوەیەتی).

## سەجدەبردن لەکاتی خوێندنی سورەتی: (علق) و (انشقاق)دا

٤٠٢ - بَابٌ السَّجْدَةِ فِي سورتين: (عَلَق) وَ (انشقاق).

٥٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى، عَنْ عَطَاءِ بْنِ مِينَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَال: سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ)، وَ (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەجدەی قورئان خوێندنمان برد لەکاتی خوێندنی ئەم دوو سورەتەدا: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ) و (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ).

٥٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ. وَفِي الحَدِيثِ أَرْبَعَةٌ مِنَ التَّابِعِينَ بَعْضُهُمْ عَنْ بَعْضٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: يَرَوْنَ السُّجُودَ فِي: (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) وَ (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ).

بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرمودە زۆربەی زانایان رایان وایە: لەکاتی خوێندنی ئەم دوو سورەتەدا سەجدەی قورئان خوێندن ببردرێت: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ) و (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ).

## سەجدەبردن لەکاتی خوێندنی سورەتی: (النَّجْمِ)دا

### ٤٠٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّجْدَةِ فِي النَّجْمِ

٥٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الْبَزَّازُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الْوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: سَجَدَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهَا، يَعْنِي النَّجْمَ، وَالْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ. وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ: يَرَوْنَ السُّجُودَ فِي سُورَةِ النَّجْمِ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: لَيْسَ فِي الْمُفَصَّلِ سَجْدَةٌ. وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ. وَالْقَوْلُ الْأَوَّلُ أَصَحُّ. وَبِهِ يَقُولُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

**واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەکاتی خوێندنی سورەتی: (النَّجْمِ)دا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و موسوڵمانان و مرۆڤەکان و جنۆکەکان و هاوبەش بۆ خوادانەران سەجدەیان برد.**

**بە پەیڕەوکردنی ئەم فەرموودە هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رایان وایە: لەکاتی خوێندنی سورەتی: (النَّجْمِ)دا سەجدەی قورئان خوێندن ببردرێت.**

## ئەوەی سەجدە نەبات لەکاتی خوێندنی: (النَّجْمِ)دا

### ٤٠٤ - بَابُ مَا جَاءَ مَنْ لَمْ يَسْجُدْ فِيهِ

٥٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ

يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قُسَيْطٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّجْمَ، فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا. حَدِيثُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَتَأَوَّلَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ هَذَا الحَدِيثَ، فَقَالَ: إِنَّمَا تَرَكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السُّجُودَ لأَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ حِينَ قَرَأَ، فَلَمْ يَسْجُدْ لَمْ يَسْجُدِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَالُوا: السَّجْدَةُ وَاجِبَةٌ عَلَى مَنْ سَمِعَهَا، فَلَمْ يُرَخِّصُوا فِي تَرْكِهَا. وَقَالُوا: إِنْ سَمِعَ الرَّجُلُ وَهُوَ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ فَإِذَا تَوَضَّأَ سَجَدَ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ. وَبِهِ يَقُولُ إِسْحَاقُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِنَّمَا السَّجْدَةُ عَلَى مَنْ أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ فِيهَا، وَالتَمَسَ فَضْلَهَا، وَرَخَّصُوا فِي تَرْكِهَا إِنْ أَرَادَ ذَلِكَ. وَاحْتَجُّوا بِالحَدِيثِ الْمَرْفُوعِ حَدِيثِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّجْمَ، فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا. فَقَالُوا: لَوْ كَانَتِ السَّجْدَةُ وَاجِبَةً لَمْ يَتْرُكِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْدًا حَتَّى كَانَ يَسْجُدَ، وَيَسْجُدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ عُمَرَ أَنَّهُ قَرَأَ سَجْدَةً عَلَى الْمِنْبَرِ، فَنَزَلَ فَسَجَدَ، ثُمَّ قَرَأَهَا فِي الجُمُعَةِ الثَّانِيَةِ، فَتَهَيَّأَ النَّاسُ لِلسُّجُودِ، فَقَالَ: إِنَّهَا لَمْ تُكْتَبْ عَلَيْنَا إِلاَّ أَنْ نَشَاءَ، فَلَمْ يَسْجُدْ، وَلَمْ يَسْجُدُوا. فَذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ.

**واتـە: لـە زەیـدی كـوڕی زەیـدەوە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: سورەتی (النَّجْمِ)م خوێندەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەجدەی نەبرد.**

## سەجدەبردن لەكاتی خوێندنی سورەتی: (ص)دا

### ٤٠٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّجْدَةِ فِي (ص)

٥٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ

عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْجُدُ فِي ص، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَلَيْسَتْ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ فِي هَذَا: فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنْ يَسْجُدَ فِيهَا. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّهَا تَوْبَةُ نَبِيٍّ، وَلَمْ يَرَوْا السُّجُودَ فِيهَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خـوام (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) دی لـەکاتی خوێنـدنی سورەتی: (ص)دا سەجدەی برد. ئیبنو عەباس دەفەرمووێت: سـەجدەی قورئـان خوێنـدن عەزیمـە نیـە لەکاتی خوێندنی سورەتی: (ص)دا.

زانایان لە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) رایـان جیـاوازە، هەندێکیان رایان وایە: سەجدە ببردرێت، ئەمەش وتەی سوفیان و ئیبنو موبـارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسـحاقە. هەنـدێکی تریـان دەفـەرموون تەوبـەی پێغەمبـەرە (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆیە رایان وایە سەجدە نەبردرێت.

## سەجدە بردن لـەکاتی خوێندنی سورەتی: (الحج)دا

### ٤٠٦ - بَابٌ فِي السَّجْدَةِ فِي الْحَجِّ

٥٧٨ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ مِشْرَحِ بْنِ هَاعَانَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فُضِّلَتْ سُورَةُ الحَجِّ بِأَنَّ فِيهَا سَجْدَتَيْنِ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْهُمَا فَلاَ يَقْرَأْهُمَا. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ القَوِيِّ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا: فَرُوِيَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُمَا قَالاَ:

فُضِّلَتْ سُورَةُ الحَجِّ بِأَنَّ فِيهَا سَجْدَتَيْنِ. وَبِهِ يَقُولُ ابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَرَأَى بَعْضُهُمْ فِيهَا سَجْدَةً. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكٍ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! سورەتی حەج سورەتێکی گەورەیە دوو سەجدەی تێدایە؟ فەرمووی: (بەڵێ، هەرکەس لەکاتی خوێندنی ئەو دوو ئایەتەدا سەجدە نەبات با سورەتی سەجدە نەخوێنێ).

## لە سەجدەی قورئان خوێندندا چی دەوترێت.

٤٠٧ - بَابُ مَا يَقُولُ فِي سُجُودِ القُرْآنِ

٥٧٩ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ بْنِ خُنَيْسٍ، قَال: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ، قَال: قَالَ لِي ابْنُ جُرَيْجٍ: يَا حَسَنُ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَال: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي رَأَيْتُنِي اللَّيْلَةَ وَأَنَا نَائِمٌ كَأَنِّي أُصَلِّي خَلْفَ شَجَرَةٍ، فَسَجَدْتُ، فَسَجَدَتِ الشَّجَرَةُ لِسُجُودِي، فَسَمِعْتُهَا وَهِيَ تَقُولُ: اللَّهُمَّ اكْتُبْ لِي بِهَا عِنْدَكَ أَجْرًا، وَضَعْ عَنِّي بِهَا وِزْرًا، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْرًا، وَتَقَبَّلْهَا مِنِّي كَمَا تَقَبَّلْتَهَا مِنْ عَبْدِكَ دَاوُدَ، قَالَ الحَسَنُ: قَالَ لِيَ ابْنُ جُرَيْجٍ: قَالَ لِي جَدُّكَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَرَأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَجْدَةً، ثُمَّ سَجَدَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَسَمِعْتُهُ وَهُوَ يَقُولُ مِثْلَ مَا أَخْبَرَهُ الرَّجُلُ عَنْ قَوْلِ الشَّجَرَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاویّ هاتە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! ئەم شەو لەخەودا وەك بڵێی لەدوای درەختێکەوە نوێژم دەکرد سەجدەم دەبرد درەختەکەیش سەجدەی دەبرد، گوێم لیّ بوو دەیوت: خودایە بەم سەجدەیە خێر و پاداشتم بۆ بنوسە، گوناهەکانمی پیّ بسڕەوە، بیکە بە گەنجینەیە بۆم لای خۆت، لێم قبوڵ بکە وەك چۆن قبوڵت کرد لە بەندەی خۆت داود.

حەسەن فەرمووی: ئیبنو جورەیج پێی فەرمووم: باپیرت پێی فەرمووم، ئیبنو عەباس فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سورەتی سەجدەی خوێند، لەپاشدا سەجدەی برد، ئیبنو عەباس فەرمووی: گوێم لێی بوو وەك وتەی درەختەکەی فەرموو.

٥٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي سُجُودِ القُرْآنِ بِاللَّيْلِ: سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەجدەی قورئان خوێندنی شەودا دەیفەرموو: (سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ) واتە: رووی من سەجدەی برد، بۆ ئەو زاتەی کە دروستی کردووە و وێنەی کێشاوە، گویّ و چاوی تێدا رواندووە، بە گۆڕانکاری خۆی و توانایی ئەو پاك و بیّ عەیب و خاوەن خەیری زۆر.

## کەسێ شەونوێژی لەدەست چوو بەرۆژ قەزای بکاتەوە

٤٠٨ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِيمَنْ فَاتَهُ حِزْبُهُ مِنَ اللَّيْلِ فَقَضَاهُ بِالنَّهَارِ

٥٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو صَفْوَانَ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ، وَعُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَخْبَرَاهُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ القَارِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ مَا بَيْنَ صَلَاةِ الفَجْرِ وَصَلَاةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو صَفْوَانَ اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدٍ الْمَكِّيُّ، وَرَوَى عَنْهُ الحُمَيْدِيُّ وَكِبَارُ النَّاسِ.

واتە: لە عومەری کوڕی (خَطَّاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ خەوت نوێژی سوننەتی شەوی نەکرد، یان هەندێکی نەکرد، لەنێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا بیانکاتەوە وەك ئەوەی کە بەشەو کردبێتی ئاوەها پاداشتەکەی بۆ دەنوسرێت). - بۆ نمونە کەسێ عادەتی وەها بێت شەوانە یانزە رکات شەونوێژ بکات و ئەوەندەو ئەوەندە قورئانیان تێدا بخوێنێت، ئەگەر شەوێ خەوت و خەبەری نەبووە دەتوانێت لەنێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا بیانکاتەوە -.

## هەڕەشەکردن لەو کەسەی لەپێش پێشنوێژەوە سەری بەرزدەکاتەوە

٤٠٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشْدِيدِ فِي الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ

٥٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ

الإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، قَالَ قُتَيْبَةُ: قَالَ حَمَّادٌ: قَالَ لِي مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ: إِنَّمَا قَالَ: أَمَا يَخْشَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ هُوَ بَصْرِيٌّ ثِقَةٌ، وَيُكْنَى أَبَا الحَارِثِ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئایا کەسێك لە ئێوە ناترسێت سەری بەرزدەکاتەوە لە سەجدە لەکاتێکدا کە پێشنوێژ لەسەجدەدایە یان لە ڕکوعدایە، خوا ئەو سەرەی بکات بەسەری گوێدرێژ؟ یان وێنەی ئەو بگۆڕێت بە وێنەی گوێدرێژ).**

## کەسێ نوێژێکی فەرز بکات لەپاشدا بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات

٤١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الَّذِي يُصَلِّي الفَرِيضَةَ ثُمَّ يَؤُمُّ النَّاسَ بَعْدَ ذَلِكَ

٥٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، كَانَ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى قَوْمِهِ فَيَؤُمُّهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَصْحَابِنَا الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. قَالُوا: إِذَا أَمَّ الرَّجُلُ القَوْمَ فِي الْمَكْتُوبَةِ وَقَدْ كَانَ صَلاَّهَا قَبْلَ ذَلِكَ أَنَّ صَلاَةَ مَنْ ائْتَمَّ بِهِ جَائِزَةٌ. وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ جَابِرٍ فِي قِصَّةِ مُعَاذٍ. وَهُوَ حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ جَابِرٍ. وَرُوِي عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، وَالقَوْمُ فِي صَلاَةِ العَصْرِ وَهُوَ يَحْسِبُ أَنَّهَا صَلاَةُ الظُّهْرِ، فَائْتَمَّ بِهِمْ، قَالَ: صَلاَتُهُ جَائِزَةٌ. وَقَدْ قَالَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ: إِذَا ائْتَمَّ قَوْمٌ بِإِمَامٍ وَهُوَ يُصَلِّي العَصْرَ وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنَّهَا الظُّهْرُ فَصَلَّى بِهِمْ، وَاقْتَدَوْا بِهِ فَإِنَّ صَلاَةَ الْمُقْتَدِي فَاسِدَةٌ إِذَا اخْتَلَفَ نِيَّةُ الْإِمَامِ وَنِيَّةُ الْمَأْمُومِ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (مُعَاذ)ی کوڕی جەبەل ڕەزای خوای لێ بێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی شێوانی کرد، پاشان گەڕایەوە بۆناو قەومەکەی و بەرنوێژی هەمان نوێژی بۆ کردن.

پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق پەیڕەوی ئەم فەرموودە دەکەن و دەفەرموون: ئەگەر کەسێ بەرنوێژی نوێژێکی فەرز بۆ خەڵك بکات، لەکاتێکدا کە خۆی پێشتر ئەو نوێژەی کردبێ، ئەوەی لەدوایەوە نوێژ دەکات نوێژەکەی دروستە. بە بەڵگەی فەرموودەکەی جابیر ڕەزای خوای لێ بێ.

پرسیار کرا ئەبو (درداء) ڕەزای خوای لێ بێ دەربارەی پیاوێ دەچێتە مزگەوتەوە، لەوکاتەدا خەڵکەکە نوێژی عەسر دەکەن، ئەویش بەلایەوە وابێ ئەوان نوێژی نیوەڕۆ دەکەن نوێژیان لەگەڵدا بکات، ئایا نوێژەکەی دروستە یان نا؟ فەرمووی: بەڵێ نوێژەکەی دروستە. هەندێ لەخەڵکی کوفە دەڵێن: ئەگەر کۆمەڵێ خەڵك لەدوای پێشنوێژێکەوە نوێژ بکەن ئەو نوێژی عەسر بکات، ئەوانیش بەلایانەوە وابێ نوێژی نیوەڕۆ دەکات، ئەوە نوێژی ئەو کەسە بەتاڵە کە لەدوایەوە نوێژ دەکات، ئەگەر نیەتی پێشنوێژ و ئەوەی لەدوایەوە نوێژ دەکات جیاواز بێت.

## دەربارەی ڕێدان بە سەجدەبردن لەسەر پۆشاك لەکاتی گەرماو سەرمادا

٤١١ - بَابُ مَا ذُكِرَ مِنْ الرُّخْصَةِ فِي السُّجُودِ عَلَى الثَّوْبِ فِي الحَرِّ وَالبَرْدِ

٥٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنِي غَالِبٌ القَطَّانُ، عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُزَنِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالظَّهَائِرِ سَجَدْنَا عَلَى ثِيَابِنَا اتِّقَاءَ الحَرِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ

جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَقَدْ رَوَى وَكِيعٌ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: کاتێ لەدوای پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نوێـژی نیوەڕۆمـان دەکرد، لەبەر گەرما لەسەر پۆشاکەکانمان سەجدەمان دەبرد.

## دانیشتن لە مزگەوت کارێکی باشە لەدوای نوێژی بەیانی هەتا خۆرهەڵاتن

٤١٢ - بَابُ ذِكْرِ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الجُلُوسِ فِي الْمَسْجِدِ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ

٥٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى الفَجْرَ قَعَدَ فِي مُصَلاَّهُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ

واتــە: لــە جــابری کــوڕی ســەمورەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: کـاتێ پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نوێـژی بـەیانی دەکـرد لـەو شوێنەی کە نوێژەکەی تێدا دەکرد دادەنیشت و هەڵنەدەستا هەتا خۆر دەردەکەوت.

٥٨٦ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاوِيَةَ الجُمَحِيُّ البَصْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو ظِلاَلٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَلَّى الغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ: عَنْ أَبِي ظِلاَلٍ؟

فَقَال: هُوَ مُقَارِبُ الحَدِيثِ، قَالَ مُحَمَّدٌ: وَاسْمُهُ هِلاَلٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس نوێژی بەیانی بکات بە کۆمەڵ، لەپاشدا لە شوێنی خۆی دانیشێ یادی خوا بکات هەتا خۆر هەڵدێ — و کەمێ بەرز دەبێتەوە — ، ئینجا دوو رکات نوێژ بکات، خێر و پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواوی بۆ دەنوسرێت).

### ئەوەی هاتووە سەبارەت بە ئاوڕدانەوە لەنوێژدا

### ٤١٣ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي الاِلْتِفَاتِ فِي الصَّلاَةِ

٥٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَلْحَظُ فِي الصَّلاَةِ يَمِينًا وَشِمَالاً، وَلاَ يَلْوِي عُنُقَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ خَالَفَ وَكِيعٌ الفَضْلَ بْنَ مُوسَى فِي رِوَايَتِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەنوێژدا چاوی دەگێڕا بەلای ڕاست و چەپداو سەرنجی دەدا، بەڵام ملی وەرنەچەرخان بۆ دواوە واتە ئاوڕی نەئەدایەوە بۆ دواوە.

٥٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ عِكْرِمَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَلْحَظُ فِي الصَّلاَةِ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَعَائِشَةَ.

واتە: لە هەندێ لە هاوەڵانی عیکریمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەنوێژدا چاوی دەگێڕا.

٥٨٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ حَاتِمٍ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا بُنَيَّ، إِيَّاكَ وَالالْتِفَاتَ فِي الصَّلاَةِ، فَإِنَّ الالْتِفَاتَ فِي الصَّلاَةِ هَلَكَةٌ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ فَفِي التَّطَوُّعِ لاَ فِي الفَرِيضَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمووم: (کوڕی خۆم هۆشیاربە نەکەی لەنوێژدا ئاوڕبدەیتەوە، بێگومان ئاوڕدانەوە لەنوێژدا تیاچوونە، ئەگەر هەر ناچار بووی لەنوێژی سوننەتدا بەهەرحاڵ بەڵام لەنوێژی فەرزدا نابێ و دروست نیە).

٥٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الالْتِفَاتِ فِي الصَّلاَةِ، قَالَ: هُوَ اخْتِلاَسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلاَةِ الرَّجُلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت ئاوڕدانەوەی نوێژخوێن پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ ئەویش فەرمووی: (ئەوە دزین و ڕفاندنێکە شەیتان لە نوێژی بەندە دەیدزێ).

## ئەگەر پێشنوێژ لەسەجدەدا بوو یەكێ هات بۆ نوێژ چی بكات

## ٤١٤ – بَابُ مَا ذُكِرَ فِي الرَّجُلِ يُدْرِكُ الإِمَامَ وَهُوَ سَاجِدٌ كَيْفَ يَصْنَعُ

٥٩١ – (صحيح) حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُونُسَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ هُبَيْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، وَعَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالاَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ وَالإِمَامُ عَلَى حَالٍ فَلْيَصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الإِمَامُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا أَسْنَدَهُ إِلاَّ مَا رُوِيَ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. قَالُوا: إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ وَالإِمَامُ سَاجِدٌ فَلْيَسْجُدْ وَلاَ تُجْزِئُهُ تِلْكَ الرَّكْعَةُ إِذَا فَاتَهُ الرُّكُوعُ مَعَ الإِمَامِ. وَاخْتَارَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ أَنْ يَسْجُدَ مَعَ الإِمَامِ. وَذَكَرَ عَنْ بَعْضِهِمْ فَقَالَ: لَعَلَّهُ لاَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فِي تِلْكَ السَّجْدَةِ حَتَّى يُغْفَرَ لَهُ.

واتە: لە (مُعَاذ)ی كوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەكێ لەئێوە هات بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەماعەت و پێشنوێژ لە نوێژدا بوو یەكسەر نوێژ دابەستێ و وەك پێشنوێژ بكات). – بۆ نمونە ئەگەر پێشنوێژ لە سەجدەدا بوو ئەویش سەجدە بەرێت –.

بە پەیڕەوكردنی فەرموودەكە هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەگەر پیاوێ هات بۆ مزگەوت پێشنوێژ لە سەجدەدا بوو ئەویش سەجدە بەرێت، ئەو ركاتەی بۆ حساب نیە، ئەگەر لەگەڵ پێشنوێژدا ركوعی نەبردبوو. (عبد الله)ی كوڕی موبارەك دەفەرمووێ: با لەگەڵ پێشنوێژدا سەجدە بەرێت. هەندێكیان دەفەرموون: لەوانەیە لەو سەجدە سەری بەرزنەكاتەوە هەتا خوا لێی خۆش دەبێت.

## کە قامەت کرا خەڵکەکە هەستانەوە چاوەڕێکردنی پێشنوێژ باش نیە

### ٤١٥ - بَابُ كَرَاهِيَةِ أَنْ يَنْتَظِرَ النَّاسُ الإِمَامَ وَهُمْ قِيَامٌ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلاَةِ

٥٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي خَرَجْتُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَحَدِيثُ أَنَسٍ غَيْرُ مَحْفُوظٍ. حَدِيثُ أَبِي قَتَادَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ أَنْ يَنْتَظِرَ النَّاسُ الإِمَامَ وَهُمْ قِيَامٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ الإِمَامُ فِي الْمَسْجِدِ فَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَإِنَّمَا يَقُومُونَ إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ. وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ الْمُبَارَكِ.

لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبو قەتادەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ هەڵمەسن هەتا دەمبینن دەردەچم).

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش بەلایانەوە باش نیە کە قامەت کرا خەڵکەکە هەستانەوە چاوەڕێی پێشنوێژ بکەن. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر پێشنوێژ لەمزگەوت بوو قامەت کرا، هەڵسنەوە لەکاتێکدا کە بانگبێژ فەرمووی: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ). ئەمەش وتەی پێشەوا ئیبنو موبارەکە.

## سوپاس و ستایشی خوای گەورە و سڵاواتدان لەپێش پاڕانەوەدا

٤١٦ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي الثَّنَاءِ عَلَى اللهِ، وَالصَّلاَةِ عَلَى النَّبِيِّ قَبْلَ الدُّعَاءِ

٥٩٣ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَال: كُنْتُ أُصَلِّي وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ مَعَهُ، فَلَمَّا جَلَسْتُ بَدَأْتُ بِالثَّنَاءِ عَلَى اللهِ، ثُمَّ الصَّلاَةِ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ دَعَوْتُ لِنَفْسِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سَلْ تُعْطَهْ، سَلْ تُعْطَهْ وَفِي البَابِ عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ.حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: نوێژم دەکرد، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دانیشتبوو پێشەوا ئەبو بەکر و عومەری لەگەڵ بوو، دانیشتم بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەستم پێ کرد، لەپاشدا بە سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئینجا پاڕامەوە بۆ خۆم، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بپاڕێرەوە و داوا بکە پێت دەدرێت، بپاڕێرەوە و داوا بکە پێت دەدرێت).

## سەبارەت بە بۆن خۆش کردنی مزگەوتەکان

٤١٧ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي تَطْيِيبِ الْمَسَاجِدِ

٥٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَاتِمٍ الْمُؤَدِّبُ البَغْدَادِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَامِرُ بْنُ صَالِحٍ الزُّبَيْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبِنَاءِ الْمَسَاجِدِ فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُنَظَّفَ، وَتُطَيَّبَ.

واتــە: لــە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــیّ بــیّ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی دا بە دروستکردنی مزگـەوت لـەناو هـۆز و گـەڕەك و ماڵەکانـدا، هـەروەها فـەرمانی دا پـاك بکرێنـەوەو بـۆن خـۆش بکرێن.

٥٩٥ - حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، وَوَكِيعٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ.

٥٩٦ - حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ. وقَالَ سُفْيَانُ: قَوْلُهُ بِبِنَاءِ الْمَسَاجِدِ فِي الدُّورِ يَعْنِي القَبَائِلَ.

## نوێژی سوننەتی شەو دوو ڕکات دوو ڕکاتە

٤١٨ - بَابٌ: أَنَّ صَلاَةَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى

٥٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ عَلِيٍّ الأَزْدِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صَلاَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى. اخْتَلَفَ أَصْحَابُ شُعْبَةَ فِي حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ فَرَفَعَهُ بَعْضُهُمْ، وَأَوْقَفَهُ بَعْضُهُمْ. وَرُوِي عَنْ عَبْدِ اللهِ العُمَرِيِّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوُ هَذَا. وَالصَّحِيحُ مَا رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى. وَرَوَى الثِّقَاتُ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ صَلاَةَ النَّهَارِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى،

وَبِالنَّهَارِ أَرْبَعًا. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي ذَلِكَ: فَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنَّ صَلاَةَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَرَأَوْا صَلاَةَ التَّطَوُّعِ بِالنَّهَارِ أَرْبَعًا، مِثْلَ الأَرْبَعِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَغَيْرِهَا مِنْ صَلاَةِ التَّطَوُّعِ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (نوێژی سوننەتی شەو و رۆژ دوو رکات دوو رکاتە).

لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە شەو دوو رکات دوو رکات نوێژی سوننەتی دەکرد، بەرۆژ چوار رکاتی دەکرد.

زانایان رایان جیاوازە لەوبارەوە: هەندێکیان رایان وایە: نوێژی سوننەتی شەو و رۆژ دوو رکات دوو رکاتە. ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعی و ئەحمەدە.

هەندێکی تریان دەفەرموون: نوێژی سوننەتی شەو دوو رکات دوو رکاتە. رایان وایە نوێژی سوننەت بەرۆژدا چوار رکاتە. وەك چوار رکات لەپێش نوێژی نیوەرۆ و چوار رکات لەدوای نوێژی نیوەرۆ، غەیری نیوەرۆش لە نوێژە سوننەتەکان. ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و ئیسحاقە.

## چۆنیەتی نوێژی سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەرۆژدا

٤١٩ - بَابُ كَيْفَ كَانَ تَطَوُّعُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالنَّهَارِ

٥٩٨ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، قَالَ: سَأَلْنَا عَلِيًّا عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ النَّهَارِ؟ فَقَالَ: إِنَّكُمْ لاَ تُطِيقُونَ ذَاكَ، فَقُلْنَا: مَنْ أَطَاقَ ذَاكَ مِنَّا، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَاهُنَا كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَاهُنَا عِنْدَ الْعَصْرِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَإِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَاهُنَا كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَاهُنَا عِنْدَ الظُّهْرِ صَلَّى أَرْبَعًا، وَصَلَّى أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا، يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ، وَالنَّبِيِّينَ، وَالْمُرْسَلِينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، وَالْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە عاصمی کوڕی (ضَمْرَة)وە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت بە چۆنیەتی نوێژی سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەڕۆژدا، لە پێشەوا (علي)مان ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ فەرمووی: ئێوە ناتوانن وەك ئەو بکەن و بەردەوام بن لەسەری، وتمان: کێ لە ئێمە ئەتوانێ ئەوە بکات، فەرمووی: کاتێ کە خۆر دەردەکەوت و بەرزدەبۆوە دوو رکات نوێژی دەکرد، نیوەڕۆ چوار رکات نوێژی دەکرد، لەپێش نوێژی نیوەڕۆ چوار رکات نوێژی دەکرد، لەدوای نوێژی نیوەڕۆ دوو رکاتی دەکرد، لەپێش نوێژی عەسر چوار رکات نوێژی سوننەتی بە دوو سەلام دانەوە دەکرد واتە دوو رکات دوو رکات، سڵاوی دەکرد لە مەلائیکە نزیکەکان و پێغەمبەران و نێرراوان، هەروەها لە هەموو موسوڵمان و باوەڕدارێ کە پەیڕەوی ئەوان دەکات.

٥٩٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: أَحْسَنُ شَيْءٍ رُوِيَ فِي تَطَوُّعِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّهَارِ هَذَا. وَرُوِي عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، أَنَّهُ كَانَ يُضَعِّفُ

هَذَا الحَدِيثَ. وَإِنَّمَا ضَعَّفَهُ عِنْدَنَا، وَاللَّهُ أَعْلَمُ، لأَنَّهُ لاَ يُرْوَى مِثْلُ هَذَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ. وَعَاصِمُ بْنُ ضَمْرَةَ هُوَ ثِقَةٌ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْحَدِيثِ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ قَالَ سُفْيَانُ: كُنَّا نَعْرِفُ فَضْلَ حَدِيثِ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ عَلَى حَدِيثِ الحَارِثِ.

## نوێژکردن لەسەر عەباو پۆشاکی ژنان باش نیە

### ٤٢٠ - بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّلاَةِ فِي لُحُفِ النِّسَاءِ

٦٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ أَشْعَثَ وَهُوَ ابْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُصَلِّي فِي لُحُفِ نِسَائِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رُخْصَةٌ فِي ذَلِكَ.

**واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر عەباو پۆشاکی ژنەکانی نوێژی نەدەکرد. لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە ڕیگەی داوە بە نوێژکردن لەسەر عەباو پۆشاکی ژنان.**

## ڕۆشتن و کارکردن دروستە لەکاتی ئەنجامدانی نوێژی سوننەتدا

### ٤٢١ - بَابُ مَا يَجُوزُ مِنَ الْمَشْيِ وَالعَمَلِ فِي صَلاَةِ التَّطَوُّعِ

٦٠١ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ بُرْدِ بْنِ سِنَانٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: جِئْتُ وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِي البَيْتِ، وَالبَابُ عَلَيْهِ مُغْلَقٌ، فَمَشَى حَتَّى فَتَحَ لِي، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مَكَانِهِ، وَوَصَفَتِ البَابَ فِي القِبْلَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هاتم پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەماڵەوە نوێژی سوننەتی دەکرد دەرگاکە داخرابوو لەسەری، ڕۆشت هەتا کردیەوە بۆم، لەپاشدا پاشەوپاش گەڕایەوە شوێنی خۆی، دەرگاکە لەڕووی قیبلەوە بوو دایخستبوو بۆئەوەی کەس نەدات بە بەر نوێژەکەیدا.

## سەبارەت بە خوێندنی دوو سورەت لەڕکاتێکدا

### ٤٢٢ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي قِرَاءَةِ سُورَتَيْنِ فِي رَكْعَةٍ

٦٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَنْبَأَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ عَبْدَ اللهِ، عَنْ هَذَا الحَرْفِ (غَيْرِ آسِنٍ) أَوْ يَاسِنٍ؟ قَالَ: كُلَّ القُرْآنِ قَرَأْتَ غَيْرَ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: إِنَّ قَوْمًا يَقْرَءُونَهُ يَنْثُرُونَهُ نَثْرَ الدَّقَلِ، لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، إِنِّي لأَعْرِفُ السُّوَرَ النَّظَائِرَ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرُنُ بَيْنَهُنَّ، قَالَ: فَأَمَرْنَا عَلْقَمَةَ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: عِشْرُونَ سُورَةً مِنَ الْمُفَصَّلِ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرُنُ بَيْنَ كُلِّ سُورَتَيْنِ فِي رَكْعَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەعمەشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ دەربارەی پیتەکان (غَيْرِ آسِنٍ) سورة محمد: ١٥. یان (يَاسِنٍ) لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودی ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ فەرمووی: سەرجەم قورئانت خوێندۆتەوە جگە لەمە، وتی: بەڵێ، فەرمووی: کۆمەڵێ قورئان دەخوێنن پەرش و بڵاوی

دەکەنەوە وەك رەقەڵەی خورما، لە گەرویان تێپەڕ ناکات واتە قبوڵ نابێت، من چەند سورەتێکی هاوشێوە دەزانم کە لەماناندا وەك یەکن بەڵام ژمارەی ئایەتەکانیان وەك یەك نیە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوو سورەت دوو سورەت پێکەوە دەیخوێندن لەرکاتێکدا، ئەبو وائل فەرمووی: فەرمانمان کرد بە عەلقەمە دەربارەی ئەو سورەتانە پرسیار بکات لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعود رەزای خوای لێ بێ؟ فەرمووی: بیست سورەتی (مفصل)ن — لەسورەتی قاف بەدواوە پێیان دەوترێت سورەتە موفەصەلەکان -، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوو دوو پێکەوە دەیخوێندن لەرکاتێکدا.

## دەربارەی خێرو گەورەیی بەپێ رۆشتن بۆ مزگەوت

### ٤٢٣ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي فَضْلِ الْمَشْيِ إِلَى الْمَسْجِدِ

٦٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، سَمِعَ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا تَوَضَّأَ الرَّجُلُ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ لاَ يُخْرِجُهُ، أَوْ قَالَ: لاَ يَنْهَزُهُ، إِلاَّ إِيَّاهَا، لَمْ يَخْطُ خُطْوَةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، أَوْ حَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر پیاوێ لەماڵەوە دەستنوێژێکی جوان بگرێ بەتەواوی، لەپاشدا دەرچێ بەرەو مزگەوت، لەو چوونەی بۆ مزگەوت نیەت و مەبەستی بەس نوێژ بێ، وە تەنها نوێژ پاڵی پێوە بنێت، هەر هەنگاوێ دەنێ پلەیە پێی بەرزدەبێتەوەو گوناهێکی پێی هەڵدەوەرێ هەتا دەچێتە مزگەوتەوە).

## سوننەتی دوای نوێژی شێوان لەماڵەوە چاکترە و خێری زیاترە

### ٤٢٤ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي الصَّلاَةِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ أَنَّهُ فِي البَيْتِ أَفْضَلُ

٦٠٤ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ أَبِي الوَزِيرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ الْمَغْرِبَ، فَقَامَ نَاسٌ يَتَنَفَّلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الصَّلاَةِ فِي البُيُوتِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَالصَّحِيحُ مَا رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ حُذَيْفَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الْمَغْرِبَ فَمَا زَالَ يُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ حَتَّى صَلَّى العِشَاءَ الآخِرَةَ. فَفِي هَذَا الْحَدِيثِ دِلاَلَةٌ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي الْمَسْجِدِ.

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مزگەوتی هۆزی (عَبْد الأَشْهَل) نوێژی شێوانی کرد، کاتێ کە لێ بوونەوە خەڵکەکە هەستانەوە سوننەتی دوای نوێژی شێوانیان ئەنجامدا، فەرمووی: (دەستبگرن بەم نوێژانەوە لەماڵەوە واتە لەماڵەوە ئانجامیان بدەن). فەرموودەی صەحیح ئەمەیە لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەماڵی خۆیان دوو ركات سوننەتی دوای نوێژی شێوانی دەکرد.

لە (حذیفة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەمزگەوت دوو ركات سوننەتی دوای نوێژی شێوانی دەکرد، بەردەوام درێژەی دەدا بە قورئان خوێندنەکەی هەتا نوێژی خەوتنانی دەکرد. ئەم فەرموودەش

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەمزگەوت سوننەتی دوای نوێژی شێوانی دەکرد.

## دەربارەی کاتێ کەسێ موسوڵمان بوو خۆی بشوات

٤٢٥ - بَابٌ: فِي الاِغْتِسَالِ عِنْدَمَا يُسْلِمُ الرَّجُلُ

٦٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَغَرِّ بْنِ الصَّبَّاحِ، عَنْ خَلِيفَةَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ، أَنَّهُ أَسْلَمَ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: يَسْتَحِبُّونَ لِلرَّجُلِ إِذَا أَسْلَمَ أَنْ يَغْتَسِلَ وَيَغْسِلَ ثِيَابَهُ.

واتە: لە قەیسی کوڕی عاصیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە موسوڵمان بوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمامانی پێ کرد خۆی بشوات بە ئاو و سیدر. بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان پێیان باشە کاتێ کەسێ موسوڵمان دەبێ خۆی و پۆشاکەکانی بەری بشوات.

## دەربارەی وتنی (بِسْمِ اللَّهِ) لەکاتی چوونە سەرئاو.

٤٢٦ - بَابُ مَا ذُكِرَ مِنَ التَّسْمِيَةِ عِنْدَ دُخُولِ الخَلاَءِ

٦٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ بَشِيرِ بْنِ سَلْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَلاَّدٌ الصَّفَّارُ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ النَّصْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: سَتْرُ مَا بَيْنَ أَعْيُنِ الجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُهُمُ الخَلاَءَ، أَنْ يَقُولَ:

بِسْمِ اللَّهِ. هَـذَا حَـدِيثٌ غَرِيـبٌ، لاَ نَعْرِفُـهُ إِلاَّ مِـنْ هَـذَا الوَجْـهِ. وَإِسْـنَادُهُ لَـيْسَ بِـذَاكَ القَوِيِّ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَشْيَاءُ فِي هَذَا.

**واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) فەرموویەتی: (حیجاب و داپۆشەری نێوان چاوی جنۆکـەکان و شەرمگەی ئادەمیزادەکان ئەمەیە: کاتێ یەکێکیان چووە سەرئاو بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ)).**

## ڕوخساری ئەم ئومەتە لەقیامەتدا بەشوێنەواری سەجدەو دەستنوێژدا دەناسرێتەوە

٤٢٧ - بَابُ مَا ذُكِرَ مِنْ سِيمَاءِ هَذِهِ الأُمَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ آثَارِ السُّجُودِ وَالطُّهُورِ

٦٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ أَحْمَدُ بْنُ بَكَّارٍ الدِّمَشْقِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَال: قَالَ صَفْوَانُ بْنُ عَمْرٍو قَال: أَخْبَرَنِي يَزِيدُ بْنُ خُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: أُمَّتِي يَوْمَ القِيَامَةِ غُرٌّ مِنَ السُّجُودِ، مُحَجَّلُونَ مِنَ الوُضُوءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ.

**واتە: لـە (عبـد الله)ی کـوڕی بوسـرەوە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کەسانی ئومەتی من لە قیامەتدا بە شوێنەواری سپی و درەوشاوەی جێگەی سەجدە و دەستنوێژدا دەناسرێنەوە).**

## باشی دەست پێ کردن بە دەستنوێژ لەلای راستەوە

٤٢٨ - بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ التَّيَمُّنِ فِي الطُّهُورِ

٦٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ إِذَا تَطَهَّرَ، وَفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ، وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو الشَّعْثَاءِ اسْمُهُ سُلَيْمُ بْنُ أَسْوَدَ الْمُحَارِبِيُّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەهەموو هەڵسوکەوت و کاروباێکی خۆیدا بەپێی توانا حەزی دەکرد لەلای راستەوە دەست پێ بکات وەك: دەستنوێژگرتن ئەگەر دەستنوێژی بگرتایە، شانەکردنی مووی سەر و ریشی ئەگەر شانەی بکردنایە، پێڵاو لەپێ کردن ئەگەر لەپێی بکردایە.

## دەربارەی چەندە ئاو بەسە بۆ دەستنوێژگرتن.

٤٢٩ - بَابُ قَدْرِ مَا يُجْزِئُ مِنَ الْمَاءِ فِي الْوُضُوءِ

٦٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عِيسَى، عَنِ ابْنِ جَبْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُجْزِئُ فِي الْوُضُوءِ رِطْلاَنِ مِنْ مَاءٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ عَلَى هَذَا اللَّفْظِ. وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَبْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَوَضَّأُ بِالمكُّوكِ، وَيَغْتَسِلُ بِخَمْسَةِ مَكَاكِيَّ. وَرُوِي عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عِيسَى، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَبْرٍ، عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَوَضَّأُ بِالمدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ.

واتە: لە ئەنەسی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (دوو ڕەتڵ ئاو بەسە بۆ دەستنوێژگرتن).

هەر لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە (مەکۆك)مودێ ئاو دەستنوێژی دەگرت و بە پێنج (مەکۆك)مودیش خۆی دەشت.

لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە دوو ڕەتڵ ئاو دەستنوێژی دەگرت و بە (صاع)ێکیش خۆی دەشت[1].

## ئاوپژاندن لە جێگەی میزی کوڕی شیرەخۆرە.

٤٣٠ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي نَضْحِ بَوْلِ الغُلاَمِ الرَّضِيعِ

٦١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي حَرْبِ بْنِ أَبِي الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ فِي بَوْلِ الغُلاَمِ الرَّضِيعِ: يُنْضَحُ بَوْلُ الغُلاَمِ، وَيُغْسَلُ بَوْلُ الجَارِيَةِ، قَالَ قَتَادَةُ: وَهَذَا مَا لَمْ يَطْعَمَا، فَإِذَا طَعِمَا غُسِلاَ جَمِيعًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صحيح. رَفَعَ هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ قَتَادَةَ، وَأَوْقَفَهُ سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ وَلَمْ يَرْفَعْهُ

---

[1] ئەو (صاع)ەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەکاری هێناوە بریتی بووە لە چوار مشت ئەم چوار مشتەش دادەنرێت بە سێ لیتر بە پێوانە, یەکسانیشە بە ٢٤٠٠ غرام بە کێشانە. (فقة المنهجی علی مذهب شافعي).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی میزی کوڕی شیرەخۆرە فەرموویەتی: (ئەگەر میزی کوڕ بەر پۆشاك کەوت ئاوی لێ دەپژێنرێت، بەڵام هی کچ دەشۆردرێت). قەتادە فەرمووی: ئەمە ئەگەر خواردن نەخۆن، ئەگەر خواردنیان خوارد دەبێ جێگەی میزی هەردووکیان بشۆردرێت.

## پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم مەسحی کاڵەکانی دەکرد لەدوای دابەزینی مائیدە

٤٣١ - باب مَا ذُكِرَ فِي مَسْحِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ

٦١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ مُقَاتِلِ بْنِ حَيَّانَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، قَالَ: رَأَيْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ فِي ذَلِكَ، فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم تَوَضَّأَ فَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ فَقُلْتُ لَهُ: أَقَبْلَ الْمَائِدَةِ أَمْ بَعْدَ الْمَائِدَةِ، قَالَ: مَا أَسْلَمْتُ إِلاَّ بَعْدَ الْمَائِدَةِ.

واتە: لە شەهری کوڕی حەوشەبەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جەریری کوڕی (عبد الله)م دی دەستنوێژی گرت و مەسحی خوفەکانی کرد، دەربارەی ئەوە لێم پرسی؟ فەرمووی: بە چاوی خۆم پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی دەستنوێژی گرت و مەسحی خوفەکانی کرد، جا پێم وت: ئەوە پێش دابەزینی سورەتی (المائدة) بوو یان لەدوای؟ فەرمووی: من لەدوای دابەزینی (المائدة)وە موسوڵمان بووم.

٦١٢ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا نُعَيْمُ بْنُ مَيْسَرَةَ النَّحْوِيُّ، عَنْ خَالِدِ بْنِ زِيَادٍ نَحْوَهُ. قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِثْلَ هَذَا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُقَاتِلِ بْنِ حَيَّانَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ.

## باسی ئایا لەشگران بۆی هەیە بخوات پێش ئەوەی خۆی بشوات؟

٤٣٢ - بَابٌ: فِي الرُّخْصَةِ لِلْجُنُبِ فِي الأَكْلِ وَالنَّوْمِ إِذَا تَوَضَّأَ

٦١٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَطَاءٍ الخُرَاسَانِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ، عَنْ عَمَّارٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ لِلْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ، أَوْ يَشْرَبَ، أَوْ يَنَامَ أَنْ يَتَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمارەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕێی داوە بە لەشگران ئەگەر ویستی بخوات و بخواتەوە و بخەوێت و دەستنوێژ بگرێ وەك چۆن دەستنوێژ دەگرێت بۆ نوێژکردن.

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی نوێژکردن

٤٣٣ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي فَضْلِ الصَّلاَةِ

٦١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ القَطَوَانِيُّ الكُوفِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، قَال: حَدَّثَنَا غَالِبٌ أَبُو بِشْرٍ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ عَائِذٍ الطَّائِيِّ، عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، قَال: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُعِيذُكَ بِاللهِ يَا كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ مِنْ أُمَرَاءَ يَكُونُونَ مِنْ بَعْدِي، فَمَنْ غَشِيَ أَبْوَابَهُمْ فَصَدَّقَهُمْ فِي كَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ، وَلاَ يَرِدُ عَلَيَّ الحَوْضَ، وَمَنْ غَشِيَ أَبْوَابَهُمْ أَوْ لَمْ يَغْشَ وَلَمْ يُصَدِّقْهُمْ فِي كَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَسَيَرِدُ عَلَيَّ الحَوْضَ، يَا كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ الصَّلاَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ حَصِينَةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، يَا كَعْبَ

بْنَ عُجْرَةَ، إِنَّهُ لاَ يَرْبُو لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ، إِلاَّ كَانَتِ النَّارُ أَوْلَى بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مُوسَى. وَأَيُّوبُ بْنُ عَائِذٍ يُضَعَّفُ وَيُقَالُ: كَانَ يَرَى رَأْيَ الإِرْجَاءِ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَلَمْ يَعْرِفْهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مُوسَى وَاسْتَغْرَبَهُ جِدًّا.

واتـە: لـە كـەعبی كـوڕی عـوجرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێـی فـەرمووم: (ئـەی كـەعبی كوڕی عوجرە پەنات دەدەم بە خوای گـەورە لەكاربەدەسـتانێكی درۆزن و سـتەمكار كە لەدوای من پەیدا دەبن، ئەوەی بچێ بۆ لایان و لـەدەرگایان بـدات و درۆكانیـان بەڕاست بزانێ و بەراستیان بخاتەوە و یارمەتیدەری زوڵم و ستەمیان بێت — فتـوای ناڕەوایـان بـۆ بـدات یـان هـەر شـتێكی لـەو جـۆرە - ، ئـەوە لـە مـن نیـە واتـە شوێنكەوتەی ڕێبازی من نیـە، منـیش لـەوان نـیم، لەگـەڵم نایـەن بۆسـەر حـەوزی كەوسەر، ئەو كەسەی نەچێ بـۆ لایـان درۆكانیـان بەڕاسـت نـەزانێ و یارمـەتیـدەری زوڵم و ستەمیان نەبێت، ئـەوە لـە منـە واتـە شـوێنكەوتەی ڕێبـازی منـە، منـیش لـەوانم، لەگـەڵم دێـت بۆسـەر حـەوزی كەوسـەر، نوێـژ بەڵگـەیـە لەسـەر بـاوەڕی خاوەنەكەی، ڕۆژوو قـەڵغانێكی پۆڵاینـە خاوەنەكـەی دەپـارێزێ لـە گونـاهو تـاوان، چاكەكردن گوناهو تاوان دەكوژێنێتـەوە، وەك چـۆن ئـاو ئـاگر دەكوژێنێتـەوە، ئـەی كەعبی كوڕی عوجرە جەستەیە بە ماڵی حەرام پەروەردە بێت گەشە ناكات، بـەڵكو ئاگری دۆزەخ لەپێشترە بۆ سوتاندنی.

٦١٥ - وقَالَ مُحَمَّدٌ: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مُوسَى، عَنْ غَالِبٍ بِهَذَا.

## باسێکی تر لەو باباتە

### ٤٣٤ - بَابٌ مِنْهُ

٦١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ الحُبَابِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيمُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ فَقَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ، وَصَلُّوا خَمْسَكُمْ، وَصُومُوا شَهْرَكُمْ، وَأَدُّوا زَكَاةَ أَمْوَالِكُمْ، وَأَطِيعُوا ذَا أَمْرِكُمْ، تَدْخُلُوا جَنَّةَ رَبِّكُمْ، قَالَ: فَقُلْتُ لأَبِي أُمَامَةَ: مُنْذُ كَمْ سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الحَدِيثِ؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ وَأَنَا ابْنُ ثَلاَثِينَ سَنَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆخۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە وتاری حەجی ماڵاواییدا فەرمووی: (لە خوا بترسن کە پەروەردگارتانە، پێنج فەرزەی نوێژ ئەنجام بدەن، مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بن، زەکاتی ماڵ و سامانەکەتان دەربکەن، پەیڕەوی فەرمانی چاکەی کاربەدەست و پێشەواکانتان بکەن، دەچنە بەهەشتی پەروەردگارتانەوە). وتی: بە ئەبو ئومامەم وت: لەکەیەوە ئەم فەرموودەت بیستووە لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فەرمووی: تەمەنم سی ساڵان بوو.

# باسەكانی زەكات

## ٥ - كتاب الزكاة

### ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڕەشەی توند لەو كەسانەی كە زەكات دەرناكەن.

١ - بَابُ مَا جَاءَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَنْعِ الزَّكَاةِ مِنَ التَّشْدِيدِ

٦١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادُ بْنُ السَّرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنِ الْمَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الكَعْبَةِ، قَالَ: فَرَآنِي مُقْبِلاً، فَقَالَ: هُمُ الأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الكَعْبَةِ يَوْمَ القِيَامَةِ، قَالَ: فَقُلْتُ: مَا لِي لَعَلَّهُ أُنْزِلَ فِيَّ شَيْءٌ، قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هُمْ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي؟، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هُمُ الأَكْثَرُونَ، إِلاَّ مَنْ قَالَ: هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، فَحَثَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَعَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يَمُوتُ رَجُلٌ، فَيَدَعُ إِبِلاً أَوْ بَقَرًا، لَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا، إِلاَّ جَاءَتْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا عَادَتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ مِثْلُهُ. وَعَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: لُعِنَ مَانِعُ الصَّدَقَةِ. وَعَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ. حَدِيثُ أَبِي ذَرٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَاسْمُ أَبِي ذَرٍّ: جُنْدَبُ بْنُ السَّكَنِ، وَيُقَالُ: ابْنُ جُنَادَةَ.

**واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هاتم بـۆ**

خزمەتی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەژێر سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو، بینی هاتم، فەرمووی: (بە پەروەردگاری کەعبە ئەوانەن دۆڕاو و خەسارەتمەند لەڕۆژی قیامەتدا). ئەبو (ذر) فەرمووی: لەدەروونی خۆمدا وتم: لەوانەیە شتێ لەبارەی منەوە دابەزیبێ، ئەبو (ذر) فەرمووی: وتم: دایك و باوکم بە فیدات بێ ئەوانە کێن؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (دەوڵەمەندو خاوەن ماڵ و سامانە زۆرەکان، جگە لەوانەی ئاواو ئاواو ئاوا لێی دەبەخشن)، لەپێشەوە و بەلای راست و چەپدا لێی دەبەخشن، لەپاشدا فەرمووی: (سوێند بە (الله) کە گیانی منی بە دەستە، هەرکەسێ بمرێت لەدوای خۆی وشتر یان رەشەوڵاخی بەجێ هێشتبێ و زەکاتی نەدابێت، لەڕۆژی قیامەتدا لە جاران قەڵەوتر دەبن، بە سمەکانیان دەڕۆن بەسەر جەستەی خاوەنەکانیانداو بە شاخەکانیان لێیان دەدەن، جا کە ئەوانەی دواوە تەواو بوون ئەوانەی سەرەتا دێنەوە جارێکی تر بە هەمان شێوە، ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام دەبن تاکو خوای گەورە دادوەری دەکات لەنێوان خەڵکدا).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: نەفرەت کراوە لەو کەسانەی زەکات دەرناکەن.

٦١٧م- (صحيح الإسناد مقطوع: يعني موقوف عن الضحاك) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُنِيرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ الدَّيْلَمِ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ مُزَاحِمٍ قَالَ: الأَكْثَرُونَ أَصْحَابُ عَشَرَةِ آلاَفٍ.

واتە: لە (ضحاك)ی کوڕی موزاحیمەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (الأَكْثَرُونَ) ئەوانەن کە خاوەنی دە هەزار درهەمن. — درهەمی کاتی خۆی - .

## ئەگەر زەکاتت دەرکرد بێگومان ئەوەی لەسەرتە جێبەجێی دەکەیت

### ٢ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أَدَّيْتَ الزَّكَاةَ فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ

٦١٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ الشَّيْبَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنِ ابْنِ حُجَيْرَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَدَّيْتَ زَكَاةَ مَالِكَ فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ أَنَّهُ ذَكَرَ الزَّكَاةَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ فَقَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَتَطَوَّعَ. وَابْنُ حُجَيْرَةَ هُوَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ حُجَيْرَةَ الْمَصْرِيُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر زەکاتی ماڵ و سامانەکەت دەرکرد ئەوە بەڕاستی ئەو واجبەی لەسەرتە جێبەجێت کردووە).

لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە باسی زەکاتی دەکرد، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جگە لەوەی کە خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەرم هیچی ترم لەسەر واجبە، فەرمووی: (نەخێر) مەگەر بە ئارەزووی خۆت خێری لێ بکەیت.

٦١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ الحَمِيدِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كُنَّا نَتَمَنَّى أَنْ يَبْتَدِئَ الأَعْرَابِيُّ العَاقِلُ فَيَسْأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ عِنْدَهُ، فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ، إِذْ أَتَاهُ أَعْرَابِيٌّ، فَجَثَا بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ رَسُولَكَ أَتَانَا فَزَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ اللهَ أَرْسَلَكَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

نَعَمْ، قَالَ: فَبِالَّذِي رَفَعَ السَّمَاءَ، وَبَسَطَ الأَرْضَ، وَنَصَبَ الجِبَالَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ عَلَيْنَا خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ، آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ عَلَيْنَا صَوْمَ شَهْرٍ فِي السَّنَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ، آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ عَلَيْنَا فِي أَمْوَالِنَا الزَّكَاةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ، آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ عَلَيْنَا الحَجَّ إِلَى البَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ، آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ. فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ لاَ أَدَعُ مِنْهُنَّ شَيْئًا وَلاَ أُجَاوِزُهُنَّ، ثُمَّ وَثَبَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ صَدَقَ الأَعْرَابِيُّ دَخَلَ الجَنَّةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ: قَالَ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ: فِقْهُ هَذَا الحَدِيثِ، أَنَّ القِرَاءَةَ عَلَى العَالِمِ وَالعَرْضَ عَلَيْهِ جَائِزٌ مِثْلُ السَّمَاعِ، وَاحْتَجَّ بِأَنَّ الأَعْرَابِيَّ عَرَضَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَقَرَّ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: ئاواتەخواز بووین لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بـێن و عەرەبێکی ئاقڵی دەشتەکی بێت پرسیاری لێ بکـات، جـارێ لـە خزمەتیـدا بـووین عەرەبێکی دەشتەکی هات، لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەسـەر چۆك دانیشت وتی: ئەی موحەممەد، فروستادەکەت هات بۆ لامان پێی وتین: کە تـۆ دەفـەرمووی و پێـت وایـە خـوای گـەورە ڕاوانـەی کردوویـت و پێغەمبـەری خـوای،

پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بەڵێ). وتی: سوێندت دەدەم بەوەی کە ئاسمانی بەرز راگرتووە و زەوی راخستووە و کێوەکانی وەك مێخ داکوتاوە، ئایا خوای گەورە راوانەی کردووی؟ فەرمووی: (بەڵێ). فروستادەکەت پێی وتین: کە تۆ دەفەرمووی: (پێنج نوێژمان لەسەر فەرزە لەشەو و رۆژێکدا)، پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بەڵێ). وتی: سوێندت دەدەم بە (الله) کە رەوانەی کردووی، خوای گەورە بەمە فەرمانی پێ کردووی، فەرمووی: (بەڵێ). وتی: فروستادەکەت پێی وتین: کە تۆ دەفەرمووی: (لە ساڵێکدا مانگێ بە رۆژوو بین)، پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (راست دەکات). وتی: سوێندت دەدەم بە (الله) کە رەوانەی کردووی، خوای گەورە بەمە فەرمانی پێ کردووی، فەرمووی: (بەڵێ). فروستادەکەت پێی وتین: کە تۆ دەفەرمووی: (زەکاتمان لەسەر فەرزە و دەبێ زەکاتی ماڵ و سامانەکانمانن دەربکەین)، پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (راست دەکات). سوێندت دەدەم بە (الله) کە رەوانەی کردووی، خوای گەورە بەمە فەرمانی پێ کردووی، فەرمووی: (بەڵێ). وتی: فروستادەکەت پێی وتین: کە تۆ دەفەرمووی: (هەریەکێ لە ئێمە ئەگەر توانای هەبوو حەجی لەسەر فەرزە) — لەهەموو تەمەنیدا یەکجار- ، پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (راست دەکات). وتی: سوێندت دەدەم بە (الله) کە رەوانەی کردووی، خوای گەورە بەمە فەرمانی پێ کردووی، فەرمووی: (بەڵێ). وتی: سوێند بە (الله) کە تۆی رەوانەکردووە بە هەق هەتا ماوم جێبەجێیان دەکەم و هیچ شتێکیان لێ تەرك ناکەم، لەوەش زیاتر ناکەم، لەپاشدا بە پەلە هەستا رۆشت، پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەگەر ئەو عەرەبە دەشتەکیە راست بکات دەچێتە بەهەشتەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی زێڕ و زیو

### ٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ الذَّهَبِ وَالوَرِقِ

٦٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَدْ عَفَوْتُ عَنْ صَدَقَةِ الخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ: مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمًا، وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ مِائَتَيْنِ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ. رَوَى هَذَا الحَدِيثَ الأَعْمَشُ، وَأَبُو عَوَانَةَ، وَغَيْرُهُمَا، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا: عَنْ هَذَا الحَدِيثِ؟ فَقَالَ: كِلَاهُمَا عِنْدِي صَحِيحٌ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، يُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ رُوِيَ عَنْهُمَا جَمِيعًا.

**واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لەزەکاتی ئەسپ و بەندەکانتان بوراوم، ئێوەش زەکاتی زیو بدەن لەچل درهەم درهەمێك، لە سەدو نەوەد درهەمدا هیچ زەکات نیە، جا کاتێ کە گەیشتە دوو سەد درهەم ئەوە پێنج درهەم زەکاتی لێ دەکەوێت).**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی وشتر و مەڕ

### ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ الإِبِلِ وَالغَنَمِ

٦٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ البَغْدَادِيُّ، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الهَرَوِيُّ، وَمُحَمَّدُ بْنُ كَامِلٍ الْمَرْوَزِيُّ، المعْنَى وَاحِدٌ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ العَوَّامِ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَبَ كِتَابَ الصَّدَقَةِ، فَلَمْ يُخْرِجْهُ إِلَى عُمَّالِهِ حَتَّى قُبِضَ، فَقَرَنَهُ بِسَيْفِهِ، فَلَمَّا قُبِضَ عَمِلَ بِهِ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى قُبِضَ، وَعُمَرُ حَتَّى قُبِضَ، وَكَانَ فِيهِ: فِي خَمْسٍ مِنَ الإِبِلِ شَاةٌ، وَفِي عَشْرٍ شَاتَانِ، وَفِي خَمْسَ عَشْرَةَ ثَلاَثُ شِيَاهٍ، وَفِي عِشْرِينَ أَرْبَعُ شِيَاهٍ، وَفِي خَمْسٍ وَعِشْرِينَ بِنْتُ مَخَاضٍ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ، فَإِذَا زَادَتْ فَفِيهَا ابْنَةُ لَبُونٍ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ فَفِيهَا حِقَّةٌ إِلَى سِتِّينَ، فَإِذَا زَادَتْ فَفِيهَا جَذَعَةٌ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ فَفِيهَا ابْنَتَا لَبُونٍ إِلَى تِسْعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ فَفِيهَا حِقَّتَانِ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ، وَفِي الشَّاءِ: فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ فَشَاتَانِ إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِذَا زَادَتْ فَثَلاَثُ شِيَاهٍ إِلَى ثَلاَثِ مِائَةِ شَاةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثِ مِائَةِ شَاةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةِ شَاةٍ شَاةٌ، ثُمَّ لَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ حَتَّى تَبْلُغَ أَرْبَعَ مِائَةٍ، وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، مَخَافَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بِالسَّوِيَّةِ، وَلاَ يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلاَ ذَاتُ عَيْبٍ. وقَالَ الزُّهْرِيُّ: إِذَا جَاءَ الْمُصَدِّقُ قَسَّمَ الشَّاءَ أَثْلاَثًا: ثُلُثٌ خِيَارٌ، وَثُلُثٌ أَوْسَاطٌ، وَثُلُثٌ شِرَارٌ، وَأَخَذَ الْمُصَدِّقُ مِنَ الوَسَطِ. وَلَمْ يَذْكُرِ الزُّهْرِيُّ البَقَرَ، وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَبَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ عَامَّةِ الفُقَهَاءِ، وَقَدْ

رَوَى يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ هَذَا الحَدِيثَ، وَلَمْ يَرْفَعُوهُ، وَإِنَّمَا رَفَعَهُ سُفْيَانُ بْنُ حُسَيْنٍ.

واتە: لە سالم - ی کوڕی (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ - لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی کرد بە نوسینی نامەیە سەبارەت بە زەکات و پێچای بە شمشێرەکەیەوە، دەری نەهێنا بۆ ئەوانەی کە ئیشیان ئەوە بوو زەکات کۆبکەنەوە هەتا وەفاتی کرد، کاتێ کە وەفاتی کرد، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ کاری پێ دەکرد هەتا لەدنیا دەرچوو، هەروەها پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ کاری پێ دەکرد هەتا لەدنیا دەرچوو، لە نامەکەدا بەم شێوەیە زەکات دەرکردن هاتبوو: (لە پێنج وشتر شەکێ، لە دە وشتر دوو شەك، لە پانزە وشتر سێ شەك، لەبیست وشتر چوار شەك، لەبیست و پێنج سەر وشترەوە هەتا دەگاتە سی و پێنج سەر ئەوە یەك بەچکە وشتری مێینەی تەمەن یەك ساڵ، ئەگەر یەك سەر زیادی کرد واتە لە سی و شەش سەرەوە هەتا دەگەنە چل و پێنج سەر بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵە، ئەگەر یەك سەر زیادی کرد واتە لە چل و شەش سەر هەتا دەبن بە شەست سەر بەچکە وشترێکی مێینەی سێ ساڵەی بەرکەڵ، ئەگەر یەك سەر زیادی کرد واتە لە شەست و یەك سەر هەتا دەبن بە حەفتاو پێنج سەر وشترێکی مێینەی چوار ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت،، کە بوون بە حەفتاو شەش سەر هەتا دەبن بە نەوەد سەر دوو بەچکە وشتری مێینەی دوو ساڵ، کە بوون بە نەوەدو یەك هەتا دەبن بە سەدو بیست سەر دوو وشتری مێینەی سێ ساڵەی بەرکەڵ، ئەگەر ژمارەی وشترەکان لەوە زیاتری کرد ئەوە بۆ هەموو پەنجا سەر وشترێ بەچکە وشترێکی سێ ساڵە، وە بۆ هەموو چل سەرێ بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵە، لەمەڕدا: لە چل سەر مەڕ شەکێ، هەتا دەگاتە سەدو بیست سەر، ئەگەر لە سەدو بیست زیادی کرد با یەك مەڕیش

بێت هەتا دەگاتە دوو سەد سەر ئەوە دوو شەك، ئەگەر لە دوو سەد سەر زیادی کرد هەتا دەگاتە سێ سەد سەر ئەوە سێ شەك زەکاتیان لێ دەکەوێت، ئەگەر لە سێ سەد سەر زیادیان کرد ئەوە بۆ هەموو سەد سەر مەڕێ شەکێ، هەتا ژمارەیان نەگاتە چوار سەد سەر هیچ زەکاتیان ناکەوێت، نابێت ئاژەڵی کۆ جیابکرێتەوە، وە نابێت ئاژەڵی جیا کۆبکرێتەوە لەترسی زەکات لێ دەرکردن، هاوبەشانیش لەناو خۆیاندا بەرێکوپێکی کەم و زیادی دەگێڕنەوە بۆ یەکتری، ئەو ئاژەڵانەی - کە هی دوو کەس یان زیاترن — پێکەوە تێکەڵن ئەوە بێگومان بە یەکسانی دەیگێڕنەوە - دابەشی دەکەنەوە بەسەر خۆیاندا هەرکەس بەئەندازەی بەشی خۆی بەشە زەکاتی دەکەوێتە سەر، وە ئاژەڵی پیر و کوێر و عەیبدار وەرناگیرێت لە زەکاتدا). راوی فەرمودەکە سوفیانی کوڕی حوسەین دەڵێت: زوهری وتی: کاتێ کە زەکات وەرگر هات جەڵەبە مەڕەکان دەکرێن بەسێ بەشەوە: بەشێکی خراپ، بەشێکی چاك، بەشێکی مام ناوەندی، جا زەکات وەرگرەکە لە بەشە مام ناوەندیەکە دەبات، زوهری لە نوسراوی زەکاتەکەدا باسی مانگای نەکرد.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی مانگا

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ البَقَرِ

٦٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ الْمُحَارِبِيُّ، وَأَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ خُصَيْفٍ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فِي ثَلاَثِينَ مِنَ البَقَرِ تَبِيعٌ أَوْ تَبِيعَةٌ، وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ. وَفِي البَابِ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ. هَكَذَا رَوَاهُ عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ خُصَيْفٍ، وَعَبْدُ السَّلاَمِ ثِقَةٌ حَافِظٌ. وَرَوَى شَرِيكٌ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ خُصَيْفٍ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ عَبْدِ اللهِ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ.

واتە: لە (عبد اللە)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوایان لیّ بیّ دەگیّڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیّغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لەسی سەر مانگا یەك (گۆلك)کوێرەکەی یەك ساڵە زەکات هەیە کە پێی نابێتە ساڵی دووەم، لە چل سەر مانگا یەك کوێرەکە زەکات هەیە کە دوو ساڵی تەواو کربێت).

٦٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَال: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَال: بَعَثَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى اليَمَنِ، فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلاَثِينَ بَقَرَةً تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَارًا، أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى اليَمَنِ فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ، وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە (مُعَاذ)ی کوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگیّڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتیّ کە پیّغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ناردمی بۆ یەمەن فەرمانی پیّ کردم: لەهەموو سی سەر مانگایە گوێرەکەیەکی یەك ساڵەی نێر یان میّ زەکات وەربگرم، وە لەهەموو چل سەر مانگایە نێونێکی دوو ساڵ وەربگرم، وە لەهەموو باڵغێکی — نێری (أهل الذمة) - دیناریّ سەرانە(جزیە) وەربگرم، یان بە ئەندازەی ئەو دینارە جل و بەرگی(معافر) وەربگرم. — (المعافر): هۆزێك بوون لە یەمەن -.

- ئەم سەرانە(جزیە) لە گاور و جولەکە دەسەنرێت، کاتیّ کە موسوڵمانان وڵاتێکیان ڕزگار کرد نەجەنگن لەگەڵ سوپای ئیسلامداو، لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە، ئەو کاتە سەرانە(جزیە)یان لیّ دەسەنرێت لەبریّتی پاراستنی سەر و

ماڵیان لەلایەن موسوڵمانانەوە، بڕەکەشی دینارێکە بۆ هەر باڵغێکی نێر - .

٦٢٤ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا عُبَيْدَةَ: هَلْ تَذْكُرُ عَنْ عَبْدِ اللهِ شَيْئًا؟ قَالَ: لاَ.

## هەڵبژاردنی نایاب ترینی ماڵ و سامان لەجیاتی زەکات

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَخْذِ خِيَارِ الْمَالِ فِي الصَّدَقَةِ

٦٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا بْنُ إِسْحَاقَ الْمَكِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ لَهُ: إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةَ أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ. وَفِي الْبَابِ عَنِ الصُّنَابِحِيِّ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو مَعْبَدٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ: اسْمُهُ نَافِذٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (معاذ)ی نارد بۆ یەمەن، پێی فەرموو: (ئەوا تۆ دەچیت بۆ ناو گەلێك کە خاوەنی نامەی ئاسمانین، بانگیان بکە شایەتی بدەن: کە هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق جگە لە (الله)، وە شایەتی بدەن کە من نێردراوی خوام، جا

ئەکەر بەگوێیان کردی، پێیان رابگەیەنە کە خوای گەورە لەهەموو شەو و رۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردون، جا ئەکەر ئەمەشیان بەگوێ کردی، پێیان رابگەیەنە کە خوای گەورە فەرزی کردوە لەسەریان زەکاتی سامان و داراییان دەربکەن، ئەویش لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەدرێتەوە بە هەژارو نەدارەکانیان، جا ئەکەر ئەمەشیان بەگوێ کردی، نەکەی نایاب ترینی سامانەکانیان هەڵبژێری لەجیاتی زەکات، خۆت بپارێزە لە دوعاو ئاهو نزولەی ستەم لێکراو چونکە لەنێوان ئەو و خوای گەورەدا پەردە نیە واتە دوعاکەی گیرا دەبێت).

## دەربارەی زەکاتی کشتوکاڵ و خورما و دانەوێڵە

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَدَقَةِ الزَّرْعِ وَالتَّمْرِ وَالحُبُوبِ

٦٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لە پێنج وشتر کەمتر زەکات نیە، لەپێنج ئۆقیە زیویش کەمتر زەکات نیە، وە لەدانەوێڵەو خورمادا پێنج ویسق کەمتر زەکات نیە). - ویسق بەکیلۆی ئەمڕۆ دەکاتە: (٦٥٢) کیلۆ و لەدەیا هەشت، ئۆقیەیەکیش دەکاتە: چل درهەمی زیو - .

٦٢٧ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، وَشُعْبَةُ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْهُ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَالوَسْقُ: سِتُّونَ صَاعًا، وَخَمْسَةُ أَوْسُقٍ: ثَلَاثُ مِائَةِ صَاعٍ، وَصَاعُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَمْسَةُ أَرْطَالٍ وَثُلُثٌ، وَصَاعُ أَهْلِ الكُوفَةِ: ثَمَانِيَةُ أَرْطَالٍ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَالأُوقِيَّةُ: أَرْبَعُونَ دِرْهَمًا، وَخَمْسُ أَوَاقٍ: مِائَتَا دِرْهَمٍ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، يَعْنِي: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الإِبِلِ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ، وَفِيمَا دُونَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فِي كُلِّ خَمْسٍ مِنَ الإِبِلِ شَاةٌ.

بە پەیڕەوكردنی فەرموودەكە زانایان رایان وایە: وە لەدانەوێڵەو خورمـادا پێـنج ویسق كەمتر زەكات نیە، ویسقێ شەست صاعە، پێـنج ویسـق سـێ سـەد صـاعە، صاعی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) پێـنج رەتـڵ و سـێیەكە رەتلێكـە، صاعی خەڵكی كوفە هەشت رەتڵە، لەدانەوێڵەو خورمادا پێنج ویسق كەمتر زەكات نیە، ئوقیەیە چل درهەمە، پێنج ئوقیە دوو سەد درهەمـە، لـە پێـنج وشـتر كـەمتر زەكات نیە، ئەگەر ژمارەی وشترەكان گەیشتە بیسـت و پێـنج ئـەوە پێویسـتە یـەك بەچكە وشتری مێینـەی تەمـەن یـەك سـاڵ زەكاتیـان لـێ دەركرێـت، وشـتر لەیـەك سەرەوە هەتا دەگاتە بیست و چوار سەر زەكاتەكەی لە مەڕ دەدرێت، بۆ هەر پێـنج سەر وشترێ مەڕێ.

## ئەسپ و بەندەکان زەکاتیان لێ دەرناکرێت

٨ - بَابُ مَا جَاءَ لَيْسَ فِي الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ صَدَقَةٌ

٦٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، وَشُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ، وَلاَ فِي عَبْدِهِ صَدَقَةٌ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالْعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّهُ لَيْسَ فِي الْخَيْلِ السَّائِمَةِ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِي الرَّقِيقِ إِذَا كَانُوا لِلْخِدْمَةِ صَدَقَةٌ، إِلاَّ أَنْ يَكُونُوا لِلتِّجَارَةِ، فَإِذَا كَانُوا لِلتِّجَارَةِ فَفِي أَثْمَانِهِمُ الزَّكَاةُ إِذَا حَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بەندەو ئەسپی موسوڵمان زەکاتیان لێ دەرناکرێت). - ئەگەر بۆ بازرگانی نەبوون -.

## سەبارەت بە زەکاتی هەنگوین

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ الْعَسَلِ

٦٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ أَبِي سَلَمَةَ التِّنِّيسِيُّ، عَنْ صَدَقَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ مُوسَى بْنِ يَسَارٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْعَسَلِ: فِي كُلِّ عَشَرَةِ أَزُقٍّ زِقٌّ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَيَّارَةَ الْمُتْعِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ فِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ. وَلاَ يَصِحُّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا الْبَابِ كَبِيرُ شَيْءٍ،

وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لَيْسَ فِي العَسَلِ شَيْءٌ، وَصَدَقَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ لَيْسَ بِحَافِظٍ، وَقَدْ خُولِفَ صَدَقَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ فِي رِوَايَةِ هَذَا الحَدِيثِ، عَنْ نَافِعٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی زەکاتی هەنگوین فەرمووی: (لە دە (هیزە، خیگە، کوندە) هەنگوین هیزەیە زەکات دەردەکرێت).

٦٣٠ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ قَال: سَأَلَنِي عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ عَنْ صَدَقَةِ العَسَلِ، قَال: قُلْتُ: مَا عِنْدَنَا عَسَلٌ نَتَصَدَّقُ مِنْهُ، وَلَكِنْ أَخْبَرَنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ حَكِيمٍ أَنَّهُ قَال: لَيْسَ فِي العَسَلِ صَدَقَةٌ. فَقَالَ عُمَرُ: عَدْلٌ مَرْضِيٌّ، فَكَتَبَ إِلَى النَّاسِ أَنْ تُوضَعَ، يَعْنِي عَنْهُمْ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عومـەری کـوڕی (عبـد العزیـز) دەربـارەی زەکـاتی هـەنگوین لێـی پرسـم، فـەرمووی: وتم: هـەنگوینمان نیـە هـەتا زەکاتی لێ دەربکەین، بەڵام مـوغیرەی کـوڕی حـەکیم بـۆی گێڕاینـەوە، فـەرمووی: هەنگوین زەکاتی لێ دەرناکرێت، عومەری کوڕی (عبـد العزیـز) فـەرمووی: ئـەمـە شـتێکی راسـتەو جێگـەی رەزامەندیـە، نامـەی نووسـی بـۆ خـەڵك کـە زەکـاتی هەنگوینیان لەسەر هەڵگرن.

## ماڵێ سوودی لێ وەربگیرێ هەتا ساڵی بەسەردا نەیەت زەکاتی لێ دەرناکرێ

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ زَكَاةَ عَلَى الْمَالِ الْمُسْتَفَادِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ

٦٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ صَالِحٍ الطَّلْحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ اسْتَفَادَ مَالاً فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ عِنْدَ رَبِّهِ. وَفِي البَابِ عَنْ سَرَّاءَ بِنْتِ نَبْهَانَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس سوود لە ماڵ و سامانێ وەربگرێت زەکاتی لەسەر نیە، هەتا ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبێ).

٦٣٢ - (صحيح الإسناد موقوف، وهو في حكم المرفوع) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: مَنْ اسْتَفَادَ مَالاً فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ عِنْدَ رَبِّهِ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ. وَرَوَاهُ أَيُّوبُ، وَعُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، مَوْقُوفًا. وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ضَعِيفٌ فِي الحَدِيثِ، ضَعَّفَهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَعَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَغَيْرُهُمَا مِنْ أَهْلِ الحَدِيثِ وَهُوَ كَثِيرُ الغَلَطِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْ لاَ زَكَاةَ فِي الْمَالِ الْمُسْتَفَادِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ وَبِهِ يَقُولُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا كَانَ عِنْدَهُ مَالٌ تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ فَفِيهِ الزَّكَاةُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ سِوَى الْمَالِ الْمُسْتَفَادِ، مَالٌ تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، لَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ

الْمُسْتَفَادِ زَكَاةٌ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ، فَإِنْ اسْتَفَادَ مَالاً قَبْلَ أَنْ يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ، فَإِنَّهُ يُزَكِّي الْمَالَ الْمُسْتَفَادَ مَعَ مَالِهِ الَّذِي وَجَبَتْ فِيهِ الزَّكَاةُ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَأَهْلُ الكُوفَةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس سوود لە ماڵ و سامانێ وەربگرێ زەکاتی لەسەر نیە، هەتا ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبێ).

لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە هەر ماڵ و سامانێ سوودی لێ وەربگیرێت زەکاتی لێ دەرناکرێ، هەتا ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبێ. مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەگەر کەسێ ماڵ و سامانی هەبوو لەو ماڵەی فەرزە زەکاتی لێ دەرکرێت ئەوە زەکاتی لێ دەکەوێت و واجبە لەسەری زەکاتەکەی دەربکات، ئەگەر جگە لەوەی کە سوودی لێ وەردەگرت ماڵ و سامانی تری نەبوو، ئەوە هەر ماڵ و سامانێ سوودی لێ وەربگیرێت زەکاتی لێ ناکەوێت، هەتا ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبێ. ئەگەر سوودی وەرگرت لە ماڵ و سامانێ پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا بێت، ئەوە واجبە لەسەری زەکاتی ئەو ماڵ و سامانە دەربکات لەگەڵ ئەو ماڵەی تر کە زەکات لێ دەرکردنی واجبە. پێشەوا سوفیانی (ثوري) و خەڵکی کوفە ئەمە دەفەرموون.

## سەبارەت بە موسوڵمانان کە سەرانەیان لەسەر نیە

١١ - بَابُ مَا جَاءَ لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ جِزْيَةٌ

٦٣٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَكْثَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ قَابُوسَ بْنِ أَبِي ظَبْيَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَصْلُحُ قِبْلَتَانِ فِي أَرْضٍ وَاحِدَةٍ، وَلَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ جِزْيَةٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (رووکردنە دوو قیبلە لە زەویەکدا دروست نیە، هەروەها موسوڵمانان سەرانەیان لەسەر واجب نیە).

٦٣٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ قَابُوسَ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، وَجَدِّ حَرْبِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ الثَّقَفِيِّ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ قَدْ رُوِيَ عَنْ قَابُوسَ بْنِ أَبِي ظَبْيَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ النَّصْرَانِيَّ إِذَا أَسْلَمَ وُضِعَتْ عَنْهُ جِزْيَةُ رَقَبَتِهِ، وَقَوْلُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ عُشُورٌ إِنَّمَا يَعْنِي بِهِ: جِزْيَةَ الرَّقَبَةِ، وَفِي الحَدِيثِ مَا يُفَسِّرُ هَذَا حَيْثُ قَالَ: إِنَّمَا العُشُورُ عَلَى اليَهُودِ، وَالنَّصَارَى، وَلَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ عُشُورٌ.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە سەرجەم زانایان رایان وایە: ئەگەر گاورێ موسوڵمان بوو سەرانەی لەسەر هەڵدەگیرێ. فەرموودەکەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە دەفەرمووێت: (دە یەك لە موسوڵمانان وەرناگیرێت) بێگومان مەبەست لەو سەرانەی خودی خۆیەتی نەك سەرانەو باجی دەرامەت و زەوی و زار. ئەم فەرموودە راڤەی ئەوەمان بۆ دەکات کە دەفەرمووێت: ( دە یەك لە گاور و جولەکە وەردەگیرێت، بەڵام دە یەك لە موسوڵمانان وەرناگیرێت).

## سەبارەت بە زکاتی خشڵ

### ١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ الحُلِيِّ

٦٣٥ - (صحيح بما بعده) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ بْنِ الْمُصْطَلِقِ، عَنِ ابْنِ أَخِي زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ قَالَتْ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَال: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، تَصَدَّقْنَ وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ، فَإِنَّكُنَّ أَكْثَرُ أَهْلِ جَهَنَّمَ يَوْمَ القِيَامَةِ.

واتە: لە زەینەبی هاوسەری (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتاری بۆ دەخوێندینەوە فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ئافرەتان خێر و چاکە بکەن و زەکاتی خشڵە زێڕ و زیوەکانتان دەربکەن، چونکە ئێوە زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن لە ڕۆژی قیامەتدا).

٦٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَال: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ يُحَدِّثُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، ابْنِ أَخِي زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مُعَاوِيَةَ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ وَهِمَ فِي حَدِيثِهِ، فَقَال: عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنِ ابْنِ أَخِي زَيْنَبَ، وَالصَّحِيحُ إِنَّمَا هُوَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ ابْنِ أَخِي زَيْنَبَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ رَأَى فِي الحُلِيِّ زَكَاةً. وَفِي إِسْنَادِ هَذَا الحَدِيثِ مَقَالٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي ذَلِكَ، فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالتَّابِعِينَ فِي الحُلِيِّ زَكَاةَ، مَا كَانَ مِنْهُ ذَهَبٌ وَفِضَّةٌ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ. وقَالَ

بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: ابْنُ عُمَرَ، وَعَائِشَةُ، وَجَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: لَيْسَ فِي الحُلِيِّ زَكَاةٌ وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ بَعْضِ فُقَهَاءِ التَّابِعِينَ، وَبِهِ يَقُولُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واته: زەینەبی هاوسەری (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتاری بۆ دەخوێندینەوە فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ئافرەتان زەکاتی خشڵە زێڕ و زیوەکانتان دەربکەن، چونکە ئێوە زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن لە ڕۆژی قیامەتدا).

زانایان لەربارەی زەکاتی خشڵەوە ڕایان جیاوازە، هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و شوێنکەوتوان ڕایان وایە ئەگەر خشڵەکە لە زێڕ و زیو بوو ئەوە زەکاتی لێ دەکەوێت، پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك ئەمە دەفەرموون.

هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەك ئیبنو عومەر و عائیشەو جابری کوڕی (عبد الله) و ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموون: خشڵ زەکاتی لێ دەرناکرێت. لە هەندێ شەرعزانانی شوێنکەوتوانەوە بەهەمان شێوە هاتووە، پێشەوایان مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

٦٣٧ - (حسن بغير هذا اللفظ) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ امْرَأَتَيْنِ أَتَتَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفِي أَيْدِيهِمَا سُوَارَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهُمَا: أَتُؤَدِّيَانِ زَكَاتَهُ؟، قَالَتَا: لاَ، قَالَ: فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتُحِبَّانِ أَنْ يُسَوِّرَكُمَا اللَّهُ بِسُوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ؟، قَالَتَا: لاَ، قَالَ: فَأَدِّيَا زَكَاتَهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ قَدْ رَوَاهُ الْمُثَنَّى بْنُ الصَّبَّاحِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، نَحْوَ

هَذَا، وَالمُثَنَّى بْنُ الصَّبَّاحِ وَابْنُ لَهِيعَةَ يُضَعَّفَانِ فِي الحَدِيثِ. وَلاَ يَصِحُّ فِي هَذَا البَابِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْءٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لەباپیریەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێك و کچێکی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دوو بازنی گەورەی ئاڵتون لەدەستی کچەکەیدا بوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرموون: (زەکاتی ئەم بازنانە دەدەن؟). وتیان: نەخێر، پێی فەرموون: (پێتان خۆشە بە هۆی ئەم بازنانەوە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا دوو بازنی ئاگر بکاتە دەستتان؟). وتیان: نەخێر، فەرمووی: (دەی زەکاتەکەیان بدەن؟).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی سەوزەوات

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ الخَضْرَاوَاتِ

٦٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ مُعَاذٍ، أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُهُ عَنِ الخَضْرَاوَاتِ وَهِيَ البُقُولُ؟ فَقَالَ: لَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ. إِسْنَادُ هَذَا الحَدِيثِ لَيْسَ بِصَحِيحٍ، وَلَيْسَ يَصِحُّ فِي هَذَا البَابِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْءٌ، وَإِنَّمَا يُرْوَى هَذَا عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّهُ لَيْسَ فِي الخَضْرَاوَاتِ صَدَقَةٌ. وَالحَسَنُ هُوَ ابْنُ عُمَارَةَ وَهُوَ ضَعِيفٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ، ضَعَّفَهُ شُعْبَةُ وَغَيْرُهُ، وَتَرَكَهُ ابْنُ الْمُبَارَكِ.

واتە: لە (معاذ)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە نامەی نوسی بۆ

پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دەربارەی سەوزەوات کە بریتین لە پاقلەمەنیەکان پرسیاری لێ کرد؟ ئەویش فەرمووی: (زەکاتیان لێ دەرناکرێت، چونکە قوت نین).

## دەربارەی زەکاتی هەر هەرشتێ بە روبار و کانیاوەکان ئاو بدرێ

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّدَقَةِ فِيمَا يُسْقَى بِالأَنْهَارِ وَغَيْرِهَا

٦٣٩ - (صحيح بما بعده) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْمَدِينِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا الحَارِثُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، وَبُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالعُيُونُ العُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ العُشْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَشَجِّ، وَعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، وَبُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً، وَكَأَنَّ هَذَا أَصَحُّ. وَقَدْ صَحَّ حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا البَابِ، وَعَلَيْهِ العَمَلُ عِنْدَ عَامَّةِ الفُقَهَاءِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرچی بە باران و ئاوی روبار و کانیاوەکان ئاو بدرێت دە یەکی دەکەوێت، وە هەرچی بە ولاخی ئاوکێش ئاوبدرێ نیوەی دە یەکی دەکەوێت).

٦٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ، قَال: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، قَال: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَال: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ سَنَّ فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا العُشْرَ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفَ العُشْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگیّڕنەوە، کە پیّغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بڕیاری داوە هەرچی بە ئاوی باران و ڕوبار و کانیاوەکان ئاو بدریّت، یان بەڕیشکی خۆی ئاو بخواتەوە دە یەکی دەکەویّت، وە هەرچی بە وڵاخی ئاوکیّش ئاوبدریّ نیوەی دە یەکی دەکەویّت).

## دەربارەی زەکاتی ماڵی هەتیو

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ مَالِ الْيَتِيمِ

٦٤١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الْمُثَنَّى بْنِ الصَّبَّاحِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: أَلاَ مَنْ وَلِيَ يَتِيمًا لَهُ مَالٌ فَلْيَتَّجِرْ فِيهِ، وَلاَ يَتْرُكْهُ حَتَّى تَأْكُلَهُ الصَّدَقَةُ. وَإِنَّمَا رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَفِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ، لأَنَّ الْمُثَنَّى بْنَ الصَّبَّاحِ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ فَذَكَرَ هَذَا الحَدِيثَ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا البَابِ، فَرَأَى غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَالِ اليَتِيمِ زَكَاةً مِنْهُمْ: عُمَرُ، وَعَلِيٌّ، وَعَائِشَةُ، وَابْنُ عُمَرَ، وَبِهِ يَقُولُ مَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: لَيْسَ فِي مَالِ اليَتِيمِ زَكَاةٌ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ. وَعَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ هُوَ ابْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ، وَشُعَيْبٌ قَدْ سَمِعَ مِنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَقَدْ تَكَلَّمَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ فِي حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ وَقَالَ: هُوَ عِنْدَنَا وَاهٍ، وَمَنْ ضَعَّفَهُ، فَإِنَّمَا ضَعَّفَهُ مِنْ قِبَلِ أَنَّهُ يُحَدِّثُ مِنْ صَحِيفَةِ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَمَّا أَكْثَرُ أَهْلِ الحَدِيثِ فَيَحْتَجُّونَ بِحَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، وَيُثْبِتُونَهُ مِنْهُمْ: أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ

وَغَيْرِهِمَا.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتاری دەخوێندەوە فەرمووی: (هۆشیاربن هەرکەس سەرپەرشتی هەتیوێ بکات ماڵ و سامانی هەبوو با بازرگانی پێوە بکات وازی لێ نەهێنێ هەتا زەکات دەرکردن بیخوات).

زانایان رایان جیاوازە لەسەر ئەم بابەتە: هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رایان وایە ماڵی هەتیو زەکاتی لێ دەردەکرێت، لەوانە: پێشەوا عومەر و پێشەوا عەلی و عائیشە و ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ، مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون. هەندێکی تر لە زانایان رایان وایە ماڵی هەتیو زەکاتی لێ دەرناکرێت، پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك ئەمە دەفەرموون.

## بێگومان ئاژەڵ هەر زیانێ بگەیەنێ خاوەنەکەی بەرپرس نیە

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ العَجْمَاءَ جَرْحُهَا جُبَارٌ وَفِي الرِّكَازِ الخُمُسُ

٦٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: العَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالمعْدِنُ جُبَارٌ، وَالبِئْرُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الخُمُسُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، وَعَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر ئاژەڵێ بەرەڵا بێ و کەسێ بریندار بکات یان

کارێکی خراپ بکات ئەو کەسە یان ئەو شتە بە فیڕۆ دەڕوات و خوێنی نیەو خاوەنەکەی نابێتە زامن و دەستەبەر، کەسێ کرێکارێ بەکرێ بگرێت بۆ ئەوەی کان(معدن)ێکی بۆ هەڵکەنێ ئەگەر کانەکە روخا بەسەریدا، یان روخا بەسەر کەسێکی تردا لەوێوە تێپەڕی ئەوە خاوەن کانەکە زامن و دەستەبەر نیەو خوێنی کەسەکە بەفیڕۆ دەڕوات، ئەگەر کەسێ بیرێ هەڵکەنێ کەسێ بکەوێتە ناویەوەو بخنکێ یان زیانی پێ بگات ئەوە خاوەن بیرەکە زامن و دەستەبەر نیەو خوێنی کەسەکە بەفیڕۆ دەڕوات، گەنجینەی ژێر زەوی(ریکاز)ی سەردەمی نەفامی پێنج یەك زەکاتی لێ دەردەکرێت).

## ئەوەی هاتووە سەبارەت بە خەمڵاندن

١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخَرْصِ

٦٤٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي خُبَيْبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ مَسْعُودِ بْنِ نِيَارٍ، يَقُولُ: جَاءَ سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ إِلَى مَجْلِسِنَا فَحَدَّثَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: إِذَا خَرَصْتُمْ فَخُذُوا وَدَعُوا الثُّلُثَ، فَإِنْ لَمْ تَدَعُوا الثُّلُثَ، فَدَعُوا الرُّبُعَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَعَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَالعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ فِي الخَرْصِ، وَبِحَدِيثِ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَالخَرْصُ إِذَا أَدْرَكَتِ الثِّمَارُ مِنَ الرُّطَبِ وَالعِنَبِ مِمَّا فِيهِ الزَّكَاةُ بَعَثَ السُّلْطَانُ خَارِصًا يَخْرُصُ عَلَيْهِمْ، وَالخَرْصُ: أَنْ يَنْظُرَ مَنْ يُبْصِرُ ذَلِكَ فَيَقُولُ: يَخْرُجُ مِنْ هَذَا الزَّبِيبِ كَذَا، وَكَذَا، وَمِنَ التَّمْرِ، كَذَا، وَكَذَا، فَيُحْصِي عَلَيْهِمْ وَيَنْظُرُ مَبْلَغَ العُشْرِ مِنْ ذَلِكَ فَيُثْبِتُ عَلَيْهِمْ،ثُمَّ يُخَلِّي بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الثِّمَارِ، فَيَصْنَعُونَ مَا أَحَبُّوا، فَإِذَا

أَدْرَكَتِ الثِّمَارُ، أُخِذَ مِنْهُمُ العُشْرُ، هَكَذَا فَسَّرَهُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ، وَبِهَذَا يَقُولُ مَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە خوبەیبی کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی مەسعودی کوڕی نیارەوە دەیفەرموو: سەهلی کوڕی (حَثْمَة) ڕەزای خوای لێ بێ هات بۆ کۆڕ و دانیشتنەکەمان گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ شتێکتان خەملاند ئیتر لێی ببەن، بەڵام سێ یەکێکی زەکاتەکە بهێڵنەوە، ئەگەر سێ یەکتان نەهێشتەوە دەبێ چواریەکی هەر بهێڵنەوە و وازی لێ بهێن — بۆ ئەوەی خاوەن موڵك خۆی بیبەخشێ بە هەژاران - ).

کە خورما و ترێ کاتی خۆیان هات و دەگەیشتنە ڕادەی زەکات، کاربەدەست خەملێنەرێ دەنێرێ بۆیان دەخەملێنێ، سەیری دەکات دەڵێ: لە مێوژەکە ئەوەندە و ئەوەندە زەکاتی لێ دەکەوێت، لە خورما ئەوەندە و ئەوەندە زەکاتی لێ دەکەوێت بەو شێوەیە حسابی دەکات بۆیان و دە یەکەکە جێگیر دەکات لەسەریان، ئیتر ئەچێ بەدەم کاری خۆیەوە و وازیان لێ دێنێ بە ئارەزووی خۆیان چی لێ دەکەن، کاتی کۆکردنەوەی بەرهەمەکە دەیەکیان لێ وەردەگرێت، هەندێ لە زانایان بەم جۆرە ڕاڤەی دەکەن، پێشەوایان مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

٦٤٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرٍو مُسْلِمُ بْنُ عَمْرٍو الحَذَّاءُ الْمَدِينِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نَافِعٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَالِحٍ التَّمَارِ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ عَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَبْعَثُ عَلَى النَّاسِ مَنْ يَخْرُصُ عَلَيْهِمْ كُرُومَهُمْ وَثِمَارَهُمْ.

واتە: لە عەتابی ئەسیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کەسێکی دەنارد بۆ لای خەڵك بۆ خەملاَنی تری و بەروبوومەکانیان.

٦٤٤ - (م) وَبِهَذَا الإِسْنَادِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي زَكَاةِ الكُرُومِ: إِنَّهَا تُخْرَصُ كَمَا يُخْرَصُ النَّخْلُ، ثُمَّ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ زَبِيبًا كَمَا تُؤَدَّى زَكَاةُ النَّخْلِ تَمْرًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَى ابْنُ جُرَيْجٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: حَدِيثُ ابْنِ جُرَيْجٍ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَحَدِيثُ ابْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ عَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ أَثْبَتُ وَأَصَحُّ.

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی زەکاتی مێو فەرموویەتی: (بێگومان بەری داری مێو دەخەملێنرێ وەك چۆن بەری دارخورما دەخەملێنرێ، لەپاشدا زەکاتەکەی لە مێوژ دەدرێت، وەك چۆن لەجیاتی زەکاتی دارخورما خورما دەدرێت).

## دەربارەی کرێکاری سەرڕاستی زەکات کۆکردنەوە

١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العَامِلِ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالحَقِّ

٦٤٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ (ح) وحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ خَالِدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: العَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالحَقِّ كَالغَازِي فِي سَبِيلِ اللهِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ. حَدِيثُ

رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَيَزِيدُ بْنُ عِيَاضٍ ضَعِيفٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ، وَحَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ أَصَحُّ.

واتە: رافیعی کوڕی خەدیجەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (ئەوکەسەی کاری زەکات کۆکردنەوەی پێ دەسپێردرێت و زەکات کۆدەکاتەوە ئەگەر کارەکەی بەڕاستی و بە چاکی ئەنجام بدات بەپێی شەرع وەك ئەو غەزاکارە وایە کە لەپێناوی خوای پەروەردگاردا غەزا دەکات هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی).

## دەربارەی دەستدرێژی کەری سەر زەکات

١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ

٦٤٦ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ كَمَانِعِهَا وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ تَكَلَّمَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ فِي سَعْدِ بْنِ سِنَانٍ، وَهَكَذَا يَقُولُ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. وَيَقُولُ عَمْرُو بْنُ الحَارِثِ، وَابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سِنَانِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَنَسٍ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: وَالصَّحِيحُ سِنَانُ بْنُ سَعْدٍ. وَقَوْلُهُ: الْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ كَمَانِعِهَا، يَقُولُ: عَلَى الْمُعْتَدِي مِنَ الإِثْمِ كَمَا عَلَى الْمَانِعِ إِذَا مَنَعَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەو زەکات وەرگرەی کە زیاد لە ئەندازە زەکاتی واجب وەردەگرێت و دەستدرێژی دەکات وەك ئەو خاوەن ماڵ و سامانە گوناهبارەیە کە زەکات نادات). — (الْمُعْتَدِي) ئەوەیە زەکاتەکەی بداتە بە کەسانێ کە شایستە نەبن، دەڵێن: ئەگەر زەکات وەرگر لەچاکترینی ماڵ و سامانەکەی وەرگرت لەوانەیەساڵی ئایندە خاوەن ماڵ و سامانەکە زەکاتەکەی نەدات ئەوکاتە هەردوکیان وەك یەك تاوانبار دەبن[1].

## دەربارەی رازیکردنی زەکات کۆکەرەوە

٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رِضَا الْمُصَدِّقِ

٦٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَتَاكُمُ الْمُصَدِّقُ فَلاَ يُفَارِقَنَّكُمْ إِلاَّ عَنْ رِضًا.

واتە: لە جەریرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ زەکات وەرگرەکان دێنە لاتان بۆ زەکات کۆکردنەوە با جیانەبنەوە لێتان هەتا رازیان دەکەن).

٦٤٨ - حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الْحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ دَاوُدَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِنَحْوِهِ. حَدِيثُ دَاوُدَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مُجَالِدٍ، وَقَدْ ضَعَّفَ مُجَالِدًا بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ وَهُوَ كَثِيرُ الْغَلَطِ.

---

(١) عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي.

## زەکات لە دەوڵەمەندەکان وەردەگیرێ و دەدرێتەوە بە هەژاران

### ٢١ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الصَّدَقَةَ تُؤْخَذُ مِنَ الأَغْنِيَاءِ فَتُرَدُّ فِي الفُقَرَاءِ

٦٤٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ سَعِيدٍ الكِنْدِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَال: قَدِمَ عَلَيْنَا مُصَدِّقُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَخَذَ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا، فَجَعَلَهَا فِي فُقَرَائِنَا، وَكُنْتُ غُلاَمًا يَتِيمًا، فَأَعْطَانِي مِنْهَا قَلُوصًا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ أَبِي جُحَيْفَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: زەکات کۆکەرەوەکەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هات بۆ ناومان، زەکاتی لە دەوڵەمەندەکانمان وەرگرت و دایەوە بە هەژارەکانمان، منیش منداڵێکی هەتیو بووم، وشترێکی لاوی تازە پێگەیشتووی پێ بەخشیم.

## دەربارەی کێ زەکاتی پێ ڕەوایە

### ٢٢ - بَابُ مَنْ تَحِلُّ لَهُ الزَّكَاةُ

٦٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ قُتَيْبَةُ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، وَقَالَ عَلِيٌّ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، وَالمَعْنَى وَاحِدٌ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ سَأَلَ النَّاسَ وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ جَاءَ يَوْمَ القِيَامَةِ وَمَسْأَلَتُهُ فِي وَجْهِهِ خُمُوشٌ، أَوْ خُدُوشٌ، أَوْ كُدُوحٌ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا يُغْنِيهِ؟ قَالَ: خَمْسُونَ دِرْهَمًا، أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ.

وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ تَكَلَّمَ شُعْبَةُ فِي حَكِيمِ بْنِ جُبَيْرٍ، مِنْ أَجْلِ هَذَا الحَدِيثِ.

واته: له (عَبْدُ اللّٰه)ى كوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەوەی بەشی خۆی هەبێ و سواڵ بكات، ڕۆژی قیامەت كە هات نیشانەی ئەو سواڵە بە ڕوخسارییەوە دەبێت وەك پەڵەی ڕوشاوی). وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! مرۆڤ چەندی هەبێ بەشی دەكات و ئیتر نابێ سواڵ بكات؟ فەرمووی: (پەنجا درهەمی هەبێ، یان بایی ئەوەندە زێڕی هەبێت).

٦٥١ - حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ جُبَيْرٍ بِهَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُثْمَانَ صَاحِبُ شُعْبَةَ: لَوْ غَيْرُ حَكِيمٍ حَدَّثَ بِهَذَا، فَقَالَ لَهُ سُفْيَانُ: وَمَا لِحَكِيمٍ لاَ يُحَدِّثُ عَنْهُ شُعْبَةُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ سُفْيَانُ: سَمِعْتُ زُبَيْدًا يُحَدِّثُ بِهَذَا، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَصْحَابِنَا، وَبِهِ يَقُولُ الثَّوْرِيُّ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ قَالُوا: إِذَا كَانَ عِنْدَ الرَّجُلِ خَمْسُونَ دِرْهَمًا لَمْ تَحِلَّ لَهُ الصَّدَقَةُ. وَلَمْ يَذْهَبْ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى حَدِيثِ حَكِيمِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَوَسَّعُوا فِي هَذَا، وَقَالُوا: إِذَا كَانَ عِنْدَهُ خَمْسُونَ دِرْهَمًا، أَوْ أَكْثَرُ وَهُوَ مُحْتَاجٌ، فَلَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنَ الزَّكَاةِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَغَيْرِهِ مِنْ أَهْلِ الفِقْهِ وَالعِلْمِ.

هەندێ لە هاوەڵانمان كار بە فەرموودەكە دەكەن، پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون. دەڵێن: ئەو كەسەی پەنجا درهەمی هەبێ زەكاتی پێ ناشێ و بۆ حەڵاڵ نیە زەكات وەربگرێت. بەڵام پێشەوا شافیعی و هەندێ لە شەرعزانان و زانایان دەفەرموون: ئەو كەسەی پەنجا درهەم یان

زیاتری هەبێ ئەوە موحتاجە بۆی هەیە زەکات وەربگرێت.

## دەربارەی کێ زەکاتی پێ ناڕەوایە

٢٣ - بَابُ مَنْ لاَ تَحِلُّ لَهُ الصَّدَقَةُ

٦٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ سَعِيدٍ (ح) وحَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ رَيْحَانَ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَحُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ، وَقَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ هَذَا الحَدِيثَ بِهَذَا الإِسْنَادِ وَلَمْ يَرْفَعْهُ. وَقَدْ رُوِيَ فِي غَيْرِ هَذَا الحَدِيثِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَحِلُّ الْمَسْأَلَةُ لِغَنِيٍّ، وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ. وَإِذَا كَانَ الرَّجُلُ قَوِيًّا مُحْتَاجًا وَلَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ شَيْءٌ، فَتُصُدِّقَ عَلَيْهِ أَجْزَأَ عَنِ الْمُتَصَدِّقِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، وَوَجْهُ هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ عَلَى الْمَسْأَلَةِ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (زەکات دان ڕەواو دروست نیە بدرێت بە دەوڵەمەندو، کەسێ کە توانای کارکردنی هەبێت).

هەروەها لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (زەکات ڕەواو دروست نیە بۆ دەوڵەمەندو، کەسێ کە توانای کارکردنی هەبێت).

ئەگەر کەسێ توانای کارکردنی هەبێ و موحتاج بێت، ئەو کەسەی زەکاتی پێ

دەبەخشێت زەکاتەکەی دروستە بە ڕای زانایان، هەندێ لە زانایان ڕایـان وایـە ڕووی فەرموودەکە لە سوالکردنە.

٦٥٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ سَعِيدٍ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ، عَنْ حُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ السَّلُولِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ وَهُوَ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، أَتَاهُ أَعْرَابِيٌّ، فَأَخَذَ بِطَرَفِ رِدَائِهِ، فَسَأَلَهُ إِيَّاهُ، فَأَعْطَاهُ وَذَهَبَ، فَعِنْدَ ذَلِكَ حَرُمَتِ الْمَسْأَلَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ لِغَنِيٍّ، وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ، إِلاَّ لِذِي فَقْرٍ مُدْقِعٍ، أَوْ غُرْمٍ مُفْظِعٍ، وَمَنْ سَأَلَ النَّاسَ لِيُثْرِيَ بِهِ مَالَهُ، كَانَ خُمُوشًا فِي وَجْهِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَرَضْفًا يَأْكُلُهُ مِنْ جَهَنَّمَ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُقِلَّ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُكْثِرْ.

واتە: لە حوبشی کوڕی جونادەی سەلولیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لـە حـەجی مـاڵاوایی دا لەعەرەفە ڕاوەستابوو، عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی چمکێکی پۆشـاکەکەی گـرت، داوای لـێ کـرد کـە شـتێکی بـداتێ، ئـەویش پێـی بەخشـی و ڕۆشـت، جـا پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەو کاتەدا سوالکردنی قەدەغەکرد، بـۆ خـۆم گـوێم لێی بوو فەرمووی: (زەکات دان ڕەواو دروست نیە بـدرێت بـە دەوڵەمەنـدو، کەسـێ کە توانای کارکردنی هەبێت، ئیللا بۆ کەسێ نەبێ کـە زۆر نـەدار و ڕووت و ڕەجـاڵ بێ، یان زۆر زۆر قەرزار بێ، ئەوەی سواڵ بکات بۆ ئەوەی مـاڵ و سـامانەکەی زۆر بکات ئـەوە لـەڕۆژی قیامەتـدا ئـەو سـواڵە وەك پەڵـەی ڕوشـاوی بـە ڕوخسـاریەوە دەبێـت، وە دەبێتـە بـەردی سـورۆکراو بـۆی و لـە دۆزەخـدا دەیخـوات، جـا ئـەوەی دەیەوێت با سواڵی کەم بکات، ئەوەشی دەیەوێت با سواڵی زۆر بکات).

٦٥٤ - حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحِيمِ بْنِ سُلَيْمَانَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

## کێ زەکاتی پێ ڕەوایە لە قەرزاران و جگە لەوان

### ٢٤ - بَابُ مَنْ تَحِلُّ لَهُ الصَّدَقَةُ مِنَ الْغَارِمِينَ وَغَيْرِهِمْ

٦٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَشَجِّ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا، فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ، فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِغُرَمَائِهِ: خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ، وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَجُوَيْرِيَةَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پیاوێ بەروبوومی باخێکی کڕی بەروبوومەکە فەوتاو پیاوەکە توشی قەرزاریەکی زۆر بوو، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (خێری پێ بکەن و زەکاتی بدەنێ)، خەڵك خێر و زەکاتیان دایە بەڵام بەشی ئەوەی نەدەکرد بەتەواوی قەرزەکانی پێ بداتەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو: (چیتان دەستکەوتوە بیبەن لەوە زیاترتان بۆ نیە هەر ئەوەتان دەکەوێت).

## زەكات بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و خانەوادەكەی و ناشێ

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّدَقَةِ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلِ بَيْتِهِ وَمَوَالِيهِ

٦٥٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، وَيُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ الضُّبَعِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أُتِيَ بِشَيْءٍ سَأَلَ: أَصَدَقَةٌ هِيَ، أَمْ هَدِيَّةٌ؟، فَإِنْ قَالُوا: صَدَقَةٌ لَمْ يَأْكُلْ، وَإِنْ قَالُوا: هَدِيَّةٌ أَكَلَ. وَفِي البَابِ عَنْ سَلْمَانَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَالحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ، وَأَبِي عَمِيرَةَ جَدِّ مُعَرِّفِ بْنِ وَاصِلٍ، وَاسْمُهُ رُشَيْدُ بْنُ مَالِكٍ، وَمَيْمُونٍ أَوْ مِهْرَانَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي رَافِعٍ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَلْقَمَةَ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَقِيلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَجَدُّ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ اسْمُهُ مُعَاوِيَةُ بْنُ حَيْدَةَ القُشَيْرِيُّ. وَحَدِيثُ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

**واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر شتێکیان بهێنایە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیپرسی: (ئەمە زەکاتە یان هەدیەیە؟) ئەگەر بیان وتایە: زەکاتە لێی نەدەخوارد، ئەگەر بیان وتایە: هەدیەیە لێی دەخوارد.**

٦٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنِ ابْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ رَجُلاً مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَقَالَ لأَبِي رَافِعٍ: اصْحَبْنِي كَيْمَا تُصِيبَ مِنْهَا، فَقَالَ: لاَ، حَتَّى آتِيَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْأَلَهُ، فَانْطَلَقَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَهُ فَقَالَ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لاَ تَحِلُّ لَنَا، وَإِنَّ مَوَالِيَ القَوْمِ مِنْ

أَنْفُسِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو رَافِعٍ مَوْلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اسْمُهُ أَسْلَمُ، وَابْنُ أَبِي رَافِعٍ هُوَ عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي رَافِعٍ كَاتِبُ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ.

واتە: لە ئەبو رافیعەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پیاوێکی هۆزی مەخزومی کرد بە سەرکاری زەکات و ناردی بۆ زەکات کۆکردنەوە، بە ئەبو رافیعی وت: تۆش ببە بە هاوڕێم بەشی تۆشی تێ دەکەوێت، وتی: نا، با بڕۆم لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بپرسم، چوو بۆ خزمەتی لێی پرسی؟ فەرمووی: (خزمەتکاری گەل لەخۆیانە، ئێمەش زەکاتمان پێ ناشێت و دروست نیە زەکات وەربگرین).

## دەربارەی زەکات دان بە خزم و کەسوکار

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّدَقَةِ عَلَى ذِي الْقَرَابَةِ

٦٥٨ - (ضعيف، والصحيح من فعله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنِ الرَّبَابِ، عَنْ عَمِّهَا سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنَّهُ بَرَكَةٌ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ تَمْرًا فَالمَاءُ فَإِنَّهُ طَهُورٌ.

واتە: لە سەلمانی کوڕی عامرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە بەڕۆژوو بوو با بە چەند دەنکە خورمایە بەربانك بکاتەوە، جا ئەگەر خورمای دەست نەکەوت ئەوە بە ئاو رۆژووەکەی بشکێنێ، چونکە بێگومان ئاو پاکەوەکەرە).

(صحيح) وقَال: الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَهِيَ عَلَى ذِي الرَّحِمِ ثِنْتَانِ: صَدَقَةٌ

وَصِلَةٌ. وَفِي البَابِ عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَالرَّبَابُ هِيَ أُمُّ الرَّائِحِ بِنْتُ صُلَيْعٍ. وَهَكَذَا رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنِ الرَّبَابِ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ. وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنِ الرَّبَابِ. وَحَدِيثُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ وَابْنِ عُيَيْنَةَ أَصَحُّ. وَهَكَذَا رَوَى ابْنُ عَوْنٍ، وَهِشَامُ بْنُ حَسَّانَ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنِ الرَّبَابِ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ.

**هەروەها فەرموویەتی: (زەکات دان بە هەژار خێر و چاکەیەکە، بەلاّم بۆ خـزم و کەسوکار دوو جار خێر و چاکەیە).**

## ماڵ و سامان جگە لە زەکات مافی تری بەسەرەوە هەیە

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ فِي الْمَالِ حَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ

٦٥٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ مَدُّوَيْهِ، قَال: حَدَّثَنَا الأَسْوَدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، قَالَتْ: سَأَلْتُ، أَوْ سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الزَّكَاةِ؟ فَقَال: إِنَّ فِي الْمَالِ لَحَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ الَّتِي فِي البَقَرَةِ: (لَيْسَ البِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ) الآيَةَ.

واتـە: لـە (فاطمـة)ی کچـی قەیسـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: دەربارەی زەکات پرسیارم کرد یان پرسیار کرا لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: (ماڵ و سامان جگە لە زەکات مافی تری بەسەرەوە هەیـە). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ) سورة البقرة: ١٧٧. واتـە: چاکە ئەوە نیە روو بکەنە خۆرهەڵات و خۆرئاوا ...

٦٦٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الطُّفَيْلِ، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ فِي الْمَالِ حَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ. هَذَا حَدِيثٌ إِسْنَادُهُ لَيْسَ بِذَاكَ، وَأَبُو حَمْزَةَ مَيْمُونٌ الأَعْوَرُ يُضَعَّفُ. وَرَوَى بَيَانٌ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ سَالِمٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ هَذَا الْحَدِيثَ قَوْلَهُ، وَهَذَا أَصَحُّ.

واتـە: لـە (فاطمـة)ی کچـی قەیسـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ماڵ و سامان جگە لە زەکـات مـافی تری بەسەرەوە هەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی زەکات

٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّدَقَةِ

٦٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا تَصَدَّقَ أَحَدٌ بِصَدَقَةٍ مِنْ طَيِّبٍ، وَلاَ يَقْبَلُ اللَّهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ، إِلاَّ أَخَذَهَا الرَّحْمَنُ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ كَانَتْ تَمْرَةً تَرْبُو فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ، حَتَّى تَكُونَ أَعْظَمَ مِنَ الْجَبَلِ، كَمَا يُرَبِّي

أَحَدُكُمْ فُلُوَّهُ أَوْ فَصِيلَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَعَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى، وَحَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَبُرَيْدَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واته: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ لە رۆزی حەڵاڵ رۆزیە ببەخشێ، خوای گەورە جگە لە رۆزی حەڵاڵ قبوڵ ناکات، بێگومان بەدەستی راستی وەری دەگرێ، ئەگەر خورما بوو لەدەستی خوای گەورەدا خورماکە پەروەردە دەبێ هەتا لەکێو گەورەتر دەبێ، وەك چۆن یەکێ لە ئێوە جوانە ئەسپی تازە لەدایك بوو یان بەچکە وشتری تازە لەدایك بوو پەروەردە دەکات، هەتا گەورە دەبێ).

٦٦٢ - (منكر بزيادة: (وتصديق ذالك)) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ الصَّدَقَةَ وَيَأْخُذُهَا بِيَمِينِهِ فَيُرَبِّيهَا لأَحَدِكُمْ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ مُهْرَهُ، حَتَّى إِنَّ اللُّقْمَةَ لَتَصِيرُ مِثْلَ أُحُدٍ، وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ)، وَ (يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا. وَقَدْ قَالَ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ فِي هَذَا الحَدِيثِ وَمَا يُشْبِهُ هَذَا مِنَ الرِّوَايَاتِ مِنَ الصِّفَاتِ: وَنُزُولِ الرَّبِّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، قَالُوا: قَدْ تَثْبُتُ الرِّوَايَاتُ فِي هَذَا وَيُؤْمَنُ بِهَا وَلاَ يُتَوَهَّمُ وَلاَ يُقَالُ: كَيْفَ؟ هَكَذَا رُوِيَ عَنْ مَالِكٍ، وَسُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُمْ قَالُوا فِي هَذِهِ الأَحَادِيثِ: أَمِرُّوهَا بِلاَ كَيْفٍ، وَهَكَذَا قَوْلُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ، وَأَمَّا الجَهْمِيَّةُ فَأَنْكَرَتْ هَذِهِ الرِّوَايَاتِ وَقَالُوا: هَذَا تَشْبِيهٌ. وَقَدْ

ذَكَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كِتَابِهِ الْيَدَ وَالسَّمْعَ وَالْبَصَرَ، فَتَأَوَّلَتِ الْجَهْمِيَّةُ هَذِهِ الْآيَاتِ فَفَسَّرُوهَا عَلَى غَيْرِ مَا فَسَّرَ أَهْلُ الْعِلْمِ، وَقَالُوا: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَخْلُقْ آدَمَ بِيَدِهِ، وَقَالُوا: إِنَّ مَعْنَى الْيَدِ هَاهُنَا الْقُوَّةُ. وقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: إِنَّمَا يَكُونُ التَّشْبِيهُ إِذَا قَالَ: يَدٌ كَيَدٍ، أَوْ مِثْلُ يَدٍ، أَوْ سَمْعٌ كَسَمْعٍ، أَوْ مِثْلُ سَمْعٍ، فَإِذَا قَالَ: سَمْعٌ كَسَمْعٍ، أَوْ مِثْلُ سَمْعٍ، فَهَذَا التَّشْبِيهُ. وَأَمَّا إِذَا قَالَ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى يَدٌ، وَسَمْعٌ، وَبَصَرٌ، وَلاَ يَقُولُ كَيْفَ، وَلاَ يَقُولُ مِثْلُ سَمْعٍ، وَلاَ كَسَمْعٍ، فَهَذَا لاَ يَكُونُ تَشْبِيهًا، وَهُوَ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ: (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بێگومان خوای گەورە خێر و چاکە و زەکات وەردەگرێ، بەدەستی ڕاستی وەری دەگرێ و پەروەردەی دەکات، وەك چۆن یەکێ لە ئێوە بەچکە وشتری تازە لەدایك بووی خۆی پەروەردە دەکات هەتا دەبێتە وشترێکی سەرە، هەتا پاروویە هێندەی کێوی ئوحدی لێ دێ). ئەم ئایەتە ئەوە بەراست دەخاتەوە: (هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ). سورة التوبة: ١٠٤. واتە: بێگومان خوا تەوبەو پەشیمانی لە بەندەکانی وەردەگرێت، وە هەر ئەو ماڵ و بەخشینەکان وەردەگرێت. (يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ). سورة البقرة: ٢٧٦. واتە: خوا بەرەکەتی سود(ریبا) ناهێڵێ، وە برەو بە خێر و بەخشین دەدات.

٦٦٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ مُوسَى، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّ الصَّوْمِ أَفْضَلُ بَعْدَ رَمَضَانَ؟ فَقَالَ: شَعْبَانُ لِتَعْظِيمِ رَمَضَانَ، قِيلَ: فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: صَدَقَةٌ فِي رَمَضَانَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَصَدَقَةُ بْنُ مُوسَى لَيْسَ عِنْدَهُمْ بِذَاكَ الْقَوِيِّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: دەربارەی کام ڕۆژوو چاکترینە و خێری زیاترە لەپاش ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە پێغەمبەریان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی؟ فەرمووی: (ڕۆژووی مانگی شەعبان). وترا: ئەی چی بەخشینێ چاکترینە و خێری زیاترە؟ فەرمووی: (بەخشین لە مانگی ڕەمەزاندا).

٦٦٤ - (صحيح: الشطر الأول منه) حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ مُكْرَمٍ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عِيسَى الْخَزَّازُ، عَنْ يُونُسَ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لَتُطْفِئُ غَضَبَ الرَّبِّ، وَتَدْفَعُ مِيتَةَ السُّوءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بەخشین قار و توڕەیی خوای گەورە دەکوژێنێتەوە، خاوەنەکەشی لە مردنی خراپ دەپارێزێت). — لەکاتی سەرەمەرگدا ڕزگاری دەکات لە دەست شەیتانی نەفرەتی- .

## ئەوەی هاتووە سەبارەت بە مافی سوالکەر

٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَقِّ السَّائِلِ

٦٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ بُجَيْدٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ بُجَيْدٍ، وَكَانَتْ مِمَّنْ بَايَعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ الْمِسْكِينَ لَيَقُومُ عَلَى بَابِي فَمَا أَجِدُ لَهُ شَيْئًا أُعْطِيهِ إِيَّاهُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ لَمْ تَجِدِي لَهُ شَيْئًا تُعْطِيهِ إِيَّاهُ إِلاَّ ظِلْفًا مُحْرَقًا فَادْفَعِيهِ إِلَيْهِ فِي يَدِهِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَحُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ. حَدِيثُ أُمِّ بُجَيْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی بوجەیدەوە، لە نەنکیەوە دایکی بوجەید هاتووە – کە یەکێ بوو لەو ئافرەتانەی پەیمانی دا بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) – پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، هەژارێ دێتە بەر دەرگاکەم بۆ سوالکردن، منیش هیچم نیە هەتا بیدەمێ؟! پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەگەر هەر هیچت نەبوو بیدەیتێ تەنها لاسمی مەڕێ نەبێ بیدە دەستی با بڕوات). – مەبەستی ئەوەبووە بێ بەشی نەکات با کەمیش بێت – .

### بەخشین بەوانەی دڵیان هۆگری ئیسلام دەبێ

### ٣٠ – بَابُ مَا جَاءَ فِي إِعْطَاءِ الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ

٦٦٦ – (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: أَعْطَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ حُنَيْنٍ، وَإِنَّهُ لأَبْغَضُ الخَلْقِ إِلَيَّ، فَمَا زَالَ يُعْطِينِي، حَتَّى إِنَّهُ لأَحَبُّ الخَلْقِ إِلَيَّ: حَدَّثَنِي الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ بِهَذَا أَوْ شِبْهِهِ فِي الْمُذَاكَرَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. حَدِيثُ صَفْوَانَ رَوَاهُ مَعْمَرٌ، وَغَيْرُهُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ قَالَ: أَعْطَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَكَأَنَّ هَذَا الحَدِيثَ أَصَحُّ وَأَشْبَهُ، إِنَّمَا هُوَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّ صَفْوَانَ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي إِعْطَاءِ الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ. فَرَأَى أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ لاَ يُعْطَوْا، وَقَالُوا: إِنَّمَا كَانُوا قَوْمًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَأَلَّفُهُمْ عَلَى الإِسْلاَمِ حَتَّى أَسْلَمُوا، وَلَمْ يَرَوْا أَنْ يُعْطَوْا اليَوْمَ مِنَ الزَّكَاةِ عَلَى مِثْلِ هَذَا الْمَعْنَى، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ، وَغَيْرِهِمْ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ

بَعْضُهُمْ: مَنْ كَانَ الْيَوْمَ عَلَى مِثْلِ حَالِ هَؤُلاَءِ وَرَأَى الإِمَامُ أَنْ يَتَأَلَّفَهُمْ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَأَعْطَاهُمْ جَازَ ذَلِكَ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە جەنگی حونەین دا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی بەخشیم، لەکاتێکدا کە بێزراوترین دروستکراو بوو لەلام و زۆر رقم لێی بوو، بەردەوام پێی دەبەخشیم هەتا بەڕاستی بوو بە خۆشەویسترین کەس لەلام.

## دەربارەی بەخشەر میراتگری بەخشینەکەیەتی

### ٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُتَصَدِّقِ يَرِثُ صَدَقَتَهُ

٦٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ أَتَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي كُنْتُ تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِجَارِيَةٍ وَإِنَّهَا مَاتَتْ، قَالَ: وَجَبَ أَجْرُكِ، وَرَدَّهَا عَلَيْكِ الْمِيرَاثُ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا كَانَ عَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ قَالَ: صُومِي عَنْهَا، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا لَمْ تَحُجَّ قَطُّ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، حُجِّي عَنْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ يُعْرَفُ هَذَا مِنْ حَدِيثِ بُرَيْدَةَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَطَاءٍ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ ثُمَّ وَرِثَهَا حَلَّتْ لَهُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا الصَّدَقَةُ شَيْءٌ جَعَلَهَا لِلَّهِ، فَإِذَا وَرِثَهَا، فَيَجِبُ أَنْ يَصْرِفَهَا فِي مِثْلِهِ. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَزُهَيْرٌ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَطَاءٍ.

واتە: لە بورەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت

پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دانیشتبووم، ئافرەتێ هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پێشتر کەنیزەکێکی لاوم بەخشی بە دایکم، ئێستا دایکم مردوە و کەنیزەکەکەی لەپاش بەجێماوە، ئەگەر بیکەمەوە بە مولکی خۆم ئایا ئەمە پەشیمان بونەوە نیە لە بەخشین؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (پاداشتەکەت مسۆگەر کردوەو، کەنیزەکەشت بۆ دەگەڕێتەوە بە میراتی). فەرمووی: دایکم مردوەو مانگێ رۆژوو قەرزارە، ئایا بۆی بگرمەوە ئەوەی بەسەو خێری دەگات؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بەڵێ، بۆی بگرەوە). وتی: دایکم هەرگیز حەجی نەکردوە ئەگەر حەجی بۆ بکەم خێری دەگات؟ فەرمووی: (بەڵێ، حەجی بۆ بکە).

## خراپی پەشیمان بوونەوە لە بەخشین و گێڕانەوەی

### ٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ العَوْدِ فِي الصَّدَقَةِ

٦٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ، أَنَّهُ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ رَآهَا تُبَاعُ فَأَرَادَ أَنْ يَشْتَرِيَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئەسپێکی چاکی هەبوو بەخشی بە کەسێ لەڕێی خوا بۆ ئەوەی جیهادی پێ بکات و ئامادەی غەزاکردن بێت، لەپاشدا بینی ئەفرۆشرێت، ویستی بیکڕێت، لەوبارەوە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ ئەویش فەرمووی: (نە بیکڕەو نە

هیچ بەخشینێكی خۆت هەڵبگرەوە و لە زەكاتەكەت پەشیمان مەبەرەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خێركردن بۆ مردوو

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّدَقَةِ عَنِ الْمَيِّتِ

٦٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ، أَفَيَنْفَعُهَا إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّ لِي مَخْرَفًا، فَأُشْهِدُكَ أَنِّي قَدْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَبِهِ يَقُولُ أَهْلُ العِلْمِ يَقُولُونَ: لَيْسَ شَيْءٌ يَصِلُ إِلَى الْمَيِّتِ إِلاَّ الصَّدَقَةُ وَالدُّعَاءُ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. قَالَ: وَمَعْنَى قَوْلِهِ إِنَّ لِي مَخْرَفًا يَعْنِي: بُسْتَانًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پیاوێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دایكم مردوە، ئەگەر من خێری بۆ بكەم سودی بۆی دەبێت؟ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بەڵێ). وتی: دەی من باخێكی خورما یان ترێم هەیە، ئەوا تۆ بە شایەت بە دەیكەم بەخێر بۆی.

زانایان دەڵێن: مردوو بەس نزاو پاڕانەوە و خێر و چاكەی پێ دەگات.

## دەربارەی بەخشینی ژن لەماڵی مێردەكەی

### ٣٤ - بَابٌ فِي نَفَقَةِ الْمَرْأَةِ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا

٦٧٠ - (حسن) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُرَحْبِيلُ

بْنُ مُسْلِمٍ الخَوْلاَنِيُّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ قَال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خُطْبَتِهِ عَامَ حَجَّةِ الوَدَاعِ يَقُولُ: لاَ تُنْفِقُ امْرَأَةٌ شَيْئًا مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَلاَ الطَّعَامُ، قَال: ذَاكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ أَبِي أُمَامَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو لە وتارەکەی حەجی مالآوایی دا دەیفەرموو: (با ژن هیچ شتێ نەبەخشێت لە ماڵ و سامانی مێردەکەی بەبێ رەزامەندی و مۆڵەتی مێردەکەی). وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، تەنانەت خواردنیش؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەوە چاکترینی ماڵمانە).

٦٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَال: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ قَال: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ يُحَدِّثُ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَال: إِذَا تَصَدَّقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا كَانَ لَهَا بِهِ أَجْرٌ، وَلِلزَّوْجِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلاَ يَنْقُصُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ مِنْ أَجْرِ صَاحِبِهِ شَيْئًا، لَهُ بِمَا كَسَبَ، وَلَهَا بِمَا أَنْفَقَتْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ کە ژنێ لە ماڵی مێردەکەی خۆراکێ دەبەخشێ بە مەرجێ مەبەستی بەفیڕۆدانی نەبێت، ئەوە پاداشتی باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە، هەروەها مێردەکەشی پاداشتی باشی بۆ هەیە چونکە ئەو پەیدای

کردووە، هەروەها کلیل بەدەستەکەشی بە هەمان شێوە پاداشتی باشی بۆ هەیە، هەندێکیان لە پاداشتی هەندێکی تریان کەم ناکەنەوە).

٦٧٢ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُؤَمَّلُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَعْطَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا بِطِيبِ نَفْسٍ غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا مِثْلُ أَجْرِهِ، لَهَا مَا نَوَتْ حَسَنًا، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَذَا أَصَحُّ، مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، وَعَمْرُو بْنُ مُرَّةَ لاَ يَذْكُرُ فِي حَدِيثِهِ عَنْ مَسْرُوقٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ کە ژنێ لە ماڵی مێردەکەی خۆراکێ دەبەخشێ بە مەرجێ مەبەستی بەفیڕۆدانی نەبێت، ئەوە پاداشتی باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە، هەروەها کلیل بەدەستەکەشی بە هەمان شێوە پاداشتی باشی بۆ هەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی سەرفیترە

٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَدَقَةِ الفِطْرِ

٦٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الفِطْرِ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ حَتَّى قَدِمَ مُعَاوِيَةُ الْمَدِينَةَ، فَتَكَلَّمَ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ إِنِّي لأَرَى مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ

تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ. قَالَ: فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَلاَ أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ يَرَوْنَ: مِنْ كُلِّ شَيْءٍ صَاعًا وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: مِنْ كُلِّ شَيْءٍ صَاعٌ إِلاَّ مِنَ البُرِّ، فَإِنَّهُ يُجْزِئُ نِصْفُ صَاعٍ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ. وَأَهْلِ الْكُوفَةِ يَرَوْنَ: نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆیدا بۆ هەموو کەسێکی بچوك و گەورە، ئازاد یان کۆیلە، (صاع)ێك لە خۆراك، یان (صاع)ێك لە کەشك، یان (صاع)ێك لە جۆ، یان (صاع)ێك لە خورما، یا (صاع)ێك لە مێوژ زەکاتی سەرفیترەمان دەدا، بەردەوام ئەم شتانەمان دەدا هەتا موعاویە لە شامەوە هات بۆ حەج یان بۆ عەمرە، لەسەر مینبەر وتاری دا بۆ خەڵك، یەکێ لە وتەکانی ئەمە بوو وتی: وادەزانم کە نیو(صاع) لە گەنمی شام هاوتای (صاع)ێك لە خورمایە، ئیتر خەڵکیش رەفتاریان بەم قسەیەی موعاویە کرد گەنمیان دەدا لە زەکاتی سەرفترەدا. ئەبو سەعید وتی: من هەتا لەژیاندا ماوم بەردەوام (صاع)ێك لەو شتانە دەدەم لە سەرفترەدا واتە لە (صاع)ێك کەمتر نادەم.

بە پەیرەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان رایان وایە لەهەموو شتێ (صاع)ێك، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش دەفەرموون: لەهەموو شتێ (صاع)ێك جگە لە گەنم کە نیو (صاع) بەسە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و خەڵکی کوفەیە.

رایان وایە گەنم نیو (صاع)ە.

٦٧٤ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ مُكْرَمٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَالِمُ بْنُ نُوحٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مُنَادِيًا فِي فِجَاجِ مَكَّةَ: أَلاَ إِنَّ صَدَقَةَ الفِطْرِ وَاجِبَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى، حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، صَغِيرٍ أَوْ كَبِيرٍ، مُدَّانِ مِنْ قَمْحٍ، أَوْ سِوَاهُ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى عُمَرُ بْنُ هَارُونَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، وَقَالَ عَنِ العَبَّاسِ بْنِ مِينَاءَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ بَعْضَ هَذَا الحَدِيثِ. حَدَّثَنَا جَارُودُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ هَارُونَ هَذَا الحَدِيثَ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جارچی نارد بۆ سەر هەموو ڕێگە فراوانەکانی مەککە کە خەڵك لێیەوە دەهاتنە ناو شارەوە، جاربدات و بڵێ: (ئاگاداربن زەکاتی سەرفیترە واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی نێر و مێ، ئازاد و کۆیلە، گەوە و بچوك، بۆ هەر یەکێ دوو مود لە گەنم یان جگە لە گەنم، (صاع)ێك لە خواردن).

٦٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدَقَةَ الفِطْرِ عَلَى الذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالحُرِّ وَالمَمْلُوكِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، قَالَ: فَعَدَلَ النَّاسُ إِلَى نِصْفِ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَدِّ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ، وَثَعْلَبَةَ بْنِ أَبِي صُعَيْرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زەکاتی سەرفیترەی فەرزکرد لەسەر هەموو موسوڵمانێکی نێر و مێ، ئازاد و کۆیلە، بۆ هەر یەکێ (صاع)ێك لە خورما، یان (صاع)ێك لە جۆ، فەرمووی: ئیتر خەڵك نیو (صاع) لە گەنمیان دەدا لە سەرفترەدا.

٦٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَضَ زَكَاةَ الفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ أَيُّوبَ، وَزَادَ فِيهِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. وَرَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ نَافِعٍ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ: مِنَ الْمُسْلِمِينَ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ لِلرَّجُلِ عَبِيدٌ غَيْرُ مُسْلِمِينَ لَمْ يُؤَدِّ عَنْهُمْ صَدَقَةَ الفِطْرِ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُؤَدِّي عَنْهُمْ وَإِنْ كَانُوا غَيْرَ مُسْلِمِينَ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زەکاتی سەرفیترەی فەرزکرد لەسەر هەموو موسوڵمانێکی ئازاد و کۆیلە، نێر و مێ، بۆ هەر یەکێ (صاع)ێك لە خورما، یان (صاع)ێك لە جۆ.

## زەكاتی سەرفیترە دەركردن لەپێش نوێژی جەژن

٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْدِيمِهَا قَبْلَ الصَّلاَةِ

٦٧٧ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ عَمْرِو بْنِ مُسْلِمٍ أَبُو عَمْرٍو الْحَذَّاءُ الْمَدِينِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْمُرُ بِإِخْرَاجِ الزَّكَاةِ قَبْلَ الغُدُوِّ لِلصَّلاَةِ يَوْمَ الفِطْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَهُوَ الَّذِي يَسْتَحِبُّهُ أَهْلُ العِلْمِ: أَنْ يُخْرِجَ الرَّجُلُ صَدَقَةَ الفِطْرِ قَبْلَ الغُدُوِّ إِلَى الصَّلاَةِ.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی دا پێش ئەوەی خەڵك بڕۆن بۆ نوێژی جەژن زەكاتی سەرفترەكەیان بدەن.**

## دەربارەی پێشخستنی زەكاتی سەرفیترە

٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْجِيلِ الزَّكَاةِ

٦٧٨ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّا، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، عَنْ حُجَيَّةَ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ العَبَّاسَ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ.

**واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە عەباس رەزای خوای لێ بێ سەبارەت بە پێشخستنی زەكاتەكەی لە پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ**

وَسَلَّمَ) پرسی؟ ئەویش مۆڵەتی پێ دا. - مۆڵەتی پێ دا لەپێش هاتنی کاتی خۆی زەکاتەکەی دەربکات -.

٦٧٩ - (حسن) حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ الكُوفِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ جَحْلٍ، عَنْ حُجْرٍ العَدَوِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعُمَرَ: إِنَّا قَدْ أَخَذْنَا زَكَاةَ العَبَّاسِ عَامَ الأَوَّلِ لِلْعَامِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. لاَ أَعْرِفُ حَدِيثَ تَعْجِيلِ الزَّكَاةِ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ، إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَحَدِيثُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ زَكَرِيَّا، عَنِ الحَجَّاجِ عِنْدِي أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ الحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي تَعْجِيلِ الزَّكَاةِ قَبْلَ مَحِلِّهَا، فَرَأَى طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ لاَ يُعَجِّلَهَا، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ قَال: أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ لاَ يُعَجِّلَهَا، وقَالَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ: إِنْ عَجَّلَهَا قَبْلَ مَحِلِّهَا أَجْزَأَتْ عَنْهُ، وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە پێشەوا عومەری فەرموو: (ئێمە ساڵی پێشوو زەکاتی ئەم ساڵی عەباسمان وەگرت).

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر دەرکرنی زەکات لەپێش هاتنی کاتی خۆی، هەندێ لە زانایان پێش وەخت دەرنەکرێت هەتا کاتی خۆی نەیەت، ئەمەش وتەی پێشەوا سوفیانی (ثوري)ە دەڵێ: من پێم خۆشە پێش وەخت دەرنەکرێت.

سەرجەم زانایان دەفەرموون: ئەگەر پێش هاتنی کاتی خۆی زەکاتەکەی دەرکرد ئەوە دروستە، پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

## سەبارەت بە قەدەغەکردنی سوالکردن

### ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ الْمَسْأَلَةِ

٦٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ بَيَانِ بْنِ بِشْرٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لأَنْ يَغْدُوَ أَحَدُكُمْ فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَتَصَدَّقَ مِنْهُ فَيَسْتَغْنِيَ بِهِ عَنِ النَّاسِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ رَجُلاً، أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ ذَلِكَ، فَإِنَّ الْيَدَ الْعُلْيَا أَفْضَلُ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ. وَفِي الْبَابِ عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، وَعَطِيَّةَ السَّعْدِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَمَسْعُودِ بْنِ عَمْرٍو، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَثَوْبَانَ، وَزِيَادِ بْنِ الْحَارِثِ الصُّدَائِيِّ، وَأَنَسٍ، وَحُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ، وَقَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ، وَسَمُرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، يُسْتَغْرَبُ مِنْ حَدِيثِ بَيَانٍ، عَنْ قَيْسٍ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆخۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (ئەگەر یەکێ لەئێوە بەیانیان بڕوات کۆڵەدار بهێنێ لەبازاڕ بیفرۆشێ بۆ ڕۆزی خۆی و خانەوادەکەی پێویستی بە کەس نەبێ یارمەتی بدات، ئەو ئەرك و ماندوبونەی گەلێ باشترە بۆی لەوەی دەست پان بکاتەوە لەخەڵك جا ئیتر بیدەنێ یان نەیدەنێ، بەڕاستی ئەو دەستەی کاردەکات و دەیبەخشێ چاکترە لەو دەستەی کار ناکات و سواڵ دەکات - (يَدُ الْعُلْيَا) ئەو دەستەیە کە دەیبەخشێ، (يَدُ السُّفْلَى) ئەو دەستەیە کە سواڵ دەکات — جا لە خانەوادەو خزم و کەسوکارە نزیکەکانی خۆشتەوە دەست پێ بکە واتە لەپێشدا خێر و خێرات بدە بە خانەوادەو خزم و کەسوکارە نزیکەکانی خۆت).**

٦٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْمَسْأَلَةَ كَدٌّ يَكُدُّ بِهَا الرَّجُلُ وَجْهَهُ، إِلاَّ أَنْ يَسْأَلَ الرَّجُلُ سُلْطَانًا، أَوْ فِي أَمْرٍ لاَ بُدَّ مِنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بەڕاستی سوالکردن ئابڕووی پیاو دەبات و ڕەونەقی روخساری ناهێڵێت، مەگەر بۆ کەسێ داوای مافی شەرعی خۆی بکات لە فەرمانڕەوا، یان لەبەر ناچاری و پێویستی زۆر.

## کۆتایی باسەکانی زەکات

# باسەکانی رۆژوو لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٦ – أَبْوَابُ الصَّوْمِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی مانگی رەمەزان

١ – بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ شَهْرِ رَمَضَانَ

٦٨٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ العَلَاءِ بْنِ كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا كَانَ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ صُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ، وَمَرَدَةُ الجِنِّ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، فَلَمْ يُفْتَحْ مِنْهَا بَابٌ، وَفُتِّحَتْ أَبْوَابُ الجَنَّةِ، فَلَمْ يُغْلَقْ مِنْهَا بَابٌ، وَيُنَادِي مُنَادٍ: يَا بَاغِيَ الخَيْرِ أَقْبِلْ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ، وَلِلَّهِ عُتَقَاءُ مِنَ النَّارِ، وَذَلكَ كُلُّ لَيْلَةٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَسَلْمَانَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کاتێ یەکەم شەوی مانگی رەمەزان دێت شەیتانەکان و جنۆکە یاخی و سەرکەشەکان کۆت و بەند دەکرێن، دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و یەك دەرگایان ناکرێتەوە، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و یەك دەرگایان داناخرێت، جارچیەك جاڕدەدات: ئەی خێرخواز ئێستا فرسەتە برۆ بەرەوپیری کردەوە چاکەکان و خۆت ماندوو بکە، ئەی شەڕخواز وازبێنە و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا، هەموو شەوێ خوای گەورە خەڵکانێکی زۆر لەئاگری دۆزەخ رزگار دەکات).

٦٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، وَالمحَارِبِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَامَ رَمَضَانَ وَقَامَهُ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ: حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ الَّذِي رَوَاهُ أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ رِوَايَةِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي بَكْرٍ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَوْلَهُ: إِذَا كَانَ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ فَذَكَرَ الحَدِيثَ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَهَذَا أَصَحُّ عِنْدِي مِنْ حَدِيثِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر کەسێك ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت بە ئیمانەوە لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهیوای پاداشتی پەروەردگاری بێت لەسەر ئەو کارەی، خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت، وە هەر کەسێك بە ئیمانەوە شەوانی (قَدْر) بە شەونوێژ زیندوبکاتەوە لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهیوای پاداشتی پەروەردگاری بێت لەسەر ئەو کارەی، خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت).

## پێش کاتی مانگی ڕەمەزان مەکەون بە ڕۆژووگرتن،

٢ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ بِصَوْمٍ

٦٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَقَدَّمُوا

الشَّهْرَ بِيَوْمٍ وَلاَ بِيَوْمَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يُوَافِقَ ذَلِكَ صَوْمًا كَانَ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ، صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَعُدُّوا ثَلاَثِينَ ثُمَّ أَفْطِرُوا. وَفِي البَابِ عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو عِيسَى حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ كَرِهُوا أَنْ يَتَعَجَّلَ الرَّجُلُ بِصِيَامٍ قَبْلَ دُخُولِ شَهْرِ رَمَضَانَ لِمَعْنَى رَمَضَانَ وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يَصُومُ صَوْمًا فَوَافَقَ صِيَامُهُ ذَلِكَ فَلاَ بَأْسَ بِهِ عِنْدَهُمْ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: كَرِهُوا أَنْ يَتَعَجَّلَ الرَّجُلُ بِصِيَامٍ قَبْلَ دُخُولِ شَهْرِ رَمَضَانَ لِمَعْنَى رَمَضَانَ، وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يَصُومُ صَوْمًا فَوَافَقَ صِيَامُهُ ذَلِكَ فَلاَ بَأْسَ بِهِ عِنْدَهُمْ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پێش کاتی مانگی رەمەزان مەکەون بە رۆژێ یان دوو رۆژ رۆژووگرتن، مەگەر رێك بکەوێ لەگەڵ رۆژووی کەسێ لە ئێوە کە عادەتی وابێ لەو رۆژەدا بەرۆژوو بێت - بۆ نمونە کەسێ رۆژی نا رۆژێ بە رۆژوو بێ - ، بەرۆژوو مەبن هەتا مانگ دەبینن، لەپاشدا بەرۆژوو بن هەتا مانگی شەوال دەبینن، ئەگەر هەور بوو مانگ نەدەبینرا ئەوا مانگ تەواو بکەن واتە سی رۆژی تەواو بە رۆژوو بن، لەپاشدا رۆژوو بشکێنن و بیکەن بە جەژن).

٦٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَقَدَّمُوا شَهْرَ رَمَضَانَ بِصِيَامٍ قَبْلَهُ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا فَلْيَصُمْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پێش کاتی مانگی ڕەمەزان مەکەون بە ڕۆژێ یان دوو ڕۆژ ڕۆژووگرتن لە کۆتایی مانگی شەعباندا، مەگەر ڕێك بکەوێ لەگەڵ ڕۆژووی کەسێ لە ئێوە کە عادەتی وابێ لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بێت - بۆ نمونە کەسێ ڕۆژی نا ڕۆژێ یان دوو شەممان و پێنج شەممان - ).

## لەو ڕۆژەدا گومانی تێدایە ڕەمەزانە ڕۆژووگرتن باش نیە

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ صَوْمِ يَوْمِ الشَّكِّ

٦٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ، قَال: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ فَأُتِيَ بِشَاةٍ مَصْلِيَّةٍ، فَقَال: كُلُوا، فَتَنَحَّى بَعْضُ القَوْمِ، فَقَال: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ اليَوْمَ الَّذِي يَشُكُّ فِيهِ النَّاسُ فَقَدْ عَصَى أَبَا القَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ عَمَّارٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، كَرِهُوا أَنْ يَصُومَ الرَّجُلُ اليَوْمَ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، وَرَأَى أَكْثَرُهُمْ إِنْ صَامَهُ فَكَانَ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ أَنْ يَقْضِيَ يَوْمًا مَكَانَهُ.

واتە: لە صیلەی کوڕی زوفەرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت عەمماردا ڕەزای خوای لێ بێ بووین لەڕۆژێکدا گومانی تێدا هەبوو کە ڕەمەزانە یان نا، گۆشتی مەڕیان بە برژاوی بۆ هێنا، هەندێ لە خەڵکەکە چونە دواوەو لە گۆشتەکەیان نەخوارد چونکە بەڕۆژوو بوون، عەممار ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەوەی ئەمڕۆ بەڕۆژوو بێت بێگومان لە فەرمانی باوکی قاسم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

دەرچووە.

## ژماردنی رۆژەکانی مانگی شەعبان لەپێناو رۆژووی رەمەزان

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِحْصَاءِ هِلاَلِ شَعْبَانَ لِرَمَضَانَ

٦٨٧ - (حسن) حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ حَجَّاجٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَحْصُوا هِلاَلَ شَعْبَانَ لِرَمَضَانَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِثْلَ هَذَا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مُعَاوِيَةَ، وَالصَّحِيحُ مَا رُوِيَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَقَدَّمُوا شَهْرَ رَمَضَانَ بِيَوْمٍ وَلاَ يَوْمَيْنِ. وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو اللَّيْثِيِّ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (رۆژەکانی مانگی شەعبان بژمێرن لەپێناو رۆژووی رەمەزان بۆ ئەوەی رۆژەکانی مانگی رەمەزانتان لێ تێک نەچێ و بە تەواوی بەرۆژوو بن).**

## بە رۆژووبوون بە بینی مانگە شکاندنیشی بەهەمان شێوە

٥ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الصَّوْمَ لِرُؤْيَةِ الهِلاَلِ وَالإِفْطَارَ لَهُ

٦٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَصُومُوا قَبْلَ رَمَضَانَ،

صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ حَالَتْ دُونَهُ غَيَايَةٌ، فَأَكْمِلُوا ثَلاَثِينَ يَوْمًا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لەپێش مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو مەبن هەتا مانگ دەبینن، لەپاشدا بەڕۆژوو بن هەتا مانگی شەوال دەبینن، ئەگەر هەور بوو مانگ نەدەبینرا ئەوا مانگ تەواو بکەن واتە سی ڕۆژی تەواو ڕۆژوو بگرن، لەپاشدا ڕۆژوو بشکێنن).

## ئەوەی هاتووە سەبارەت بە مانگ بیست و نۆ ڕۆژە

٦ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ

٦٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي عِيسَى بْنُ دِينَارٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ بْنِ أَبِي ضِرَارٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَا صُمْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ أَكْثَرُ مِمَّا صُمْنَا ثَلاَثِينَ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ، وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ، وَجَابِرٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَأَبِي بَكْرَةَ. أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الشَّهْرُ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: زۆرترین ڕەمەزان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیستو نۆ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوین.

٦٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّهُ قَالَ: آلَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نِسَائِهِ شَهْرًا، فَأَقَامَ فِي مَشْرُبَةٍ تِسْعًا وَعِشْرِينَ يَوْمًا، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ آلَيْتَ شَهْرًا فَقَالَ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سوێندی خوارد مانگێ نەچێتە لای ژنەکانی، لە ژوورێکدا بۆ خۆی ژیانی بەسەر دەبرد، لەدوای بیست و نۆ رۆژ چوو بۆ لایان، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، تۆ سوێندەکەت خوارد بۆ مانگێ؟ فەرمووی: (مانگ بیستو نۆ رۆژە).

### شایەتیدان پێویستە بۆ رۆژووی مانگی رەمەزان

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّوْمِ بِالشَّهَادَةِ

٦٩١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ أَبِي ثَوْرٍ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الهِلاَلَ، قَالَ: أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: يَا بِلاَلُ، أَذِّنْ فِي النَّاسِ أَنْ يَصُومُوا غَدًا. حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ سِمَاكٍ، نَحْوَهُ بِهَذَا الإِسْنَادِ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ فِيهِ اخْتِلاَفٌ وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ وَغَيْرُهُ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً، وَأَكْثَرُ أَصْحَابِ سِمَاكٍ رَوَوْا، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا: تُقْبَلُ شَهَادَةُ رَجُلٍ وَاحِدٍ فِي الصِّيَامِ، وَبِهِ يَقُولُ ابْنُ

الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ، قَالَ إِسْحَاقُ: لاَ يُصَامُ إِلاَّ بِشَهَادَةِ رَجُلَيْنِ، وَلَمْ يَخْتَلِفْ أَهْلُ العِلْمِ فِي الإِفْطَارِ أَنَّهُ لاَ يُقْبَلُ فِيهِ إِلاَّ شَهَادَةُ رَجُلَيْنِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتی: مـن مانگم دیوە، فەرمووی: (ئایا شایەتی دەدەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)؟ وە شایەتی دەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئەی بیلال، جارِ بدە بە ناو خەڵکدا با سبەینێ بەرۆژوو بن).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان دەفەرموون: بۆ رۆژووگرتنی مانگی رەمەزان شایەتی پیاوێ قبوڵ دەکرێت، پێشەوایان ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و خەڵکی کوفە ئەمە دەفەرموون.

پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێ: مانگی رەمەزان دوو شایەت پێویستە، بۆ رۆژوو شکاندن و کردن بە جەژنیش هەر دوو شایەت پێویستە، لەسەر ئەم بابەتە زانایان کۆکن و رایان جیاواز نیە.

## مانگی رەمەزان و (ذي الحجة) کەم ناکەن

٨ - بَابُ مَا جَاءَ شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ

٦٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ البَصْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ: رَمَضَانُ، وَذُو الحِجَّةِ. حَدِيثُ أَبِي بَكْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. قَالَ أَحْمَدُ: مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ، يَقُولُ: لاَ يَنْقُصَانِ مَعًا فِي سَنَةٍ وَاحِدَةٍ شَهْرُ رَمَضَانَ، وَذُو الحِجَّةِ، إِنْ نَقَصَ أَحَدُهُمَا تَمَّ الآخَرُ. وقَالَ إِسْحَاقُ: مَعْنَاهُ لاَ يَنْقُصَانِ يَقُولُ: وَإِنْ كَانَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ فَهُوَ تَمَامٌ غَيْرُ نُقْصَانٍ. وَعَلَى مَذْهَبِ إِسْحَاقَ يَكُونُ يَنْقُصُ الشَّهْرَانِ مَعًا فِي سَنَةٍ وَاحِدَةٍ.

واتە: لە ئەبو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پاداشتی پەرستشی مانگی ڕەمەزان و مانگی (ذي الحجة) وەك یەکن و کەم ناکەن ئیتر مانگ بیستو نۆ ڕۆژ بێ یان سی ڕۆژ).

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرمووێ: مانای فەرموودەکە: (شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ) لەساڵێکدا مانگی ڕەمەزان و مانگی (ذي الحجة) ئەگەر یەکێکیان کەم بکات بیست و نۆ ڕۆژ بێ ئەوی تریان سی ڕۆژی تەواوە. پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێ: مانای (لاَ يَنْقُصَانِ) واتە: ئەگەر بیست و نۆ ڕۆژیش بێ وەك سی ڕۆژ وایە. لەسەر مەزهەبی پێشەوا ئیسحاق دەبێ لەساڵێکدا مانگی ڕەمەزان و مانگی (ذي الحجة) پێکەوە بیست و نۆ ڕۆژ بن.

## بینینی مانگ بۆ هەر وڵاتێ لەلایەن خەڵکەکەیەوە دەبێ

### ٩ - بَابُ مَا جَاءَ لِكُلِّ أَهْلِ بَلَدٍ رُؤْيَتُهُمْ

٦٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي حَرْمَلَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي كُرَيْبٌ، أَنَّ أُمَّ الفَضْلِ بِنْتَ الحَارِثِ، بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بِالشَّامِ قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ، فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا، وَاسْتُهِلَّ عَلَيَّ هِلاَلُ رَمَضَانَ وَأَنَا بِالشَّامِ، فَرَأَيْنَا الهِلاَلَ لَيْلَةَ الجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ، فَسَأَلَنِي ابْنُ

عَبَّاسٍ، ثُمَّ ذَكَرَ الهِلاَلَ، فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمُ الهِلاَلَ، فَقُلْتُ رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الجُمُعَةِ، فَقَالَ: أَأَنْتَ رَأَيْتَهُ لَيْلَةَ الجُمُعَةِ؟ فَقُلْتُ: رَآهُ النَّاسُ، وَصَامُوا، وَصَامَ مُعَاوِيَةُ، قَالَ: لَكِنْ رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ، فَلاَ نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلاَثِينَ يَوْمًا، أَوْ نَرَاهُ، فَقُلْتُ: أَلاَ تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ، قَالَ: لاَ، هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّ لِكُلِّ أَهْلِ بَلَدٍ رُؤْيَتَهُمْ.

واتە: لە کورەیبەوە دەگێڕنەوە، کە (أُمَّ الْفَضْلِ)ی کچی (حارثة) ناردویەتی بۆلای موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ لە شام - ئەو کاتە موعاویە فەرمانڕەوای شام بوو - کورەیب وتی: کاتێ کە گەیشتمە شام کارەکانی (أُمَّ الْفَضْل)م جێبەجێ کرد— واتە نامەکەیم گەیاندە دەستی موعاویە - ، هەر لە شام بووم مانگ بینرا، شەوی هەینی مانگمان بینی، لەپاشدا لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا هاتمەوە و گەیشتمەوە شاری مەدینە، ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ پرسیاری سەفەرەکەی لێ کردم، لەپاشدا باسی بینینی مانگی کرد، وتی: ئێوە کەی مانگتان دی؟ وتم: شەوی هەینی مانگمان دی، وتی: تۆ بەچاوی خۆت شەوی هەینی مانگت دی؟ وتم: بەڵێ، خەڵکیش بینیان و هەموو بەڕۆژوو بوون و موعاویەش بەڕۆژوو بوو، ئیبنو عەباس فەرمووی: بەڵام ئێمە شەوی شەممە مانگمان دیوە، بەردەوام بەڕۆژوو دەبین هەتا سی ڕۆژ تەواو دەکەین یان خۆمان مانگ دەبینین، وتم: ئایا بینینی مانگ لەلایەن موعاویەوەو بەڕۆژوو بوونی ئەو بەس نیە؟ وتی: نا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاوەها فەرمانی پێ کردوین.

## دەربارەی ئەو شتەی کە باشە بەربانگی پێ بکرێت

### ١٠ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُسْتَحَبُّ عَلَيْهِ الإِفْطَارُ

٦٩٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمَرَ بْنِ عَلِيٍّ الْمُقَدَّمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ وَجَدَ تَمْرًا فَلْيُفْطِرْ عَلَيْهِ، وَمَنْ لاَ، فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ، فَإِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ). وَفِي البَابِ عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَوَاهُ عَنْ شُعْبَةَ مِثْلَ هَذَا غَيْرَ سَعِيدِ بْنِ عَامِرٍ وَهُوَ حَدِيثٌ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَلاَ نَعْلَمُ لَهُ أَصْلاً مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ عَنْ أَنَسٍ، وَقَدْ رَوَى أَصْحَابُ شُعْبَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنِ الرَّبَابِ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ عَامِرٍ، وَهَكَذَا رَوَوْا عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ سَلْمَانَ، وَلَمْ يُذْكَرْ فِيهِ شُعْبَةُ، عَنِ الرَّبَابِ وَالصَّحِيحُ مَا رَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنِ الرَّبَابِ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ. وَابْنُ عَوْنٍ يَقُولُ: عَنْ أُمِّ الرَّائِحِ بِنْتِ صُلَيْعٍ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ، وَالرَّبَابُ هِيَ أُمُّ الرَّائِحِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە بەڕۆژوو بوو ئەگەر خورمای دەستکەوت با بە چەند دەنکە خورمایە بەربانك بکاتەوە، جا ئەگەر خورمای دەست نەکەوت ئەوە بە ئاو ڕۆژووەکەی بشکێنێ، چونکە ئاو پاکەوەکەرە).

٦٩٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ (ح) وحَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنِ الرَّبَابِ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ فَإِنَّهُ طَهُورٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەلمانی کوڕی عامیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە بەرۆژوو بوو کاتی بەربانگ ویستی رۆژووەکەی بشکێنێ با بە چەند دەنکە خورمایە بەربانگ بکاتەوە، جا ئەگەر خورمای دەست نەکەوت ئەوە بە ئاو رۆژووەکەی بشکێنێ، چونکە ئاو پاکەوەکەرە).

٦٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُفْطِرُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَى رُطَبَاتٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَتُمَيْرَاتٌ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تُمَيْرَاتٌ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێش ئەوەی نوێژی شێوان بکات بە چەند دەنکە خورمایەکی تەڕ رۆژووی دەشکاند، جا ئەگەر خورمای تەڕ نەبوایە ئەوە بە چەند دەنکە خورمایە - لە جۆرەکانی تر — ئەگەر ئەوەش نەبوایە ئەوە بە چەند قومێ ئاو رۆژووەکەی دەشکاند.

## جەژنی رەمەزان رۆژی رۆژوو شكاندنە،

## جەژنی قوربان رۆژی قوربانی كردنە

١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ الْفِطْرَ يَوْمَ تُفْطِرُونَ، وَالأَضْحَى يَوْمَ تُضَحُّونَ

٦٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الصَّوْمُ يَوْمَ تَصُومُونَ، وَالفِطْرُ يَوْمَ تُفْطِرُونَ، وَالأَضْحَى يَوْمَ تُضَحُّونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَفَسَّرَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ هَذَا الحَدِيثَ، فَقَالَ: إِنَّمَا مَعْنَى هَذَا أَنَّ الصَّوْمَ وَالفِطْرَ مَعَ الجَمَاعَةِ وَعُظْمِ النَّاسِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (مانگی رەمەزان ئەو رۆژیە كە بە رۆژوو دەبن، جەژن ئەو رۆژەیە كە رۆژوو دەشكێنن، جەژنی قوربان ئەو رۆژیە كە قوربانی دەكەن).

## ئەگەر شەو داهات و رۆژیش داكەوت كاتی بەربانگی رۆژووەوانە

١٢ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ، وَأَدْبَرَ النَّهَارُ فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ

٦٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ (ح) وَحَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ، وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُثَنًّى، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دَاوُدَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ، وَأَدْبَرَ النَّهَارُ، وَغَابَتِ

الشَّمْسُ، فَقَدْ أَفْطَرْتَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى، وَأَبِي سَعِيدٍ. حَدِيثُ عُمَرَ حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر شەو لەوێوە داهات واتە لە خۆر هەڵاتەوە، رۆژیش لەوێوە داكەوت واتە لە خۆر ئاواوە، ئەوە كاتی بەربانگی رۆژووەوانە).

## دەربارەی زوو رۆژوو شكاندن

### ١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْجِيلِ الإِفْطَارِ

٦٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ (ح) وَأَخْبَرَنَا أَبُو مُصْعَبٍ، قِرَاءَةً عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الفِطْرَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. حَدِيثُ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ الَّذِي اخْتَارَهُ أَهْلُ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: اسْتَحَبُّوا تَعْجِيلَ الفِطْرِ وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (خەڵك هەتا زوو رۆژووەكانیان بشكێنن نیشانەی ئەوەیە كە خێریان تێدایە و لەسەر سوننەتن). - واتە هەركە بانگی دا بەربانگ بكەنەوەو دوای نەخەن -.

زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش ئەم رایەیان پەسەند کردووە: زوو رۆژوو شکاندنیان پێ باشە، پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

٧٠٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ قُرَّةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِنَّ أَحَبَّ عِبَادِي إِلَيَّ أَعْجَلُهُمْ فِطْرًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرمووێت: (خۆشەویسترینی بەندەکانم لەلای من ئەوانەن کە زووتر بەربانگ دەکەنەوە).

٧٠١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو عَاصِمٍ، وَأَبُو الْمُغِيرَةِ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

٧٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ، فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، رَجُلاَنِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الإِفْطَارَ، وَيُعَجِّلُ الصَّلاَةَ، وَالآخَرُ يُؤَخِّرُ الإِفْطَارَ، وَيُؤَخِّرُ الصَّلاَةَ، قَالَتْ: أَيُّهُمَا يُعَجِّلُ الإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ الصَّلاَةَ؟ قُلْنَا: عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ، قَالَتْ: هَكَذَا صَنَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالآخَرُ أَبُو مُوسَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو عَطِيَّةَ: اسْمُهُ مَالِكُ بْنُ أَبِي عَامِرٍ الهَمْدَانِيُّ، وَيُقَالُ: ابْنُ عَامِرٍ الهَمْدَانِيُّ، وَابْنُ عَامِرٍ أَصَحُّ.

واتە: ئەبو (عطية) دەڵێ: من و مەسروق چووین بۆ خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ پێمان وت: ئەی دایکی باوەڕداران دوو پیاو لە یارانی موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەکێکیان زوو بەربانگ دەکاتەوەو زوویش نوێژی شێوان دەکات، ئەوی تریان درەنگ بەربانگ دەکاتەوەو درەنگیش نوێژی شێوان دەکات، کاری کامیان چاکە؟ عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: کامیان زوو بەربانگ دەکاتەوەو زوویش نوێژی شێوان دەکات کاری ئەوەیان چاکترە، وتمان بە (عبد الله)ی کوڕی مەسعود رەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: پێغەمبەری خوایش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جاران ئاوەهای دەکرد.

## سەبارەت بە دواخستنی پارشێو

### ١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَأْخِيرِ السُّحُورِ

٧٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانَ قَدْرُ ذَلِكَ؟ قَالَ: قَدْرُ خَمْسِينَ آيَةً.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پارشێومان کرد، لەپاشدا هەستاین بۆ نوێژ، ئەنەس فەرمووی: وتم: ماوەی نێوان پارشێو و هەستان بۆ نوێژەکە چەند دەبوو؟ فەرمووی: هێندەی خوێندنی پەنجا ئایەتی مام ناوەند دەبوو کە بە مام ناوەند بخوێنرێ.

٧٠٤ - حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ هِشَامٍ، بِنَحْوِهِ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: قَدْرُ قِرَاءَةِ

خَمْسِينَ آيَةً. وَفِي البَابِ عَنْ حُذَيْفَةَ. حَدِيثُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ اسْتَحَبُّوا تَأْخِيرَ السُّحُورِ.

واتە: لە هیشامەوە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموودەی پێشوو بەهەمان شێوە هاتووە، ئەوەندە نەبێ کە فەرمووی: هێندەی خوێندنی پەنجا ئایەت. پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون و دواخستنی پارشێویان پێ باشە.

**ئەوەی هاتووە سەبارەت بە شەبەقدان**

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيَانِ الفَجْرِ

٧٠٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُلاَزِمُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ النُّعْمَانِ، عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي طَلْقُ بْنُ عَلِيٍّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كُلُوا وَاشْرَبُوا، وَلاَ يَهِيدَنَّكُمُ السَّاطِعُ الْمُصْعِدُ، وَكُلُوا وَاشْرَبُوا، حَتَّى يَعْتَرِضَ لَكُمُ الأَحْمَرُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَسَمُرَةَ. حَدِيثُ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ: لاَ يَحْرُمُ عَلَى الصَّائِمِ الأَكْلُ وَالشُّرْبُ حَتَّى يَكُونَ الفَجْرُ الأَحْمَرُ الْمُعْتَرِضُ، وَبِهِ يَقُولُ عَامَّةُ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە قەیسی کوڕی (طلق)ی کوڕی عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بخۆن و بخۆنەوە، (فجر الكاذب) بەیانی درۆینە ڕێگەی پارشێوتان لێ نەگرێت، بخۆن و بخۆنەوە هەتا شەبەق دەدات و ڕووناکی بەیان بڵاودەبێتەوە(فجر الصادق) ).

٧٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَيُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ أَبِي

هِلاَلٍ، عَنْ سَوَادَةَ بْنِ حَنْظَلَةَ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَمْنَعَنَّكُمْ مِنْ سُحُورِكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ، وَلاَ الفَجْرُ الْمُسْتَطِيلُ، وَلَكِنِ الفَجْرُ الْمُسْتَطِيرُ فِي الأُفُقِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتـە: لـە سـەمورەی کـوڕی جوندوبـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (با بـانگی بـیلال و (فجر الكاذب)بەیانی درۆینە ڕێگەی پارشێوتان لـێ نـەگرێت، چـونکە ئـەو کاتـە هێشـتا شـەوی مـاوە بخـۆن و بخۆنـەوە هـەتا شـەبەق دەدات و ڕوونـاکی بـەیان بڵاودەبێتەوە).

## هەڕەشەی توند لەو کەسەی بەڕۆژووەو غەیبەت دەکات

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشْدِيدِ فِي الغِيبَةِ لِلصَّائِمِ

٧٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: وَأَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ بِأَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ وازنەهێنێ لە درۆ و وتەو کرداری خـراپ و - کارو کردەوەی نەزانانە -، ئـەوە خـوای گـەورە هـیچ پێویسـتی بـەو نیـە واز لـە خواردن و خواردنەوە بهێنێت).

## سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی پارشێو

١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ السَّحُورِ

٧٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، وَعَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَمْرِو بْنِ العَاصِ، وَالعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ، وَعُتْبَةَ بْنِ عَبْدٍ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ.

**واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پارشێو بکەن چونکە لە پارشێوکردندا بەرەکەت هەیە). لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (جیاوازی ڕۆژووی ئێمە لەگەڵ ڕۆژووی خاوەن نامەکان پارشێوکردنە).**

٧٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُلَيٍّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ، مَوْلَى عَمْرِو بْنِ العَاصِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ العَاصِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَهْلُ مِصْرَ يَقُولُونَ: مُوسَى بْنُ عَلِيٍّ، وَأَهْلُ العِرَاقِ: يَقُولُونَ مُوسَى بْنُ عُلَيٍّ، وَهُوَ مُوسَى بْنُ عُلَيِّ بْنِ رَبَاحٍ اللَّخْمِيُّ.

## دەربارەی رۆژووگرتن لەسەفەردا باش نیە

### ١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ

٧١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ عَامَ الفَتْحِ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الغَمِيمِ، وَصَامَ النَّاسُ مَعَهُ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ النَّاسَ قَدْ شَقَّ عَلَيْهِمُ الصِّيَامُ، وَإِنَّ النَّاسَ يَنْظُرُونَ فِيمَا فَعَلْتَ، فَدَعَا بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ بَعْدَ العَصْرِ، فَشَرِبَ، وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، فَأَفْطَرَ بَعْضُهُمْ، وَصَامَ بَعْضُهُمْ، فَبَلَغَهُ أَنَّ نَاسًا صَامُوا، فَقَالَ: أُولَئِكَ العُصَاةُ. وَفِي البَابِ عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: لَيْسَ مِنَ البِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ، وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الفِطْرَ فِي السَّفَرِ أَفْضَلُ، حَتَّى رَأَى بَعْضُهُمْ عَلَيْهِ الإِعَادَةَ إِذَا صَامَ فِي السَّفَرِ، وَاخْتَارَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ الفِطْرَ فِي السَّفَرِ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِنْ وَجَدَ قُوَّةً فَصَامَ فَحَسَنٌ، وَهُوَ أَفْضَلُ، وَإِنْ أَفْطَرَ فَحَسَنٌ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: وَإِنَّمَا مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْسَ مِنَ البِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ، وَقَوْلِهِ حِينَ بَلَغَهُ أَنَّ نَاسًا صَامُوا، فَقَالَ: أُولَئِكَ العُصَاةُ، فَوَجْهُ هَذَا إِذَا لَمْ يَحْتَمِلْ قَلْبُهُ قَبُولَ رُخْصَةِ اللهِ، فَأَمَّا مَنْ رَأَى الفِطْرَ مُبَاحًا وَصَامَ، وَقَوِيَ عَلَى ذَلِكَ، فَهُوَ أَعْجَبُ إِلَيَّ.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّه)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرەو مەککە دەرچوو لە ساڵی رزگارکردنی شاری مەککەدا، بەرۆژوو بوو هەتا گەیشتە (كراع الغميم) - شیوێکە لەپێش

عەسـەفانەوەیە - خەڵکەکـەش لەگـەڵ ئـەو بـەرۆژوو بـوون، پێـی وتـرا: خەڵکەکـە پەرێشانن و چاو لەتۆ دەکـەن بـە رۆژووی، کـات دوای عەسـر بـوو داوای پـەرداخێ ئاوی کردوو خواردیەوە، خەڵکەکە سەیران دەکرد، هەندێکیان رۆژووەکەیان شـکاند، هەندێکیان رۆژووەکەیان نەشکاند، پێی گەیشتەوە کـە هەنـدێ کـەس رۆژووەکـەیان نەشکاندووە، فەرمووی: (ئەوانە سەرپێچیان کـردووە). بێگومـان لـە پێغەمبـەرەوە (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: (رۆژووگـرتن لـە سـەفەردا لەکردەوە چاکەکان نیە).

## دەربارەی رۆژووگرتن لەسەفەردا رێگە پێ دراوە

- بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ

٧١١ - (صـحيح) حَـدَّثَنَا هَـارُونُ بْـنُ إِسْـحَاقَ الهَمْـدَانِيُّ، قَـال: حَـدَّثَنَا عَبْـدَةُ بْـنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَسْلَمِيَّ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، وَكَانَ يَسْرُدُ الصَّوْمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، وَحَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَسْلَمِيِّ. حَدِيثُ عَائِشَةَ أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە حـەمزەی ئەسـلەمی زۆربـەی رۆژەکـانی سـاڵ بـەرۆژوو دەبـوو دەربـارەی رۆژووگـرتن لەسـەفەردا، لـە پێغەمبەری خوای (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی؟ فەرمووی: (ئـارەزووی خۆتـە ئەگـەر ویستت بەڕۆژوو بە، ئەگەر ئارەزوت لێ نەبوو بەڕۆژوو مەبە).

٧١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ أَبِي مَسْلَمَةَ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَال: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ، فَمَا يَعِيبُ عَلَى الصَّائِمِ صَوْمَهُ، وَلاَ عَلَى الْمُفْطِرِ إِفْطَارَهُ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لـە مـانگی ڕەمەزاندا سەفەرمان دەکرد، هەمان بوو بەڕۆژوو دەبوو، هەشمان بوو بەڕۆژوو نەدەبوو، ڕەخنەمان لەیەکتر نەدەگرت کە تۆ بۆ بەڕۆژوویت و تۆش بۆ بەڕۆژوو نیت.

٧١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَال: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَال: حَدَّثَنَا الجُرَيْرِيُّ (ح) وَحَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَال: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، فَلاَ يَجِدُ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ، وَلاَ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، فَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّهُ مَنْ وَجَدَ قُوَّةً فَصَامَ فَحَسَنٌ، وَمَنْ وَجَدَ ضَعْفًا فَأَفْطَرَ فَحَسَنٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لـە مـانگی ڕەمەزاندا سەفەرمان دەکرد، هەمان بوو بەڕۆژوو دەبوو، هەشمان بوو بەڕۆژوو نەدەبوو، کەسمان توڕە نەدەبووین لەوی ترمان، پێیان وابوو ئەوەی توانای هەبێت بەڕۆژوو بێت ئەوە کارێکی چاکە، ئەوەی توانای نەبێت بەڕۆژوو بێ و ڕۆژوو نەگرێ ئەوەش هەر کارێکی چاکە.

## دەربارەی جەنگاوەر رێگەی پێ دراوە بەرۆژوو نەبێت

### ٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ لِلْمُحَارِبِ فِي الإِفْطَارِ

٧١٤ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ مَعْمَرِ بْنِ أَبِي حَبِيبَةَ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّهُ سَأَلَهُ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، فَحَدَّثَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزْوَتَيْنِ فِي رَمَضَانَ يَوْمَ بَدْرٍ، وَالفَتْحِ، فَأَفْطَرْنَا فِيهِمَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. حَدِيثُ عُمَرَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ أَمَرَ بِالفِطْرِ فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ نَحْوُ هَذَا، إِلاَّ أَنَّهُ رَخَّصَ فِي الإِفْطَارِ عِنْدَ لِقَاءِ العَدُوِّ، وَبِهِ يَقُولُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئیبنو مەسەییەبەوە دەگێڕنەوە، کە پرسیاری کرد دەربارەی رۆژووگرتن لەسەفەردا، ئیبنو مەسەییەب گێڕایەوە، کە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەشداری دوو غەزامان کرد، جەنگی بەدر و رزگارکردنی شاری مەککە، لە هەردووکیاندا بەرۆژوو نەبوین.

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە غەزایەکدا فەرمانی کرد بە ڕۆژوو شکاندن.

لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ وێنەی ئەمە دەگێرنەوە، ئەوەندە هەیە لەکاتی جەنگ و ڕوبەڕوبونەوەی دوژمن دا ڕۆژوو شکاندن رێگەی پێ دراوە، هەندێ لە زانایان ئەمە دەفەرموون.

## ئافرەتی سك پڕ و شیردەر رێگەی پێ دراوە بەرۆژوو نەبێت

## ٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي الإِفْطَارِ لِلْحُبْلَى وَالمُرْضِعِ

٧١٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَيُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو هِلاَلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَوَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبٍ قَال: أَغَارَتْ عَلَيْنَا خَيْلُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَوَجَدْتُهُ يَتَغَدَّى، فَقَال: ادْنُ فَكُلْ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَال: ادْنُ أُحَدِّثْكَ عَنِ الصَّوْمِ، أَوِ الصِّيَامِ، إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ، وَشَطْرَ الصَّلاَةِ، وَعَنِ الحَامِلِ أَوِ الْمُرْضِعِ الصَّوْمَ أَوِ الصِّيَامَ، وَاللَّهِ لَقَدْ قَالَهُمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِلَيْهِمَا أَوْ إِحْدَاهُمَا، فَيَا لَهْفَ نَفْسِي أَنْ لاَ أَكُونَ طَعِمْتُ مِنْ طَعَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ. حَدِيثُ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الكَعْبِيِّ حَدِيثٌ حَسَنٌ وَلاَ نَعْرِفُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ هَذَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ الوَاحِدِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: الحَامِلُ، وَالمُرْضِعُ، تُفْطِرَانِ وَتَقْضِيَانِ وَتُطْعِمَانِ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ، وَمَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: تُفْطِرَانِ، وَتُطْعِمَانِ، وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِمَا، وَإِنْ شَاءَتَا قَضَتَا، وَلاَ إِطْعَامَ عَلَيْهِمَا، وَبِهِ يَقُولُ إِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ کە پیاوێ بوو لە بەنی (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی کەعب، برای بەنی قوشەیر، - ئەمە ئەو ئەنەسە نیە کە خزمەتی پێغەمبەری (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەکرد - دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: کۆمەڵێ ئەسپ سواری پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دایان بەسەر قەومکەماندا، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەوکاتەدا خواردنی دەخوارد، فەرمووی: (دانیشە خواردنمان لەگەڵ نۆش بکە). وتم: من بەرۆژووم،

فەرمووی: (دانیشە هەتا باسی نوێژ و رۆژووت بۆ بکەم، بەڕاستی خوای گەورە لەسەر موسافیر رۆژوو نیوەی نوێژی لاداوە، وە لەسەر ئافرەتی شیردەر و سك پڕیش رۆژووی هەڵگرتوە). راوی وتی: سوێند بە (الله) پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئافرەتی شیردەر و سك پڕی فەرموو یان یەکێکیانی فەرموو، زۆر بەداخەوەم لە خواردنەکەی پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەخوارد، خۆزگە لێم بخواردایە.

هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئافرەتی شیردەر و سك پڕ بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن لەپاشدا بیگرنەوە، یان لە بریتی دا خواردن بدەن بە هەژاران، پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و مالیك و شافیعی و ئەحمەد ئەمە دەفەرموون.

هەندێکی تر لە زانایان دەفەرموون: ئافرەتی شیردەر و سك پڕ بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن و خواردن بدەن بە هەژاران، رۆژووگرتنەوەیان لەسەر نیە، ئەگەر توانایان هەبوو بیگرنەوە، خواردن دانیان بە هەژاران لەسەر نیە، پێشەوا ئیسحاق ئەمە دەفەرمووێ.

## دەربارەی رۆژووگرتن بۆ کەسی مردوو

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّوْمِ عَنِ الْمَيِّتِ

٧١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، وَمُسْلِمٍ البَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَعَطَاءٍ، وَمُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: إِنَّ أُخْتِي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُخْتِكِ دَيْنٌ أَكُنْتِ تَقْضِينَهُ، قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: فَحَقُّ اللهِ أَحَقُّ. وَفِي البَابِ عَنْ بُرَيْدَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

ئافرەتێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتی: خوشكەكەم مردووە دوو مانگ رۆژووی لەسەریەك قەرزارە، فەرمووی: (ئایا ئەگەر خوشكەكەت قەرزاری خەڵك بێ تۆ بۆی نابژێری)، وتی: بەڵێ بۆی دەبژێرم، فەرمووی: (دەی مافی خوای گەورە لەپێشترە). - كەواتە دوو مانگ رۆژووەكەی بۆ بگرەوە -.

٧١٧ - حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ الأَعْمَشِ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا: يَقُولُ جَوَّدَ أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ هَذَا الحَدِيثَ عَنِ الأَعْمَشِ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَقَدْ رَوَى غَيْرُ أَبِي خَالِدٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، مِثْلَ رِوَايَةِ أَبِي خَالِدٍ. وَرَوَى أَبُو مُعَاوِيَةَ وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ البَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ سَلَمَةَ بْنَ كُهَيْلٍ، وَلاَ عَنْ عَطَاءٍ، وَلاَ عَنْ مُجَاهِدٍ. وَاسْمُ أَبِي خَالِدٍ سُلَيْمَانُ بْنُ حَيَّانَ.

## دەربارەی كەفارەتی رۆژووگرتن

### ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ مِنَ الكَفَّارَةِ

٧١٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْثَرُ بْنُ القَاسِمِ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامُ شَهْرٍ، فَلْيُطْعَمْ عَنْهُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالصَّحِيحُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ مَوْقُوفٌ قَوْلُهُ وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا البَابِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُصَامُ عَنِ الْمَيِّتِ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ قَالاَ: إِذَا كَانَ عَلَى الْمَيِّتِ نَذْرُ صِيَامٍ يَصُومُ عَنْهُ، وَإِذَا كَانَ عَلَيْهِ قَضَاءُ رَمَضَانَ أَطْعَمَ عَنْهُ، وَقَالَ مَالِكٌ، وَسُفْيَانُ، وَالشَّافِعِيُّ: لاَ يَصُومُ أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ. وَأَشْعَثُ هُوَ ابْنُ سَوَّارٍ، وَمُحَمَّدٌ

هُوَ عِنْدِي ابْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس مرد رۆژووی مانگێ قەرزار بوو، با لەبریتیدا بۆ هەموو رۆژێ هەژارێ تێر بکرێت). - لەلایەن کەسوکاری مردووەکەوە -.

زانایان رایان جیاوازە لەوبارەوە، هەندێکیان دەفەرموون: رۆژووگرتن بۆ مردو دروستە، پێشەوایان ئیسحاق و ئەحمەد ئەمە دەفەرموون، دەڵێن: ئەگەر نەزری رۆژووی لەسەر بوو بۆی بگرنەوە، بەڵام ئەگەر رۆژووی مانگی رەمەزان قەرزار بوو لەبریتیدا بۆ هەموو رۆژێ هەژارێ تێر بکرێت. پێشەوایان مالیك و سوفیان و شافیعی دەفەرموون: کەس لەجیاتی کەس رۆژوو ناگرێتەوە.

## دەربارەی رشانەوەی ناچاری رۆژووەوان

٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّائِمِ يَذْرَعُهُ الْقَيْءُ

٧١٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ الْمُحَارِبِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثٌ لاَ يُفْطِرْنَ الصَّائِمَ: الحِجَامَةُ، وَالقَيْءُ، وَالاِحْتِلاَمُ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ حَدِيثٌ غَيْرُ مَحْفُوظٍ. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، وَعَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ مُرْسَلاً، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ سَمِعْتُ أَبَا دَاوُدَ السِّجْزِيَّ يَقُولُ: سَأَلْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، فَقَالَ:

أَخُوهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدٍ لاَ بَأْسَ بِهِ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَذْكُرُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمَدِينِيِّ قَالَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ثِقَةٌ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ضَعِيفٌ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَلاَ أَرْوِي شَيْئًا.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (سێ شت ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە: کەڵەشاخ، ڕشانەوەی ناچاری، شەیتانی بوون).

## دەربارەی خۆڕشاندنەوە بە ئەنقەست

## ٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ اسْتَقَاءَ عَمْدًا

٧٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ ذَرَعَهُ القَيْءُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَمَنْ اسْتَقَاءَ عَمْدًا فَلْيَقْضِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَثَوْبَانَ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ هِشَامٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِيسَى بْنِ يُونُسَ، وقَالَ مُحَمَّدٌ: لاَ أُرَاهُ مَحْفُوظًا. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلاَ يَصِحُّ إِسْنَادُهُ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَثَوْبَانَ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاءَ فَأَفْطَرَ، وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ صَائِمًا مُتَطَوِّعًا فَقَاءَ فَضَعُفَ فَأَفْطَرَ، لِذَلِكَ هَكَذَا رُوِيَ فِي بَعْضِ الحَدِيثِ مُفَسَّرًا، وَالعَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ عَلَى حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ الصَّائِمَ إِذَا ذَرَعَهُ القَيْءُ فَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِ، وَإِذَا اسْتَقَاءَ عَمْدًا، فَلْيَقْضِ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەوکەسەی بە ناچاری بڕشێتەوە ڕۆژووگرتنەوەی لەسەر نیە، بەڵام ئەوەی بە ئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە دەبێ ڕۆژووەکەی بگرێتەوە).

واتە: لە ئەبو (درداء) و (ثوبان) و (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕشاوەتەوە و ژووەکەی شکاندووە. بێگومان مانای ئەمە ئاوایە: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕۆژووی سوننەتی گرتووە ڕشاوەتەوە و ژووەکەی شکاندووە.

## ڕژووەوان لەیادی بچێ خواردن و خواردنەوە بخوات

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّائِمِ يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ نَاسِيًا

٧٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ نَاسِيًا وَهُوَ صَائِمٌ فَلاَ يُفْطِرْ، فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەو کەسەی لەیادی چوو بە ڕۆژووە خواردن و خواردنەوە بخوات با ڕۆژووەکەی نەشکێنێ، چونکە ئەوە ڕۆزیەکە خوای گەورە پێی بەخشیوە).

٧٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ عَوْفٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، وَخِلاَسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ، أَوْ نَحْوَهُ.

وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَأُمِّ إِسْحَاقَ الغَنَوِيَّةِ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: إِذَا أَكَلَ فِي رَمَضَانَ نَاسِيًا فَعَلَيْهِ القَضَاءُ، وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

## دەربارەی رژوو شکاندن بە ئەنقەست

### ٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِفْطَارِ مُتَعَمِّدًا

٧٢٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْمُطَوِّسِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ وَلاَ مَرَضٍ، لَمْ يَقْضِ عَنْهُ صَوْمُ الدَّهْرِ كُلِّهِ وَإِنْ صَامَهُ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: أَبُو الْمُطَوِّسِ: اسْمُهُ يَزِيدُ بْنُ الْمُطَوِّسِ وَلاَ أَعْرِفُ لَهُ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ رۆژێ رۆژووی مانگی رەمەزان بشکێنێ بە بێ روخسەتێ لەو روخسەتانەی کە خوای گەورە دایناون — وەك نەخۆشی و سەفەر - ، ئەوە هەموو ساڵەکە بەرۆژوو بێ جێگەی — خێر و پاداشتی - ئەو رۆژەی بۆ ناگرێتەوە).

## کەفارەتی رۆژوو شکاندنی لەمانگی رەمەزاندا

### ٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَفَّارَةِ الفِطْرِ فِي رَمَضَانَ

٧٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، وَأَبو عَمَّارٍ وَالمعْنَى وَاحِدٌ وَاللَّفْظُ لَفْظُ أَبِي عَمَّارٍ قَالاَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَال: أَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَال: يَا رَسُولَ اللهِ هَلَكْتُ. قَال: وَمَا أَهْلَكَكَ؟، قَال: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ، قَال: هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُعْتِقَ رَقَبَةً؟، قَال: لاَ، قَال: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟، قَال: لاَ، قَال: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟، قَال: لاَ، قَال: اجْلِسْ، فَجَلَسَ، فَأُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، وَالعَرَقُ الْمِكْتَلُ الضَّخْمُ، قَال: تَصَدَّقْ بِهِ، فَقَال: مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَحَدٌ أَفْقَرَ مِنَّا، قَال: فَضَحِكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، قَال: فَخُذْهُ، فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ فِي مَنْ أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ مُتَعَمِّدًا مِنْ جِمَاعٍ، وَأَمَّا مَنْ أَفْطَرَ مُتَعَمِّدًا مِنْ أَكْلٍ أَوْ شُرْبٍ، فَإِنَّ أَهْلَ العِلْمِ قَدْ اخْتَلَفُوا فِي ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَلَيْهِ القَضَاءُ، وَال كَفَّارَةُ، وَشَبَّهُوا الأَكْلَ وَالشُّرْبَ بِالجِمَاعِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: عَلَيْهِ القَضَاءُ وَلاَ كَفَّارَةَ عَلَيْهِ، لأَنَّهُ إِنَّمَا ذُكِرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الكَفَّارَةُ فِي الجِمَاعِ وَلَمْ تُذْكَرْ عَنْهُ فِي الأَكْلِ وَالشُّرْبِ، وَقَالُوا: لاَ يُشْبِهُ الأَكْلُ وَالشُّرْبُ الجِمَاعَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: وَقَوْلُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلرَّجُلِ الَّذِي أَفْطَرَ فَتَصَدَّقَ عَلَيْهِ خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ يَحْتَمِلُ هَذَا مَعَانِيَ: يَحْتَمِلُ أَنْ تَكُونَ الكَفَّارَةُ عَلَى مَنْ قَدَرَ عَلَيْهَا، وَهَذَا رَجُلٌ لَمْ يَقْدِرْ عَلَى الكَفَّارَةِ، فَلَمَّا أَعْطَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا وَمَلَكَهُ، فَقَالَ الرَّجُلُ: مَا أَحَدٌ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنَّا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ: خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ، لأَنَّ الكَفَّارَةَ إِنَّمَا تَكُونُ بَعْدَ الفَضْلِ عَنْ قُوتِهِ. وَاخْتَارَ الشَّافِعِيُّ لِمَنْ كَانَ عَلَى مِثْلِ هَذَا الحَالِ أَنْ يَأْكُلَهُ وَتَكُونَ الكَفَّارَةُ عَلَيْهِ دَيْنًا، فَمَتَى مَا مَلَكَ يَوْمًا مَا كَفَّرَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: لـە مـانگی رەمـەزاندا پیاوێ لەمزگەوت هاتە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فـەوتاوم کـارێکی وەهـام کـردوە شایستەی ئەوەم بە ئاگر بسوتێم، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فـەرمووی: (چی فەوتاندویتی؟) وتی: بەرۆژوو بووم و لەگەڵ ژنەکەمدا جـوت بـووم، پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئـەتوانی بەندەیـە رزگـار بکـەی؟)، وتـی: نـەخێر، فەرمووی: (ئەتوانی دوو مانگ لەسەریەك بەرۆژوو بیت؟)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (ئەتوانی خواردنی سی هەژار بدەی؟)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (دانیشـە). ئـەویش دانیشت، لەوکاتەدا پیاوێ زەنبیلەیەکی گەورە خورمای هێنـا بـۆ پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: (ئەمە ببەو برۆ بیبەخشە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیکەم بە خێـر و بیـدەم بـە خـەڵکانی تـر لەکاتێکـدا کـە لەناو شاری مەدینەدا لەمن هەژار تری تێدا نیە، خۆم و خانەوادەکـەم زۆر موحتـاج و هەژارین و هیچمان نیە بیخۆین، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەنـدە پێکەنی هەتا ددانەکانی بەشی پێشـەوەی دەرکـەوتن، فـەرمووی: (باشـە بـرۆ بیبـە خۆت و خانەوادەکەت بیخۆن).

بە پەیرەوکردنی فەرموودەکە هەرکەس بـە ئەنقەسـت رۆژووی مـانگی رەمـەزان بشکێنێ ئیتر بە خواردن و خواردنەوە بێت یان بە کـاری جـووت بـوون بـێ، زانایـان رایان جیاوازە لەوبارەوە، هەندێکی دەفەرموون: دەبـێ بیگرێتـەوەو کەفارەتەکەشـی

بدات، خواردن و خواردنـەوەیان چـواندووە بـە کـاری جـووت بـوون، ئەمـەش وتـەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و ئیسحاقە.

هەندێکی تریان دەفەرموون: دەبێ بیگرێتەوەو کەفارەتی لەسەر نیە، چونکە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی کەفارەتی کاری جـووت بـوون دەگێڕنـەوە، باسی کەفارەتی خواردن و خواردنەوە ناگێڕنەوە، دەفەرموون: کـاری جـووت بـوون و خـواردن و خواردنـەوە ناچـوێنرێن بـە یـەك، ئەمـەش وتـەی پێشـەوایان شـافیعی و ئەحمەدە.

پێشەو شافیعی دەفەرمووێ: فەرموودەکـەی پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (ئەمە ببەو دەرخـواردی خانەوادەکـەتی بـدە). ئیحتیمالـە بـۆ کەسـێ بێـت توانای ماڵی هەبێت، کابرا هەژاربوو توانای نەبوو، وتی: کەس لەمن هەژار تر نیە، بۆیـە پێـی فـەرموو: (ئەمـە ببـەو دەرخـواردی خانەوادەکـەتی بـدە). ئـەوەی ئـەو حاڵەتەی هەبێ بۆی هەیە لێی بخوات، کەفارەتەکەی قەرزە لە گەردنیـدا هـەر رۆژێ دەسەڵاتی هەبوو بیدات.

## بەکارهێنانی سیواك لەلایەن رۆژووەوانەوە

### ٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السِّوَاكِ لِلصَّائِمِ

٧٢٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لاَ أُحْصِي يَتَسَوَّكُ وَهُوَ صَائِمٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. حَدِيثُ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ بِالسِّوَاكِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا، إِلاَّ أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ العِلْمِ كَرِهُوا السِّوَاكَ لِلصَّائِمِ بِالعُودِ

وَالرُّطَبِ، وَكَرِهُوا لَهُ السِّوَاكَ آخِرَ النَّهَارِ، وَلَمْ يَرَ الشَّافِعِيُّ بِالسِّوَاكِ بَأْسًا أَوَّلَ النَّهَارِ وَلاَ آخِرَهُ، وَكَرِهَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ السِّوَاكَ آخِرَ النَّهَارِ.

واتە: لە عامیری کوڕی رەبیعەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی بەرۆژوو بوو سیواکی دەکرد، ئەوەندەم دیوە لە ژمارە نایەت. موسەددەد ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئەوەندە سیواکی دەکرد لە ژمارە نەدەهات.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان پێیان وایە بەکارهێنانی سیواك لەلایەن رۆژووەوانەوە هیچی تێدا نیە و دروستە، بەڵام هەندێکیان بەکارهێنانی سیواکی تەڕیان پێ باش نیە، هەروەها بەکارهێنانی سیواکیان پێ باش نیە لەکۆتایی رۆژدا، بەلای پێشەوا شافیعیەوە دروستە هەرکاتێ بەکاربهێنرێت، بەڵام پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق بەکارهێنانی سیواکیان پێ باش نیە لەکۆتایی رۆژدا.

## بەکارهێنانی کل لەلایەن رۆژووەوانەوە

٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكُحْلِ لِلصَّائِمِ

٧٢٦ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ وَاصِلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَطِيَّةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاتِكَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: اشْتَكَتْ عَيْنِي، أَفَأَكْتَحِلُ وَأَنَا صَائِمٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي رَافِعٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ، وَلاَ يَصِحُّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا البَابِ شَيْءٌ، وَأَبُو عَاتِكَةَ يُضَعَّفُ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الكُحْلِ لِلصَّائِمِ: فَكَرِهَهُ بَعْضُهُمْ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَرَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي الكُحْلِ لِلصَّائِمِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، سکاڵای کرد وتی: قوربان چاو ئێشەم هەیە، بە ڕۆژووم ئایا کل بەکاربهێنم؟ فەرمووی: (بەڵێ).

زانایان رایان جیاوازە لەسەر بەکارهێنانی کل لەلایەن ڕۆژووەوانەوە، هەندێکیان پێیان باش نیە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیان و ئیبنو موبارەك و ئەحمەد و ئیسحاقە. بەلاّم هەندێکی تریان ڕێگەیان پێداوە، ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیە.

## دەربارەی ماچکردن لەلایەن ڕۆژووەوانەوە

٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ

٧٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَقُتَيْبَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُقَبِّلُ فِي شَهْرِ الصَّوْمِ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَحَفْصَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ فِي القُبْلَةِ لِلصَّائِمِ: فَرَخَّصَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي القُبْلَةِ لِلشَّيْخِ، وَلَمْ يُرَخِّصُوا لِلشَّابِّ مَخَافَةَ أَنْ لاَ يَسْلَمَ لَهُ صَوْمُهُ، وَالمُبَاشَرَةُ عِنْدَهُمْ أَشَدُّ. وَقَدْ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: القُبْلَةُ تُنْقِصُ الأَجْرَ وَلاَ تُفْطِرُ الصَّائِمَ، وَرَأَوْا أَنَّ لِلصَّائِمِ إِذَا مَلَكَ نَفْسَهُ أَنْ يُقَبِّلَ، وَإِذَا لَمْ يَأْمَنْ عَلَى نَفْسِهِ تَرَكَ القُبْلَةَ لِيَسْلَمَ لَهُ صَوْمُهُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەمانگی رەمەزاندا لەگەڵ ئەوەشدا كە بە رۆژوو بوو ژنەكانی خۆی ماچ دەكرد.

زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان جیاوازە لەسەر ماچكردن لەلایەن رۆژووەوانەوە، هەندێ لە هاوەڵان بۆ كەسی بەتەمەن رێگەیان پێ داوە، بەڵام بۆ گەنج نا لەترسی ئەوەی نەوەكا رۆژووەكەی سەلامەت نەبێ و بەتاڵ بێتەوە، توند تر بوون لەسەر دەستبازی و ماچكردن چونكە مەترسی زیاتری هەیە بۆ سەر رۆژووەكە.

هەندێكی تر لە زانایان دەفەرموون: ماچكردن دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی خێر و پاداشت، رایان وایە ئەگەر توانی خۆی بگرێ با ماچی هاوسەرەكەی خۆی بكات، ئەگەر نەیتوانی خۆی بەدوربگرێت با رۆژووەكەی سەلامەت بێ، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و شافیعییە.

## دەست بازی و ماچكردن لەلایەن رۆژووەوانەوە

٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مُبَاشَرَةِ الصَّائِمِ

٧٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُبَاشِرُنِي وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرۆژوو دەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ماچ و موچ و یاری لەگەڵ دەكردم، بەڵام ئەو لە هەمووتان زیاتر نەفسی خۆی پێ رادەگیرا. - واتە ئەوەی توانای خۆراگرتنی نەبوو بۆی دروست نیە ئەو كارە بكات - .

٧٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، وَالأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو مَيْسَرَةَ: اسْمُهُ عَمْرُو بْنُ شُرَحْبِيلَ، وَمَعْنَى لِإِرْبِهِ: لِنَفْسِهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرۆژوو دەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ماچ و موچ و یاری لەگەڵ هاوسەرەکانی دەکرد، بەڵام ئەو لە هەمووتان زیاتر نەفسی خۆی پێ رادەگیرا.

## هەرکەس لەشەودا نیەت و عەزمی نەبێ رۆژووەکەی دروست نیە

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يَعْزِمْ مِنَ اللَّيْلِ

٧٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَفْصَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الفَجْرِ، فَلاَ صِيَامَ لَهُ. وَ أَصَحُّ، وَهَكَذَا أَيْضًا رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ الزُّهْرِيِّ مَوْقُوفًا وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَفَعَهُ إِلاَّ يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ. وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ طُلُوعِ الفَجْرِ فِي رَمَضَانَ، أَوْ فِي قَضَاءِ رَمَضَانَ، أَوْ فِي صِيَامِ نَذْرٍ، إِذَا لَمْ يَنْوِهِ مِنَ اللَّيْلِ، لَمْ يُجْزِهِ، وَأَمَّا صِيَامُ التَّطَوُّعِ، فَمُبَاحٌ لَهُ أَنْ يَنْوِيَهُ بَعْدَ مَا أَصْبَحَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە حەفصەی هاوسەری پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس

لەپێش بەیان(فجری صادق)دا نیەتی بەرۆژوو بوونی نەبێت و عەزمی لەسەری نەبێ ئەوە رۆژووەکەی دروست نیە).

ئەمە بۆ رۆژووی فەرزە بەڵام بۆ رۆژووی سوننەت لەدوای رۆژبوونەوەش هەر دروستە، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رۆژووی سوننەت شکاندن

## ٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِفْطَارِ الصَّائِمِ الْمُتَطَوِّعِ

٧٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنِ ابْنِ أُمِّ هَانِئٍ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ قَالَتْ: كُنْتُ قَاعِدَةً عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ نَاوَلَنِي فَشَرِبْتُ مِنْهُ، فَقُلْتُ: إِنِّي أَذْنَبْتُ فَاسْتَغْفِرْ لِي، فَقَالَ: وَمَا ذَاكِ؟، قَالَتْ: كُنْتُ صَائِمَةً، فَأَفْطَرْتُ، فَقَالَ: أَمِنْ قَضَاءٍ كُنْتِ تَقْضِينَهُ، قَالَتْ: لاَ، قَالَ: فَلاَ يَضُرُّكِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعَائِشَةَ.

واتە: لە ئوممو هانیئەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دانیشتبووم، خوارنەوەیان بۆ هێنا لێی خواردەوە، لەپاشدا دایەوە دەستم منیش لێم خواردەوە، وتم: من تاوانێکم کرد داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکە، فەرمووی: (چی بووە؟). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرۆژوو بووم بەڵام رۆژووەکەم شکاند، فەرمووی: (رۆژووی فەرز بوو گرتوتەتەوە؟). وتی: نەخێر، رۆژووی سوننەت بوو، فەرمووی: (دەی هیچ کاریگەری نیە بۆت و زیانت پێ ناگەیەنێت). - ئەگەر رۆژووی فەرز بێ ئەوە دەبێ لە جیاتیدا رۆژێکی تر بگیرێتەوە -.

٧٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: كُنْتُ أَسْمَعُ سِمَاكَ بْنَ حَرْبٍ يَقُولُ: أَحَدُ بَنِي أُمِّ هَانِئٍ حَدَّثَنِي فَلَقِيتُ أَنَا أَفْضَلَهُمْ وَكَانَ اسْمُهُ جَعْدَةَ، وَكَانَتْ أُمُّ هَانِئٍ جَدَّتَهُ، فَحَدَّثَنِي عَنْ جَدَّتِهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا فَدَعَا بِشَرَابٍ فَشَرِبَ، ثُمَّ نَاوَلَهَا فَشَرِبَتْ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَمَا إِنِّي كُنْتُ صَائِمَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الصَّائِمُ الْمُتَطَوِّعُ أَمِينُ نَفْسِهِ، إِنْ شَاءَ صَامَ، وَإِنْ شَاءَ أَفْطَرَ. قَالَ شُعْبَةُ: فَقُلْتُ لَهُ، أَأَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ أُمِّ هَانِئٍ؟ قَالَ: لاَ، أَخْبَرَنِي أَبُو صَالِحٍ وَأَهْلُنَا عَنْ أُمِّ هَانِئٍ. وَرَوَى حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، فَقَالَ: عَنْ هَارُونَ ابْنِ بِنْتِ أُمِّ هَانِئٍ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ. وَرِوَايَةُ شُعْبَةَ أَحْسَنُ، هَكَذَا حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، عَنْ أَبِي دَاوُدَ، فَقَالَ: أَمِينُ نَفْسِهِ وحَدَّثَنَا غَيْرُ مَحْمُودٍ، عَنْ أَبِي دَاوُدَ، فَقَالَ: أَمِيرُ نَفْسِهِ، أَوْ أَمِينُ نَفْسِهِ عَلَى الشَّكِّ. وَهَكَذَا رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ شُعْبَةَ أَمِينُ أَوْ أَمِيرُ نَفْسِهِ عَلَى الشَّكِّ، وَحَدِيثُ أُمِّ هَانِئٍ فِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ، وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الصَّائِمَ الْمُتَطَوِّعَ إِذَا أَفْطَرَ فَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِ، إِلاَّ أَنْ يُحِبَّ أَنْ يَقْضِيَهُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە جەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چوو بۆ ماڵی ئوممو هانی - کە نەنکی جەعدە بوو — داوای خواردنەوەی کرد ئەویش بۆی هێنا لێی خواردەوە، لەپاشدا دایەوە دەستی ئەویش لێی خواردەوە، ئوممو هانی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) من بەرۆژوو بووم، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەو کەسەی ڕۆژووی سوننەت بگرێ بەدەستی خۆیەتی، ئەگەر ویستی لەسەر بێ بە

رۆژوو دەبێ، ئەگەر ویستیشی لەسەربێ بە رۆژوو نابێ). شوعبە فەرمووی: تۆ خۆت ئەمەت بیست لە ئوممو هانی؟ وتی نا، ئەبو صالح بۆی گێڕامەوە.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان وایە: شکاندنی رۆژووی سوننەت گرتنەوەی واجب نیە، مەگەر کەسەکە خۆی پێی خۆش بێ، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## رۆژووی سوننەت بەبێ نیەتهێنان لەشەودا

## ٣٥ - بَابُ صِيَامِ الْمُتَطَوِّعِ بِغَيْرِ تَبْيِيتٍ

٧٣٣ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَمَّتِهِ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا، فَقَال: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟، قَالَتْ: قُلْتُ: لاَ، قَال: فَإِنِّي صَائِمٌ

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: رۆژێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هات بۆلام، فەرمووی: (هیچ خواردنێکتان لایە بۆم بێنی بیخۆم). عائیشە وتی: وتم: نەخێر، فەرمووی: (دەی ئەوە ئەمرۆ من بەرۆژوو دەبم).

٧٣٤ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْتِينِي، فَيَقُولُ: أَعِنْدَكِ غَدَاءٌ؟، فَأَقُولُ: لاَ، فَيَقُولُ: إِنِّي

صَائِمٌ، قَالَتْ: فَأَتَانِي يَوْمًا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ قَدْ أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ، قَال: وَمَا هِيَ؟، قَالَتْ: قُلْتُ: حَيْسٌ، قَال: أَمَا إِنِّي قَدْ أَصْبَحْتُ صَائِمًا، قَالَتْ: ثُمَّ أَكَلَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هات بۆلام، فەرمووی: (هیچ خواردنێکت لایە بۆم بێنی بیخۆم). وتم: نەخێر، فەرمووی: (دەی ئەوە من بەرۆژووم). هەروەها عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ڕۆژێکی تر هات بۆلام وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دیاریەکیان بۆ هێناوین، فەرمووی: (چیە؟). وتم: (حیس)ە — تێکەڵەیە لە خورماو ڕۆن و کەشك —، فەرمووی: (ئەم بەیانیە بەرۆژوو بووم)، عائیشە فەرمووی: (لەپاشدا لێی خواردو ڕۆژووەکەی شکاند).

## دەربارەی ئەگەر ڕۆژووی شکاند دەبێ بیگرێتەوە

### ٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِيجَابِ القَضَاءِ عَلَيْهِ

٧٣٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَال: حَدَّثَنَا كَثِيرُ بْنُ هِشَامٍ، قَال: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ بُرْقَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ صَائِمَتَيْنِ، فَعُرِضَ لَنَا طَعَامٌ اشْتَهَيْنَاهُ فَأَكَلْنَا مِنْهُ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَبَدَرَتْنِي إِلَيْهِ حَفْصَةُ، وَكَانَتْ ابْنَةَ أَبِيهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا صَائِمَتَيْنِ، فَعُرِضَ لَنَا طَعَامٌ اشْتَهَيْنَاهُ فَأَكَلْنَا مِنْهُ، قَال: اقْضِيَا يَوْمًا آخَرَ مَكَانَهُ. وَرَوَى صَالِحُ بْنُ أَبِي الأَخْضَرِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ أَبِي حَفْصَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ مِثْلَ هَذَا، وَرَوَاهُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَمَعْمَرٌ، وَعُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَزِيَادُ بْنُ

سَعْدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الحُفَّاظِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ مُرْسَلاً، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ عُرْوَةَ، وَهَذَا أَصَحُّ لأَنَّهُ رُوِيَ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ قُلْتُ لَهُ: أَحَدَّثَكَ عُرْوَةُ عَنْ عَائِشَةَ؟ قَالَ: لَمْ أَسْمَعْ مِنْ عُرْوَةَ فِي هَذَا شَيْئًا، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ فِي خِلاَفَةِ سُلَيْمَانَ بْنِ عَبْدِ الْمَلِكِ مِنْ نَاسٍ، عَنْ بَعْضِ مَنْ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنْ هَذَا الحَدِيثِ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَلِيُّ بْنُ عِيسَى بْنِ يَزِيدَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ فَذَكَرَ الحَدِيثَ. وَقَدْ ذَهَبَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ فَرَأَوْا عَلَيْهِ القَضَاءَ إِذَا أَفْطَرَ وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: من و حەفصە بەرۆژوو بووین (رۆژووی سوننەت)، خواردنیان بۆ دانایین حەزمان لێ کردو خواردمان، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هات، حەفصە کچی باوکی خۆی بوو پێش من کەوت و فەرمووی: من عائیشە بەرۆژوو بووین خواردنیان بۆ دانایین حەزمان لێ کردو خواردمان، فەرمووی: (لەجیاتی ئەو رۆژەدا رۆژێکی تر بگرنەوە).

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان وایە: ئەگەر شکاندی دەبێ بیگرێتەوە، ئەمەش وتەی پێشەوا مالیکە.

## مانگی شەعبان و رەمەزان لەسەر یەك بەرۆژوو بوون

٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وِصَالِ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ

٧٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ

سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ إِلاَّ شَعْبَانَ وَرَمَضَانَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. حَدِيثُ أُمِّ سَلَمَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَ صِيَامًا مِنْهُ فِي شَعْبَانَ كَانَ يَصُومُهُ إِلاَّ قَلِيلاً بَلْ كَانَ يَصُومُهُ كُلَّهُ.

**واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو دەبوو جگە لە مانگی شەعبان و مانگی ڕەمەزان.**

**واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەرگیز نەمبینیوە لەهیچ مانگێکدا زۆر تر تێیدا بەرۆژوو بێت وەك مانگی شەعبان، هەندێ جار کەمێ لە مانگی شەعبان بە ڕۆژوو دەبوو، هەندێ جاریش هەموو مانگەکە بەڕۆژوو دەبوو واتە زۆربەی مانگەکە.**

٧٣٧ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ قَالَ فِي هَذَا الحَدِيثِ، هُوَ جَائِزٌ فِي كَلاَمِ العَرَبِ، إِذَا صَامَ أَكْثَرَ الشَّهْرِ أَنْ يُقَال: صَامَ الشَّهْرَ كُلَّهُ، وَيُقَالُ: قَامَ فُلاَنٌ لَيْلَهُ أَجْمَعَ، وَلَعَلَّهُ تَعَشَّى وَاشْتَغَلَ بِبَعْضِ أَمْرِهِ، كَأَنَّ ابْنَ الْمُبَارَكِ قَدْ رَأَى كِلاَ الحَدِيثَيْنِ مُتَّفِقَيْنِ، يَقُولُ: إِنَّمَا مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ أَنَّهُ كَانَ يَصُومُ أَكْثَرَ الشَّهْرِ. وَقَدْ رَوَى سَالِمٌ أَبُو النَّضْرِ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ نَحْوَ رِوَايَةِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو.

## بەرۆژووبوونی نیوەی کۆتایی مانگی شەعبان باش نیە لەپێناو رەمەزاندا

### ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّوْمِ فِي النِّصْفِ الْبَاقِي مِنْ شَعْبَانَ لِحَالِ رَمَضَانَ

٧٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا بَقِيَ نِصْفٌ مِنْ شَعْبَانَ فَلاَ تَصُومُوا. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ عَلَى هَذَا اللَّفْظِ، وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يَكُونَ الرَّجُلُ مُفْطِرًا، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ شَعْبَانَ شَيْءٌ أَخَذَ فِي الصَّوْمِ لِحَالِ شَهْرِ رَمَضَانَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا يُشْبِهُ قَوْلَهُمْ، حَيْثُ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَقَدَّمُوا شَهْرَ رَمَضَانَ بِصِيَامٍ، إِلاَّ أَنْ يُوَافِقَ ذَلِكَ صَوْمًا كَانَ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ. وَقَدْ دَلَّ فِي هَذَا الحَدِيثِ أَنَّمَا الكَرَاهِيَةُ عَلَى مَنْ يَتَعَمَّدُ الصِّيَامَ لِحَالِ رَمَضَانَ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر مانگی شەعبان نیوە بوو ئەوە رۆژوو مەگرن هەتا مانگی رەمەزان دێت).**

## دەربارەی شەوی نیوەی مانگی شەعبان

### ٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لَيْلَةِ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ

٧٣٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً فَخَرَجْتُ، فَإِذَا هُوَ بِالبَقِيعِ، فَقَالَ: أَكُنْتِ تَخَافِينَ أَنْ

يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي ظَنَنْتُ أَنَّكَ أَتَيْتَ بَعْضَ نِسَائِكَ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَنْزِلُ لَيْلَةَ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَيَغْفِرُ لأَكْثَرَ مِنْ عَدَدِ شَعْرِ غَنَمِ كَلْبٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ. حَدِيثُ عَائِشَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ الحَجَّاجِ، وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يُضَعِّفُ هَذَا الحَدِيثَ. وقَالَ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عُرْوَةَ، وَالحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: شەوێ پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێ ون بوو، لەماڵ دەرچووم دەبینم لە گۆڕستانی بەقیعە نزیکی ماڵی خۆمان، فەرمووی: (ئەوە ترسای خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ستەمت لێ بکەن؟). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وام ئەزانی چوویت بۆ لای یەکێ لە هاوسەرەکانت، فەرمووی: (خوای گەورە شەوی نیوەی شەعبان دێتە ئاسمانی دونیا، لە گوناهو تاوانی کەسانێ خۆش دەبێت کە زیاترن لە ژمارەی مووی مەڕەکانی هۆز و تیرەی بەنی کەلب).

## دەربارەی ڕۆژووی مانگی موحەڕەم

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ الْمُحَرَّمِ

٧٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحِمْيَرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللهِ الْمُحَرَّمُ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (چاکترین رۆژوو لەدوای رۆژووی مانگی رەمەزان رۆژووی مانگی موحەڕەمە).

٧٤١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: سَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: أَيُّ شَهْرٍ تَأْمُرُنِي أَنْ أَصُومَ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ، قَالَ لَهُ: مَا سَمِعْتُ أَحَدًا يَسْأَلُ عَنْ هَذَا، إِلاَّ رَجُلاً سَمِعْتُهُ يَسْأَلُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَنَا قَاعِدٌ عِنْدَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ شَهْرٍ تَأْمُرُنِي أَنْ أَصُومَ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ، قَالَ: إِنْ كُنْتَ صَائِمًا بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ فَصُمِ الْمُحَرَّمَ، فَإِنَّهُ شَهْرُ اللهِ، فِيهِ يَوْمٌ تَابَ فِيهِ عَلَى قَوْمٍ، وَيَتُوبُ فِيهِ عَلَى قَوْمٍ آخَرِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ پرسیاری لێ کرد وتی: لەدوای رۆژووی مانگی رەمەزان لە چی مانگێکی تردا فەرمانم پێ دەکەیت بە رۆژوو بم؟ پێی فەرموو: نەمبیستووە کەس ئەو پرسیارە بکات، جگە لە پیاوێ نەبێ ئەو پرسیارەی کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەکاتێکدا من لە خزمەتیدا بووم، لە وەڵامدا فەرمووی: (ئەگەر لەدوای رۆژووی مانگی رەمەزان بە رۆژوو دەبی مانگی موحەڕەم بە رۆژووبە، چونکە مانگی خوایە، رۆژێکی تێدایە خوای گەورە لەو رۆژەدا لە گەلێ خۆش بوو کە گەلی موسا بوو، هەر لەم رۆژەدا لە گەلانی تریش خۆش دەبێت).

## ئەوەی هاتووە سەبارەت بە رۆژووی هەینی

٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ يَوْمِ الجُمُعَةِ

٧٤٢ - (حسن) حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، وَطَلْقُ بْنُ غَنَّامٍ، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ مِنْ غُرَّةِ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَقَلَّمَا كَانَ يُفْطِرُ يَوْمَ الجُمُعَةِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ اسْتَحَبَّ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ صِيَامَ يَوْمِ الجُمُعَةِ، وَإِنَّمَا يُكْرَهُ أَنْ يَصُومَ يَوْمَ الجُمُعَةِ لاَ يَصُومُ قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ. وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ عَاصِمٍ هَذَا الحَدِيثَ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە (عبد الله)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە سەرەتای هەموو مانگێکەوە یان لەرۆژانی (أيام البيض)دا بەرِۆژوو دەبوو - کە دەکاتە سیانزەو چواردەو پانزەی هەموو مانگێکی عەرەبی -، کەم رۆژێکی هەینی بە رۆژوو نەدەبوو.

هەندێ لە زانایان رۆژووی رۆژی هەینیان پێ باشە، هەندێکی تریان رۆژووگرتنی رۆژی هەینییان پێ باش نیە، مەگەر کەسەکە رۆژێ پێشوو تر واتە رۆژی پێنج شەممە بەرِۆژوو بوو بێ، یان رۆژی دواتری لەگەڵ بگرێ واتە رۆژی شەممە.

## بەرِۆژوو بوون بە تەنیا باش نیە لەرۆژی هەینیدا

٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ صَوْمِ يَوْمِ الجُمُعَةِ وَحْدَهُ

٧٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَصُومُ أَحَدُكُمْ يَوْمَ

الجُمُعَةِ إِلاَّ أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَجَابِرٍ، وَجُنَادَةَ الأَزْدِيِّ، وَجُوَيْرِيَةَ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: يَكْرَهُونَ لِلرَّجُلِ أَنْ يَخْتَصَّ يَوْمَ الجُمُعَةِ بِصِيَامٍ، لاَ يَصُومُ قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لە ئێوە رۆژی هەینی بە رۆژوو نەبێ، مەگەر رۆژێ پێشتر بەڕۆژوو بوو بێ، یان رۆژی دواتری لەگەڵ بگرێ).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان بە لایانەوە باش نیە رۆژی هەینی تایبەت بکرێت بۆ رۆژووگرتن، مەگەر رۆژێ پێشتر یان رۆژی دواتری لەگەڵ بێ، پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

## دەربارەی بەڕۆژوو بوون لەرۆژی شەممەدا باش نیە

٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ صَوْمِ يَوْمِ السَّبْتِ

٧٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ حَبِيبٍ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ، عَنْ أُخْتِهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلاَّ فِيمَا افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلاَّ لِحَاءَ عِنَبَةٍ أَوْ عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضُغْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَمَعْنَى كَرَاهَتِهِ فِي هَذَا: أَنْ يَخُصَّ الرَّجُلُ يَوْمَ السَّبْتِ بِصِيَامٍ، لأَنَّ اليَهُودَ تُعَظِّمُ يَوْمَ السَّبْتِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بوسرەوە، لە خوشکیەوە، رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (رۆژی شەممان

بەرۆژوو مەبن مەگەر ئەوەی کە خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەرتان، ئەگەر هیچتان دەست نەکەوت بیخۆن جگە لە تلّپی دەنکە ترێیەك یان پەلکە دارێك ئەوا ئەوە بجون و بیخۆن و بەرۆژوو مەبن).

مەبەستی لەوەی کە پیاو رۆژی شەممان تایبەت بکات بۆ رۆژووگرتن کە باش نیە ئەمەیە: جولەکەکان رۆژی شەممە بەرز رادەگرن و بەلایانەوە گەورە و پیرۆزە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رۆژووی دوو شەممەو پێنج شەممە

٤٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ يَوْمِ الاِثْنَيْنِ وَالخَمِيسِ

٧٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ، عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ الفَلاَّسُ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دَاوُدَ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ رَبِيعَةَ الجُرَشِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَحَرَّى صَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَالخَمِيسِ. وَفِي البَابِ عَنْ حَفْصَةَ، وَأَبِي قَتَادَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگەڕا بەدوای رۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممەدا بۆ ئەوەی بە رۆژوو بێت، بە هیوای خێر و پاداشتی ئەو دوو رۆژە مشوری دەخوارد).

٧٤٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، وَمُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ السَّبْتَ، وَالأَحَدَ، وَالاِثْنَيْنِ، وَمِنَ الشَّهْرِ

الآخَرِ الثُّلاَثَاءَ، وَالأَرْبِعَاءَ، وَالخَمِيسَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَرَوَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ سُفْيَانَ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مانگێکدا ڕۆژانی شەممە و یەك شەممە و دوو شەممە بە ڕۆژوو دەبوو، لەمانگی دواتردا ڕۆژانی سێ شەممە و چوار شەممە و پێنج شەممە بە ڕۆژوو دەبوو.

٧٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تُعْرَضُ الأَعْمَالُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَالخَمِيسِ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي هَذَا البَابِ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لە ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممەدا کاروکردەوەکان ڕادەنوێنرێن و نمایش دەکرێن، بۆیە منیش پێم خۆشە کاتێ کە کردەوەکانم نیشان دەدرێن بە ڕۆژوو بم).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووی چوار شەممەو پێنج شەممە

## ٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ يَوْمِ الأَرْبِعَاءِ وَالخَمِيسِ

٧٤٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الجُرَيْرِيُّ، وَمُحَمَّدُ بْنُ مَدُّوَيْهِ قَالاَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا هَارُونُ بْنُ سَلْمَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مُسْلِمٍ القُرَشِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ، أَوْ سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صِيَامِ الدَّهْرِ؟

فَقَالَ: إِنَّ لأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، صُمْ رَمَضَانَ، وَالَّذِي يَلِيهِ، وَكُلَّ أَرْبِعَاءَ وَخَمِيسٍ، فَإِذَا أَنْتَ قَدْ صُمْتَ الدَّهْرَ وَأَفْطَرْتَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. حَدِيثُ مُسْلِمٍ القُرَشِيِّ حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَرَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ هَارُونَ بْنِ سَلْمَانَ، عَنْ مُسْلِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە (عُبَيْدِ الله)ی موسلیمی قورەشیەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ڕۆژانی دوانزە مانگەی ساڵ بە ڕۆژوو بوون، پرسیارم کرد – یان پرسیار کرا – لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: (خانەوادەکەت هەق مافی لەسەرتە دەبێ هەق و مافی ئەوانیش جێبەجێ بکەیت)، لەپاشدا فەرمووی: (مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بە، لەگەڵ ئەوەی بەدوایدا دێت، لەگەڵ هەموو چوار شەممەو پێنج شەممەیە، وەك ئەوە وایە ڕۆژانی دوانزە مانگەی ساڵ بەڕۆژوو بیت) - مەبەستی لە مانگی شەوال یان شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بوو، هەموو مانگی شەوال نەسەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بەڵکو شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال فەرمودەی لەسەرە - ، وە هەموو چوار شەممەو پێنج شەممەیە بەڕۆژوو بە، چوار شەممە نەسەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بەڵام پێنج شەممە فەرمودەی زۆری لەسەرە -.

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە

٤٦ – بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ

٧٤٩ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْبَدٍ الزِّمَّانِيِّ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ

وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. حَدِيثُ أَبِي قَتَادَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدِ اسْتَحَبَّ أَهْلُ العِلْمِ صِيَامَ يَوْمِ عَرَفَةَ، إِلاَّ بِعَرَفَةَ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئومێد دەکەم لە خوای گەورە کە رۆژووی رۆژی عەرەفە ببێتە کەفارەتی گوناهی ساڵی پێشو و ساڵی داهاتوو). زانایان رۆژووی رۆژی عەرەفەیان بەلاوە پەسەند و باشە جگە لە رۆژووی ئەو کەسەی کە لە عەرەفەیە.

## رۆژووی ئەو کەسەی لەعەرەفەیە باش نیە

٤٧ - بَابُ كَرَاهِيَةِ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَةَ

٧٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفْطَرَ بِعَرَفَةَ، وَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ أُمُّ الفَضْلِ بِلَبَنٍ فَشَرِبَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأُمِّ الفَضْلِ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: حَجَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَصُمْهُ، يَعْنِي يَوْمَ عَرَفَةَ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَمَعَ عُمَرَ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَمَعَ عُثْمَانَ فَلَمْ يَصُمْهُ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: يَسْتَحِبُّونَ الإِفْطَارَ بِعَرَفَةَ لِيَتَقَوَّى بِهِ الرَّجُلُ عَلَى الدُّعَاءِ، وَقَدْ صَامَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ يَوْمَ عَرَفَةَ بِعَرَفَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە عەرەفە بەرۆژوو نەبوو، ئوممو (الفَضْل) شیری بۆ نارد لێی خواردەوە.

لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و (عثمان)دا رەزای خوایان لێ بێ حەجم کردووە، هیچ کامیان لە حەج رۆژی عەرەفە بە رۆژوو نەدەبوون.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان بە رۆژوو نەبوونی رۆژی عەرەفەیان لە عەرەفە پێ باشە، بۆ ئەوەی حاجیەکان بە هێز بن و توانای پاڕانەوەیان باشتر هەبێت، هەندێ لە زانایانی تر لە عەرەفە بە رۆژوو دەبوون.

٧٥١ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عُمَرَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ: حَجَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَمَعَ عُمَرَ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَمَعَ عُثْمَانَ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَأَنَا لاَ أَصُومُهُ، وَلاَ آمُرُ بِهِ، وَلاَ أَنْهَى عَنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رَجُلٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبُو نَجِيحٍ: اسْمُهُ يَسَارٌ وَقَدْ سَمِعَ مِنْ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو نەجیحەوە، لە باوکیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی بە رۆژوو بوونی رۆژی عەرەفە لە عەرەفە پرسیار کرا لە ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ؟ فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و (عثمان)دا رەزای خوایان لێ بێ حەجم کردووە، هیچ کامیان لە عەرەفە بە رۆژوو نەدەبوون، من بۆ خۆم هەرگیز لە عەرەفە بە رۆژوو نابم، نە فەرمانی پێ دەکەم و نە ڕێگریشی لێ دەکەم.

## دەربارەی خەختکردنەوە لەسەر ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا

### ٤٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَثِّ عَلَى صَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ

٧٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْبَدٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَمُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ، وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَهِنْدِ بْنِ أَسْمَاءَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَالرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَلَمَةَ الخُزَاعِيِّ، عَنْ عَمِّهِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ. ذَكَرُوا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ حَثَّ عَلَى صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ. لاَ نَعْلَمُ فِي شَيْءٍ مِنَ الرِّوَايَاتِ أَنَّهُ قَالَ: صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ كَفَّارَةُ سَنَةٍ، إِلاَّ فِي حَدِيثِ أَبِي قَتَادَةَ. وَبِحَدِيثِ أَبِي قَتَادَةَ، يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئومێد دەکەم لە خوای گەورە کە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا دەی مانگی موحەڕەم ببێتە کەفارەتی گوناهی ساڵی پێشوو).

## دەربارەی ڕێگەدان بە بە ڕۆژوو نەبوون لە ڕۆژی عاشورادا

### ٤٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ صَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ

٧٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ عَاشُورَاءُ يَوْمًا تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ، صَامَهُ وَأَمَرَ النَّاسَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا افْتُرِضَ رَمَضَانُ كَانَ رَمَضَانُ هُوَ الفَرِيضَةُ، وَتَرَكَ

عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَقَيْسِ بْنِ سَعْدٍ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَمُعَاوِيَةَ. وَالعَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ عَلَى حَدِيثِ عَائِشَةَ، وَهُوَ حَدِيثٌ صَحِيحٌ، لاَ يَرَوْنَ صِيَامَ يَوْمِ عَاشُورَاءَ وَاجِبًا، إِلاَّ مَنْ رَغِبَ فِي صِيَامِهِ لِمَا ذُكِرَ فِيهِ مِنَ الفَضْلِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: عاشـورا دەی مانگی موحەڕم ڕۆژی بوو قورەیش لەسەردەمی نەفامی دا لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبوون، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەشریفی بردە مەدینە لـەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبوو، فەرمانی دەکرد بە خەڵك بـەڕۆژوو بـن، کـاتێ کـە مـانگی ڕەمەزان فەرز کـرا، تـەرکی ڕۆژووی عاشـورای کـرد، ئـیتر ئـەوەی بیویسـتایە لـەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبوو، ئەوەشی بیویستایە بەڕۆژوو نەدەبوو.

## دەربارەی ڕۆژی عاشورا چ ڕۆژێکە

٥٠ - بَابُ مَا جَاءَ عَاشُورَاءُ أَيُّ يَوْمٍ هُوَ

٧٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَأَبُو كُرَيْبٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ حَاجِبِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ الأَعْرَجِ، قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ رِدَاءَهُ فِي زَمْزَمَ، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، أَيُّ يَوْمٍ أَصُومُهُ؟ قَالَ: إِذَا رَأَيْتَ هِلاَلَ الْمُحَرَّمِ فَاعْدُدْ، ثُمَّ أَصْبِحْ مِنَ التَّاسِعِ صَائِمًا، قَالَ: فَقُلْتُ: أَهَكَذَا كَانَ يَصُومُهُ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: نَعَمْ.

واتـە: لـە حەکـەمی کـوڕی ئەعرەجـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: لە مزگەوتی حەرام چومە خزمەت ئیبنو عـەباس ڕەزای خوایـان لـێ

بێ لەسەر پۆشاکەکەی شانی دادابوو، وتم: هەواڵی ڕۆژووی ڕۆژی عاشورام پێ ڕابگەیەنە، چ ڕۆژێ بەڕۆژوو بم؟ فەرمووی: کاتێ کە مانگی یەك شەوەی مانگی موحەڕەمت دی: ڕۆژەکان بژمێرە، ڕۆژی نۆیەم بەڕۆژوو بە: وتم: موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاوەها بەڕۆژوو دەبوو؟ فەرمووی: بەڵێ.

٧٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِصَوْمِ عَاشُورَاءَ يَوْمُ عَاشِرٍ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي يَوْمِ عَاشُورَاءَ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: يَوْمُ التَّاسِعِ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: يَوْمُ العَاشِرِ، وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَال: صُومُوا التَّاسِعَ وَالعَاشِرَ وَخَالِفُوا اليَهُودَ. وَبِهَذَا الحَدِيثِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی کرد بە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا لەدەی مانگی موحەڕەمدا.

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر ڕۆژی عاشورا، هەندێکیان دەفەرموون: ڕۆژی نۆیەمی مانگی موحەڕەمە، هەندێکی تریان دەفەرموون: ڕۆژی دەی مانگی موحەڕەمە.

لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژی نۆ و دەی مانگی موحەڕەم بەڕۆژوو بن، سەرپێچی جولەکەکان بکەن. پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

## دەربارەی رۆژووی دەی مانگی (ذي الحجة)

### ٥١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ العَشْرِ

٧٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَائِمًا فِي العَشْرِ قَطُّ. هَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ. وَرَوَى الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُهُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يُرَ صَائِمًا فِي العَشْرِ. وَرَوَى أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ، عَنِ الأَسْوَدِ، وَقَدْ اخْتَلَفُوا عَلَى مَنْصُورٍ فِي هَذَا الحَدِيثِ، وَرِوَايَةُ الأَعْمَشِ أَصَحُّ وَأَوْصَلُ إِسْنَادًا. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ أَبَانَ يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا يَقُولُ: الأَعْمَشُ أَحْفَظُ لِإِسْنَادِ إِبْرَاهِيمَ مِنْ مَنْصُورٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نۆ رۆژی سەرەتای مانگی (ذو الحجة)دا بەرۆژوو بێت.

## دەربارەی گەورەیی کردەوەی چاك لەو دە رۆژەدا

### ٥٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العَمَلِ فِي أَيَّامِ العَشْرِ

٧٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ هُوَ البَطِينُ وَهُوَ ابْنُ أَبِي عِمْرَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ أَيَّامٍ العَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ العَشْرِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَلاَ الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَلاَ الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ، إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هیچ رۆژێ نیە وەك دە رۆژی یەکەمی مانگی (ذو الحجة) — واتە نۆمینەی حاجیان - کردەوەی چاکیان تێدا خۆشەویست بێ بەلای خوای گەورەوە)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جیهادو تێکۆشانیش لەرێگەی خوای گەورەدا؟ فەرمووی: (تەنانەت جیهادو تێکۆشانیش لەرێگەی خوای گەورەدا، مەگەر کەسێ بە خۆی و ماڵ و سامانیەوە بڕوات بۆ جیهادو خۆی بکوژرێت و ماڵ و سامانەکەی بڕوات).

٧٥٨ – (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ نَافِعٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَسْعُودُ بْنُ وَاصِلٍ، عَنْ نَهَّاسِ بْنِ قَهْمٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا مِنْ أَيَّامٍ أَحَبُّ إِلَى اللهِ أَنْ يُتَعَبَّدَ لَهُ فِيهَا مِنْ عَشْرِ ذِي الحِجَّةِ، يَعْدِلُ صِيَامُ كُلِّ يَوْمٍ مِنْهَا بِصِيَامِ سَنَةٍ، وَقِيَامُ كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْهَا بِقِيَامِ لَيْلَةِ القَدْرِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مَسْعُودِ بْنِ وَاصِلٍ، عَنِ النَّهَّاسِ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا، عَنْ هَذَا الحَدِيثِ فَلَمْ يَعْرِفْهُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ مِثْلَ هَذَا. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً شَيْءٌ مِنْ هَذَا. وَقَدْ تَكَلَّمَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ فِي نَهَّاسِ بْنِ قَهْمٍ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پەرستشی هیچ رۆژێ نیە بەلای خوای گەورەوە خۆشەویست بێ وەك پەرستشی دە رۆژی یەکەمی مانگی (ذو الحجة)، خێری

ڕۆژووی هەر ڕۆژێکی بەرامبەر خێری ڕۆژووی ساڵێکە، خێری شەونوێژی هەر شەوێکی بەرامبەر شەونوێژی شەو قەدرە).

## دەربارەی ڕۆژووی شەش ڕۆژی مانگی شەوال

### ٥٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ

٧٥٩ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَثَوْبَانَ. حَدِيثُ أَبِي أَيُّوبَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ اسْتَحَبَّ قَوْمٌ صِيَامَ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ بِهَذَا الحَدِيثِ. قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: هُوَ حَسَنٌ هُوَ مِثْلُ صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ. قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: وَيُرْوَى فِي بَعْضِ الحَدِيثِ وَيُلْحَقُ هَذَا الصِّيَامُ بِرَمَضَانَ، وَاخْتَارَ ابْنُ الْمُبَارَكِ أَنْ تَكُونَ سِتَّةَ أَيَّامٍ فِي أَوَّلِ الشَّهْرِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ قَالَ: إِنْ صَامَ سِتَّةَ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ مُتَفَرِّقًا فَهُوَ جَائِزٌ. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، وَسَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا. وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ وَرْقَاءَ بْنِ عُمَرَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ هَذَا الحَدِيثَ، وَسَعْدُ بْنُ سَعِيدٍ هُوَ أَخُو يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ فِي سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئەیوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ، لەپاشدا شەش ڕۆژی مانگی شەوال بەدوایدا بگرێت، وەك ئەوە وایە دوانزە مانگەی ساڵ بەڕۆژوو بێت).

بە پێی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان رۆژووی شەش رۆژی مانگی شەوالیان پێ باشە، ئیبنو موبارەك دەفەرموێت: ئەمە کارێکی چاکە، وەك سێ رۆژ رۆژوو وایە لە مانگێکدا، سەرەتای مانگی هەڵبژاردووە، ئەگەر بە جیاش بێ ئەوەش بەلایەوە هەر دروستە.

(صحيح الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الحُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ الجُعْفِيُّ، عَنْ إِسْرَائِيلَ أَبِي مُوسَى، عَنِ الحَسَنِ البَصْرِيِّ قَالَ: كَانَ إِذَا ذُكِرَ عِنْدَهُ صِيَامُ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ، فَيَقُولُ: وَاللَّهِ لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ بِصِيَامِ هَذَا الشَّهْرِ عَنِ السَّنَةِ كُلِّهَا.

ئەگەر لەخزمەت پێشەوا حەسەنی بەصریدا باسی شەش رۆژی رۆژووی شەوال بکرایە، دەیفەرموو: سوێند بە (الله) خوای گەورە لەهەموو سوننەتەکانی ساڵ زیاتر پێی رازیە.

## دەربارەی سێ رۆژ رۆژوو لەهەموو مانگێکدا

٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ

٧٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ أَبِي الرَّبِيعِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: عَهِدَ إِلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثَةً: أَنْ لاَ أَنَامَ إِلاَّ عَلَى وِتْرٍ، وَصَوْمَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَأَنْ أُصَلِّيَ الضُّحَى.

واتە: لە ئەبو هوریرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئامۆژگاری کردوم بە ئەنجامدانی سێ شت کە تەرکیان نەکەم: نوێژی ویتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم، لە مانگێکدا سێ رۆژ بە رۆژوو بم، نوێژی چێشتەنگاویش بکەم.

٧٦١ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَال: أَنْبَأَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَال: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ سَامٍ، يُحَدِّثُ عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، قَال: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا أَبَا ذَرٍّ، إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَصُمْ ثَلاَثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَقُرَّةَ بْنِ إِيَاسٍ الْمُزَنِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي عَقْرَبٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ، وَقَتَادَةَ بْنِ مِلْحَانَ، وَعُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ، وَجَرِيرٍ. حَدِيثُ أَبِي ذَرٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ فِي بَعْضِ الحَدِيثِ: أَنَّ مَنْ صَامَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ كَانَ كَمَنْ صَامَ الدَّهْرَ.

واتە: لە موسای کوڕی (طَلْحَةَ)وە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئەبو (ذر) بوو ڕەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەی ئەبو (ذر)، ئەگەر سێ ڕۆژ ڕۆژووت گرت لە مانگێکدا، ڕۆژانی سانزە و چواردە و پانزە بە ڕۆژوو بە. لە فەرموودەدا هاتووە: هەرکەس لە مانگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت وەك ئەوە وایە دوانزە مانگەی ساڵ بەڕۆژوو بێت.

٧٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَامَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقَ ذَلِكَ فِي كِتَابِهِ: (مَنْ جَاءَ بِالحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا) اليَوْمُ بِعَشْرَةِ أَيَّامٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي شِمْرٍ، وَأَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو (ذر)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەس لە مانگێکدا سێ

رۆژ بە رۆژوو بێت، وەك ئەوە وایە دوانزە مانگەی ساڵ بەرۆژوو بێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە و ئەوەی سەلماند و بەراستی دانا: (مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا). سورة الأنعام: ١٦٠. واتە: هەرکەس چاکەیە بکات ئەوە (لە رۆژی دوایی‌دا) دە ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە. رۆژێ بەرامبەر بە دە رۆژ.

٧٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يَزِيدَ الرِّشْكِ، قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاذَةَ قَالَتْ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قُلْتُ: مِنْ أَيِّهِ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: كَانَ لاَ يُبَالِي مِنْ أَيِّهِ صَامَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيَزِيدُ الرِّشْكُ هُوَ يَزِيدُ الضُّبَعِيُّ وَهُوَ يَزِيدُ بْنُ الْقَاسِمِ وَهُوَ الْقَسَّامُ، وَالرِّشْكُ هُوَ الْقَسَّامُ بِلُغَةِ أَهْلِ الْبَصْرَةِ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی ریشکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئەبو (معاذة) بوو فەرمووی: وتم بە عائیشە رەزای خوای لێ بێ: ئایا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە هەموو مانگێکدا سێ رۆژ بە رۆژوو دەبوو؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: لە چ رۆژێکی مانگدا بە رۆژوو دەبوو؟ فەرمووی: هەر رۆژێ بوایە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی رۆژوو

٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّوْمِ

٧٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مُوسَى الْقَزَّازُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ

رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ رَبَّكُمْ يَقُولُ: كُلُّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وَالصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ. وَلَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَإِنْ جَهِلَ عَلَى أَحَدِكُمْ جَاهِلٌ وَهُوَ صَائِمٌ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ. وَفِي البَابِ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، وَكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، وَسَلاَمَةَ بْنِ قَيْصَرٍ، وَبَشِيرِ ابْنِ الخَصَاصِيَةِ، وَاسْمُ بَشِيرٍ زَحْمُ بْنُ مَعْبَدٍ، وَالخَصَاصِيَةُ هِيَ أُمُّهُ. وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (پاداشتی هەموو چاکەیە یەك بە دەیە هەتا یەك بە حەوت سەد زیاتر، ڕۆژوو بۆ منە، خۆشم پاداشتی ڕۆژووەوان دەدەمەوە، ڕۆژوو قەڵغانە بۆ دۆزەخ، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لەلای خوای پەروەردگار لەبۆنی میسك خۆشترە، ئەگەر یەکێ لە ئێوە بەڕۆژوو بوو کەسێ جنێوی پێ دا یان شەڕی لەگەڵ کرد با بڵێ: من بەڕۆژووم).

٧٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَبَابًا يُدْعَى الرَّيَّانَ، يُدْعَى لَهُ الصَّائِمُونَ، فَمَنْ كَانَ مِنَ الصَّائِمِينَ دَخَلَهُ، وَمَنْ دَخَلَهُ لَمْ يَظْمَأْ أَبَدًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لە بەهەشتدا دەرگایە هەیە پێی دەوترێت ڕەیان، ڕۆژووەوانان لەو دەرگاوە بانگ دەکرێن، جا هەرکەس لە ڕۆژووەوانان بوو ئەوە لەوێوە دەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسێك لەوێوە چووە ژوورەوە هەرگیز تینوی نابێت).

٧٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ حِينَ يُفْطِرُ، وَفَرْحَةٌ حِينَ يَلْقَى رَبَّهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بۆ رۆژووەوان دوو خۆشی و شادی هەیە: کاتێ کە رۆژوو دەشکێنێ لە برسێتی تینوێتی رزگاری دەبێ، کاتێکیش کە بە دیداری پەروەردگاری شاد دەبێت).

## دەربارەی بەرۆژووبوونی ساڵ دوانزە مانگە

### ٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ الدَّهْرِ

٧٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْبَدٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ بِمَنْ صَامَ الدَّهْرَ؟ قَالَ: لاَ صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ، أَوْ لَمْ يَصُمْ وَلَمْ يُفْطِرْ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَأَبِي مُوسَى. حَدِيثُ أَبِي قَتَادَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ صِيَامَ الدَّهْرِ، وَقَالُوا: إِنَّمَا يَكُونُ صِيَامُ الدَّهْرِ إِذَا لَمْ يُفْطِرْ يَوْمَ الفِطْرِ، وَيَوْمَ الأَضْحَى، وَأَيَّامَ التَّشْرِيقِ، فَمَنْ أَفْطَرَ هَذِهِ الأَيَّامَ فَقَدْ خَرَجَ مِنْ حَدِّ الكَرَاهِيَةِ، وَلاَ يَكُونُ قَدْ صَامَ الدَّهْرَ كُلَّهُ. هَكَذَا رُوِيَ عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ نَحْوًا مِنْ هَذَا، وَقَالاَ: لاَ يَجِبُ أَنْ يُفْطِرَ أَيَّامًا غَيْرَ هَذِهِ الخَمْسَةِ الأَيَّامِ الَّتِي نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْهَا يَوْمِ الفِطْرِ، وَيَوْمِ الأَضْحَى، وَأَيَّامِ التَّشْرِيقِ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەلاتەوە چۆنە کەسێك هەموو ڕۆژێکی ژیانی بەڕۆژوو بێت؟ فەرمووی: (ئەوە نە ڕۆژووەکەی تەواوە، وە نە ڕۆژوو شکاندنەکەشی تەواوە - موخالەفەی سوننەی کردووە - ).

زانایان ئەمەیان پێ باش نیە، هەندێکیان ڕێگەیان پێ داوە بەمەرجێ ڕۆژی یەکەمی جەژنی ڕەمەزان و چوار ڕۆژی جەژنی قوربان بەڕۆژوو نەبێت، لە پێشەوا مالیکەوە دەگێڕنەوە کە هەمان ڕای هەبووە، ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیە.

## دەربارەی بەڕۆژووبوونی بەردەوام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ

٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سَرْدِ الصَّوْمِ

٧٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَال: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صِيَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَفْطَرَ، قَالَتْ: وَمَا صَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا كَامِلاً إِلاَّ رَمَضَانَ وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شەقیقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ فەرمووی: جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو هەتا دەمانوت ئیتر بەردەوام هەر بەڕۆژوو دەبێت، جاری واش هەبوو ئەوەندە بەڕۆژوو نەدەبوو هەتا دەمانوت: ئیتر ڕۆژوو ناگرێت، فەرمووی: هەرگیز

نەمبینیوە ڕۆژووی هیچ مانگێ تەواو بکات جگە لەمانگی ڕەمەزان.

٧٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ صَوْمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: كَانَ يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى نَرَى أَنَّهُ لاَ يُرِيدُ أَنْ يُفْطِرَ مِنْهُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَرَى أَنَّهُ لاَ يُرِيدُ أَنْ يَصُومَ مِنْهُ شَيْئًا، وَكُنْتَ لاَ تَشَاءُ أَنْ تَرَاهُ مِنَ اللَّيْلِ مُصَلِّيًا إِلاَّ رَأَيْتَهُ مُصَلِّيًا، وَلاَ نَائِمًا إِلاَّ رَأَيْتَهُ نَائِمًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پرسیاری لێ کرا؟ فەرمووی: مانگی وا دەبوو ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو لەدڵی خۆمانا دەمانوت: وا دیارە ئەم مانگە هەمووی بەڕۆژوو دەبێت، مانگی واش دەبوو ئەوەندە بەڕۆژوو نەدەبوو لەدڵی خۆمانا دەمانوت: وا دیارە ئەم مانگە هیچ ڕۆژێکی بەڕۆژوو نابێت، هەرکاتێ بتویستایە و حەزت بکردایە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەبینی شەو نوێژ دەکات ئیللا دەتبینی شەو نوێژ دەکات، هەرکاتێکیش بتویستایە و حەزت بکردایە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەبینی خەوتوە ئیللا دەتبینی کە خەوتوە.

٧٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ مِسْعَرٍ، وَسُفْيَانَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي الْعَبَّاسِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَفْضَلُ الصَّوْمِ صَوْمُ أَخِي دَاوُدَ كَانَ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَلاَ يَفِرُّ إِذَا لاَقَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو الْعَبَّاسِ هُوَ الشَّاعِرُ الْمَكِّيُّ وَاسْمُهُ: السَّائِبُ بْنُ فَرُّوخَ. قَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ أَنْ تَصُومَ يَوْمًا وَتُفْطِرَ يَوْمًا، وَيُقَالُ: هَذَا هُوَ أَشَدُّ الصِّيَامِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (گەورەترین و باشترین ڕۆژوو ڕۆژووی داود پێغەمبەری برامە، ڕۆژێ بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو، کاتێ کە ڕوو بەڕووی دوژمنان دەبووەوە دامەزراو بوو هەڵنەئەهات). هەندێ لە زانایان دەفەرموون: گەورەترین و باشترین ڕۆژوو ڕۆژووی ڕۆژێ نا ڕۆژێکە.

## دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژی هەردوو جەژنەکە دروست نیە

٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّوْمِ يَوْمَ الفِطْرِ وَالنَّحْرِ

٧٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ، مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: شَهِدْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ فِي يَوْمِ النَّحْرِ بَدَأَ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الخُطْبَةِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْ صَوْمِ هَذَيْنِ اليَوْمَيْنِ، أَمَّا يَوْمُ الفِطْرِ فَفِطْرُكُمْ مِنْ صَوْمِكُمْ وَعِيدٌ لِلْمُسْلِمِينَ، وَأَمَّا يَوْمُ الأَضْحَى فَكُلُوا مِنْ لُحُومِ نُسُكِكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو عُبَيْدٍ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: اسْمُهُ سَعْدٌ وَيُقَالُ لَهُ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَزْهَرَ أَيْضًا، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَزْهَرَ هُوَ ابْنُ عَمِّ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ.

واتە: لە ئەبو عوبەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێشەوا عومەردا ڕەزای خوای لێ بێ ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان بووم، لەپێشەوە دوو ڕکات نوێژی جەژنی کرد لەپاشدا وتاری خوێندەوەو وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕۆژووی ڕۆژی هەردوو جەژنی

ڕەمەزان و قوربانی قەدەغەکردووە: جەژنی ڕەمەزان جەژنی موسوڵمانانە کۆتایی بەڕۆژوو گرتن بهێنن، جەژنی قوربانیش لەگۆشتی قوربانیەکانتان بخۆن.

٧٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صِيَامَيْنِ: يَوْمِ الأَضْحَى، وَيَوْمِ الفِطْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَعَمْرُو بْنُ يَحْيَى هُوَ ابْنُ عُمَارَةَ بْنِ أَبِي الحَسَنِ الْمَازِنِيُّ الْمَدِينِيُّ وَهُوَ ثِقَةٌ رَوَى لَهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَشُعْبَةُ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕێگری کردوە لە بەڕۆژوو بوونی دوو ڕۆژ: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان.

## ڕۆژووی سێ ڕۆژەی دوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان

### ٥٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّوْمِ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ

٧٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَوْمُ عَرَفَةَ، وَيَوْمُ النَّحْرِ، وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ، عِيدُنَا أَهْلَ الإِسْلَامِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَسَعْدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ، وَنُبَيْشَةَ، وَبِشْرِ بْنِ سُحَيْمٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ حُذَافَةَ، وَأَنَسٍ، وَحَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَسْلَمِيِّ، وَكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، وَعَائِشَةَ، وَعَمْرِو بْنِ العَاصِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَحَدِيثُ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ

العِلْمِ: يَكْرَهُونَ الصِّيَامَ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ، إِلاَّ أَنَّ قَوْمًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ رَخَّصُوا لِلْمُتَمَتِّعِ إِذَا لَمْ يَجِدْ هَدْيًا وَلَمْ يَصُمْ فِي العَشْرِ أَنْ يَصُومَ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ وَبِهِ يَقُولُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَأَهْلُ العِرَاقِ يَقُولُونَ مُوسَى بْنُ عَلِيٍّ، وَأَهْلُ مِصْرَ يَقُولُونَ مُوسَى بْنُ عُلِيٍّ، سَمِعْتُ قُتَيْبَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ اللَّيْثَ بْنَ سَعْدٍ يَقُولُ: قَالَ مُوسَى بْنُ عَلِيٍّ: لاَ أَجْعَلُ أَحَدًا فِي حِلٍّ صَغَّرَ اسْمَ أَبِي.

واتە: لە عوقبەی كوڕی عامیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەی ئەهلی ئیسلام ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی قوربانی كردن و سێ ڕۆژەی دوای یەكەم ڕۆژی جەژنی قوربان ئەم ڕۆژانە جەژنی ئێمەن، ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن واتە تێیاندا بەڕۆژوو مەبن).

## كەڵەشاخ گرتن بۆ ڕۆژووەوان باش نیە

٦٠ - بَابُ كَرَاهِيَةِ الحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ

٧٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ النَّيْسَابُورِيُّ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَيَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَارِظٍ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَفْطَرَ الحَاجِمُ وَالمحْجُومُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَسَعْدٍ، وَشَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، وَثَوْبَانَ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَعَائِشَةَ، وَمَعْقِلِ بْنِ سِنَانٍ، وَيُقَالُ: ابْنُ يَسَارٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي مُوسَى، وَبِلاَلٍ. وَحَدِيثُ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَذُكِرَ عَنْ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ أَنَّهُ قَالَ: أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا البَابِ حَدِيثُ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ. وَذُكِرَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ أَنَّهُ قَالَ: أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا البَابِ حَدِيثُ

ثَوْبَانَ، وَشَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ لأَنَّ يَحْيَى بْنَ أَبِي كَثِيرٍ رَوَى عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ الحَدِيثَيْنِ جَمِيعًا، حَدِيثَ ثَوْبَانَ، وَحَدِيثَ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: الحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ حَتَّى أَنَّ بَعْضَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ بِاللَّيْلِ، مِنْهُمْ: أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ، وَابْنُ عُمَرَ، وَبِهَذَا يَقُولُ ابْنُ الْمُبَارَكِ. سَمِعْتُ إِسْحَاقَ بْنَ مَنْصُورٍ يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ: مَنْ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ فَعَلَيْهِ القَضَاءُ. قَالَ إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ: وَهَكَذَا قَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا الزَّعْفَرَانِيُّ، قَال: وقَالَ الشَّافِعِيُّ: قَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ، وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَال: أَفْطَرَ الحَاجِمُ وَالمحْجُومُ وَلاَ أَعْلَمُ وَاحِدًا مِنْ هَذَيْنِ الحَدِيثَيْنِ ثَابِتًا، وَلَوْ تَوَقَّى رَجُلٌ الحِجَامَةَ وَهُوَ صَائِمٌ كَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ، وَلَوْ احْتَجَمَ صَائِمٌ لَمْ أَرَ ذَلِكَ أَنْ يُفْطِرَهُ. هَكَذَا كَانَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ بِبَغْدَادَ، وَأَمَّا بِمِصْرَ فَمَالَ إِلَى الرُّخْصَةِ وَلَمْ يَرَ بِالحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا، وَاحْتَجَّ بِأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ وَهُوَ مُحْرِمٌ صَائِمٌ.

**واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کەڵەشاخ گرو کەڵەشاخ لێ گیراو رۆژوویان دەشکێ ئەگەر بەرۆژوو بوون). - چونکە کەڵەشاخ گر بێ هێز دەکات، جاران خوێنەکەی بە دەم هەڵدەمژی، وە کەڵەشاخ لێ گریش - .**

## کەڵەشاخ گرتن ڕێگە پێ دراوە بۆ رۆژووەوان

٦١ - بَابُ مَا جَاءَ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

٧٧٥ - (صحيح: بلفظ: (...وَاحْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ هِلاَلٍ البَصْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، قَال: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ

قَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ صَائِمٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهَكَذَا رَوَى وَهِيبٌ نَحْوَ رِوَايَةِ عَبْدِ الوَارِثِ، وَرَوَى إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ مُرْسَلاً، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کەڵەشاخی بۆ خۆی کرد لەکاتێکدا کە لەئیحرامدا بوو وە بە رۆژووش بوو.

٧٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ، عَنْ مَيْمُونِ بْنِ مِهْرَانَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کەڵەشاخی کرد لەکاتێکدا کە بە رۆژووش بوو.

٧٧٧ - (منكر بهذا اللفظ) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ فِيمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَالمَدِينَةِ وَهُوَ مُحْرِمٌ صَائِمٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَجَابِرٍ، وأَنَسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ وَلَمْ يَرَوْا بِالحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەنێوان مەککەو مەدینەدا کەڵەشاخی کرد لەکاتێکدا کە لەئیحرامدا بوو وە بە رۆژووش بوو.

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان وایە کەڵەشاخ گرتن بۆ رۆژووەوان دروستە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و شافیعی و مالیکە.

## چەند رۆژێ لەسەریەك بەرۆژوو بوون باش نیە

٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الوِصَالِ لِلصَّائِمِ

٧٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، وَخَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ تُوَاصِلُوا، قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: إِنِّي لَسْتُ كَأَحَدِكُمْ، إِنَّ رَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَبَشِيرِ ابْنِ الخَصَاصِيَةِ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: كَرِهُوا الوِصَالَ فِي الصِّيَامِ. وَرُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ كَانَ يُوَاصِلُ الأَيَّامَ وَلاَ يُفْطِرُ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بەردەوام مەبن لەسەر رۆژووگرتن بەبێ ئەوەی بەربانگ بکەنەوە — دوو رۆژ لەسەریەك یان زیاتر - ، ئەگەر یەکێکتان ویستی بەردەوام بێت با هەتا پارشێو بەردەوام بێ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆ تۆ بەردەوام دەبیت؟ فەرمووی: (من وەك ئێوە نیم، من خوای گەورە تێرم دەکات و تینوێتیم دەشکێنێ).

## لەش گران هەتا بەیان دەدا بمێنێتەوە و بیەوێ بەڕۆژووش بێ

٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الجُنُبِ يُدْرِكُهُ الفَجْرُ وَهُوَ يُرِيدُ الصَّوْمَ

٧٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ، وَأُمُّ سَلَمَةَ، زَوْجَا النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُدْرِكُهُ الفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فَيَصُومُ. حَدِيثُ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَدْ قَالَ قَوْمٌ مِنَ التَّابِعِينَ: إِذَا أَصْبَحَ جُنُبًا يَقْضِي ذَلِكَ اليَوْمَ، وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە عائیشە و ئوممو سەلەمەوە کە هەردووکیان هاوسەری پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوون دەگێڕنەوە، کە فەرمویانە: بێگومان جاری وا دەبوو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەش گران دەبوو لە جووت بوون لەگەڵ ژنەکانی، بەو لەش گرانیەوە دەمایەوە هەتا بەیانی دەدا، لەپاشدا خۆی دەشت و، لەکاتی ئاسایی خۆیدا نوێژی بەیانی دەکردو بەڕۆژووش دەبوو.

## ئەگەر ڕۆژووەوانێ بانگ کرا بۆ نانخواردن بچێت

٦٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِجَابَةِ الصَّائِمِ الدَّعْوَةَ

٧٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ مَرْوَانَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَوَاءٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائِمًا، فَلْيُصَلِّ، يَعْنِي: الدُّعَاءَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە دەعوەت کرا بۆ نانخواردنێ با بچێت، ئەگەر بەڕۆژوو بوو بپاڕێتەوە بۆ خاوەن خوانەکە).

٧٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ صَائِمٌ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ. وَكِلاَ الحَدِيثَيْنِ فِي هَذَا البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە بەڕۆژوو بوو دەعوەت کرا بۆ نانخواردنێ، با بڵێت: من بەڕۆژووم).

## دروست نیە ژن بەبێ پرسی مێردەکەی بەڕۆژوو بێت

٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ صَوْمِ الْمَرْأَةِ إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا

٧٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَنَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ يَوْمًا مِنْ غَيْرِ شَهْرِ رَمَضَانَ، إِلاَّ بِإِذْنِهِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر ژن مێردەکەی لەماڵ

بوو جگە لەرۆژووی مانگی رەمەزان، دروست نیە بەبێ پرس و رەزامەندی ئەو بەرۆژوو بێت).

## دەربارەی دواخستنی قەزاکردنەوەی رۆژووی رەمەزان

٦٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَأْخِيرِ قَضَاءِ رَمَضَانَ

٧٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ السُّدِّيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ البَهِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا كُنْتُ أَقْضِي مَا يَكُونُ عَلَيَّ مِنْ رَمَضَانَ إِلاَّ فِي شَعْبَانَ، حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر رۆژووی رەمەزانم لەسەر بوایە، هەتا مانگی شەعبان دەهات نەم دەگرتەوە.

## فەزڵی کەسێ بە رۆژوو بێ و نانی رۆژووەوان بدات

٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّائِمِ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ

٧٨٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ لَيْلَى، عَنْ مَوْلاَتِهَا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الصَّائِمُ إِذَا أَكَلَ عِنْدَهُ الْمَفَاطِيرُ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ. وَرَوَى شُعْبَةُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ لَيْلَى، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ عُمَارَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ خۆی بە رۆژوو

بێ و نانی رۆژووەوان بدات مەلائیکە بۆی دەپاڕێنەوە).

٧٨٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ زَيْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ مَوْلاَةً لَنَا يُقَالُ لَهَا: لَيْلَى تُحَدِّثُ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ عُمَارَةَ بِنْتِ كَعْبٍ الأَنْصَارِيَّةِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا فَقَدَّمَتْ إِلَيْهِ طَعَامًا، فَقَالَ: كُلِي، فَقَالَتْ: إِنِّي صَائِمَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الصَّائِمَ تُصَلِّي عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ حَتَّى يَفْرُغُوا، وَرُبَّمَا قَالَ: حَتَّى يَشْبَعُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ.

واتە: لە ئوممو عەمارەی کچی کەعبی ئەنصاریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چووە بۆ مالّیان خواردنی بۆ دانا، فەرمووی: تۆش لێی بخۆ، ئوممو عەمارە وتی: من بە رۆژووم، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (هەر رۆژووەوانێ نانی لەلا بخۆن هەتا لە نان خواردن دەبنەوە یان تێر دەبن مەلائیکە بۆی دەپاڕێنەوە).

٧٨٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ مَوْلاَةٍ لَهُمْ يُقَالُ لَهَا: لَيْلَى، عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ بِنْتِ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ: حَتَّى يَفْرُغُوا أَوْ يَشْبَعُوا. وَأُمُّ عُمَارَةَ هِيَ جَدَّةُ حَبِيبِ بْنِ زَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ.

واتە: لە ئوممو عەمارەوە فەرموودەی پێشوو هاتووە، بەلاّم راوی لە فەرموودەکەیدا باسی: (هەتا لە نان خواردن دەبنەوە یان تێر دەبن)ی نەکرد.

## دەربارەی قەزاکردنەوەی رۆژوو لەلایەن ئافرەتی بێ نوێژەوە

### ٦٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَضَاءِ الحَائِضِ الصِّيَامَ دُونَ الصَّلاَةِ

٧٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَال: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ عُبَيْدَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنَّا نَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ نَطْهُرُ، فَيَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصِّيَامِ، وَلاَ يَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ مُعَاذَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَيْضًا وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ لاَ نَعْلَمُ بَيْنَهُمْ اخْتِلاَفًا، أَنَّ الحَائِضَ تَقْضِي الصِّيَامَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ. وَعُبَيْدَةُ هُوَ ابْنُ مُعَتِّبٍ الضَّبِّيُّ الكُوفِيُّ يُكْنَى أَبَا عَبْدِ الكَرِيمِ.

**واتـە: لـە عائیشـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا خۆیدا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بێ نوێژ دەبووین، لەپاشدا پاك دەبووینەوە، فەرمانی پێ دەکردین بە قەزاکردنەوەی رۆژوو، بەڵام فەرمانی پـێ نەدەکردین بە قەزاکردنەوەی نوێژ.**

## زێدەڕەوی لە ئاو وەردانە دەم و لوت لەلایەن رۆژووەوانەوە

### ٦٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ مُبَالَغَةِ الِاسْتِنْشَاقِ لِلصَّائِمِ

٧٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ بْنُ عَبْدِ الحَكَمِ الوَرَّاقُ، وَأَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمٍ قَال: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ كَثِيرٍ، قَال: سَمِعْتُ عَاصِمَ بْنَ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَال: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، أَخْبِرْنِي عَنِ الوُضُوءِ؟ قَال: أَسْبِغِ الوُضُوءَ، وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ، وَبَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ كَرِهَ أَهْلُ العِلْمِ السُّعُوطَ لِلصَّائِمِ، وَرَأَوْا أَنَّ ذَلِكَ يُفْطِرُهُ،

وَفِي الْحَدِيثِ مَا يُقَوِّي قَوْلَهُمْ.

واتە: لە (لقیط)ی كوڕی صەبرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فێری چۆنیەتی دەستنوێژگرتنم بكە، فەرمووی: (دەستنوێژێك بگرە بە جوانی و پەنجەت بهێنە بە ناو پەنجەكانتدا، بە توندی ئاو لەدەم و لوتت وەردە مەگەر بە ڕۆژوو بیت) - واتە ئەگەر بە ڕۆژوو بویت زێدەڕەوی مەكە نەوەك بچێتە قوڕگتەوە و ڕۆژووەكەت بەتاڵ بێتەوە - .

## كەسێ لەلای قەومێ دابەزی بابێ مۆڵەتی ئەوان بە ڕۆژوو نەبێت

٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ نَزَلَ بِقَوْمٍ فَلاَ يَصُومُ إِلاَّ بِإِذْنِهِمْ

٧٨٩ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ العَقَدِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ وَاقِدٍ الكُوفِيُّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ نَزَلَ عَلَى قَوْمٍ فَلاَ يَصُومَنَّ تَطَوُّعًا إِلاَّ بِإِذْنِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ لاَ نَعْرِفُ أَحَدًا مِنَ الثِّقَاتِ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ. وَقَدْ رَوَى مُوسَى بْنُ دَاوُدَ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الْمَدَنِيِّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوًا مِنْ هَذَا. وَهَذَا حَدِيثٌ ضَعِيفٌ أَيْضًا، وَأَبُو بَكْرٍ ضَعِيفٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ. وَأَبُو بَكْرٍ الْمَدِينِيُّ الَّذِي رَوَى عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: اسْمُهُ الفَضْلُ بْنُ مُبَشِّرٍ وَهُوَ أَوْثَقُ مِنْ هَذَا وَأَقْدَمُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەركەس لەلای قەومێ

دابەزی بۆ میوانی با بەبێ مۆڵەتی ئەوان رۆژووی سوننەت نەگرێت).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی ئیعتیكاف

### ٧١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاعْتِكَافِ

٧٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَعْتَكِفُ العَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَأَبِي لَيْلَى، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەتا خوای گەورە رۆحی كێشاو لەدنیا دەرچوو لە دە رۆژی كۆتایی مانگی رەمەزاندا ئیتیكافی دەكرد و شەو و رۆژ لە مزگەوت دەمایەوە.

٧٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الفَجْرَ، ثُمَّ دَخَلَ فِي مُعْتَكَفِهِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. رَوَاهُ مَالِكٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ مُرْسَلاً، وَرَوَاهُ الأَوْزَاعِيُّ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ،وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ يَقُولُونَ: إِذَا أَرَادَ الرَّجُلُ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الفَجْرَ، ثُمَّ دَخَلَ فِي مُعْتَكَفِهِ وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ فَلْتَغِبْ لَهُ الشَّمْسُ مِنَ اللَّيْلَةِ

الَّتِي يُرِيدُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهَا مِنَ الغَدِ وَقَدْ قَعَدَ فِي مُعْتَكَفِهِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ.

واتـە: لـە عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر بیویستایە ئیعتیكاف بكات نوێژی بـە یانی دەكرد، لەپاشدا دەچووە شوێنی ئیتیكاف كردنەكەیەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی شەوی قەدر

### ٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لَيْلَةِ القَدْرِ

٧٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُجَاوِرُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، وَيَقُولُ: تَحَرَّوْا لَيْلَةَ القَدْرِ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَأُبَيٍّ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَالفَلَتَانِ بْنِ عَاصِمٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أُنَيْسٍ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَبِلاَلٍ، وَعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَوْلُهَا: يُجَاوِرُ يَعْنِي: يَعْتَكِفُ وَأَكْثَرُ الرِّوَايَاتِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: التَمِسُوهَا فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ فِي كُلِّ وِتْرٍ. وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي لَيْلَةِ القَدْرِ أَنَّهَا لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَلَيْلَةُ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ، وَخَمْسٍ وَعِشْرِينَ، وَسَبْعٍ وَعِشْرِينَ، وَتِسْعٍ وَعِشْرِينَ، وَآخِرُ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: كَأَنَّ هَذَا عِنْدِي وَاللَّهُ أَعْلَمُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُجِيبُ عَلَى نَحْوِ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ، يُقَالُ لَهُ نَلْتَمِسُهَا فِي لَيْلَةِ كَذَا؟ فَيَقُولُ: التَمِسُوهَا فِي لَيْلَةِ كَذَا. قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَأَقْوَى الرِّوَايَاتِ عِنْدِي فِيهَا لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ أَنَّهُ: كَانَ يَحْلِفُ أَنَّهَا

لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، وَيَقُولُ: أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَلاَمَتِهَا فَعَدَدْنَا وَحَفِظْنَا. وَرُوِيَ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ أَنَّهُ قَالَ: لَيْلَةُ القَدْرِ تَنْتَقِلُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ بِهَذَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە دە ڕۆژی كۆتایی مانگی ڕەمەزاندا ئیعتیكافی دەكرد، لەپاشدا دەیفەرموو: (لە دە شەوی كۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن چونكە لەیەكێ لەو شەوانەدایە).

زۆربەی ریوایەتەكان كە لە پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: (لە شەوە تاكەكانی دە شەوی كۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن).

لە پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی شەوی قەدر دەگێڕنەوە، كە لەیەكێ لەم شەوانەدایە: (بێگومان شەوی بیست و یەك و بیست و سێ و بیست و پێنج و بیست و حەوت و بیست و نۆ كۆتا شەوی مانگی ڕەمەزان).

پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: بەهێزترین ریوایەت لای من شەوی بیست و یەكە.

لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە سوێندی خواردووە شەوی بیست و حەوتە، دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نیشانەكانی پێ ڕاگەیاندین، ئێمەش ژماردمان و لەبەرمان كردن.

٧٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، عَنْ

عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ قَالَ: قُلْتُ لأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّى عَلِمْتَ أَبَا الْمُنْذِرِ أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، قَالَ: بَلَى أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا لَيْلَةٌ صَبِيحَتُهَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ لَيْسَ لَهَا شُعَاعٌ، فَعَدَدْنَا، وَحَفِظْنَا وَاللهِ لَقَدْ عَلِمَ ابْنُ مَسْعُودٍ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، وَلَكِنْ كَرِهَ أَنْ يُخْبِرَكُمْ فَتَتَّكِلُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زیڕەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە ئوبەی کوڕی کەعبم ڕەزای خوای لێ بێ وت: ئەی ئەبا (منذر) بەچی بەڵگەیەکدا دەزانی کە شەوی بیست و حەوتە، فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی ڕاگەیاندین: (شەوێکە بەیانیەکەی کە خۆر هەڵدێ تیشکی نیە). ئێمەش ژماردمان و لەبەرمان کردن. سوێند بە (الله) ئیبنو مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەیزانی ئەو شەوە لە مانگی ڕەمەزاندایە و، شەوی بیست و حەوتیشە، بەڵام پێی باش نەبوو پێتان بڵێ و ئێوە پاڵی لێ بدەنەوەو هەر ئەو شەوە زیندوو بکەنەوە بە پەرستش شەوەکانی تر هەوڵ نەدەن.

٧٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُيَيْنَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ذُكِرَتْ لَيْلَةُ الْقَدْرِ عِنْدَ أَبِي بَكْرَةَ فَقَالَ: مَا أَنَا مُلْتَمِسُهَا لِشَيْءٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، فَإِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: الْتَمِسُوهَا فِي تِسْعٍ يَبْقَيْنَ، أَوْ فِي سَبْعٍ يَبْقَيْنَ، أَوْ فِي خَمْسٍ يَبْقَيْنَ، أَوْ فِي ثَلاثِ أَوَاخِرِ لَيْلَةٍ، وَكَانَ أَبُو بَكْرَةَ يُصَلِّي فِي الْعِشْرِينَ مِنْ رَمَضَانَ كَصَلاتِهِ فِي سَائِرِ السَّنَةِ، فَإِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ اجْتَهَدَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عویەینەی کوڕی (عبد الرحمن)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە، فەرمووی: لە خزمەت ئەبو بەکرەدا باسی شەوی قەدر کرا، فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو:

(لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا بەتایبەتی کۆتایی شەوە تاکەکانی شەوی نۆ و حەوت و پێنج واتە شەوی بیست و نۆ و بیست حەوت و بیست و پێنج). جا منیش بۆ هیچ شتێ کە بیستبێتم لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەندەی ئەوە هەوڵم بۆ نەداوەو نەگەڕاوم.

ئەبو بەکرە ڕەزای خوای لێ بێ لە بیستی ڕەمەزاندا وەك باقی ساڵەکە نوێژی دەکرد، بەڵام کە پێی نایە دە شەوی کۆتایی ئیتر هەوڵی زۆری دەداو ئەو شەوانەی بە پەرستش زیندوو دەکردەوە.

### باسێکی تر لەوبارەوە

٧٣- بَابٌ مِنْهُ

٧٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ هُبَيْرَةَ بْنِ يَرِيمَ، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُوقِظُ أَهْلَهُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بێگومان پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا خزمانی و خانەوادەکەی هەڵئەسان بۆ شەونوێژ و یادی خواو زیندوکردنەوەی شەوانی قەدر.

٧٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجْتَهِدُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مَا لاَ يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتــە: لــە عائیشــەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەنـدەی لـە دە شـەوی کۆتـایی مـانگی رەمەزانـدا خـۆی مانـدوو دەکـرد، لـە هـیچ کـاتێکی تـردا ئەوەنـدە خـۆی مانـدوو نەدەکرد.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رۆژوو لە زستاندا

٧٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّوْمِ فِي الشِّتَاءِ

٧٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ نُمَيْرِ بْنِ عَرِيبٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الغَنِيمَةُ البَارِدَةُ: الصَّوْمُ فِي الشِّتَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ مُرْسَلٌ عَامِرُ بْنُ مَسْعُودٍ لَمْ يُدْرِكِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ وَالِدُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَامِرٍ القُرَشِيِّ الَّذِي رَوَى عَنْهُ شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ.

واتــە: لــە عــامیری کــوڕی مەســعودەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویــەتی: (دەســتکەوتی ســارد: رۆژووە لە وەرزی زسـتاندا). - بەدەسـتهێنانی پاداشـتە بـەبێ ئـەرك و مانـدوبونی زۆر-.

## دەربارەی ئایەتی: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ).

٧٥ - بَابُ مَا جَاءَ: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ).

٧٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ،

عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَشَجِّ، عَنْ يَزِيدَ، مَوْلَى سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) كَانَ مَنْ أَرَادَ مِنَّا أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَيَزِيدُ هُوَ ابْنُ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ.

**واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ...) سورة البقرة: ١٨٤.**
**واتە: ئەوانەی کە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە — لەجیاتی ئەوە — خواردن بدەن بە هەژار و کەم دەستێك.**

**سەلەمە وتی: ئێمە بە ئارەزووی خۆمان بوو، ئەوەی ئارەزووی بوایە ڕۆژووی دەشکاند لەجیاتی ئەوە خواردنی هەژار و کەم دەستێکی دەدا، هەتا ئایەتی دوای ئەو هاتەخوارەوەو هەڵیوەشاندەوە: (فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ...). سورة البقرة: ١٨٥. واتە: جا هەرکەسێ لەئێوە هیلالی مانگی ڕەمەزانی بینی با بەڕۆژوو بێ...**

## ئەوەی بیەوێ سەفەر بکات نان بخوات و دەرچێ.

٧٦ - بَابُ مَنْ أَكَلَ ثُمَّ خَرَجَ يُرِيدُ سَفَرًا

٧٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّهُ قَالَ: أَتَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ فِي رَمَضَانَ وَهُوَ يُرِيدُ سَفَرًا، وَقَدْ رُحِلَتْ لَهُ رَاحِلَتُهُ، وَلَبِسَ ثِيَابَ السَّفَرِ، فَدَعَا بِطَعَامٍ فَأَكَلَ، فَقُلْتُ لَهُ: سُنَّةٌ؟ قَالَ: سُنَّةٌ ثُمَّ رَكِبَ.

**واتە: لە موحەممەدی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە مانگی**

ڕەمەزاندا چووم بۆ خزمەت ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ دەیویست سەفەر بکات پۆشاکی سەفەری پۆشی بوو وڵاخەکەیان بۆ ئامادەکردبوو، داوای خواردنی کرد بۆیان هێنا لێی خوارد، پێم وت: ئەوە سوننەتە؟ فەرمووی: بەڵێ، سوننەتە، جا سواری وڵاخەکەی بوو ڕۆشت.

٨٠٠ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: أَتَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ فِي رَمَضَانَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَمُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ هُوَ ابْنُ أَبِي كَثِيرٍ هُوَ مَدِينِيٌّ ثِقَةٌ، وَهُوَ أَخُو إِسْمَاعِيلَ بْنِ جَعْفَرٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ هُوَ ابْنُ نَجِيحٍ وَالِدُ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمَدِينِيِّ، وَكَانَ يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ يُضَعِّفُهُ. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ، وَقَالُوا: لِلْمُسَافِرِ أَنْ يُفْطِرَ فِي بَيْتِهِ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَقْصُرَ الصَّلاَةَ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ جِدَارِ الْمَدِينَةِ أَوِ القَرْيَةِ، وَهُوَ قَوْلُ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ الحَنْظَلِيِّ.

بە پێی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان دەفەرموون: موسافیر بۆی هەیە پێش ئەوەی دەرچێت ڕۆژووەکەی بشکێنێ، بەڵام بۆ نوێژ دەبێ لە سنووری شارەکەی یان گوندەکەی خۆی دەرچێ ئەو کاتە بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە، ئەمەش وتەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی (حَنْظَلِيّ)ە.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی دیاری رۆژووەوان

٧٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تُحْفَةِ الصَّائِمِ

٨٠١ - (موضوع) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ طَرِيفٍ، عَنْ عُمَيْرِ بْنِ مَأْمُونٍ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تُحْفَةُ الصَّائِمِ الدُّهْنُ وَالمِجْمَرُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَعْدِ بْنِ طَرِيفٍ، وَسَعْدُ بْنُ طَرِيفٍ يُضَعَّفُ، وَيُقَالُ عُمَيْرُ بْنُ مَأْمُومٍ أَيْضًا.

واتە: لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (دیاری رۆژووەوان بوخوردان و ئەو دار عودەی دەسوتێ بۆن بڵاو دەکاتەوە و میوەی ناسك و تازەیە).

### دەربارەی کەی رۆژی جەژنی رەمەزان و قوربانە؟

٧٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الفِطْرِ وَالأَضْحَى مَتَى يَكُونُ؟

٨٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ اليَمَانِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الفِطْرُ يَوْمَ يُفْطِرُ النَّاسُ، وَالأَضْحَى يَوْمَ يُضَحِّي النَّاسُ). سَأَلْتُ مُحَمَّدًا: قُلْتُ لَهُ: مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ سَمِعَ مِنْ عَائِشَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، يَقُولُ فِي حَدِيثِهِ، سَمِعْتُ عَائِشَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (جەژنی رەمەزان ئەو رۆژەیە خەڵك بەرۆژوو نابن، جەژنی قوربانیش ئەو رۆژەیە خەڵك قوربانی دەكەن).

## دەربارەی ئەگەر ساڵێ ئیعتیكاف نەكرا

### ٧٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الاِعْتِكَافِ إِذَا خَرَجَ مِنْهُ

٨٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، قَالَ: أَنْبَأَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْتَكِفُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ عَامًا، فَلَمَّا كَانَ فِي العَامِ الْمُقْبِلِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الْمُعْتَكِفِ إِذَا قَطَعَ اعْتِكَافَهُ قَبْلَ أَنْ يُتِمَّهُ عَلَى مَا نَوَى، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا نَقَضَ اعْتِكَافَهُ وَجَبَ عَلَيْهِ القَضَاءُ، وَاحْتَجُّوا بِالحَدِيثِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ مِنْ اعْتِكَافِهِ، فَاعْتَكَفَ عَشْرًا مِنْ شَوَّالٍ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ نَذْرُ اعْتِكَافٍ أَوْ شَيْءٌ أَوْجَبَهُ عَلَى نَفْسِهِ، وَكَانَ مُتَطَوِّعًا، فَخَرَجَ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يَقْضِيَ إِلاَّ أَنْ يُحِبَّ ذَلِكَ اخْتِيَارًا مِنْهُ، وَلاَ يَجِبُ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: فَكُلُّ عَمَلٍ لَكَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ فِيهِ، فَإِذَا دَخَلْتَ فِيهِ، فَخَرَجْتَ مِنْهُ، فَلَيْسَ عَلَيْكَ أَنْ تَقْضِيَ إِلاَّ الحَجَّ وَالعُمْرَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە دەی كۆتایی رەمەزاندا ئیعتیكافی دەكرد، ساڵێ ئیعتیكافی نەكرد، لە ساڵی ئایندەدا بیست شەو و رۆژ ئیعتیكافی كرد.

## بۆی هەیە دەرچێ بۆ کارێکی پێویست یان نا؟

## ٨٠ - بَابُ الْمُعْتَكِفِ يَخْرُجُ لِحَاجَتِهِ أَمْ لاَ ؟

٨٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُصْعَبٍ الْمَدَنِيُّ، قِرَاءَةً عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اعْتَكَفَ أَدْنَى إِلَيَّ رَأْسَهُ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ البَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. هَكَذَا رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَالصَّحِيحُ عَنْ عُرْوَةَ، وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر بچوایە ئیعتیکافەوە سەری دەهێنایە پێشەوە بۆم شانە دەکرد، نەدەهاتەوە بۆ ماڵەوە مەگەر بۆ کارێ کە ئادەمیزاد پێویستیەتی.

٨٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ إِذَا اعْتَكَفَ الرَّجُلُ أَنْ لاَ يَخْرُجَ مِنْ اعْتِكَافِهِ إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ، وَاجْتَمَعُوا عَلَى هَذَا، أَنَّهُ يَخْرُجُ لِقَضَاءِ حَاجَتِهِ لِلْغَائِطِ وَالبَوْلِ. ثُمَّ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي عِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَشُهُودِ الجُمُعَةِ، وَالجَنَازَةِ لِلْمُعْتَكِفِ، فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنْ يَعُودَ الْمَرِيضَ، وَيُشَيِّعَ الجَنَازَةَ، وَيَشْهَدَ الجُمُعَةَ، إِذَا اشْتَرَطَ ذَلِكَ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ لَهُ أَنْ يَفْعَلَ شَيْئًا مِنْ هَذَا، وَرَأَوْا لِلْمُعْتَكِفِ إِذَا كَانَ فِي مِصْرٍ يُجَمَّعُ فِيهِ أَنْ لاَ يَعْتَكِفَ إِلاَّ فِي مَسْجِدِ الجَامِعِ،

لأَنَّهُمْ كَرِهُوا الخُرُوجَ لَهُ مِنْ مُعْتَكَفِهِ إِلَى الجُمُعَةِ، وَلَمْ يَرَوْا لَهُ أَنْ يَتْرُكَ الجُمُعَةَ، فَقَالُوا: لاَ يَعْتَكِفُ إِلاَّ فِي مَسْجِدِ الجَامِعِ، حَتَّى لاَ يَحْتَاجَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْ مُعْتَكَفِهِ لِغَيْرِ قَضَاءِ حَاجَةِ الإِنْسَانِ، لأَنَّ خُرُوجَهُ لِغَيْرِ حَاجَةِ الإِنْسَانِ قَطْعٌ عِنْدَهُمْ لِلاِعْتِكَافِ، هُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ. وقَالَ أَحْمَدُ: لاَ يَعُودُ الْمَرِيضَ، وَلاَ يَتْبَعُ الجَنَازَةَ عَلَى حَدِيثِ عَائِشَةَ. وقَالَ إِسْحَاقُ: إِنْ اشْتَرَطَ ذَلِكَ فَلَهُ أَنْ يَتْبَعَ الجَنَازَةَ وَيَعُودَ الْمَرِيضَ.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان رایان وایە: ئەگەر کەسێ ئیعتیکافی کرد نابێ لە مزگەوت دەرچێ مەگەر بۆ کارێکی پێویست وەك دەست بە ئاو گەیاندن، هەروەها زانایان کۆن لەسەر ئەوەی باو گەیاندن.

زانایان رایان جیاوازە لەسەر سەردانی نەخۆش و ئامادەی نوێژی هەینی و شوێنکەوتنی جەنازە لەلایەن کەسێکەوە ئیعتیکافی کردبێ، هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش دەفەرموون: بۆی هەیە ئەو کارانە بکات ئەگەر لەپێشەوە بەمەرجی دانابن، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەکە. هەندێکیان دەفەرموون: بۆی نیە هیچ کام لەو کارانە ئەنجام بدات، رایان وایە لەو مزگەوتانەدا ئیعتیکاف بکات کە نوێژی هەینیان تێدا دەکرێت، لەبەرئەوەی بەلایانەوە باش نیە دەرچێ بۆ نوێژی هەینی، رایان وایە نابێ تەرکی نوێژی هەینی بکات، دەفەرموون: ئیعتیکاف نەکات لەو مزگەوتانەدا نەبێ کە نوێژی هەینیان تێدا دەکرێت، هەتا پێویستی بە دەرچوون نەبێت مەگەر بۆ کارێکی زۆر پێویست، چونکە دەرچوونی بۆ کارێکی زۆر پێویست نەبێ ئیعتیکافەکەی پوچەڵ دەکاتەوە، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و مالیکە. پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت: بە پێی فەرموودەکەی عائیشە رەزای خوای لێ بێ بۆی نیە سەردانی نەخۆش بکات و شوێنی جەنازە بکەوێت. پێشەوا

ئیسحاق دەفەرمووێ: ئەگەر لەپێشدا بەمەرجی دانابن بۆی هەیە سەردانی نەخۆش بکات و شوێنی جەنازە بکەوێ.

## دەربارەی شەونوێژی مانگی ڕەمەزان

٨١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ

٨٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفُضَيْلِ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الجُرَشِيِّ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يُصَلِّ بِنَا، حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ مِنَ الشَّهْرِ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا فِي السَّادِسَةِ، وَقَامَ بِنَا فِي الخَامِسَةِ، حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَقُلْنَا لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ نَفَّلْتَنَا بَقِيَّةَ لَيْلَتِنَا هَذِهِ؟ فَقَالَ: إِنَّهُ مَنْ قَامَ مَعَ الإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ، ثُمَّ لَمْ يُصَلِّ بِنَا حَتَّى بَقِيَ ثَلاَثٌ مِنَ الشَّهْرِ، وَصَلَّى بِنَا فِي الثَّالِثَةِ، وَدَعَا أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى تَخَوَّفْنَا الفَلاَحَ، قُلْتُ لَهُ: وَمَا الفَلاَحُ، قَالَ: السُّحُورُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ، فَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنْ يُصَلِّيَ إِحْدَى وَأَرْبَعِينَ رَكْعَةً مَعَ الوِتْرِ، وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَهُمْ بِالمَدِينَةِ. وَأَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ عَلَى مَا رُوِيَ عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَغَيْرِهِمَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِشْرِينَ رَكْعَةً، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: وَهَكَذَا أَدْرَكْتُ بِبَلَدِنَا بِمَكَّةَ يُصَلُّونَ عِشْرِينَ رَكْعَةً. وقَالَ أَحْمَدُ: رُوِيَ فِي هَذَا أَلْوَانٌ وَلَمْ يُقْضَ فِيهِ بِشَيْءٍ. وقَالَ إِسْحَاقُ: بَلْ نَخْتَارُ إِحْدَى وَأَرْبَعِينَ رَكْعَةً عَلَى مَا رُوِيَ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. وَاخْتَارَ ابْنُ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: الصَّلاَةَ مَعَ الإِمَامِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ. وَاخْتَارَ الشَّافِعِيُّ: أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ وَحْدَهُ إِذَا كَانَ قَارِئًا. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: (أَبِي ذَرّ) ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مانگی ڕەمەزان بەرۆژوو بووین، لە شەوانی مانگی ڕەمەزاندا جگە لە نوێژە فەرزەکان بەرنوێژی هیچ نوێژێکی تری بۆ نەدەکردین هەتا حەوت شەوی مابوو بۆ سەری مانگ، واتە شەوی بیست و سێ ئەوکاتە هەتا سێیەکی دوایی شەو بەرنوێژی بۆ دەکردین و بە پەرستش و قورئان خوێندن و یادی خواوە خەریك دەبوو، کاتێ کە شەش شەوی مابوو بۆ سەری مانگ هەڵنەسا بەرنوێژمان بۆ بکات، کاتێ کە پێنج شەوی مابوو هەڵسا بەرنوێژی بۆ کردین هەتا نیوەی شەو تێپەڕی، پێمان فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆزگە ئەم شەوت بۆ زیاد دەکردین واتە هەتا کۆتایی شەو بەرنوێژیت بۆ دەکردین؟ (أَبِي ذَرّ) وتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێك لەگەڵ پێشنوێژ نوێژی عیشاو بەیانی بەکۆمەڵ بکات هەتا پێشنوێژ لەنوێژ دەبێتەوە ئەو شەوەی بە شەونوێژ بۆ حسابە واتە پاداشتی شەوێکی تەواو شەونوێژی بۆ دەنوسرێت). لەپاشدا بەرنوێژی بۆ نەکردین هەتا سێ شەوی ما واتە شەوی بیست و حەوت جا خێزانەکانی و کەسوکارەکەی و خەڵکی کۆکردەوە، ئەوەندە بەرنوێژی بۆ کردین ترساین لەوەی بگاتە کاتی (فَلاَح)، ڕاوی فەرمودەکە جوبەیر وتی: وتم: کاتی (فَلاَح) کەیە؟ (أَبِي ذَرّ) وتی: کاتی پارشێوە.

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر ژمارەی ڕکاتەکانی مانگی ڕەمەزان، هەندێکیان ڕایان لەسەر چل و یەك ڕکاتە بە نوێژی ویترەکەوە، ئەمەش وتەی خەڵکی مەدینەیە، کاریان بەمە دەکرد لە مەدینە. زۆربەی زانایان لەسەر ئەمەن، لە پێشەوایان عومەر و عەلی و جگە لەوانەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بیست ڕکاتە، ئەمەش وتەی

پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و شافیعی و ئیبنو موبارەکە. پێشەوا شافیعی دەفەرمووێ: لە وڵاتی ئێمە لە مەککە بیست ڕکاتیان دەکرد. پێشەوا ئەحمەد دەفەرمووێ: چەندەها ڕیوایەتی جۆراو جۆر هاتووە، هیچ حوکمێکی لەسەری نەداوە. پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێ: بەڵکو چل و یەك زکات هەڵدەبژێرم لەسەر فەرموودەکەی ئوبەی کوڕی کەعب ڕەزای خوای لێ بێ. سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك ئەحمەد و ئیسحاق ئەمەیان هەڵبژاردووە نوێژەکە لەمانگی ڕەمەزاندا بە کۆمەڵ لەگەڵ پێشنوێژ بکرێ، پێشەوا شافیعی ئەمەی هەڵبژاردووە ئەگەر کەسەکە قورئانی زۆری لەبەربوو بۆی بە تەنیا ئەنجامی بدات.

## گەورەیی پاداشتی کەسێ بەربانگ نان بدات بە ڕۆژووەوانێ

٨٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا

٨٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ کاتی بەربانگ نان بدات بە ڕۆژووەوانێ، ئەویش بە قەد ڕۆژووەوانەکە پاداشتی بۆ دەنوسرێت، بەبێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ڕۆژووەوانەکەش کەم بکاتەوە).

## فەزڵ و گەورەیی شەونوێژی مانگی رەمەزان و هاندانی خەڵك بۆی

### ٨٣ - بَابُ التَّرْغِيبِ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ، وَمَا جَاءَ فِيهِ مِنَ الفَضْلِ

٨٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ بِعَزِيمَةٍ، وَيَقُولُ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ كَانَ الأَمْرُ كَذَلِكَ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَصَدْرًا مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ عَلَى ذَلِكَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یارانی هاندەدا لەسەر شەونوێژی شەوانی رەمەزان بەڵام جەختی لێ نەکردن، دەیفەرموو: (هەر کەسێك رەمەزان شەونوێژ بکات بە ئیمانەوە لەبەر رەزامەندی خوای گەورەو بەهیوای پاداشتی پەروەردگاری بێت لەسەر ئەو کارەی، خوا لە گوناهەکانی رابردووی خۆش دەبێت).

ئیتر هەتا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدنیا دەرچوو ئەم کارە هەر بەم شێوەیە بوو - واتە خەڵك وەك ئێستا نوێژی تەراویحیان لەمزگەوتدا بە کۆمەڵ ئەنجام نەئەدا - ، لەپاشدا لەسەردەمی خەلافەتی پێشەوا ئەبو بەکردا رەزای خوای لێ بێ ئەم کارە هەر بەم شێوەیە بوو، لەسەرەتای خەلافەتی پێشەوا عومەردا رەزای خوای لێ بێ ئەم کارە هەر بەم شێوەیە بوو.

طَرِيقِ مَكَّةَ تَخَلَّفَ مَعَ أَصْحَابٍ لَهُ مُحْرِمِينَ، وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ، فَرَأَى حِمَارًا وَحْشِيًّا، فَاسْتَوَى عَلَى فَرَسِهِ، فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ أَنْ يُنَاوِلُوهُ سَوْطَهُ، فَأَبَوْا، فَسَأَلَهُمْ رُمْحَهُ، فَأَبَوْا عَلَيْهِ، فَأَخَذَهُ، ثُمَّ شَدَّ عَلَى الحِمَارِ، فَقَتَلَهُ فَأَكَلَ مِنْهُ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبَى بَعْضُهُمْ، فَأَدْرَكُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ طُعْمَةٌ أَطْعَمَكُمُوهَا اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەفەرێکدا دەچوون بەرەو مەککە هەتا لەگەڵ چەند هاورێیەکی لە رێگادا دواکەوتن لە کاروانەکە کە لە ئیحرامدا بوون، بەڵام ئەبو قەتادە لە ئیحرامدا نەبوو، کەرە کێوییەکی دی، لەسەر ئەسپەکەی وەستا، راوی وتی: داوای کرد لە هاورێکانی قەمچیەکەی بدەنە دەستی، نەیاندایە دەستی چونکە لە ئیحرامدا بوون، داوای رمەکەی کرد، ئەویشیان نەدایە، لەپاشدا ئەبو قەتادە خۆی کەرە کێویەکەی کوشت، هەندێ لە یارانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە گۆشتی کەرە کێویەکەیان خوارد چونکە نە خۆیان راویان کردبو نە یارمەتیشیان دا بۆ ئەوەی راوی بکات، بەڵام هەندێکیان نەیانخوارد، کاتێ کە گەیشتنەوە بە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەوبارەوە لێیان پرسی، فەرمووی: (بێگومان ئەوە خواردنێکە کە خوای گەورە دەرخواردی داون).

٨٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، فِي حِمَارِ الوَحْشِ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي النَّضْرِ، غَيْرَ أَنَّ فِي حَدِيثِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: هَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ؟.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

فەرموودەی پێشوو بە هەمان شێوە هاتووە، ئەوەندە هەیە لە فەرموودەکەی

زەیدی کوڕی ئەسلەمدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئایا هیچ لە گۆشتەکەیتان پێ یە؟).

## خواردنی گۆشتی نێچیر بۆ کەسێ لە ئیحرامدا بێ باش نیە

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ لَحْمِ الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ

٨٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ الصَّعْبَ بْنَ جَثَّامَةَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِهِ بِالأَبْوَاءِ، أَوْ بِوَدَّانَ، فَأَهْدَى لَهُ حِمَارًا وَحْشِيًّا، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا فِي وَجْهِهِ مِنَ الكَرَاهِيَةِ، فَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ بِنَا رَدٌّ عَلَيْكَ، وَلَكِنَّا حُرُمٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ ذَهَبَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ، وَكَرِهُوا أَكْلَ الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنَّمَا وَجْهُ هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَنَا إِنَّمَا رَدَّهُ عَلَيْهِ لَمَّا ظَنَّ أَنَّهُ صِيدَ مِنْ أَجْلِهِ، وَتَرَكَهُ عَلَى التَّنَزُّهِ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُ أَصْحَابِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ هَذَا الحَدِيثَ، وَقَالَ: أَهْدَى لَهُ لَحْمَ حِمَارٍ وَحْشٍ، وَهُوَ غَيْرُ مَحْفُوظٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ.

واتە: لە سەعدی کوڕی (جثامة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لە ئەبوا یان وەدان دای بەلایدا، کەرە کێوێکی بە دیاری دایە، دایەوە بەسەریدا و قبوڵی نەکرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) بە ڕوخساریدا زانی کە پێی ناخۆشە، فەرمووی: (بۆیە لێت وەرناگرین چونکە لە ئیحرامداین، ئەگینا لێمان وەردەگرتی).

## نێچیری دەریا بۆ کەسێ لە ئیحرامدا بێ

## ٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَيْدِ البَحْرِ لِلْمُحْرِمِ

٨٥٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَزِّمِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ، فَاسْتَقْبَلَنَا رِجْلٌ مِنْ جَرَادٍ، فَجَعَلْنَا نَضْرِبُهُ بِسِيَاطِنَا وَعِصِيِّنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كُلُوهُ فَإِنَّهُ مِنْ صَيْدِ البَحْرِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الْمُهَزِّمِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبُو الْمُهَزِّمِ: اسْمُهُ يَزِيدُ بْنُ سُفْيَانَ وَقَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ شُعْبَةُ. وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ لِلْمُحْرِمِ أَنْ يَصِيدَ الجَرَادَ وَيَأْكُلَهُ، وَرَأَى بَعْضُهُمْ عَلَيْهِ صَدَقَةً إِذَا اصْطَادَهُ وَأَكَلَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: لـە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دەرچـووین بـۆ حـەج یـان عـومرە، توشی کۆمەڵێ کوللەی زۆر بـووین لـە ئیحرامـدا بـووین هەریـەکێ لـە ئێمـە بـە قەمچی و داردەستەکەی لێی دەدان و راوی دەکـردن، پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فـەرمووی: (بێگومـان کوللـە حـوکمی نێچـیری دەریـای هەیـە کەواتـە خواردنی دروستە بۆ ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە).

## ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە گۆشتی کەمتیار دەسکەوێت

### ٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الضَّبُعِ يُصِيبُهَا الْمُحْرِمُ

٨٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي عَمَّارٍ قَالَ: قُلْتُ لِجابر: الضَّبُعُ أَصَيْدٌ هِيَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: قُلْتُ: آكُلُهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: قُلْتُ: أَقَالَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: نَعَمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: وَرَوَى جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ هَذَا الحَدِيثَ، فَقَالَ: عَنْ جابير، عَنْ عُمَرَ، وَحَدِيثُ ابْنِ جُرَيْجٍ أَصَحُّ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ فِي الْمُحْرِمِ إِذَا أَصَابَ ضَبُعًا أَنَّ عَلَيْهِ الجَزَاءَ.

واتە: لە ئیبنو ئەبی عەممارەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە جابیرم وت: کەمتیار راو بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: لە گۆشتەکەی بخۆم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شتی وای فەرمووە؟ فەرمووی: بەڵێ.

## خۆشتن بۆ چوونە ناو شاری مەککەوە

### ٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاغْتِسَالِ لِدُخُولِ مَكَّةَ

٨٥٢ - (ضعيف الإسناد جدا: لكن رواه الشيخان دون ذكر (فخ) ) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ صَالِحٍ الطَّلْحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: اغْتَسَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِدُخُولِهِ مَكَّةَ

بِفَخٍّ. هَذَا حَدِيثٌ غَيْرُ مَحْفُوظٍ وَالصَّحِيحُ مَا رَوَى نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَغْتَسِلُ لِدُخُولِ مَكَّةَ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ: يُسْتَحَبُّ الاِغْتِسَالُ لِدُخُولِ مَكَّةَ. وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ضَعِيفٌ فِي الحَدِيثِ؛ ضَعَّفَهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَعَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ وَغَيْرُهُمَا، وَلاَ نَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆی شت و چووە ناو شاری مەككەوە.

لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە خۆی دەشت جا دەچووە ناو شاری مەككەوە. پێشەوا شافیعی ئەمە دەفەرمووێ، خۆشتنی پێی باشە لەپێش چوونە ناو شاری مەككەوە.

## دەربارەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەبەشی سەرەوەی مەككەوە دەچووە ناو شاری مەككە و لەبەشی خوارویشیەوە لێی دەدەرچوو.

٣٠ – باب ما جاء فِي دُخُولِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ مِنْ أَعْلاَهَا، وَخُرُوجِهِ مِنْ أَسْفَلِهَا

٨٥٣ - لكن رواه الشيخان دونحَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى مَكَّةَ دَخَلَ مِنْ أَعْلاَهَا، وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هات بۆ شاری مەككە لەبەشی سەرەوەی مەككەوە هاتە ناو شار و لەبەشی خوارەوە لێی دەرچوو.

## پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەڕۆژدا دەچووە ناو شاری مەککەوە

### ٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دُخُولِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ نَهَارًا

٨٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا العُمَرِيُّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ مَكَّةَ نَهَارًا.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە ڕۆژدا دەچووە ناو شاری مەککەوە.

## بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لەکاتی بینینی ماڵی خوادا باش نیە

### ٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ رَفْعِ اليَدَيْنِ عِنْدَ رُؤْيَةِ البَيْتِ

٨٥٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي قَزَعَةَ البَاهِلِيِّ، عَنِ الْمُهَاجِرِ الْمَكِّيِّ، قَالَ: سُئِلَ جابير بْنُ عَبْدِ اللهِ: أَيَرْفَعُ الرَّجُلُ يَدَيْهِ إِذَا رَأَى البَيْتَ؟ فَقَالَ: حَجَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفَكُنَّا نَفْعَلُهُ؟ رَفْعُ اليَدَيْنِ عِنْدَ رُؤْيَةِ البَيْتِ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي قَزَعَةَ. وَأَبُو قَزَعَةَ: اسْمُهُ سُوَيْدُ بْنُ حُجَيْرٍ.

واتە: لە موهاجیری مەککیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئایا کەسێ کە ماڵی خوای بینی دروستە دەستەکانی بەرزکاتەوە یان نا؟ لە جابیری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)یان ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ جابیر وتی: بێگومان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حەجمان کردوە ئەو کارەی

نەکردوە. واتە لەکاتی بینینیماڵی خوادا دەستەکانی بەرزنەدەکردەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چۆنیەتی تەواف

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ كَيْفَ الطَّوَافُ

٨٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جابِرٍ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَاسْتَلَمَ الحَجَرَ، ثُمَّ مَضَى عَلَى يَمِينِهِ، فَرَمَلَ ثَلاَثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ أَتَى الْمَقَامَ، فَقَالَ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى)، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَالمقَامُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ البَيْتِ، ثُمَّ أَتَى الحَجَرَ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا، أَظُنُّهُ قَالَ: (إِنَّ الصَّفَا وَالمرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ).وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ جابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گەیشتە شاری مەککە، چووە ناو مزگەوتەوە، دەستی هێنا بە بەردە رەشەکەدا و دەستی کرد بە تەواف کردن سێ جار بە هەڵەداوان (بە لۆقە) سوڕایەوە بەدەوری ماڵی خوادا، چوار جارەکەی تریش بە رۆشتنی ئاسایی و لەسەرخۆ، لەپاشدا رۆشت بۆلای مەقامی ئیبراهیم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) سورة البقرة: ١٠٥. مەقامی خستە نێوان خۆی و ماڵی خواوە و دوو رکات سوننەتی تەوافی کرد، ئینجا هاتە لای بەردە رەشەکە و دەستی هێنا بە بەردەکەدا، لەپاشدا بەرەو صەفا رۆشت، وا ئەزانم فەرمووی: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ). سورة البقرة: ١٥٨. واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەکانی (دینی) خوای گەورەن.

## لەبەردەکەوە بۆ بەردەکە سێ جار بە لۆقە سوڕانەوە

## ٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّمَلِ مِنَ الحَجَرِ إِلَى الحَجَرِ

٨٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جابر، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَمَلَ مِنَ الحَجَرِ إِلَى الحَجَرِ ثَلاَثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ جابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: إِذَا تَرَكَ الرَّمَلَ عَمْدًا فَقَدْ أَسَاءَ وَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ، وَإِذَا لَمْ يَرْمُلْ فِي الأَشْوَاطِ الثَّلاَثَةِ لَمْ يَرْمُلْ فِيمَا بَقِيَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لَيْسَ عَلَى أَهْلِ مَكَّةَ رَمَلٌ، وَلاَ عَلَى مَنْ أَحْرَمَ مِنْهَا.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەبەردەکەوە بۆ بەردەکە سێ جار بە هەڵەداوان (بە لۆقە) سوڕایەوە، چوار جاریش بە ڕۆشتنی ئاسایی و لەسەرخۆ.

پێشەوا شافیعی دەفەرمووێ: ئەگەر بە ئەنقەست سێ جار بە لۆقە سوڕانەوەکەی تەرك کرد ئەوە کارێکی باشی نەکردووە بەڵام هیچی لەسەر نیە، ئەگەر لەسێ جاری یەکەمدا بە هەڵەداوان (بە لۆقە) نەسوڕایەوە ئەوە با لە چوارەکەی تردا نەیکات. هەندێ لە زانایان دەفەرموون: خەڵکی مەککە بە هەڵەداوان (بە لۆقە) سوڕانەوەیان لەسەر نیە. هەروەها هەرکەسێك لەوێ ئیحرام دابەستێ بە هەڵەداوان (بە لۆقە) سوڕانەوەی لەسەر نیە.

## دەربارەی تەنها دەست هێنان بە بەردە ڕەشەکەو روکنی یەمانی دا

٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِلاَمِ الحَجَرِ، وَالرُّكْنِ اليَمَانِي دُونَ مَا سِوَاهُمَا

٨٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَال: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، وَمَعْمَرٌ، عَنِ ابْنِ خُثَيْمٍ، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، قَال: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَمُعَاوِيَةُ لاَ يَمُرُّ بِرُكْنٍ إِلاَّ اسْتَلَمَهُ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ يَسْتَلِمُ إِلاَّ الحَجَرَ الأَسْوَدَ، وَالرُّكْنَ اليَمَانِيَ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: لَيْسَ شَيْءٌ مِنَ البَيْتِ مَهْجُورًا. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ لاَ يَسْتَلِمَ إِلاَّ الحَجَرَ الأَسْوَدَ، وَالرُّكْنَ اليَمَانِيَ.

واتە: لە ئەبو (طفيل)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت ئیبنو عەباسدا ڕەزای خوایان لێ بێ بووم، هەرکاتێ موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ دەیدا بەلای روکنێکدا دەستی پێدا دەهێنا، ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ پێی فەرموو: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جگە لە بەردە ڕەشەکەو روکنی یەمانی دەستی بە هیچ شوێنێکی تردا نەدەهێنا، موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: هیچ شوێنێکی ماڵی خوا پشتگوێ ناخرێت.

## پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە (مضطبع) تەوافی ماڵی خوای دەکرد

٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ مُضْطَبِعًا

٨٥٩ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَال: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ، عَنِ ابْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ بِالبَيْتِ مُضْطَبِعًا وَعَلَيْهِ بُرْدٌ. هَذَا حَدِيثُ الثَّوْرِيِّ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ

حَدِيثِهِ. وَهُوَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَعَبْدُ الحَمِيدِ هُوَ ابْنُ جُبَيْرِ بْنِ شَيْبَةَ عَنِ ابْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ، وَهُوَ يَعْلَى بْنُ أُمَيَّةَ.

واتە: لە ئەبو یەعلاوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەوافی ماڵی خوای دەکرد ناوەڕاستی بوردەیەکی سەوزی کردبو بە ژێر باڵی ڕاستیداو لاکانی دابوو بەسەر لای چەپیدا واتە شانی ڕاستی دەرخستبوو.

## دەربارەی ماچکردنی بەردە ڕەشەکە

### ٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْبِيلِ الحَجَرِ

٨٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَابِسِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ يُقَبِّلُ الحَجَرَ، وَيَقُولُ: إِنِّي أُقَبِّلُكَ وَأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، وَلَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُكَ لَمْ أُقَبِّلْكَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عابیسی کوڕی ڕەبیعەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عومەرم ڕەزای خوای لێ بێ دی بەردە ڕەشەکەی ماچ دەکرد، دەیفەرموو: من دەزانم تۆ بەردێکیت نە سودت هەیەو نە زیان دەگەیەنیت، ئەگەر بە چاوی خۆم پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەدیایە ماچی دەکردی هەرگیز ماچم نەدەکردی.

٨٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَرَبِيٍّ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ عَنْ اسْتِلاَمِ الحَجَرِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَرَأَيْتَ إِنْ غُلِبْتُ عَلَيْهِ؟ أَرَأَيْتَ إِنْ زُوحِمْتُ؟ فَقَالَ ابْنُ

عُمَرَ: اجْعَلْ أَرَأَيْتَ بِاليَمَنِ، رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ. وَهَذَا هُوَ الزُّبَيْرُ بْنُ عَرَبِيٍّ رَوَى، عَنْهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، وَالزُّبَيْرُ بْنُ عَدِيٍّ كُوفِيٌّ، سَمِعَ مِنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ وَغَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَوَى عَنْهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: يَسْتَحِبُّونَ تَقْبِيلَ الحَجَرِ، فَإِنْ لَمْ يُمْكِنْهُ وَلَمْ يَصِلْ إِلَيْهِ اسْتَلَمَهُ بِيَدِهِ وَقَبَّلَ يَدَهُ، وَإِنْ لَمْ يَصِلْ إِلَيْهِ اسْتَقْبَلَهُ إِذَا حَاذَى بِهِ وَكَبَّرَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە زوبێری کوڕی عەرەبیەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ دەربارەی دەست هێنـان بە بەردە ڕەشەکەدا لە ئیبنو عومەری ڕەزای خوایان لێ بـێ پرسـی؟ فـەرمووی: بـە چاوی خۆم پێغەمبەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی دەستی هێنا بـە بـەردە ڕەشـەکەداو ماچی کرد، پیاوەکە وتی: ئەی ئەگەر قەرەباڵغ بـوو نەیانهێشـت دەسـتم بیگـاتێ، ئیبنو عومەر فەرمووی: ئەی ئەگەر لە یەمەن بوو، گرنگ ئەوەیـە مـن پێغەمبـەرم (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی دەستی هێنا بە بەردە ڕەشەکەداو ماچی کرد.

زانایان کار بـەم فـەرمووده دەکـەن، ماچـکردنی بـەردە ڕەشـەکەیان پـێ باشـە، ئەگەر بۆی نەدەگونجا دەستی پێدا بهێنێ و بە دەستی ئاماژەی بۆ بکات و سەلامی لێ بکات جا خۆی ماچ بکات، ئەگەر نەیگەیشتێ دەستی بەرامبەری ڕاگرێ و وەك ئاماژەیە بۆی و (الله اکبر) بکات، پێشەوا شافیعی ئەمە دەفەرمووێت.

## دەربارەی لە صەفاوە دەستی پێ دەکرد بەرەو مەروە

### ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يَبْدَأُ بِالصَّفَا قَبْلَ الْمَرْوَةِ

٨٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ طَافَ بِالبَيْتِ سَبْعًا، فَقَرَأَ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى)، فَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ، ثُمَّ أَتَى الحَجَرَ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ قَالَ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ، فَبَدَأَ بِالصَّفَا، وَقَرَأَ: (إِنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ).هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ يَبْدَأُ بِالصَّفَا قَبْلَ الْمَرْوَةِ، فَإِنْ بَدَأَ بِالمَرْوَةِ قَبْلَ الصَّفَا لَمْ يُجْزِهِ، وَبَدَأَ بِالصَّفَا. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِيمَنْ طَافَ بِالبَيْتِ وَلَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ حَتَّى رَجَعَ، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِنْ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ حَتَّى خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ فَإِنْ ذَكَرَ وَهُوَ قَرِيبٌ مِنْهَا رَجَعَ فَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، وَإِنْ لَمْ يَذْكُرْ حَتَّى أَتَى بِلاَدَهُ أَجْزَأَهُ وَعَلَيْهِ دَمٌ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنْ تَرَكَ الطَّوَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ حَتَّى رَجَعَ إِلَى بِلاَدِهِ، فَإِنَّهُ لاَ يُجْزِيهِ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ قَالَ: الطَّوَافُ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ وَاجِبٌ لاَ يَجُوزُ الحَجُّ إِلاَّ بِهِ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گەیشتە شاری مەککە حەوت جار بەدەوری کەعبەدا سوڕایەوە، لەپاشدا ڕۆشت بۆلای مەقامی ئیبراهیم و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى). جا مەقامی خستە نێوان خۆی و ماڵی خواوە و دوو ڕکات سوننەتی تەوافی کرد، ئینجا چوو بۆ لای بەردە ڕەشەکە دەستی هێنا بە بەردەکەدا، لەپاشدا فەرمووی: (دەست پێ دەکەم بەوەی کە خوای گەورە دەستی

پێ كردوە). لە صەفاوە دەستی پێ كردو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە

٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ

٨٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: إِنَّمَا سَعَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ لِيُرِيَ الْمُشْرِكِينَ قُوَّتَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ الَّذِي يَسْتَحِبُّهُ أَهْلُ العِلْمِ أَنْ يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ، فَإِنْ لَمْ يَسْعَ وَمَشَى بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ رَأَوْهُ جَائِزًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە هەڵەداوان تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی دەكرد، بۆ ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەران هێز و توانای ببینن.

٨٦٤ - (صحيح)حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَال: حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ جُمْهَانَ، قَال: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يَمْشِي فِي السَّعْيِ، فَقُلْتُ لَهُ: أَتَمْشِي فِي السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ؟ قَال: لَئِنْ سَعَيْتُ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْعَى، وَلَئِنْ مَشَيْتُ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْشِي، وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَرُوِي عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ نَحْوُهُ.

واتە: لە (كَثِير)ی کوڕی جوهمانەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئیبنو عومەرم ڕەزای خوایان لێ بێ دی لە نێوان صەفاو مەروەدا بە ئاسایی دەڕۆیشت، پێم وت: ئەوە لە نێوان صەفاو مەروەدا بە ئاسایی دەڕۆی؟ فەرمووی: ئەگەر لە هەندێ شوێندا بە پەلەو هەڵەداوان بڕۆم ئەوە بێگومان پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە بەو شێوەیە ڕۆشتووە، ئەگەر لە هەندێ شوێنی تردا بە ڕۆشتنی ئاسایی بڕۆم ئەوە پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوە بە ڕۆشتنی ئاسایی ڕۆشتوە، من پیاوێکی بە تەمەنم.

## سەبارەت بە تەوافکردن بە سواری

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الطَّوَافِ رَاكِبًا

٨٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ هِلَالٍ الصَّوَّافُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: طَافَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَاحِلَتِهِ فَإِذَا انْتَهَى إِلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي الطُّفَيْلِ، وَأُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ أَنْ يَطُوفَ الرَّجُلُ بِالبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ رَاكِبًا إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە سواری وڵاخەکەیەوە تەوافی دەکرد، کاتێ کە تەواو دەبوو دەگەیشتەوە روکنی یەمانی و بەردە ڕەشەکە ئاماژەی بۆ دەکرد.

هەندێ لە زانایان پێیان باش نیە بە سواری وڵاخەوە تەوافی ماڵی خواو

هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە بکرێت مەگەر کەسێ بەهانەی شەرعی هەبێت، ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیەیە.

## دەربارەی گەورەیی تەوافی ماڵی خوا

### ٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الطَّوَافِ

٨٦٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَمَانٍ، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ طَافَ بِالبَيْتِ خَمْسِينَ مَرَّةً خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ. سَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: إِنَّمَا يُرْوَى هَذَا عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلُهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ پەنجا جار تەوافی ماڵی خوا بکات لە تاوان پاك دەبێتەوە وەك ئەو ڕۆژەی لە دایك بووە).

٨٦٧ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، قَالَ: كَانُوا يَعُدُّونَ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ أَفْضَلَ مِنْ أَبِيهِ، وَلِعَبْدِ اللهِ أَخٌ يُقَالُ لَهُ: عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ وَقَدْ رَوَى عَنْهُ أَيْضًا.

## دەربارەی نوێژی دوای عەسر و بەیانی بۆ کەسێ تەواف بکات

## ٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ بَعْدَ العَصْرِ، وَبَعْدَ الصُّبْحِ لِمَنْ يَطُوفُ

٨٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، وَعَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَابَاهَ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لاَ تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ بِهَذَا البَيْتِ، وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي ذَرٍّ. حَدِيثُ جُبَيْرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَابَاهَ أَيْضًا. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الصَّلاَةِ بَعْدَ العَصْرِ وَبَعْدَ الصُّبْحِ بِمَكَّةَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ بَأْسَ بِالصَّلاَةِ وَالطَّوَافِ بَعْدَ العَصْرِ وَبَعْدَ الصُّبْحِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا طَافَ بَعْدَ العَصْرِ لَمْ يُصَلِّ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَكَذَلِكَ إِنْ طَافَ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ أَيْضًا لَمْ يُصَلِّ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ عُمَرَ: أَنَّهُ طَافَ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ فَلَمْ يُصَلِّ، وَخَرَجَ مِنْ مَكَّةَ حَتَّى نَزَلَ بِذِي طُوًى فَصَلَّى بَعْدَ مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ.

واتە: لە جویەیری کوری (مُطْعِم)ەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ( ئەی بەنی عەبدی مەناف رێگری لە هیچ کەسێك نەکەن، کە بەدەوری ئەم ماڵەدا بسورێتەوەو نوێژ بکات، هەرکاتێ کە ئارەزووی لێی بێ لە شەودا بێت یان لە رۆژدا).

زانایان رایان جیاوازە لەسەر نوێژی دوای عەسر و بەیانی لە مەککە، هەندێکیان دەفەرموون: تەواف و نوێژکردن لەپاش عەسر و بەیانی دروستە،

ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە، بەڵگەیان فەرمودەکەی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر لەپاش نوێژی عەسر تەوافی کرد نوێژ نەکات هەتا خۆرئاوا دەبێت، هەروەها ئەگەر لەپاش نوێژی بەیانی تەوافی کرد نوێژ نەکات هەتا لە مەککە دەردەچێت و لە (ذِي طُوًى) دادەبەزێت. دوای ئەوەی کە خۆرهەڵدێ و کەمێ بەرزدەبێتەوە ئەو کاتە نوێژ بکات، ئەمەش وتەی سوفیانی (ثوري) و مالیکە.

## لە نوێژی تەوافدا چ سورەتێ دەخوێنرێت

٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُقْرَأُ فِي رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ

٨٦٩ - (صحيح) أَخْبَرَنَا أَبُو مُصْعَبٍ الْمَدَنِيُّ، قِرَاءَةً، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ عِمْرَانَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ فِي رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ بِسُورَتَيِ الْإِخْلَاصِ: قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ، وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێژی تەوافدا سورەتی: (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ) و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی خوێند.

٨٧٠ - (صحيح الإسناد مقطوعا) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يَقْرَأَ فِي رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ بِقُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ، وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ عِمْرَانَ، وَحَدِيثُ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِيهِ فِي هَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَابِرٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَعَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عِمْرَانَ ضَعِيفٌ فِي الحَدِيثِ.

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێی باش بووە لە نوێژی تەوافدا سورەتی: (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ) و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی بخوێنرێت.

## دەربارەی تەوافکردن بەڕووتی دروست نیە

٤٤ – بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الطَّوَافِ عُرْيَانًا

٨٧١ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَال: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أُثَيْعٍ، قَال: سَأَلْتُ عَلِيًّا بِأَيِّ شَيْءٍ بُعِثْتَ؟ قَال: بِأَرْبَعٍ: لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَلاَ يَجْتَمِعُ الْمُسْلِمُونَ وَالمشْرِكُونَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا، وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَهْدٌ فَعَهْدُهُ إِلَى مُدَّتِهِ، وَمَنْ لاَ مُدَّةَ لَهُ فَأَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە زەیــدی کــوڕی (أُثَيْع)ەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: لە پێشەوا عەلیم ڕەزای خوای لێ بێ پرسی: بە چی شتێ ناردیتیان بۆ مەککە پەیامت چی بوو بۆ خەڵك؟ فەرمووی: هەرکەسێ موسوڵمان نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە، نابێ کەس بەڕوتی تەوافی ماڵی خوا بکات، موسوڵمانان و هاوبەش بۆ خوا دانەران لەم ساڵ بەدواوە کۆنابنەوە واتە لەدوای ئەمساڵ ئیتر نابێ هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران حەج بکەن، هەرکەس پەیمانی بەستوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تا کاتی دیاریکراو پەیمانەکە بەردەوام دەبێت لەپاش ئەوە هەڵوەشێنرێتەوە، ئەگەر کاتەکە دیاریکراو نەبوو ئەوە تا چوار مانگی تر پەیمانەکە بەردەوام دەبێت.

٨٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، وَنَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ نَحْوَهُ، وَقَالاَ زَيْدُ بْنُ يُثَيْعٍ وَهَذَا أَصَحُّ. وَشُعْبَةُ وَهِمَ فِيهِ فَقَالَ زَيْدُ بْنُ أُثَيْلٍ.

## دەربارەی چوونە ناو شاری مەککە

٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دُخُولِ الكَعْبَةِ

٨٧٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عِنْدِي وَهُوَ قَرِيرُ العَيْنِ، طَيِّبُ النَّفْسِ، فَرَجَعَ إِلَيَّ وَهُوَ حَزِينٌ، فَقُلْتُ لَهُ، فَقَال: إِنِّي دَخَلْتُ الكَعْبَةَ، وَوَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ فَعَلْتُ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ أَكُونَ أَتْعَبْتُ أُمَّتِي مِنْ بَعْدِي.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بــە خۆشــی و دڵشــادی لــەلای مــن دەرچــوو، بەڵام بە غەمباری گەڕایەوە بۆلام، پێم وت: بۆ غەمباری؟ فەرمووی: (چــوومە نــاو کەعبەوە، خۆزگە نەچوومایەتە ناوی و ئەو کارەم نەکردایــە، دەترســم لــەدوای خــۆم ئومەتەکەم شوێن من بکەون و بچنە ناوی).

## دەربارەی نوێژکردن لەناو کەعبەدا

٤٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ فِي الكَعْبَةِ

٨٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ بِلاَلٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي جَوْفِ الكَعْبَةِ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَمْ يُصَلِّ وَلَكِنَّهُ كَبَّرَ. وَفِي البَابِ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَالفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَعُثْمَانَ بْنِ طَلْحَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ عُثْمَانَ. حَدِيثُ بِلاَلٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ بِالصَّلاَةِ فِي الكَعْبَةِ بَأْسًا. وقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: لاَ بَأْسَ بِالصَّلاَةِ النَّافِلَةِ فِي الكَعْبَةِ، وَكَرِهَ أَنْ تُصَلَّى الْمَكْتُوبَةُ فِي الكَعْبَةِ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: لاَ بَأْسَ أَنْ تُصَلَّى الْمَكْتُوبَةُ وَالتَّطَوُّعُ فِي الكَعْبَةِ لأَنَّ حُكْمَ النَّافِلَةِ وَالمكْتُوبَةِ فِي الطَّهَارَةِ وَالقِبْلَةِ سَوَاءٌ.

واتە: لە بیلالەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە لــەناو کەعبــەدا نوێــژی کــرد، ئیبنــو عــەباس ڕەزای خوایــان لــێ بــێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێــژی تێــدا نــەکرد بــەڵکو (الله أکبر)ی کرد.

## دەربارەی روخاندنی کەعبە

### ٤٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَسْرِ الكَعْبَةِ

٨٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ، قَالَ لَهُ: حَدِّثْنِي بِمَا كَانَتْ تُفْضِي إِلَيْكَ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ يَعْنِي عَائِشَةَ، فَقَالَ: حَدَّثَتْنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهَا: لَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُو عَهْدٍ بِالجَاهِلِيَّةِ، لَهَدَمْتُ الكَعْبَةَ، وَجَعَلْتُ لَهَا بَابَيْنِ قَالَ: فَلَمَّا مَلَكَ ابْنُ الزُّبَيْرِ هَدَمَهَا وَجَعَلَ لَهَا بَابَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئیبنو زوبێر رەزای خوای لێ بێ پێی فەرمووە: شتێکم بۆ باس بکە عائیشە رەزای خوای لێ بێ چپاندوویەتی بە گوێی تۆدا، فەرمووی: بۆی گێرامەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمووە: (ئەگەر قەومەکەت نزیك نەبوونایە لەسەردەمی نەفامیەوە و تازە موسوڵمان نەبوونایە، کەعبەم دەڕووخاند و دوو دەرگام تێ دەخست). دەرگایە لە رووی خۆرهەڵاتەوە و دەرگایە لە رووی خۆرئاواوە.

## دەربارەی نوێژکردن لە حیجردا

### ٤٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ فِي الحِجْرِ

٨٧٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أُحِبُّ أَنْ أَدْخُلَ البَيْتَ فَأُصَلِّيَ فِيهِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِي فَأَدْخَلَنِي الحِجْرَ، فَقَالَ: صَلِّي فِي الحِجْرِ إِنْ أَرَدْتِ دُخُولَ البَيْتِ، فَإِنَّمَا هُوَ قِطْعَةٌ مِنَ البَيْتِ، وَلَكِنَّ قَوْمَكِ اسْتَقْصَرُوهُ حِينَ بَنَوْا الكَعْبَةَ فَأَخْرَجُوهُ مِنَ البَيْتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَعَلْقَمَةُ بْنُ أَبِي عَلْقَمَةَ هُوَ

عَلْقَمَةُ بْنُ بِلاَلٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: مـن پـێم خۆش بوو بچمە ناو ماڵی خواوەو نوێژی تێدا بکەم، جا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستی گرتم و بردمیە ناو حیجرەوەو فەرمووی: (ئەگەر دەتـەوێ بچیتە ناو بەیتەوە لە حیجری ئیسماعیلدا نوێژ بکە چونکە بەشێکە لە بـەیت، هۆزەکـەت کاتێ کە بەیتیان دروستکرد بە شێکیان لە کەعبە بەجێهێشت).

## دەربارەی گەورەیی بەردە رەشەکە و روکن و مەقام

٤٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الحَجَرِ الأَسْوَدِ، وَالرُّكْنِ، وَالمَقَامِ

٨٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَزَلَ الحَجَرُ الأَسْوَدُ مِنَ الجَنَّةِ، وَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ فَسَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لـێ بـێ دەگێرنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویـەتی: (بـەردە رەشـەکە لەبەهشـتەوە دابەزیوە، لە شیر و ماست و دۆ سپی تر بوو بەڵام تاوانی ئادەمیزاد رەشی کرد).

٨٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ رَجَاءٍ أَبِي يَحْيَى، قَالَ: سَمِعْتُ مُسَافِعًا الحَاجِبَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ الرُّكْنَ، وَالمَقَامَ يَاقُوتَتَانِ مِنْ يَاقُوتِ الجَنَّةِ، طَمَسَ اللهُ نُورَهُمَا، وَلَوْ لَمْ يَطْمِسْ نُورَهُمَا لأَضَاءَتَا مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ. هَذَا يُرْوَى عَنْ عَبْدِ اللهِ

بْنِ عَمْرٍو مَوْقُوفًا قَوْلُهُ. وَفِيهِ عَنْ أَنَسٍ أَيْضًا وَهُوَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واته: له (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: (ڕوكن و مەقام دوو یاقوتن لە یاقوتەكانی بەهەشت، خوای گەورە ڕۆناكیەكەیانی كوژاندۆتەوە، ئەگەر خوا ڕۆناكیەكەیانی نەكوژاندایاتەوە ئەوا نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوایان ڕووناك دەكردەوە).

## دەربارەی دەرچوون بۆ مینا و مانەوە لەوێ

٥٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُرُوجِ إِلَى مِنًى وَالمقَامِ بِهَا

٨٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الأَجْلَحِ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى الظُّهْرَ، وَالعَصْرَ، وَالمغْرِبَ، وَالعِشَاءَ، وَالفَجْرَ، ثُمَّ غَدَا إِلَى عَرَفَاتٍ. وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ قَدْ تَكَلَّمُوا فِيهِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واته: له ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مینا بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و شێوان و خەوتنان و بەیانی بۆ كردین، لەپاشدا بەرەو عەرەفات كەوتەڕێ.

٨٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الأَجْلَحِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِمِنًى الظُّهْرَ وَالفَجْرَ، ثُمَّ غَدَا إِلَى عَرَفَاتٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: قَالَ يَحْيَى: قَالَ شُعْبَةُ: لَمْ

يَسْمَعِ الحَكَمُ مِنْ مِقْسَمٍ إِلاَّ خَمْسَةَ أَحَادِيثَ، وَعَدَّهَا، وَلَيْسَ هَذَا الحَدِيثُ فِيمَا عَدَّ شُعْبَةُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مینا نوێژی نیوەڕۆ بەیانی کرد، لەپاشدا بەرەو عەرەفات کەوتەڕێ.

## مینا جێگەی بارگە خستنی کەسێکە زوتر بگاتە ئەوێ

٥١ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ مِنًى مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ

٨٨١ – (ضعيف) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، وَمُحَمَّدُ بْنُ أَبَانَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُهَاجِرٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكَ، عَنْ أُمِّهِ مُسَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ نَبْنِي لَكَ بَيْتًا يُظِلُّكَ بِمِنًى؟ قَال: لاَ، مِنًى مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئایا لە میناماڵێکت بۆ دروست نەکەین سێبەرت بۆ بکات و لەگەرما بتپارێزێ؟ فەرمووی: (نەخێر، چونکە بێگومان مینا جێگەی بارگە خستنی کەسێکە زوتر بگاتە ئەوێ) – ئەو کەسە شایانترە بەو شوێنە، مینا شوێنی سەربڕینی قوربانی و شەیتان ڕەجم و سەرتاشین یان کورتکردنەوەیە، تایبەت نیە بە کەسێکەوە – .

## دەربارەی کورتکردنەوەی نوێژ لە مینا

## ٥٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْصِيرِ الصَّلاَةِ بِمِنًى

٨٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى، آمَنَ مَا كَانَ النَّاسُ وَأَكْثَرَهُ رَكْعَتَيْنِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَمَعَ عُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ رَكْعَتَيْنِ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي تَقْصِيرِ الصَّلاَةِ بِمِنًى لأَهْلِ مَكَّةَ، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لَيْسَ لأَهْلِ مَكَّةَ أَنْ يَقْصُرُوا الصَّلاَةَ بِمِنًى، إِلاَّ مَنْ كَانَ بِمِنًى مُسَافِرًا، وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ جُرَيْجٍ، وَسُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَيَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ القَطَّانِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ بَأْسَ لأَهْلِ مَكَّةَ أَنْ يَقْصُرُوا الصَّلاَةَ بِمِنًى، وَهُوَ قَوْلُ الأَوْزَاعِيِّ، وَمَالِكٍ، وَسُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَهْدِيٍّ.

واتە: لە (حَارِثَة)ی کوڕی وەهبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: لەدوای پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مینا دوو ركات نوێژم كردوە لەوكاتەدا ژمارەی خەڵكەكە زۆر زۆر بوو.

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر كورتكردنەوەی نوێژ لە مینا بۆ خەڵكی مەككە، هەندێ لە زانایان دەفەرموون: كورتكردنەوەی نوێژ لە مینا بۆ خەڵكی مەككە نیە، مەگەر كەسێ لە مینا موسافیر بێ، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئیبنو جورەیج و سوفیانی (ثوري) و یەحیای كوڕی سەعید و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

هەندێکی تر لە زانایان دەفەرموون: کورتکردنەوەی نوێژ لە مینا بۆ خەڵکی مەککە دروستە، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئەوزاعی و سوفیانی کوڕی عویەینە و (عبد الرحمن)ی کوڕی مەهدییە.

## دەربارەی وەستان و پاڕانەوە لە عەرەفات

### ٥٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوُقُوفِ بِعَرَفَاتٍ وَالدُّعَاءِ بِهَا

٨٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَفْوَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ شَيْبَانَ، قَالَ: أَتَانَا ابْنُ مِرْبَعٍ الأَنْصَارِيُّ وَنَحْنُ وُقُوفٌ بِالمَوْقِفِ مَكَانًا يُبَاعِدُهُ عَمْرٌو، فَقَالَ: إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْكُمْ يَقُولُ: كُونُوا عَلَى مَشَاعِرِكُمْ، فَإِنَّكُمْ عَلَى إِرْثٍ مِنْ إِرْثِ إِبْرَاهِيمَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ، وَجُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، وَالشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ الثَّقَفِيِّ. حَدِيثُ ابْنِ مِرْبَعٍ الأَنْصَارِيِّ حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، وَابْنُ مِرْبَعٍ: اسْمُهُ يَزِيدُ بْنُ مِرْبَعٍ الأَنْصَارِيُّ، وَإِنَّمَا يُعْرَفُ لَهُ هَذَا الحَدِيثُ الوَاحِدُ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی شەیبانەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە عەرەفە لە شوێنێ وەستابووین کە عەمر دوور بوو لەو شوێنەوە - کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێی وەستا بوو - ، ئیبنو میربەعی ئەنصاری ڕەزای خوای لێ بێ هات بۆ لامان، فەرمووی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) منی ناردوە بۆلای ئێوە: پێتان دەفەرموێت: (لە شوێنی پەرستشەکانی حەجتان بن - لەشوێنی خۆتان ڕاوەستن و بمێننەوە چونکە هەموو شوێنێکی خاکی عەرەفات شوێنی وەستانە - ، بێگومان لە ئیبراهیم پێغەمبەرەوە بە میراتی بۆتان بەجێ ماوە).

٨٨٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الطُّفَاوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ كَانَ عَلَى دِينِهَا وَهُمُ الحُمْسُ يَقِفُونَ بِالمُزْدَلِفَةِ يَقُولُونَ: نَحْنُ قَطِينُ اللهِ، وَكَانَ مَنْ سِوَاهُمْ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ كَانُوا لاَ يَخْرُجُونَ مِنَ الحَرَمِ، وَعَرَفَةُ خَارِجٌ مِنَ الحَرَمِ، وَأَهْلُ مَكَّةَ كَانُوا يَقِفُونَ بِالمُزْدَلِفَةِ، وَيَقُولُونَ: نَحْنُ قَطِينُ اللهِ، يَعْنِي: سُكَّانَ اللهِ، وَمَنْ سِوَى أَهْلِ مَكَّةَ كَانُوا يَقِفُونَ بِعَرَفَاتٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ)، وَالحُمْسُ هُمْ أَهْلُ الحَرَمِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: قورەیش و ئەوانەی کە لەسەر دینی قورەیش بوون - کە پێیان دەوتن (حُمْس) خەڵکی حەرەم کۆی (أحمس)ە کە مانای ئازایەتی و دلێری دەگەیەنێت -، لە موزدەلیفە رادەوەستان دەیانوت: ئێمە دانیشتوانی ماڵی خواین، عەرەبەکانی تریش لە عەرەفە رادەوەستان، کاتێ کە دینی ئیسلام هات خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە موزدەلیفە نەوەستێ و بڕوات بۆ عەرەفات و لەوێ راوەستێ، لەپاشدا دابەزێ بۆ موزدەلیفەو (مشعر الحرام) و مینا، وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ).

## هەموو شوێنێكی خاكی عەرەفات شوێنی وەستانە

### ٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ عَرَفَةَ كُلَّهَا مَوْقِفٌ

٨٨٥ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ: هَذِهِ عَرَفَةُ، وَهُوَ الْمَوْقِفُ، وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، ثُمَّ أَفَاضَ حِينَ غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، وَجَعَلَ يُشِيرُ بِيَدِهِ عَلَى هِيْئَتِهِ، وَالنَّاسُ يَضْرِبُونَ يَمِينًا وَشِمَالاً، يَلْتَفِتُ إِلَيْهِمْ، وَيَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ، ثُمَّ أَتَى جَمْعًا فَصَلَّى بِهِمُ الصَّلاَتَيْنِ جَمِيعًا، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى قُزَحَ فَوَقَفَ عَلَيْهِ، وَقَالَ: هَذَا قُزَحُ وَهُوَ الْمَوْقِفُ، وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، ثُمَّ أَفَاضَ حَتَّى انْتَهَى إِلَى وَادِي مُحَسِّرٍ، فَقَرَعَ نَاقَتَهُ، فَخَبَّتْ حَتَّى جَاوَزَ الوَادِيَ فَوَقَفَ، وَأَرْدَفَ الفَضْلَ ثُمَّ أَتَى الجَمْرَةَ فَرَمَاهَا، ثُمَّ أَتَى الْمَنْحَرَ، فَقَالَ: هَذَا الْمَنْحَرُ وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ. وَاسْتَفْتَتْهُ جَارِيَةٌ شَابَّةٌ مِنْ خَثْعَمٍ، فَقَالَتْ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ قَدْ أَدْرَكَتْهُ فَرِيضَةُ اللهِ فِي الحَجِّ، أَفَيُجْزِئُ أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ؟ قَالَ: حُجِّي عَنْ أَبِيكِ. قَالَ: وَلَوَى عُنُقَ الفَضْلِ، فَقَالَ العَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لِمَ لَوَيْتَ عُنُقَ ابْنِ عَمِّكَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ شَابًّا وَشَابَّةً فَلَمْ آمَنِ الشَّيْطَانَ عَلَيْهِمَا. ثُمَّ أَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَفَضْتُ قَبْلَ أَنْ أَحْلِقَ، قَالَ: احْلِقْ، أَوْ قَصِّرْ وَلاَ حَرَجَ. قَالَ: وَجَاءَ آخَرُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ، قَالَ: ارْمِ وَلاَ حَرَجَ. قَالَ: ثُمَّ أَتَى البَيْتَ فَطَافَ بِهِ، ثُمَّ أَتَى زَمْزَمَ، فَقَالَ: يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَوْلاَ أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَنْهُ لَنَزَعْتُ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَلِيٍّ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ عَيَّاشٍ. وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الثَّوْرِيِّ مِثْلَ هَذَا، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ رَأَوْا أَنْ يُجْمَعَ

بَيْنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ بِعَرَفَةَ فِي وَقْتِ الظُّهْرِ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا صَلَّى الرَّجُلُ فِي رَحْلِهِ وَلَمْ يَشْهَدِ الصَّلَاةَ مَعَ الإِمَامِ إِنْ شَاءَ جَمَعَ هُوَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ مِثْلَ مَا صَنَعَ الإِمَامُ. وَزَيْدُ بْنُ عَلِيٍّ هُوَ ابْنُ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ.

واتـە: پێشـەوا عـەلی کـوڕی (أَبِي طَالِب) ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەفـەرموێت: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە عەرەفە ڕاوەستا، فـەرمووی: (ئـەوە بـزانن ئەمە عەرەفەیە، ئەمە شوێنی وەستانە هەموو خـاکی عەرەفـە شـوێنی وەسـتانە). لەپاشدا دابەزی بۆ موزدەلیفە کاتێ کە خۆرئـاوا بـوو، ئوسـامەی لەپشـکۆدا بـوو، وەك عادەتی ڕێـی دەکـردو بەدەسـتی ئامـاژەی دەکـرد، خەڵکەکـە لـەلای ڕاسـت و چەپەوە دەیاندا لە وشترەکانیان و بە توندی لێیان دەخوڕین، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) ئـاوڕی دایـەوە لایانـداو دەیفـەرموو: (ئـەی خەڵکینـە ئـارام و لەسەرخۆبن). ئینجا هات هەتا گەیشتە موزدەلیفە بەرنوێژی دوو نوێژی پێکەوە بۆ کردن، کاتێ کە ڕۆژ بوویەوە چوو لەسەر قەزەح ڕاوەستا کە کێوێکە لـە موزدەلیفـە فـەرمووی: (ئـەوە بـزانن ئەمـە کێـوی قەزەحـە شـوێنی وەسـتانە، هـەموو خـاکی موزدەلیفە شوێنی وەستانە)، ئینجا دابەزی هەتا گەیشـتە شـیوی موحەسـیر(وَادِي مُحَسِّر)، بە قامچی دای لـە وشـترەکەی هـەتا لـە شـیوەکە تێپـەڕی، ئینجـا وەسـتا (فضل)ی خستە پشکۆی خۆیەوە، لەپاشدا هاتە لای جەمرە و ڕەجمـی کـرد، ئینجـا هات بۆ شوێنی سەربڕینی قوربانی فەرمووی: (ئەمە شوێنی سەربڕینە، ئەوە بـزانن خاکی مینا هەمووی جێگەیە بۆ سـەربڕینی قوربـانی). جاریەیـەکی جـوانی گـەنجی هۆزی (خَثْعَم) پرسیاری لێ کرد وتی: بێگومان باوکم پیاوێکی پیرە حەجی لەسـەرە بەڵام لەبەر پیری توانای ئەنجامدانی حەجی نیە، ئایا دروستە من حەجی بـۆ بکـەم؟ فـەرمووی: (بـەڵێ حـەج بکـە بـۆ باوکـت). (فضـل)ی سـەیری جاریەکـەی دەکـرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ملی گـرت و ڕووی وەرچـەرخان بـەولادا بـۆ

ئەوەی سەیری نەکات، عەباس رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەوە بۆ وا لەملی ئەو کوڕە مامەت دەکەی؟ فەرمووی: (دوو لاوم دی، ئەمین نەبووم لە شەیتان کە تووشی گوناهیان نەکات). پیاوێ هات لێی پرسی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) من نەمزانی تەوافم کرد پێش ئەوەی سەرم بتاشم، فەرمووی: (سەرت بتاشە یان کورتی بکەرەوە هیچی تێدا نیە و دروستە). پیاوێکی تر هات لێی پرسی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) من نەمزانی لەپێش شەیتان رەجم قوربانیەکەم سەربڕی، فەرمووی: (شەیتان رەجم بکە هیچی تێدا نیە و دروستە). فەرمووی: جا هات بۆ ماڵی خوا تەوافی کرد، ئینجا هات بۆ زەمزەم فەرمووی: (ئەی بەنی (عَبْدِ الْمُطَّلِب) ئاو هەڵگۆزن و بیدەن بە حاجیان، ئەگەر لەترسی ئەوە نەبوایە خەڵکتان لەسەر کۆببێتەوەو قەڵەباڵغ بێت منیش لەگەڵتان ئاوم دەدا بە خەڵك).

## دابەزین لە عەرەفاتەوە بۆ موزدەلیفە

### ٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِفَاضَةِ مِنْ عَرَفَاتٍ

٨٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَبِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، وَأَبُو نُعَيْمٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ. وَزَادَ فِيهِ بِشْرٌ: وَأَفَاضَ مِنْ جَمْعٍ وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ وَأَمَرَهُمْ بِالسَّكِينَةِ. وَزَادَ فِيهِ أَبُو نُعَيْمٍ: وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَرْمُوا بِمِثْلِ حَصَى الخَذْفِ، وَقَالَ: لَعَلِّي لاَ أَرَاكُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا. وَفِي البَابِ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە شیوی موحەسیر کەمێ خێراتر وشترەکەی لێخوڕی، بیشر لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: بە ئارامی و لەسەرخۆ لە موزدەلیفەوە دابەزی بەرەو مینا، فەرمانی کرد بە خەڵکەکە ئارام و لەسەرخۆبن. ئەبو نوعەیم لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: فەرمانی کرد بە پیچەکە بەردی وەك دەنکە پاقلە شەیتان رەجم بکەن، وە فەرمووی: (لەوانەیە لەپاش ئەم ساڵ ئیتر نەمبیننەوە).

## کۆکردنەوەی نوێژی شێوان و خەوتنان پێکەوە لە موزدەلیفە

٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الجَمْعِ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالعِشَاءِ بِالمُزْدَلِفَةِ

٨٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ، صَلَّى بِجَمْعٍ فَجَمَعَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ بِإِقَامَةٍ، وَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ مِثْلَ هَذَا فِي هَذَا الْمَكَانِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ لە موزدەلیفە بە یەك قامەت بەرنوێژی سێ رکات نوێژی شێوان و دوو رکات نوێژی خەوتنانی بۆ کردین بەیەکەوە، جا فەرمووی: پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی لەم شوێنەدا ئەم دوو نوێژەی بەم شێوەیە کرد.

٨٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِهِ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ: قَالَ يَحْيَى. وَالصَّوَابُ حَدِيثُ سُفْيَانَ. وَفِي

البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرٍ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ. حَدِيثُ ابْنُ عُمَرَ فِي رِوَايَةِ سُفْيَانَ أَصَحُّ مِنْ رِوَايَةِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، وَحَدِيثُ سُفْيَانَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ لأَنَّهُ لاَ تُصَلَّى صَلاَةُ الْمَغْرِبِ دُونَ جَمْعٍ، فَإِذَا أَتَى جَمْعًا وَهُوَ الْمُزْدَلِفَةُ جَمَعَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ، وَلَمْ يَتَطَوَّعْ فِيمَا بَيْنَهُمَا، وَهُوَ الَّذِي اخْتَارَهُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ، وَذَهَبَ إِلَيْهِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ قَالَ سُفْيَانُ: وَإِنْ شَاءَ صَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ تَعَشَّى وَوَضَعَ ثِيَابَهُ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى العِشَاءَ وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: يَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالعِشَاءِ بِالمُزْدَلِفَةِ بِأَذَانٍ وَإِقَامَتَيْنِ، يُؤَذِّنُ لِصَلاَةِ الْمَغْرِبِ وَيُقِيمُ، وَيُصَلِّي الْمَغْرِبَ ثُمَّ يُقِيمُ وَيُصَلِّي العِشَاءَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. وَرَوَى إِسْرَائِيلُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، وَخَالِدٍ ابْنَيْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ. وَحَدِيثُ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ هُوَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ أَيْضًا رَوَاهُ سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَأَمَّا أَبُو إِسْحَاقَ فَرَوَاهُ عَنْ عَبْدِ اللهِ وَخَالِدٍ ابْنَيْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لیّ بیّ، لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوەیە هاتووە.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان ڕایان وایە دەبیّ نوێژی شێوان لە موزدەلیفە ئەنجام دەدرێت، بە یەك قامەت نوێژی شێوان و نوێژی خەوتنان پێکەوە ئەنجام دەدرێن، ئەمەش وتەی پێشەوا سوفیانی (ثوري)ە، سوفیان دەفەرمووێت: ئەگەر ویستی نوێژی شێوان ئەنجام بدات، ئینجا نان بخوات و خۆی بکاتەوە، لەپاشدا نوێژی خەوتنان ئەنجام بدات.

هەندیّ لە زانایان دەفەرموون: لە موزدەلیفە بە بانگێك و دوو قامەت نوێژی شێوان و نوێژی خەوتنان پێکەوە ئەنجام دەدرێن، بانگ دەدریّ بۆ نوێژی شێوان و

قامەت دەکرێ و نوێژی شێوان ئـەنجام دەدرێ، لەپاشدا قامـەت دەکـرێ و نوێـژی خەوتنان ئەنجام دەدرێ، ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعی یە.

## ئەو کەسەی لە موزدەلیفە بگات بە پێشنوێژ ئەوە حەجەکەی دروستە

٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ أَدْرَكَ الإِمَامَ بِجَمْعٍ فَقَدْ أَدْرَكَ الحَجَّ

٨٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ، أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ أَتَوْا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِعَرَفَةَ فَسَأَلُوهُ، فَأَمَرَ مُنَادِيًا، فَنَادَى: الحَجُّ عَرَفَةُ، مَنْ جَاءَ لَيْلَةَ جَمْعٍ قَبْلَ طُلُوعِ الفَجْرِ فَقَدْ أَدْرَكَ الحَجَّ، أَيَّامُ مِنًى ثَلاَثَةٌ، فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ، وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ. قَالَ: وَزَادَ يَحْيَى: وَأَرْدَفَ رَجُلاً فَنَادَى.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی یەعمەرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، لـە عەرەفە هەندێ لە خەڵکی نەجد هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی حەج پرسیاریان لێ کرد، ئەویش فەرمانی دا بە پیاوێ کە جاڕبدات و بەدەنگی بەرز بڵێ: حەجی ڕاست و دروست حـەجی ڕۆژی عەرەفەیـە، هەرکـەس شەوی مودەلیفە پێش خۆرهەڵاتن واتە بەر لە نوێژی بەیانی هاتبێ بۆ عەرەفە ئەوە حەجەکەی تەواوە، ڕۆژەکانی مینا سێ ڕۆژن، هەرکەسێ پەلە بکات و لە دوو ڕۆژدا ئەنجامیان بدات هیچ تاوانێکی ناگات، ئەوەشی دوای بخات و سـێ ڕۆژ لـە مینـا بمێنێتەوە هیچ تاوانێکی ناگات.

٨٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. وقَالَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: قَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ: وَهَذَا أَجْوَدُ حَدِيثٍ رَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ. وَالعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ، عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ أَنَّهُ مَنْ لَمْ يَقِفْ بِعَرَفَاتٍ قَبْلَ طُلُوعِ الفَجْرِ فَقَدْ فَاتَهُ الحَجُّ وَلاَ يُجْزِئُ عَنْهُ إِنْ جَاءَ بَعْدَ طُلُوعِ الفَجْرِ وَيَجْعَلُهَا عُمْرَةً، وَعَلَيْهِ الحَجُّ مِنْ قَابِلٍ وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ نَحْوَ حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ. قَالَ: وَسَمِعْتُ الجَارُودَ يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا أَنَّهُ ذَكَرَ هَذَا الحَدِيثَ، فَقَالَ: هَذَا الحَدِيثُ أُمُّ الْمَنَاسِكِ.

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جگە لەوانیش رایان وایە ئەوەی لەپێش خۆرهەڵاتن ئامادەی عەرەفە نەبێ ئەوە حەجەكەی دەفەوتێ و دروست نیە، ئەوەی لەپاش خۆرهەڵاتن ئامادە نەبێ ئەوە بە عومرە بۆی هەژمار دەكرێ، دەبێ ساڵی داهاتوو حەجەكەی بكاتەوە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

٨٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، وَإِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، وَزَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسِ بْنِ أَوْسِ بْنِ حَارِثَةَ بْنِ لاَمٍ الطَّائِيِّ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالمُزْدَلِفَةِ حِينَ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي جِئْتُ مِنْ جَبَلَيْ طَيِّئٍ أَكْلَلْتُ رَاحِلَتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، وَاللَّهِ مَا تَرَكْتُ مِنْ حَبْلٍ إِلاَّ وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ شَهِدَ صَلاَتَنَا هَذِهِ، وَوَقَفَ مَعَنَا حَتَّى نَدْفَعَ

وَقَدْ وَقَفَ بِعَرَفَةَ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً، أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ أَتَمَّ حَجَّهُ، وَقَضَى تَفَثَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَوْلُهُ تَفَثَهُ، يَعْنِي: نُسُكَهُ، قَوْلُهُ مَا تَرَكْتُ مِنْ حَبْلٍ إِلاَّ وَقَفْتُ عَلَيْهِ: إِذَا كَانَ مِنْ رَمْلٍ يُقَالُ لَهُ حَبْلٌ، وَإِذَا كَانَ مِنْ حِجَارَةٍ يُقَالُ لَهُ: جَبَلٌ.

واتە: لە عورووەی کوڕی (مُضَرِّس)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە موزدەلیفە چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ کە دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە کێوی (طَيِّئ)ەوە هاتووم، وڵاخەکەم هیلاك و ماندو کردوە، نەفسی خۆشم هیلاك و ماندو کردوە، سوێند بە خوا هیچ کێوێکم تەرك نەکردوە ئیللا لەسەری ڕاوەستاوم، ئایا حەجم بۆ هەیە واتە ئایا حەجەکەم ڕاست و دروستە؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەوەی گەیشتبێ بەم نوێژەماندا واتە نوێژی بەیانی ڕۆژی جەژنی قوربان، لەپێشدا هاتبێ بۆ عەرەفات لە شەودا بێ یان لە ڕۆژدا ئەوە حەجەکەی ڕاست و دروستە، ئەو شتانە بکات کە لەسەریەتی لە دوای ئیحرام شکاندن وەك: سەرتاشین یان کورتکردنەوەی و خۆشتن و نینۆك کردن و هەڵکێشانی مووەکانی بن باڵ و لابردنی مووەکانی شەرمگەی).

## پێشخستنی کەسە لاوازەکان لە موزدەلیفەوە بۆ مینا

٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْدِيمِ الضَّعَفَةِ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ

٨٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَقَلٍ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَالفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شەوی موزدەلیفە لەگەڵ کەسە لاوازەکان ناردمی بۆ مینا.

٨٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الْمَسْعُودِيِّ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدَّمَ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ، وَقَالَ: لاَ تَرْمُوا الجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ لَمْ يَرَوْا بَأْسًا أَنْ يَتَقَدَّمَ الضَّعَفَةُ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ بِلَيْلٍ يَصِيرُونَ إِلَى مِنًى. وقَالَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ بِحَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُمْ لاَ يَرْمُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَرَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي أَنْ يَرْمُوا بِلَيْلٍ، وَالعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُمْ لاَ يَرْمُونَ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَقَلٍ حَدِيثٌ صَحِيحٌ، رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ. وَرَوَى شُعْبَةُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مُشَاشٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدَّمَ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ .. وَهَذَا حَدِيثٌ خَطَأٌ، أَخْطَأَ فِيهِ مُشَاشٌ، وَزَادَ فِيهِ عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَرَوَى ابْنُ جُرَيْجٍ، وَغَيْرُهُ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَمُشَاشٌ بَصْرِيٌّ رَوَى عَنْهُ شُعْبَةُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شەوی موزدەلیفە کەسوکارە لاوازەکانی پێش خست و ناردنی بۆ مینا، فەرمووی: (شەیتان ڕەجم مەکەن هەتا خۆر هەڵدێ).

## ڕەجمی شەیتان لە چێشتەنگاوی یەکەم ڕۆژی قورباندا

٥٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رَمْيِ يَوْمِ النَّحْرِ ضُحًى

٨٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمِي يَوْمَ النَّحْرِ ضُحًى، وَأَمَّا بَعْدَ ذَلِكَ، فَبَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ لاَ يَرْمِي بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ إِلاَّ بَعْدَ الزَّوَالِ.

واتە: لە جابرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان لە چێشتەنگاودا شەیتانی ڕەجم کرد، بەڵام لەدوای ئەوە واتە سێ ڕۆژەکەی تری جەژنی قوربان لەپاش نیوەڕۆ شەیتانی ڕەجم دەکرد.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە لای زۆربەی زانایان دەبێ لەدوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان لەپاش نیوەڕۆ شەیتان ڕەجم بکرێت.

## ڕۆشتن لە موزدەلیفەوە بەرەو مینا لەپێش خۆرهەڵاتن

٦٠ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الإِفَاضَةَ مِنْ جَمْعٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ

٨٩٥ - (صحيح بما بعده) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفَاضَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَإِنَّمَا كَانَ أَهْلُ الجَاهِلِيَّةِ يَنْتَظِرُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ ثُمَّ يُفِيضُونَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەپێش خۆرهەڵاتن لە موزدەلیفەوە رۆشت بەرەو مینا.

٨٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَنْبَأَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ مَيْمُونٍ، يُحَدِّثُ يَقُولُ: كُنَّا وُقُوفًا بِجَمْعٍ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: إِنَّ الْمُشْرِكِينَ كَانُوا لاَ يُفِيضُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَكَانُوا يَقُولُونَ: أَشْرِقْ ثَبِيرُ، وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَالَفَهُمْ، فَأَفَاضَ عُمَرُ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری كوڕی مەیمونەوە دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: ئێمە لە موزدەلیفە وەستابووین، پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانەران لە موزدەلیفەوە نەدەكەوتنەڕێ بەرەو مینا هەتا خۆریان لە كێوی (ثَبِير) دەبینی، بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە پێچەوانەی ئەوانەوە لەپێش خۆرهەڵاتن لە موزدەلیفەوە دەكەوتەڕێ بەرەو مینا.

پێشەوا عومەری رەزای خوای لێ بێ لەپێش خۆرهەڵاتنەوە لە موزدەلیفەوە دەكەوتەڕێ بەرەو مینا.

### ئەو بەردەی کە شەیتانی پێ ڕەجم دەکرێ دەبێ بەقەد پیچەکەیە بێ

٦١ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الجِمَارَ الَّتِي يُرْمَى بِهَا مِثْلُ حَصَى الخَذْفِ

| ٨٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمِي الجِمَارَ بِمِثْلِ حَصَى الخَذْفِ. وَفِي البَابِ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ، عَنْ أُمِّهِ وَهِيَ أُمُّ جُنْدُبٍ الأَزْدِيَّةُ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَالفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُعَاذٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ الَّذِي اخْتَارَهُ أَهْلُ العِلْمِ أَنْ تَكُونَ الجِمَارُ الَّتِي يُرْمَى بِهَا مِثْلَ حَصَى الخَذْفِ. |
|---|

واتە: لە جابرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی شەیتانی ڕەجم کرد بە وردە بەردی وەك پیچەکە کە بەقەد دەنکە پاقلەیەکە.

### دەربارەی شەیتان ڕەجم لەپاش نیوەڕۆ

٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّمْيِ بَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ

| ٨٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمِي الجِمَارَ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. |
|---|

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدووەم ڕۆژنی جەژنەوە تا کۆتایی ڕۆژانە لەپاش نیوەڕۆ شەیتانی ڕەجم دەکرد.

## دەربارەی شەیتان رەجم بە پێ و بە سواری

### ٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رَمْيِ الجِمَارِ رَاكِبًا وَمَاشِيًا

٨٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الحَجَّاجُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَمَى الجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ رَاكِبًا. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَقُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأُمِّ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَاخْتَارَ بَعْضُهُمْ أَنْ يَمْشِيَ إِلَى الجِمَارِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي إِلَى الجِمَارِ وَوَجْهُ هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَنَا أَنَّهُ رَكِبَ فِي بَعْضِ الأَيَّامِ لِيُقْتَدَى بِهِ فِي فِعْلِهِ، وَكِلاَ الحَدِيثَيْنِ مُسْتَعْمَلٌ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەكەم رۆژی جەژنی قوربان بە سواری شەیتانی رەجم كرد.

٩٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا رَمَى الجِمَارَ مَشَى إِلَيْهَا ذَاهِبًا وَرَاجِعًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنْ عُبَيْدِ اللهِ وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: يَرْكَبُ يَوْمَ النَّحْرِ، وَيَمْشِي فِي الأَيَّامِ الَّتِي بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ. وَكَأَنَّ مَنْ قَالَ هَذَا، إِنَّمَا أَرَادَ اتِّبَاعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي فِعْلِهِ، لأَنَّهُ إِنَّمَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ رَكِبَ يَوْمَ النَّحْرِ حَيْثُ ذَهَبَ يَرْمِي الجِمَارَ، وَلاَ يَرْمِي يَوْمَ النَّحْرِ إِلاَّ جَمْرَةَ العَقَبَةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كاتێ كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شەیتانی رەجم دەكرد بەپێ دەرۆشت و دەهاتەوە.

هەندێ لە زانایان دەفەرموون: یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بە سواری شەیتانی ڕەجم کرد و ڕۆژەکانی تر بە پێ. وەك بڵێی ئەوەی ئەمە دەڵێ، مەبەستی شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە کردەوەکەیدا، لەبەرئەوەی لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕنەوە، کە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان کە ڕۆشت بۆ شەیتان ڕەجم بە سواری ڕۆشت و تەنها (جَمْرَةَ العَقَبَةَ)ی ڕەجم کرد.

## دەربارەی چۆنیەتی شەیتان ڕەجم

٦٤ - بَابُ مَا جَاءَ كَيْفَ تُرْمَى الجِمَارُ

٩٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمَسْعُودِيُّ، عَنْ جَامِعِ بْنِ شَدَّادٍ أَبِي صَخْرَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: لَمَّا أَتَى عَبْدُ اللهِ جَمْرَةَ العَقَبَةِ اسْتَبْطَنَ الوَادِيَ، وَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ، وَجَعَلَ يَرْمِي الجَمْرَةَ عَلَى حَاجِبِهِ الأَيْمَنِ، ثُمَّ رَمَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ قَالَ: وَاللهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، مِنْ هَاهُنَا رَمَى الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ البَقَرَةِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی یەزیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ (عبد الله) گەیشتە لای (جَمْرَةَ العَقَبَة) لە ناوەڕاستی دا ڕاوەستا، ڕووی کردە کەعبە، حەوت بەردی یەکە یەکە تێ گرت، لەگەڵ هەر بەردێکدا (الله اكبر)ی دەکرد، لەپاشدا فەرمووی: سوێند بە (الله) کە هیچ پەرستراوێ نیە بە هەق جگە لەو پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئا لێرەوە ڕەجمی دەکرد ئەو کەسەی کە سورەتی (البقرة)ی بۆ دابەزی — بۆیە سورەتی (البقرة)ی تایبەت کرد چونکە باسی زۆربەی ئەحکامەکانی حەجی تێدایە - .

٩٠١ (م) - حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الْمَسْعُودِيِّ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وجَابِرٍ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ يَخْتَارُونَ أَنْ يَرْمِيَ الرَّجُلُ مِنْ بَطْنِ الوَادِي بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِنْ لَمْ يُمْكِنْهُ أَنْ يَرْمِيَ مِنْ بَطْنِ الوَادِي رَمَى مِنْ حَيْثُ قَدَرَ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي بَطْنِ الوَادِي.

هەندێ لە زانایان ڕێگەیان داوە ئەگەر کەسێ بۆی نەگونجاو توانای نەبوو لە (بَطْنِ الوَادِي)ەوە شەیتان ڕەجم بکات، ئەوە بە پێی توانای خۆی لەکوێوە بۆی گونجا شەیتان ڕەجم بکات، با لە (بَطْنِ الوَادِي)ەوە نەبێ.

٩٠٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، وَعَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ رَمْيُ الجِمَارِ، وَالسَّعْيُ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ لِإِقَامَةِ ذِكْرِ اللهِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بێگومان هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە و شەیتان ڕەجم بۆیە دانراون یادی خوای گەورەیان تێدا بکرێت).

## خەڵك دەركردن لەكاتی شەیتان ڕەجم دا كارێكی خراپ و ناپەسەندە

٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ طَرْدِ النَّاسِ عِنْدَ رَمْيِ الجِمَارَ

٩٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، عَنْ أَيْمَنَ بْنِ نَابِلٍ، عَنْ قُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمِي الجِمَارُ عَلَى نَاقَةٍ لَيْسَ ضَرْبٌ، وَلاَ طَرْدٌ، وَلاَ إِلَيْكَ إِلَيْكَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَنْظَلَةَ. حَدِيثُ قُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَإِنَّمَا يُعْرَفُ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَهُوَ حَدِيثُ أَيْمَنَ بْنِ نَابِلٍ وَهُوَ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ.

واتە: لە قودامەی كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی بەسەر وشترێكەوە شەیتان ڕەجمی كرد بەبێ لێدان و پاڵنان و خەڵك دەركردن، هەروەها بەبێ ئەوەی بە خەڵك بڵێ خۆتان لادەن و ڕێگە چۆڵ بكەن.

## دەربارەی بەشداربوون لە وشتر و مانگای قوربانی

٦٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِشْتِرَاكِ فِي البَدَنَةِ وَالبَقَرَةِ

٩٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَحَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الحُدَيْبِيَةِ البَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالبَدَنَةَ

عَنْ سَبْعَةٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: يَرَوْنَ الجَزُورَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ البَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالجَزُورَ عَنْ عَشَرَةٍ، وَهُوَ قَوْلُ إِسْحَاقَ، وَاحْتَجَّ بِهَذَا الحَدِيثِ، وَحَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ وَجْهٍ وَاحِدٍ.

واتە: لە جابرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە ساڵی حودەیبیەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وشتر و مانگای قوربانیمان سەربڕی یەك سەر بۆ حەوت کەس.

٩٠٥ - (صحیح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ حُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، عَنْ عِلْبَاءَ بْنِ أَحْمَرَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَ الأَضْحَى، فَاشْتَرَكْنَا فِي البَقَرَةِ سَبْعَةً، وَفِي الجَزُورِ عَشَرَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَهُوَ حَدِيثُ حُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئامادە بووین، جەژنی قوربان هاتەپێشەوە، بۆ مانگایەکی قوربانی حەوت کەس بەشداردەبووین واتە مانگایەکمان سەردەبڕی بۆ حەوت کەس و، بۆ وشترێکیش دە کەس بەشداردەبووین واتە وشترێکمان سەردەبڕی بۆ دە کەس.

## دەربارەی دیاریکردنی وشتری قوربانی

### ٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِشْعَارِ البُدْنِ

٩٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ هِشَامٍ الدَّسْتُوَائِيِّ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي حَسَّانَ الأَعْرَجِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَلَّدَ نَعْلَيْنِ، وَأَشْعَرَ الهَدْيَ فِي الشِّقِّ الأَيْمَنِ بِذِي الحُلَيْفَةِ، وَأَمَاطَ عَنْهُ الدَّمَ. وَفِي البَابِ عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو حَسَّانَ الأَعْرَجُ: اسْمُهُ مُسْلِمٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ، يَرَوْنَ الإِشْعَارَ وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. سَمِعْتُ يُوسُفَ بْنَ عِيسَى يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا يَقُولُ حِينَ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ، فَقَالَ: لاَ تَنْظُرُوا إِلَى قَوْلِ أَهْلِ الرَّأْيِ فِي هَذَا، فَإِنَّ الإِشْعَارَ سُنَّةٌ، وَقَوْلُهُمْ بِدْعَةٌ. وَسَمِعْتُ أَبَا السَّائِبِ يَقُولُ: كُنَّا عِنْدَ وَكِيعٍ، فَقَالَ لِرَجُلٍ عِنْدَهُ مِمَّنْ يَنْظُرُ فِي الرَّأْيِ: أَشْعَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَيَقُولُ أَبُو حَنِيفَةَ هُوَ مُثْلَةٌ؟ قَالَ الرَّجُلُ: فَإِنَّهُ قَدْ رُوِيَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ أَنَّهُ قَالَ: الإِشْعَارُ مُثْلَةٌ. قَالَ: فَرَأَيْتُ وَكِيعًا غَضِبَ غَضَبًا شَدِيدًا، وَقَالَ: أَقُولُ لَكَ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَقُولُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ، مَا أَحَقَّكَ بِأَنْ تُحْبَسَ، ثُمَّ لاَ تَخْرُجَ حَتَّى تَنْزِعَ عَنْ قَوْلِكَ هَذَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە (ذِي الْحُلَيْفَة) نوێژی نیوەڕۆی کرد، لەپاشدا داوای کرد وشترێ لە وشترە دیاریەکانی ماڵی خوایان بۆ هێنا، دوو نەعلی کردە ملیەوە و نیشانەی کرد، بە شێوەیە تیغی دا لەسەر بەشی لای راستی کۆپارەکەی و لەتی کرد خوێنی پێدا هاتەخوارەوە.

## دەروازە

٦٨ – بَابٌ

٩٠٧ – (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ الْيَمَانِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اشْتَرَى هَدْيَهُ مِنْ قُدَيْدٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ الْيَمَانِ. وَرُوِيَ عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ اشْتَرَى هَدْيَهُ مِنْ قُدَيْدٍ. وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە قودەید ئاژەڵە دیارییەکانی کڕی. لە نێوان مەککە و مەدینەدایە.

لە نافیعەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ لە قودەید ئاژەڵە دیارییەکانی کڕی.

## ملوانکە کردنە ملی ئاژەڵی دیاری بۆ کەسی نیشتەجێ

٦٩ – بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْلِيدِ الْهَدْيِ لِلْمُقِيمِ

٩٠٨ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: فَتَلْتُ قَلاَئِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ لَمْ يُحْرِمْ وَلَمْ يَتْرُكْ شَيْئًا مِنَ الثِّيَابِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ قَالُوا: إِذَا قَلَّدَ الرَّجُلُ الْهَدْيَ وَهُوَ يُرِيدُ الْحَجَّ، لَمْ يَحْرُمْ عَلَيْهِ شَيْءٌ مِنَ الثِّيَابِ وَالطِّيبِ حَتَّى يُحْرِمَ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: إِذَا قَلَّدَ الرَّجُلُ هَدْيَهُ فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ مَا وَجَبَ عَلَى الْمُحْرِمِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بەدەستی خۆم ملوانکەی ئاژەڵە دیارییەکانی پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هۆندۆتەوە، جا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەو ملوانکانەی دەکردە ملیان و نیشانەی دەکردن، لەپاشدا دەیناردن بۆ ماڵی خوا، خۆشی لە مەدینە دەمایەوە، هیچ شتێکی لێ حەرام نەدەبوو کە پێشتر بۆی حەڵاڵ بوو وەك پۆشینی پۆشاك و بۆنی خۆش.

## دەربارەی ملوانکە کردنە ملی مەڕ و بزن

٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْلِيدِ الغَنَمِ

٩٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَ هْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلاَئِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلَّهَا غَنَمًا، ثُمَّ لاَ يُحْرِمُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: يَرَوْنَ تَقْلِيدَ الغَنَمِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بەدەستی خۆم ملوانکەی سەرجەم مەڕ و بزنە دیارییەکانی پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هۆندۆتەوە، لەپاشدا هیچ شتێکی لێ حەرام نەدەبوو کە پێشتر بۆی حەڵاڵ بوو وەك پۆشاك و بۆنی خۆش.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕایان وایە دەبێ مەڕ و بزنیش دیاری بکرێن.

## ئەگەر ئاژەڵی دیاری کەوتە حاڵەتی لەناوچوون چی لێ دەکرێ

٧١ – بَابُ مَا جَاءَ إِذَا عَطِبَ الهَدْيُ مَا يُصْنَعُ بِهِ

٩١٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ نَاجِيَةَ الخُزَاعِيِّ، صَاحِبِ بُدْنِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ أَصْنَعُ بِمَا عَطِبَ مِنَ البُدْنِ؟ قَالَ: انْحَرْهَا، ثُمَّ اغْمِسْ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ خَلِّ بَيْنَ النَّاسِ وَبَيْنَهَا، فَيَأْكُلُوهَا. وَفِي البَابِ عَنْ ذُؤَيْبٍ أَبِي قَبِيصَةَ الخُزَاعِيِّ. حَدِيثُ نَاجِيَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا فِي هَدْيِ التَّطَوُّعِ: إِذَا عَطِبَ لاَ يَأْكُلُ هُوَ، وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِهِ، وَيُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ يَأْكُلُونَهُ، وَقَدْ أَجْزَأَ عَنْهُ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالُوا: إِنْ أَكَلَ مِنْهُ شَيْئًا غَرِمَ بِقَدْرِ مَا أَكَلَ مِنْهُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا أَكَلَ مِنْ هَدْيِ التَّطَوُّعِ شَيْئًا فَقَدْ ضَمِنَ الَّذِي أَكَلَ.

واتە: لە ناجیەی خوزاعی خاوەن ئاژەڵە دیارییەکانی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەگەر یەکێ لە ئاژەڵە دیارییەکان کەوتە حاڵەتی تیاچوونەوە چی لێ بکەم؟ فەرمووی: (سەری ببرە، لەپاشدا نەعلەکەی بێنە بە خوێنەکەیدا با خوێناوی ببێ و وازی لێ بێنە با خەڵك لێی بخۆن). – نەعلەکەی خوێناوی بکات بۆ ئەوەی خەڵك بزانێ ئاژەڵی دیارییە – .

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان دەربارەی ئاژەڵی دیاری کەوتە حاڵەتی تیاچوونەوە دەفەرموون: با خۆی و هاوڕێکانی کاروانیەکەی لێی نەخۆن، وازی لێ بێنن با خەڵك لێی بخۆن، ئەوە دروستە، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد

و ئیسحاقە. دەفەرموون: ئەگەر لێی خوارد بە ئەندازەی ئەوەی خواردوویەتی غەرامە دەکرێت. هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەگەر شتێکی لێ خوارد دەبێ بیگۆڕێ بەئاژەڵێکی تر. ئەمەش خیلافی جمهوری زانایانە وەك لە (تحفة الأحوذي)دا هاتووە.

## دەربارەی سواربوونی ئاژەڵی دیاری

٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رُكُوبِ البَدَنَةِ

٩١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ لَهُ: ارْكَبْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ قَالَ لَهُ فِي الثَّالِثَةِ أَوْ فِي الرَّابِعَةِ: ارْكَبْهَا وَيْحَكَ، أَوْ وَيْلَكَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ فِي رُكُوبِ البَدَنَةِ إِذَا احْتَاجَ إِلَى ظَهْرِهَا، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ يَرْكَبُ مَا لَمْ يُضْطَرَّ إِلَيْهَا.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پیاوێکی بینی وشترێکی دیاری بۆ قوربانی لێ دەخوڕی، پێی فەرموو: (سواری ببە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وشتری دیارییە بۆ قوربانی، لە جاری سێهەم یان چوارەمدا پێی فەرموو: (سواری ببە وەیل بۆ تۆ).

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رێگەیان

داوە بە سواربوونی ئاژەڵی دیاری ئەگەر پێویست بوو، ئەمەش وتەی شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر ناچار نەبوو با سواری نەبێ.

## لەکوێی سەرەوە دەست بکرێت بە سەرتاشین

### ٧٣ - بَابُ مَا جَاءَ بِأَيِّ الرَّأْسِ يَبْدَأُ فِي الحَلْقِ

٩١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا رَمَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الجَمْرَةَ نَحَرَ نُسُكَهُ، ثُمَّ نَاوَلَ الحَالِقَ شِقَّهُ الأَيْمَنَ فَحَلَقَهُ، فَأَعْطَاهُ أَبَا طَلْحَةَ، ثُمَّ نَاوَلَهُ شِقَّهُ الأَيْسَرَ فَحَلَقَهُ، فَقَالَ: اقْسِمْهُ بَيْنَ النَّاسِ. حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شەیتانی ڕەجم کردو قوربانیەکەی سەربڕی، لەپاشدا سەرتاشی بانگ کرد سەرتاشەکە لای ڕاستی سەری تاشی، ئینجا لای چەپی سەری تاشی، مووەکانی دا بە ئەبو (طَلْحَة)، فەرمووی: (دابەشی بکە بەسەرخەڵکدا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرتاشین و کورکردنەوەی

٧٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَلْقِ وَالتَّقْصِيرِ

٩١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: حَلَقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَحَلَقَ طَائِفَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَقَصَّرَ بَعْضُهُمْ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: رَحِمَ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ قَال: وَالمقَصِّرِينَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ أُمِّ الحُصَيْنِ، وَمَارِبَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي مَرْيَمَ، وَحُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: يَخْتَارُونَ أَنْ يَحْلِقَ رَأْسَهُ، وَإِنْ قَصَّرَ يَرَوْنَ أَنَّ ذَلِكَ يُجْزِئُ عَنْهُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەری تاشی، هەندێ لە هاوەڵانی سەریان تاشی، هەندێکیان قژیان کورتکردەوە، ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوو تا سێ جار فەرمووی: (خودایە ڕەحم بکە بەوانەی سەریان تاشی)، لەپاشدا فەرمووی: (خودایە ڕەحم بکە بەوانەش مووی سەریان کورتکردەوە).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان ئەمەیان پەسەند کردووە: پیاو سەری بتاشێ، خۆ ئەگەر کورتیشی بکاتەوە هەر دروستە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## سەرتاشین لەلایەن ئافرەتانەوە کارێکی ناپەسندە

### ٧٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الحَلْقِ لِلنِّسَاءِ

٩١٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى الْجُرَشِيُّ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ خِلاَسِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَحْلِقَ الْمَرْأَةُ رَأْسَهَا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رێگری کردووە لەوەی ئافرەت سەری بتاشێ.

٩١٥ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ خِلاَسٍ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَلِيٍّ. حَدِيثُ عَلِيٍّ فِيهِ اضْطِرَابٌ. وَرُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ تَحْلِقَ الْمَرْأَةُ رَأْسَهَا، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ لاَ يَرَوْنَ عَلَى الْمَرْأَةِ حَلْقًا، وَيَرَوْنَ أَنَّ عَلَيْهَا التَّقْصِيرَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رێگری کردووە لەوەی ئافرەت سەری بتاشێ. هەندێ لە زانایان رایان وایە ئافرەت بەس قژی کورتکاتەوە.

## سەرتاشین لەپێش قوربانی کردن، یان قوربانی لەپێش شەیتان رەجم

### ٧٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ حَلَقَ قَبْلَ أَنْ يَذْبَحَ، أَوْ نَحَرَ قَبْلَ أَنْ يَرْمِيَ

٩١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، وَابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو،

أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ فَقَالَ: اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ، وَسَأَلَهُ آخَرُ، فَقَالَ: نَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: ارْمِ وَلاَ حَرَجَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا قَدَّمَ نُسُكًا قَبْلَ نُسُكٍ فَعَلَيْهِ دَمٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) وتی: من نەمزانی سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم، فەرمووی: (سەری ببڕە هیچی تێدا نیەو دروستە)، پیاوێکی تر هات لێی پرسی وتی: من نەمزانی قوربانیەکەم سەربڕی پێش ئەوەی شەیتان ڕەجم بکەم؟ فەرمووی: (بڕۆ ڕەجمی بکە هیچی تێدا نیەو دروستە).

## بەکارهێنانی بۆنی خۆش لەپێش تەواف لەلایەن ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە

### ٧٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الطِّيبِ عِنْدَ الإِحْلاَلِ قَبْلَ الزِّيَارَةِ

٩١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَنْصُورٌ يَعْنِي ابْنَ زَاذَانَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَيَوْمَ النَّحْرِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالبَيْتِ، بِطِيبٍ فِيهِ مِسْكٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ يَرَوْنَ: أَنَّ الْمُحْرِمَ إِذَا رَمَى جَمْرَةَ العَقَبَةِ يَوْمَ النَّحْرِ، وَذَبَحَ، وَحَلَقَ أَوْ قَصَّرَ، فَقَدْ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ حَرُمَ عَلَيْهِ إِلاَّ النِّسَاءَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ

عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ أَنَّهُ قَالَ: حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ النِّسَاءَ وَالطِّيبَ، وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: مـن خـۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) پـێش ئـەوەی ئیحـرام دابەستێ، یەکەم رۆژی جەژنی قوربـانیش پـێش ئـەوەی تـەواف بکـات بـە بـۆنێکی خۆش میسکی پێوە بوو.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان وایە: ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە لەدوای شـەیتان رەجم و قوربانی کردن و سەرتاشین یان کورتکردنەوەی، هەر شتێك کـە پێشـتر بـۆی حەرام بووە بۆی حەڵاڵە جگە لە چوونە لای هاوسەرەکەی، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هـەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە جگە لە چوونە لای هاوسـەرەکەی و بـەکارهێنانی بـۆنی خـۆش. هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگـە لـەوانیش رایـان وایـە، ئەمەش وتەی خەڵکی کوفەیە.

## لە حەج (لبيك اللهم لبيك) کەی تەواو دەبێ

٧٨ - بَابُ مَا جَاءَ مَتَى تُقْطَعُ التَّلْبِيَةُ فِي الحَجِّ

٩١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى الجَمْرَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ الفَضْلِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الحَاجَّ لاَ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ حَتَّى يَرْمِيَ الجَمْرَةَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە (فَضْل)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە موزدەلیفە خستمیە پشکۆی خۆیەوە هەتا مینا بەردەوام تەلبییەی دەکرد هەتا شەیتانی ڕەجم کرد.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان وایە: حاجی هەتا شەیتان ڕەجم دەکات تەلبیە بکات ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## لە عومرە (لبيك اللهم لبيك)ە کەی تەواو دەبێ

٧٩ - بَابُ مَا جَاءَ مَتَى تُقْطَعُ التَّلْبِيَةُ فِي العُمْرَةِ

٩١٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ، يَرْفَعُ الحَدِيثَ؛ أَنَّهُ كَانَ يُمْسِكُ عَنِ التَّلْبِيَةِ فِي العُمْرَةِ إِذَا اسْتَلَمَ

الحَجَرَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا: لاَ يَقْطَعُ الْمُعْتَمِرُ التَّلْبِيَةَ حَتَّى يَسْتَلِمَ الحَجَرَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا انْتَهَى إِلَى بُيُوتِ مَكَّةَ قَطَعَ التَّلْبِيَةَ. وَالعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ - فەرموودەکەی بەرزکردەوە بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) - دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بێگومان لە عومرەدا کاتێ کە دەستی دەهێنا لەبەردە ڕەشەکە ئیتر تەلبیەی نەدەکرد.

## دەربارەی تەوافی زیارەت لەشەودا

٨٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طَوَافِ الزِّيَارَةِ بِاللَّيْلِ

٩٢٠ - (شاذ) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَّرَ طَوَافَ الزِّيَارَةِ إِلَى اللَّيْلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي أَنْ يُؤَخَّرَ طَوَافُ الزِّيَارَةِ إِلَى اللَّيْلِ، وَاسْتَحَبَّ بَعْضُهُمْ أَنْ يَزُورَ يَوْمَ النَّحْرِ، وَوَسَّعَ بَعْضُهُمْ أَنْ يُؤَخَّرَ وَلَوْ إِلَى آخِرِ أَيَّامِ مِنًى.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەوافی زیارەتی دوادەخست بۆ شەو.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان ڕایان وایە: لە عومرەدا هەتا دەستهێنان بە بەردە ڕەشەکەدا تەلبیە دەکرێت. هەندێکیان دەفەرموون: هەتا دەگەنە ماڵەکانی ناو شاری مەککە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دابەزین لە (أَبْطَح)

٨١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نُزُولِ الأَبْطَحِ

٩٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، يَنْزِلُونَ الأَبْطَحَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي رَافِعٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ. وَقَدْ اسْتَحَبَّ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ نُزُولَ الأَبْطَحِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَرَوْا ذَلِكَ وَاجِبًا إِلاَّ مَنْ أَحَبَّ ذَلِكَ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَنُزُولُ الأَبْطَحِ لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ، إِنَّمَا هُوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و ئەبو بەکر و عومەر و (عُثْمَان) لە (أَبْطَح) دادەبەزین.

٩٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَيْسَ التَّحْصِيبُ بِشَيْءٍ، إِنَّمَا هُوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: التَّحْصِيبُ: نُزُولُ الأَبْطَحِ. هذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە (أَبْطَح) دابەزین هیچی تێدا نیەو روکنێ نیە لە مەناسیکی حەج، بەڵکو مەنزلگایەکە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێی دادەبەزی — بۆئەوەی بحەوێتەوە و بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆ شاری مەدینە- .

## کێ لە (أَبْطَح) دادەبەزی

٨٢ - بَابُ مَنْ نَزَلَ الأَبْطَحَ

٩٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبِيبٌ الْمُعَلِّمُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنَّمَا نَزَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الأَبْطَحَ لأَنَّهُ كَانَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ نَحْوَهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە (أَبْطَح) دادەبەزی لەبەرئەوەی لەوێوە بە ئاسانی دەرچێ و بگەڕێتەوە بۆ مەدینە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی حەجی منداڵ

٨٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَجِّ الصَّبِيِّ

٩٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ طَرِيفٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سُوقَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: رَفَعَتْ امْرَأَةٌ صَبِيًّا لَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِهَذَا حَجٌّ، قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ژنێ منداڵێکی خۆی بەرزکردەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەمە حەجی بۆ هەیە؟ فەمووی: (بەڵێ، بەڵام خێر و پاداشتەکەی بۆ تۆیە).

٩٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَزَعَةُ بْنُ سُوَيْدٍ البَاهِلِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

٩٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يُوسُفَ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: حَجَّ بِي أَبِي مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ وَأَنَا ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. وَقَدْ أَجْمَعَ أَهْلُ العِلْمِ: أَنَّ الصَّبِيَّ إِذَا حَجَّ قَبْلَ أَنْ يُدْرِكَ فَعَلَيْهِ الحَجُّ إِذَا أَدْرَكَ، لاَ تُجْزِئُ عَنْهُ تِلْكَ الحَجَّةُ عَنْ حَجَّةِ الإِسْلاَمِ، وَكَذَلِكَ الْمَمْلُوكُ إِذَا حَجَّ فِي رِقِّهِ ثُمَّ أُعْتِقَ فَعَلَيْهِ الحَجُّ إِذَا وَجَدَ إِلَى ذَلِكَ سَبِيلاً، وَلاَ يُجْزِئُ عَنْهُ مَا حَجَّ فِي حَالِ رِقِّهِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەحەجی ماڵاوایی‌دا حەوت ساڵان بووم باوکم حەجی پێ کردم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

زانایان کۆ و یەکدەنگن لەسەر ئەمە: ئەگەر منداڵ حەجی کرد پێش باڵغ بوون کاتێ کە باڵغ بوو ئەوە حەجی لەسەرە ئەگەر دەسەڵات و توانای هەبوو دەبێ حەج بکات، بەندەش ئەگەر لەکاتی بەندەیی‌دا حەجی کرد، کاتێ کە ئازاد کرا حەجی لەسەرە ئەگەر دەسەڵات و توانای هەبوو دەبێ حەج بکات، ئەگینا هیچ کامیان ئەو حەجەی کە ئیسلام دایناوە لەسەریان ناکەوێ.

## باسێکی تر

٨٤ - بَابٌ

٩٢٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الوَاسِطِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ نُمَيْرٍ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ سَوَّارٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا إِذَا حَجَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكُنَّا نُلَبِّي عَنِ النِّسَاءِ، وَنَرْمِي عَنِ الصِّبْيَانِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ أَجْمَعَ أَهْلُ العِلْمِ عَلَى: أَنَّ الْمَرْأَةَ لاَ يُلَبِّي عَنْهَا غَيْرُهَا، بَلْ هِيَ تُلَبِّي عَنْ نَفْسِهَا، وَيُكْرَهُ لَهَا رَفْعُ الصَّوْتِ بِالتَّلْبِيَةِ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ لە خزمەت خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حەجمان دەکرد لەجیاتی ئافرەتان (لبیك اللهم لبیك)ەمان دەکرد، هەروەها لەجیاتی منداڵانیش شەیتانمان رەجم دەکرد.

بێگومان زانایان کۆ و یەکدەنگن لەسەر ئەمە: نابێ لەجیاتی ئافرەتان (لبیك اللهم لبیك) بکرێت، بەڵکو دەبێ خۆیان بیڵێن، لەو کاتەشدا باش نیە دەنگیان بەرزکەنەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی حەجکردن بۆ پیاوی پیر و مردوو

٨٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَجِّ عَنِ الشَّيْخِ الكَبِيرِ، وَالمَيِّتِ

٩٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمٍ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبِي أَدْرَكَتْهُ

فَرِيضَةُ اللهِ فِي الحَجِّ وَهُوَ شَيْخٌ كَبِيرٌ لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْتَوِيَ عَلَى ظَهْرِ البَعِيرِ، قَالَ: حُجِّي عَنْهُ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَبُرَيْدَةَ، وَحُصَيْنِ بْنِ عَوْفٍ، وَأَبِي رَزِينٍ العُقَيْلِيِّ، وَسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ حُصَيْنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَيْضًا، عَنْ سِنَانِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الجُهَنِيِّ، عَنْ عَمَّتِهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذِهِ الرِّوَايَاتِ، فَقَالَ: أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا البَابِ مَا رَوَى ابْنُ عَبَّاسٍ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَيُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ ابْنُ عَبَّاسٍ سَمِعَهُ مِنَ الفَضْلِ وَغَيْرِهِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ رَوَى هَذَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَرْسَلَهُ وَلَمْ يَذْكُرِ الَّذِي سَمِعَهُ مِنْهُ. وَقَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا البَابِ غَيْرُ حَدِيثٍ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. وَبِهِ يَقُولُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ يَرَوْنَ أَنْ يُحَجَّ عَنِ الْمَيِّتِ. وقَالَ مَالِكٌ: إِذَا أَوْصَى أَنْ يُحَجَّ عَنْهُ حُجَّ عَنْهُ. وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُهُمْ أَنْ يُحَجَّ عَنِ الحَيِّ إِذَا كَانَ كَبِيرًا أَوْ بِحَالٍ لاَ يَقْدِرُ أَنْ يَحُجَّ، وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە (فضل)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئافرەتێ لە هۆزی (خَثْعَم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، حەج فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی کەوتۆتە سەر باوکم ئەویش پیرێکی بە ساڵاچووەو بەسواری وڵاخەوە خۆی ناگرێت: ئایا دەبێت من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ، حەجی بۆ بکە).

**باسێكی تر:**

٨٦ - بَابٌ

٩٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَطَاءٍ (ح) وحَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَلَمْ تَحُجَّ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، حُجِّي عَنْهَا. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بورەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئافرەتێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وتی: دایكم مردووەو حەجی نەكردووە، ئایا حەجی بۆ بكەم؟ فەرمووی: (بەڵێ، حەجی بۆ بكە).

**باسێكی تر لەوبارەوە**

٨٧ - بَابٌ مِنْهُ

٩٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ، عَنْ أَبِي رَزِينٍ العُقَيْلِيِّ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ لاَ يَسْتَطِيعُ الحَجَّ، وَلاَ العُمْرَةَ، وَلاَ الظَّعْنَ، قَالَ: حُجَّ عَنْ أَبِيكَ وَاعْتَمِرْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَإِنَّمَا ذُكِرَتِ العُمْرَةُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا الحَدِيثِ أَنْ يَعْتَمِرَ الرَّجُلُ عَنْ غَيْرِهِ. وَأَبُو رَزِينٍ العُقَيْلِيُّ: اسْمُهُ لَقِيطُ بْنُ عَامِرٍ.

واتە: لە ئەبو ڕەزینی عوقەیلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە هاتە

خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، باوکم پیر بووە بەسواری ولاخەوە خۆی ناگرێت ناتوانێ حەج و عومرە بکات، ئایا دەبێت من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ، حەج و عومرەی بۆ بکە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی عومرە کە ئایا واجبە یان نا

٨٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العُمْرَةِ أَوَاجِبَةٌ هِيَ أَمْ لاَ؟

٩٣١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ العُمْرَةِ أَوَاجِبَةٌ هِيَ؟ قَال: لاَ، وَأَنْ تَعْتَمِرُوا هُوَ أَفْضَلُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا: العُمْرَةُ لَيْسَتْ بِوَاجِبَةٍ. وَكَانَ يُقَالُ: هُمَا حَجَّانِ الحَجُّ الأَكْبَرُ يَوْمُ النَّحْرِ، وَالحَجُّ الأَصْغَرُ العُمْرَةُ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: العُمْرَةُ سُنَّةٌ، لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَخَّصَ فِي تَرْكِهَا، وَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ ثَابِتٌ بِأَنَّهَا تَطَوُّعٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِإِسْنَادٍ وَهُوَ ضَعِيفٌ، لاَ تَقُومُ بِمِثْلِهِ الحُجَّةُ، وَقَدْ بَلَغَنَا عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ كَانَ يُوجِبُهَا. كُلُّهُ كَلاَمُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە دەربارەی عومرە واجبە یان نا لە پێغەمبەریان (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی؟ فەرمووی: (نەخێر، بەلام ئەنجامدانی چاکترە).

## باسێکی تر لەوبارەوە

### ٨٩ - بَابٌ مِنْهُ

٩٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَال: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: دَخَلَتِ العُمْرَةُ فِي الحَجِّ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ. وَفِي البَاب عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ جُعْشُمٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: أَنْ لاَ بَأْسَ بِالعُمْرَةِ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ، وَهَكَذَا قَالَ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: أَنَّ أَهْلَ الجَاهِلِيَّةِ كَانُوا لاَ يَعْتَمِرُونَ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ رَخَّصَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ، فَقَال: دَخَلَتِ العُمْرَةُ فِي الحَجِّ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، يَعْنِي: لاَ بَأْسَ بِالعُمْرَةِ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ، وَأَشْهُرُ الحَجِّ: شَوَّالٌ، وَذُو القَعْدَةِ، وَعَشْرٌ مِنْ ذِي الحِجَّةِ، لاَ يَنْبَغِي لِلرَّجُلِ أَنْ يُهِلَّ بِالحَجِّ إِلاَّ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ، وَأَشْهُرُ الحُرُمِ: رَجَبٌ، وَذُو القَعْدَةِ، وَذُو الحِجَّةِ، وَالمحَرَّمُ، هَكَذَا قَالَ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئیتر لەم ڕۆژەوە هەتا ڕۆژی قیامەت عومرە لەگەڵ حەج تێکەڵ بووە واتە دەبێ لەگەڵ حەجدا عومرەش ئەنجام بدرێ).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی عومرە

### ٩٠ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي فَضْلِ العُمْرَةِ

٩٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ

أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ تُكَفِّرُ مَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەنجامدانی عومرەیە بۆ عومرەیەکی تر دەبێتەهۆی سڕینەوەی گوناهی نێوانیان، حەجی وەرگیراو پاداشتەکەی بەهەشتە).

## دەربارەی ئیحرام دابەستن لە تەنعیم بۆ عومرە

٩١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْعُمْرَةِ مِنَ التَّنْعِيمِ

٩٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، وَابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ أَنْ يُعْمِرَ عَائِشَةَ مِنَ التَّنْعِيمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی ئەبو بەکرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی کرد بە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی ئەبو بەکر عائیشەی خوشکی بەرێ بۆ تەنعیم بۆ ئەوەی لەوێ بە نیەتی عومرە ئیحرام دابەستێ

## دەربارەی ئیحرام دابەستن لە جیعرانە بۆ عومرە

٩٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْعُمْرَةِ مِنَ الْجِعِرَّانَةِ

٩٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ

جُرَيْجٍ، عَنْ مُزَاحِمِ بْنِ أَبِي مُزَاحِمٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ مُحَرِّشٍ الكَعْبِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ مِنَ الجِعِرَّانَةِ لَيْلاً مُعْتَمِرًا، فَدَخَلَ مَكَّةَ لَيْلاً، فَقَضَى عُمْرَتَهُ، ثُمَّ خَرَجَ مِنْ لَيْلَتِهِ، فَأَصْبَحَ بِالجِعِرَّانَةِ كَبَائِتٍ، فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ مِنَ الغَدِ خَرَجَ مِنْ بَطْنِ سَرِفَ، حَتَّى جَاءَ مَعَ الطَّرِيقِ طَرِيقِ جَمْعٍ بِبَطْنِ سَرِفَ، فَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ خَفِيَتْ عُمْرَتُهُ عَلَى النَّاسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَلاَ نَعْرِفُ لِمُحَرِّشٍ الكَعْبِيِّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ.

واتە: لە موحەریشی کەعبییەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شەو لە جیعرانە ئیحرامی دابەست بۆ عومرەو دەرچوو بەرەو شاری مەککەی پیرۆز، هەر ئەو شەوە چووە ناو مەککەوە عومرەی کرد تەواوی کردو هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی کرد، هەر هەمان شەو گەڕایەوە بۆ جیعرانەو لەوێ مایەوە وەك ئەوەی شەو هەر لەوێ بووبێ و نەڕۆشتبێ بۆ مەککە، ئینجا کاتێ کە خۆر لایدا سواری وڵاخەکەی بوو، رووی کردە ناو شیوەکەی سەریف هەتا گەیشتە سەر رێگای مەدینە لەوێوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، لەپێناوی ئەوەدا عومرەکە شاردرایەوە لە خەڵك.

## دەربارەی عومرەی مانگی رەجەب

٩٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عُمْرَةِ رَجَبٍ

٩٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ عُرْوَةَ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عُمَرَ: فِي أَيِّ شَهْرٍ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: فِي رَجَبٍ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: مَا اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ وَهُوَ مَعَهُ، تَعْنِي ابْنَ عُمَرَ، وَمَا اعْتَمَرَ فِي

شَهْرِ رَجَبٍ قَطُّ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: حَبِيبُ بْنُ أَبِي ثَابِتٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ

واتە: لە عورووەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: دەربـارەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە چ مانگێکدا عـومرەی دەکـرد لـە ئیبنـو عومەریان ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی؟ فـەرمووی: لـە مـانگی ڕەجەبدا، عائیشـە ڕەزای خـوای لـێ بـێ فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) هـەر عومرەیـەکی کردبـێ ئیبنـو عومـەری لەگـەڵ بـووە، هـەرگیز لـە مـانگی ڕەجەبـدا عومرەی نەکردووە.

٩٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اعْتَمَرَ أَرْبَعًا إِحْدَاهُنَّ فِي رَجَبٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، چوار عومرەی کردووە یەکێکیان لە مانگی ڕەجەبدا بوو.

## دەربارەی عومرەی مانگی (ذي القعدة)

٩٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عُمْرَةِ ذِي القَعْدَةِ

٩٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا العَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ هُوَ السَّلُولِيُّ الكُوفِيُّ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اعْتَمَرَ فِي ذِي القَعْدَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە بەرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لە مانگی (ذي القعدة)دا عومرەی کرد.

## دەربارەی عومرەی مانگی ڕەمەزان.

٩٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عُمْرَةِ رَمَضَانَ

٩٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ أُمِّ مَعْقِلٍ، عَنْ أُمِّ مَعْقِلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَال: عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَوَهْبِ بْنِ خَنْبَشٍ. وَيُقَالُ: هَرِمُ بْنُ خَنْبَشٍ. قَالَ بَيَانٌ وَجَابِرٌ: عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ وَهْبِ بْنِ خَنْبَشٍ. وقَالَ دَاوُدُ الأَوْدِيُّ: عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ هَرِمُ بْنِ خَنْبَشٍ. وَوَهْبٌ أَصَحُّ. وَحَدِيثُ أُمِّ مَعْقِلٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وقَالَ أَحْمَدُ وَإِسْحَاقُ: قَدْ ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً. قَالَ إِسْحَاقُ: مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ مِثْلُ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَال: مَنْ قَرَأَ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فَقَدْ قَرَأَ ثُلُثَ القُرْآنِ.

واتە: لە ئوممو مەعقیلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەنجامدانی عومرەیە لە مانگی ڕەمەزاندا بەرامبەر بە حەجێکە).

پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێ: مانای ئەم فەرموودە وەك ئەم فەرموودە وایە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) بخوێنێ وەك ئەوە وایە سێیەکی قورئان بخوێنێ.

## کەسێ ئیحرام دابەستێ بۆ حەج قاچی شکا یان توشی شەلی بوو

### ٩٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الَّذِي يُهِلُّ بِالحَجِّ فَيُكْسَرُ أَوْ يَعْرَجُ

٩٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ الصَّوَّافُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي الحَجَّاجُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ كُسِرَ أَوْ عَرِجَ فَقَدْ حَلَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى. فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالاَ: صَدَقَ.

واتە: لە عیکریمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: حەجاجی کوڕی عەمر ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ قاچی شکا یان توشی شەلی بوو بە جۆرێ کە بوونە ڕێگر لەبەردەم ئەنجامدانی دروشم و ئەرکانەکانی حەج ئەوە دروستە ئیحرامەکەی بشکێنێ بەڵام لەسەریەتی ساڵی داهاتوو حەجەکەی بکاتەوە). ئەم گێڕایەوە بۆ ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموویان: ڕاست دەکات.

٩٤٠ (م ١) - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، عَنِ الحَجَّاجِ مِثْلَهُ. قَالَ: وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. هَكَذَا رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الحَجَّاجِ الصَّوَّافِ نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ. وَرَوَى مَعْمَرٌ، وَمُعَاوِيَةُ بْنُ سَلاَّمٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَافِعٍ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الحَدِيثَ. وَحَجَّاجٌ الصَّوَّافُ لَمْ يَذْكُرْ فِي حَدِيثِهِ عَبْدَ اللهِ بْنَ رَافِعٍ، وَحَجَّاجٌ ثِقَةٌ حَافِظٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: رِوَايَةُ مَعْمَرٍ، وَمُعَاوِيَةَ بْنِ سَلاَّمٍ أَصَحُّ.

٩٤٠ (م ٢) - حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَافِعٍ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مەرج دانان لە حەجدا

٩٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاشْتِرَاطِ فِي الحَجِّ

٩٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ عَوَّامٍ، عَنْ هِلَالِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ ضُبَاعَةَ بِنْتَ الزُّبَيْرِ أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أُرِيدُ الحَجَّ، أَفَأَشْتَرِطُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَتْ: كَيْفَ أَقُولُ؟ قَالَ: قُولِي لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ مَحِلِّي مِنَ الأَرْضِ حَيْثُ تَحْبِسُنِي. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ يَرَوْنَ الِاشْتِرَاطَ فِي الحَجِّ، وَيَقُولُونَ: إِنْ اشْتَرَطَ فَعَرَضَ لَهُ مَرَضٌ أَوْ عُذْرٌ فَلَهُ أَنْ يَحِلَّ وَيَخْرُجَ مِنْ إِحْرَامِهِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَلَمْ يَرَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ الِاشْتِرَاطَ فِي الحَجِّ، وَقَالُوا: إِنْ اشْتَرَطَ فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَخْرُجَ مِنْ إِحْرَامِهِ وَيَرَوْنَهُ كَمَنْ لَمْ يَشْتَرِطْ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە (ضُبَاعَة)ی کچی زوبەیری کوڕی (عبد المطلب) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) من دەمەوێت حەج بکەم مەرج دابنێم؟ فەرمووی: (بەڵێ). وتی: بڵێم چی؟ فەرمووی: (بڵێ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ وَمَحِلِّي مِنَ الأَرْضِ حَيْثُ حَبَسْتَنِي). خودایە لەهەرکوێ نەخۆشت خستم لەو شوێنە ئیحرام دەشکێنم.

## باسێکی تر لەوبارەوە

### ٩٨ - بَابٌ مِنْهُ

٩٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يُنْكِرُ الاِشْتِرَاطَ فِي الحَجِّ، وَيَقُولُ: أَلَيْسَ حَسْبُكُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئینکاری مەرج دانانی بۆ حەج دەکرد، دەیفەرموو: ئایا سوننەتی پێغەمبەرەکەتان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەس نیە.

## ئەگەر ئافرەت لەدوای (الإفاضة) کەوتە بێ نوێژیەوە

### ٩٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَرْأَةِ تَحِيضُ بَعْدَ الإِفَاضَةِ

٩٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: ذَكَرْتُ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ حَاضَتْ فِي أَيَّامِ مِنًى، فَقَالَ: أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟، قَالُوا: إِنَّهَا قَدْ أَفَاضَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَلاَ إِذًا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا طَافَتْ طَوَافَ الزِّيَارَةِ ثُمَّ حَاضَتْ، فَإِنَّهَا تَنْفِرُ وَلَيْسَ عَلَيْهَا شَيْءٌ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ

پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باس کرد، کە صەفیەی کچی حویەییە کەوتۆتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (گیری داین لە گەڕانەوە بۆ مەدینە). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەوافی (الإفاضة)ی کردوە، فەرمووی: (کەواتە نابێت — واتە مادەم تەوافی (الإفاضة)ی کردوە کەواتە تەوافی ماڵاوایی لەسەر نیە و نابێتە ڕێگر لە گەڕانەوەمان بۆ شاری مەدینە - ).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان ڕایان وایە: ئەگەر ئافرەت لەدوای تەوافی زیارەت کەوتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە بەبێ تەوافی ماڵئاوایی دەگەڕێتەوە و هیچ شتێکی لەسەر نیە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

٩٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: مَنْ حَجَّ الْبَيْتَ فَلْيَكُنْ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ إِلاَّ الْحُيَّضَ، وَرَخَّصَ لَهُنَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەوەی حەجی ماڵی خوا بکات کۆتا کاری تەوافی ماڵئاواییە جگە لەو ئافرەتانەی کە دەکەونە حاڵەتی بێ نوێژیەوە، ئەویش پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مۆڵەتی پێ داون.

## ئافرەتێ کەوتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە چ (مناسك)ێ بگێڕێتەوە.

١٠٠ - بَابُ مَا جَاءَ مَا تَقْضِي الحَائِضُ مِنَ الْمَنَاسِكِ

٩٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ جَابِرٍ وَهُوَ ابْنُ يَزِيدَ الجُعْفِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: حِضْتُ فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَقْضِيَ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا، إِلاَّ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّ الحَائِضَ تَقْضِي الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا مَا خَلاَ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَائِشَةَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ أَيْضًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کەوتمە حاڵەتی بێ نوێژیەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کردم هەموو (مناسك)ئەرك و واجباتەکانی حەج بگێڕمەوە جگە لە تەوافی ماڵی خوا.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان رایان وایە: ئافرەت بێ نوێژ دەبێ هەموو (مناسك)ئەرك و واجباتەکانی حەج بگێڕێتەوە جگە لە تەوافی ماڵی خوا.

٩٤٥م- (صحيح) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ شُجَاعٍ الجَزَرِيُّ، عَنْ خُصَيْفٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، وَمُجَاهِدٍ، وَعَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَفَعَ الحَدِيثَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ النُّفَسَاءَ وَالحَائِضَ تَغْتَسِلُ، وَتُحْرِمُ، وَتَقْضِي الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا، غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفَ بِالبَيْتِ حَتَّى تَطْهُرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ — فەرموودەکەی بەرزکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) - دەگێڕنەوە، کە ئافرەتی زەیسان و بێ نوێژ خۆی دەشوات و ئیحرام دەدابەستێ جا هەموو (مناسك)ئەرك و واجباتەکانی حەج جێبەجێ دەکات، تەوافی ماڵی خوا ناکات هەتا پاك دەبێتەوە.

## دەربارەی حاجی یان عومرەکار کۆتا کاری تەوافیماڵئاواییە

### ١٠١ - بَابُ مَا جَاءَ مَنْ حَجَّ أَوْ اعْتَمَرَ فَلْيَكُنْ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ

٩٤٦ - (منكر بهذا اللفظ – صحيح بمعناه دون قوله : (أَوْ اعْتَمَرَ) ) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ البَيْلَمَانِيِّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ حَجَّ هَذَا البَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلْيَكُنْ آخِرُ عَهْدِهِ بِالبَيْتِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: خَرَرْتَ مِنْ يَدَيْكَ، سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ تُخْبِرْنَا بِهِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَوْسٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ مِثْلَ هَذَا، وَقَدْ خُولِفَ الحَجَّاجُ فِي بَعْضِ هَذَا الإِسْنَادِ.

واتە: لە (حارث)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی ئەوسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (ئەوەی حەجی ماڵی خوا یان عومرە دەکات کۆتا کاری تەوافی ماڵئاواییە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ پێی فەرموو: لەدەستت دەرچوو ئەمەت لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیستوەو پێت ڕانەگەیاندووین.

## ئەنجامدانی یەك تەواف بۆ کەسێ عومرەو حەج پێکەوە دەکات

### ١٠٢ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ القَارِنَ يَطُوفُ طَوَافًا وَاحِدًا

٩٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنْ

أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَنَ الحَجَّ وَالعُمْرَةَ، فَطَافَ لَهُمَا طَوَافًا وَاحِدًا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ قَالُوا: القَارِنُ يَطُوفُ طَوَافًا وَاحِدًا، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: يَطُوفُ طَوَافَيْنِ، وَيَسْعَى سَعْيَيْنِ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عومرە و حەجی پێکەوە کرد، یەك تەوافی کرد بۆ هەردووکیان.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایـان لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش دەفەرموون: ئەنجامدانی یەك تەواف بەسە بـۆ کەسـێ عـومرە و حـەج پێکـەوە دەکـات، ئەمـەش وتـەی شـافیعی و ئەحمـەد و ئیسحاقە.

٩٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ أَسْلَمَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَحْرَمَ بِالحَجِّ وَالعُمْرَةِ، أَجْزَأَهُ طَوَافٌ وَاحِدٌ، وَسَعْيٌ وَاحِدٌ مِنْهُمَا، حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ تَفَرَّدَ بِهِ الدَّرَاوَرْدِيُّ عَلَى ذَلِكَ اللَّفْظِ، وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ وَلَمْ يَرْفَعُوهُ وَهُوَ أَصَحُّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکـەس ئیحرامـی دابەسـت بۆ حەج و عومرە، یەك تەواف و یـەکجار هاتوچـۆی سـەفاو مـەروەی بەسـە، هـەتا ئیحرامی هەردووکیان پێکەوە دەشکێنێ).

## کۆچەران لەدوای تەواو کردنی حەج
## سێ ڕۆژ بۆیان هەیە لەمەککە بمێننەوە

### ١٠٣ - بَابُ مَا جَاءَ أَنْ يَمْكُثَ الْمُهَاجِرُ بِمَكَّةَ بَعْدَ الصَّدْرِ ثَلاَثًا

٩٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ، سَمِعَ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ الحَضْرَمِيِّ يَعْنِي مَرْفُوعًا، قَالَ: يَمْكُثُ الْمُهَاجِرُ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ بِمَكَّةَ ثَلاَثًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ بِهَذَا الإِسْنَادِ مَرْفُوعًا.

واتــە: لــە (علاء)ی کــوڕی (حَضْرَمِیّ)ەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ — واتــە فەرموودەکەی بەرزکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) - دەگێڕنـەوە، کە فەرموویەتی: ئەوانەی لە مەککەوە کۆچیان کـردوە بـۆ مـەدینـە لـەدوای تـەواو کردنی حەج واتە لەدوای گەڕانەوە لە مینا هەتا سێ ڕۆژ بۆیـان هەیـە بمێننـەوە لـە مەککە.

## لەکاتی گەڕانەوە لەحەج و عومرە چی دەوترێت

### ١٠٤ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يَقُولُ عِنْدَ القُفُولِ مِنَ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ

٩٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوَةٍ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ فَعَلاَ فَدْفَدًا مِنَ الأَرْضِ أَوْ شَرَفًا كَبَّرَ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ

عَابِدُونَ سَائِحُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ. وَفِي البَاب عَنِ البَرَاءِ، وَأَنَسٍ، وجَابِرٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە غەزایە یان حەج یان عومرە دەگەڕایەوە کە سەردەکەوتە سەر هەر بەرزاییەکی سەر زەوی سێ (الله أکبر)ی دەکرد و دەیفەرموو: (هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، گەڕاینەوە لەسەفەر بۆ وڵاتی خۆمان، بە تەوبەکردن و پەرستش کردن و سەجدەبردنەوە، سوپاسی پەروەردگارمان دەکەین، خوای گەورە بەڵێنەکەی بەراست بەجێهێناو دینەکەی ئاشکرا کرد، بەندەکەی خۆی سەرخست و، هەموو کۆمەڵ و حیزبەکانی تێك شکاند).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێ لە ئیحرامدا بمرێت

١٠٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُحْرِمِ يَمُوتُ فِي إِحْرَامِهِ

٩٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَرَأَى رَجُلاً قَدْ سَقَطَ مِنْ بَعِيرِهِ فَوُقِصَ فَمَاتَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ القِيَامَةِ يُهِلُّ أَوْ يُلَبِّي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ

العِلْمِ: إِذَا مَاتَ الْمُحْرِمُ انْقَطَعَ إِحْرَامُهُ وَيُصْنَعُ بِهِ كَمَا يُصْنَعُ بِغَيْرِ الْمُحْرِمِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا بووین (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پیاوێکی بینی لەسەر وشترەکەی کەوتبوەخوارەوە ملی شکابوو مردبوو لە ئیحرامدا بوو، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بە ئاو و مۆرد بیشۆن، ئەو دوو پۆشاکەی خۆی بۆ بکەن بە کفن واتە ئیحرامەکەی، سەری دامەپۆشن، لەبەرئەوەی خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا کاتێ کە زیندوی دەکاتەوە (لبیك، لبیك) دەڵێتەوە).

## کەسێ لە ئیحرامدا بێت چاوی ژان بکات بە (صَّبر) تەداوی بکات

١٠٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُحْرِمِ يَشْتَكِي عَيْنَهُ فَيَضْمِدُهَا بِالصَّبِرِ

٩٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى، عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مَعْمَرٍ اشْتَكَى عَيْنَيْهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَسَأَلَ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ، فَقَال: اضْمِدْهُمَا بِالصَّبِرِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، يَذْكُرُهَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: اضْمِدْهُمَا بِالصَّبِرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ بَأْسًا أَنْ يَتَدَاوَى الْمُحْرِمُ بِدَوَاءٍ مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ طِيبٌ.

واتە: لە نوبەیهی کوڕی وەهبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عومەری کوڕی (عُبَيْدِ اللّٰهِ)ی کوڕی مەعمەر چاوەکانی ژانیان دەکرد، لەوبارەوە لە ئەبانی کوڕی پێشەوا (عُثْمَان)ی رەزای خوای لێ بێ پرسی؟ — ئەو

ساڵە ئەو ئەمیر و کاربەدەستی حەج بوو — ئەبان فەرمووی: بە گوشراوی درەختی (صَّبِرِ) کە تاڵە تەداوی بکە، چونکە من بیستومە لە پێشەوا (عُثْمَان) رەزای خوای لێ بێ ئەمەی لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) گێڕایـەوە، دەیفـەرموو: (بە گوشراوی درەختی (صَّبِرِ) تەداوی بکە).

## کەسێ لە ئیحرامدا سەری بتاشێ چ کەفارەتێکی لەسەرە

### ١٠٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُحْرِمِ يَحْلِقُ رَأْسَهُ فِي إِحْرَامِهِ مَا عَلَيْهِ

٩٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، وَابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، وَحُمَيْدٍ الأَعْرَجِ، وَعَبْدِ الكَرِيمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِهِ وَهُوَ بِالحُدَيْبِيَةِ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ مَكَّةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، وَهُوَ يُوقِدُ تَحْتَ قِدْرٍ، وَالقَمْلُ يَتَهَافَتُ عَلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ: أَتُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ هَذِهِ؟، فَقَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ: احْلِقْ، وَأَطْعِمْ فَرَقًا بَيْنَ سِتَّةِ مَسَاكِينَ، وَالفَرَقُ: ثَلاَثَةُ آصُعٍ،، أَوْ صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ انْسُكْ نَسِيكَةً، قَالَ ابْنُ أَبِي نَجِيحٍ: أَوْ اذْبَحْ شَاةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الْمُحْرِمَ إِذَا حَلَقَ رَأْسَهُ، أَوْ لَبِسَ مِنَ الثِّيَابِ مَا لاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَلْبَسَ فِي إِحْرَامِهِ، أَوْ تَطَيَّبَ فَعَلَيْهِ الكَفَّارَةُ بِمِثْلِ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، لـە سـەردەمی رێککەوتنی حودەیبیەدا پێش ئەوەی بچنە شاری مەککەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەلای کەعبدا تێپەڕی بینی جانەوەرەکانی سەری دەکەوتنـەخوارەوەو بەسـەر روخسـاریدا، فـەرمووی: (جانـەوەرەکانی سـەرت ئـازارت دەدەن؟). کـەعب فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فـەرمووی: (دەی سـەرت بتاشـە،

لەپاشدا سێ مەن(صاع) خورما بدە بە شەش هەژار، یان سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە، یان ئاژەڵێ سەربڕە بۆ خوا).

## بۆ شوانەکان روخسەت هەیە ڕۆژێ شەیتان ڕەجم بکەن و ڕۆژێ نەیکەن

### ١٠٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ لِلرِّعَاءِ أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا وَيَدَعُوا يَوْمًا

٩٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ لِلرِّعَاءِ: أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا، وَيَدَعُوا يَوْمًا. هَكَذَا رَوَى ابْنُ عُيَيْنَةَ. وَرَوَى مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ. وَرِوَايَةُ مَالِكٍ أَصَحُّ. وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ لِلرِّعَاءِ: أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا، وَيَدَعُوا يَوْمًا، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئەبو بەدداحی کوڕی عەدییەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) روخسەتی دا بە شوانەکان ڕۆژێ شەیتان ڕەجم بکەن و ڕۆژێ نەیکەن.

بێگومان هەندێ لە زانایان ڕێگەیان داوە بە شوانەکان ڕۆژێ شەیتان ڕەجم بکەن و ڕۆژێ نەیکەن، پێشەوا شافیعی ئەمە دەفەرمووێ.

٩٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الْخَلَّالُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِرِعَاءِ الإِبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ: أَنْ يَرْمُوا يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَجْمَعُوا رَمْيَ يَوْمَيْنِ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ فَيَرْمُونَهُ فِي

أَحَدِهِمَا، قَالَ مَالِكٌ: ظَنَنْتُ أَنَّهُ قَالَ: فِي الأَوَّلِ مِنْهُمَا، ثُمَّ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّفْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ.

واتە: لە ئەبو بەدداحی كوڕی عاصیمی كوڕی عەدییەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕوخسەتی دا بە شوانە وشترەكان ئەوانەی كە شەو لە مینا دەمێننەوە تا بەیانی یەكەم ڕۆژی جەژن شەیتان ڕەجم بكەن، لەپاشدا دوو ڕۆژی دواتر كۆیكەنەوە و لەیەك ڕۆژیاندا شەیتان ڕەجم بكەن، پێشەوا مالیك فەرمووی: وا ئەزانم فەرمووی: لەیەكەم ڕۆژیاندا، لەپاشدا ڕۆژی گەڕانەوەش.

## باسێكی تر:

١٠٩ - بَابٌ

٩٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ بْنِ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمُ بْنُ حَيَّانَ، قَالَ: سَمِعْتُ مَرْوَانَ الأَصْفَرَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عَلِيًّا قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ اليَمَنِ، فَقَالَ: بِمَ أَهْلَلْتَ؟ قَالَ: أَهْلَلْتُ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لَوْلاَ أَنَّ مَعِي هَدْيًا لأَحْلَلْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێشەوا عەلیش ڕەزای خوای لێ بێ كە لە یەمەنەوە هاتبووەوە، مەروان فەرمووی: بە نیەتی چی ئیحرام دادەبەستی؟ فەرمووی: بەنیەتی ئەوە ئیحرام دادەبەستم كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆی دابەستوە، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای

لێ بێ فەرمووی: ئەگەر ئاژەڵی دیاری ماڵی خوام پێ نەبوایە ئیحرامم دەشکاند.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژی حەجی گەورە

١١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي يَوْمِ الحَجِّ الأَكْبَرِ

| ٩٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ بْنِ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ يَوْمِ الحَجِّ الأَكْبَرِ، فَقَالَ: يَوْمُ النَّحْرِ. |
|---|

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت بە ڕۆژی حەجی گەورە و شکۆمەند لە پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی؟ فەرمووی: (یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە کە قوربانی تێدا دەکرێت).

| ٩٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: يَوْمُ الحَجِّ الأَكْبَرِ يَوْمُ النَّحْرِ. وَلَمْ يَرْفَعْهُ وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ، وَرِوَايَةُ ابْنِ عُيَيْنَةَ مَوْقُوفًا أَصَحُّ مِنْ رِوَايَةِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ مَرْفُوعًا، هَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الحُفَّاظِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ مَوْقُوفًا، وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ مَوْقُوفًا. |
|---|

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژی حەجی گەورە و شکۆمەند یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە کە قوربانی تێدا دەکرێت.

## دەستهێنان بە بەردە ڕەشەكە و ڕوكنی یەمانی دا

١١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِلاَمِ الرُّكْنَيْنِ

٩٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنِ ابْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يُزَاحِمُ عَلَى الرُّكْنَيْنِ زِحَامًا مَا رَأَيْتُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُهُ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّكَ تُزَاحِمُ عَلَى الرُّكْنَيْنِ زِحَامًا مَا رَأَيْتُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُزَاحِمُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: إِنْ أَفْعَلْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ مَسْحَهُمَا كَفَّارَةٌ لِلْخَطَايَا. وَسَمِعْتُهُ، يَقُولُ: (مَنْ طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ أُسْبُوعًا فَأَحْصَاهُ كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ). وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (لاَ يَضَعُ قَدَمًا وَلاَ يَرْفَعُ أُخْرَى إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ عَنْهُ خَطِيئَةً وَكَتَبَ لَهُ بِهَا حَسَنَةً). وَرَوَى حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنِ ابْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ نَحْوَهُ. وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عوبەیدی كوڕی عومەیرەوە دەگێڕنەوە، كە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ بە شێوەیە تەكانی دەدا بەرەو بەردە ڕەشەكە و ڕوكنی یەمانی و پاڵەپەستۆی دروست دەكرد، هیچ كەسێكم نەدیوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەو شێوەیە بكات، وتم: ئەی باوكی (عبد الرحمن) هیچ كەسێكم نەدیوە لە هاوەڵان بەو شێوەیە بكات، فەرمووی: ئەگەر ئەو كارە بكەم، ئەوە بۆ خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: (دەستهێنان بە بەردە ڕەشەكە وس ڕوكنی یەمانیدا دەبنەهۆی كەفارەتی گوناهو تاوان). وە گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (ئەوەی حەوت جار تەوافی ئەم ماڵە بكات، وەك ئەوە وایە كۆیلەیە ڕزگار بكات). هەروەها گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (ئەو پێیەی كە دایدەنێ و ئەو پێیەی كە بەرزی دەكاتەوە بەوە گوناهێكی دەسڕێتەوەو چاكەیەكی بۆ دەنوسرێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی قسەكردن لە تەوافدا

### ١١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَلاَمِ فِي الطَّوَافِ

٩٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: الطَّوَافُ حَوْلَ البَيْتِ مِثْلُ الصَّلاَةِ، إِلاَّ أَنَّكُمْ تَتَكَلَّمُونَ فِيهِ، فَمَنْ تَكَلَّمَ فِيهِ فَلاَ يَتَكَلَّمَنَّ إِلاَّ بِخَيْرٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنِ ابْنِ طَاوُوسٍ وَغَيْرِهِ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ مَوْقُوفًا، وَلاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: يَسْتَحِبُّونَ أَنْ لاَ يَتَكَلَّمَ الرَّجُلُ فِي الطَّوَافِ إِلاَّ لِحَاجَةٍ، أَوْ بِذِكْرِ اللهِ تَعَالَى، أَوْ مِنَ العِلْمِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (تەوافی ماڵی خوا وەك نوێژ وایە ئەوەندە هەیە قسەی تێدا دەكەن، ئەوەی قسەی تێدا دەكات با یادی خوا و قسەی خێر بكات).

بە پەیڕەوكردنی فەرموودەكە زۆربەی زانایان پێیان باشە كەس لە تەوافدا قسە نەكات مەگەر لەبەر حاڵەتی پێویستی، یان بە یادی خوا، یا بە عیلم و زانست.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەردە رەشەكە

### ١١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَجَرِ الأَسْوَدِ

٩٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ ابْنِ خُثَيْمٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الحَجَرِ: وَاللَّهِ

لَيَبْعَثَنَّهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ، يَشْهَدُ عَلَى مَنْ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی بەردە ڕەشەکە فەرموویەتی: (سوێند بە (الله) خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا زیندووی دەکاتەوە دوو چاوی هەیە پێی دەبینێ و ئەو کەسانە دەناسێتەوە دەستیان پێدا هێناوەو ماچیان کردووە، زمانێکی هەیەو قسەی پێ دەکات شایەتی دەدات بۆ ئەو کەسەی بە هەق دەستی پێدا دەهێنێ).

**باسێکی تر:**

١١٤ - بَابٌ

٩٦٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدَّهِنُ بِالزَّيْتِ وَهُوَ مُحْرِمٌ غَيْرِ الْمُقَتَّتِ: الْمُقَتَّتُ: الْمُطَيَّبُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَقَدْ تَكَلَّمَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ فِي فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ، وَرَوَى عَنْهُ النَّاسُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ئیحرامدا بووە و زەیتی بەکاردەهێنا بەڵام بەبێ بۆنی خۆش.

١١٥ - بَابٌ

٩٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَزِيدَ الجُعْفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا كَانَتْ تَحْمِلُ

مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ وَتُخْبِرُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَحْمِلُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئاوی زەمزەمی هەڵدەگرت و لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ خواردنەوە، ڕایگەیاند کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاوی زەمزەمی هەڵدەگرت لەگەڵ خۆی دەیبرد.

**باسێکی تر:**

١١٦ – بَابٌ

٩٦٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الوَزِيرِ الوَاسِطِيُّ الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، قَال: قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ حَدِّثْنِي بِشَيْءٍ عَقَلْتَهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَيْنَ صَلَّى الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ؟ قَال: بِمِنًى. قَال: قُلْتُ: فَأَيْنَ صَلَّى العَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَال: بِالأَبْطَحِ، ثُمَّ قَال: افْعَلْ كَمَا يَفْعَلُ أُمَرَاؤُكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، يُسْتَغْرَبُ مِنْ حَدِيثِ إِسْحَاقَ بْنِ يُوسُفَ الأَزْرَقِ، عَنِ الثَّوْرِيِّ.

واتە: لە (عَبْد الْعَزِيز)ی کوڕی ڕوفەیعەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ڕەزای خوای لێ بێ وت: شتێکم بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فێربوویی و لەبەرت کردبێت، پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی هەشتەمی مانگی (ذی الحجة)دا کە ناسراوە بە ڕۆژی (تروية)ە لە کوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد، وتی: لە مینا، وتم: ئەی لە ڕۆژی سیانزەهەمی مانگی (ذی الحجة)دا کاتێ کە لە مینا دەگەڕایەوە لە کوێ نوێژی عەسری کرد؟ وتی: لە

(أبطَح)، لەپاشدا وتی: ئەوە بکە کە ئەمیر و کاربەدەستەکانت دەیکەن پێچەوانەی ئەوان مەجولێرەوە.

# باسەكانی جەنازە لـە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٨ - أَبْوَابُ الْجَنَائِزِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی نەخۆش

### ١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ الْمَرِيضِ

٩٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا، إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً. وَفِي البَاب عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَأَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَسَدِ بْنِ كُرْزٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَزْهَرَ، وَأَبِي مُوسَى. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر ئازار و ناخۆشیە باوەڕدار توشی ببێ لە دڕكێكەوە بگرە كە بچێ بـە جەسـتەیدا هـەتا دەگاتـە زیـاتر، ئـیللا خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە پلەیە بەرزی دەكاتەوە و گوناهێكی هەڵئەوەرێنی).

٩٦٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ:

قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ شَيْءٍ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنْ نَصَبٍ، وَلاَ حَزَنٍ، وَلاَ وَصَبٍ حَتَّى الهَمُّ يَهُمُّهُ إِلاَّ يُكَفِّرُ اللَّهُ بِهِ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ فِي هَذَا البَابِ. وَسَمِعْتُ الجَارُودَ يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا يَقُولُ: لَمْ يُسْمَعْ فِي الهَمِّ أَنَّهُ يَكُونُ كَفَّارَةً إِلاَّ فِي هَذَا الحَدِيثِ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر ئازار و ناخۆشی و پەژارەو نەخۆشییە توشی باوەڕدار ببێ، ئیللا خوای گەورە دەیکاتە کەفارەتی گوناهەکانی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سەردانی نەخۆش

### ٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عِيَادَةِ الْمَرِيضِ

٩٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ الرَّحَبِيِّ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا عَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الجَنَّةِ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي مُوسَى، وَالبَرَاءِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ ثَوْبَانَ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَرَوَى أَبُو غِفَارٍ، وَعَاصِمٌ الأَحْوَلُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي الأَشْعَثِ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: مَنْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي الأَشْعَثِ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ فَهُوَ أَصَحُّ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحَادِيثُ أَبِي قِلاَبَةَ إِنَّمَا هِيَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ إِلاَّ هَذَا الحَدِيثَ فَهُوَ عِنْدِي عَنْ أَبِي الأَشْعَثِ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ.

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (موسوڵمان ئەگەر سەردانی برایەكی نەخۆشی موسوڵمانی بكات هەتا دەگەڕێتەوە لەمیوەی بەهەشت دەچنێ).

٩٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ وَزِيرٍ الْوَاسِطِيُّ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي الأَشْعَثِ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَزَادَ فِيهِ: قِيلَ: مَا خُرْفَةُ الجَنَّةِ؟ قَالَ: جَنَاهَا.

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد كرد، وترا: (خُرْفَةُ الجَنَّةِ) مانای چییە؟ فەرمووی: چنینەوەی بەروبوومە.

٩٦٨ (م) - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ خَالِدٍ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِي الأَشْعَثِ. وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

٩٦٩ - (صحيح: الا قوله: (زائرا) والصواب: (شامتا) ) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ ثُوَيْرٍ هُوَ ابْنُ أَبِي فَاخِتَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَخَذَ عَلِيٌّ بِيَدِي، قَالَ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى الحَسَنِ نَعُودُهُ، فَوَجَدْنَا عِنْدَهُ أَبَا مُوسَى، فَقَالَ عَلِيٌّ: أَعَائِدًا جِئْتَ يَا أَبَا مُوسَى أَمْ زَائِرًا؟ فَقَالَ: لاَ بَلْ عَائِدًا، فَقَالَ عَلِيٌّ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَعُودُ مُسْلِمًا غُدْوَةً إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ عَادَهُ عَشِيَّةً إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ، وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رُوِيَ

عَنْ عَلِيٍّ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ مِنْهُمْ مَنْ وَقَفَهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ وَأَبُو فَاخِتَةَ: اسْمُهُ سَعِيدُ بْنُ عِلاَقَةَ.

واتە: لە ئەبو فاخیتەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ دەستی گرتم و فەرمووی: حەسەن نەخۆشە با سەردانی بکەین کە چووین ئەبو موسای لەلا بوو، پێشەوا عەلی فەرمووی: ئەی ئەبو موسا بۆ سەردانی نەخۆشیەکەی هاتوویت یان بۆ دیدەنی وەك عادەتی؟ فەرمووی: نەخێر، بۆ سەردانی نەخۆشیەکەی هاتووم، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (هەر موسوڵمانێ سەر لە بەیانی بچێت بۆ سەردانی موسوڵمانێ ئەوە حەفتا هەزار مەلائیکە هەتا ئێوارە داوای لێ خۆش بوونی بۆ دەکەن و رەحمەتی بۆ دەنێرن، وە هەر موسوڵمانێ سەر لە ئێوارە بچێت بۆ سەردانی موسوڵمانێ ئەوە حەفتا هەزار مەلائیکە هەتا بەیانی داوای لێ خۆش بوونی بۆ دەکەن و رەحمەتی بۆ دەنێرن، لە بەهەشتدا باخێکی خاوەن بەروبوومی دەدەنێ بۆ خۆی).

## دەربارەی قەدەغەکردنی ئاوات خواستن بۆ مەرگ

### ٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ التَّمَنِّي لِلْمَوْتِ

٩٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ حَارِثَةَ بْنِ مُضَرِّبٍ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى خَبَّابٍ وَقَدْ اكْتَوَى فِي بَطْنِهِ، فَقَالَ: مَا أَعْلَمُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقِيَ مِنَ البَلاَءِ مَا لَقِيتُ، لَقَدْ كُنْتُ وَمَا أَجِدُ دِرْهَمًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفِي نَاحِيَةِ مِنْ بَيْتِي أَرْبَعُونَ أَلْفًا، وَلَوْلاَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانَا أَوْ نَهَى أَنْ نَتَمَنَّى

الْمَوْتَ لَتَمَنَّيْتُ. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ خَبَّابٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الوَفَاةُ خَيْرًا لِي.

واتـە: لـە (حَارِثَة)ی کـوڕی (مُضَرِّب)ەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: چووم بۆ سەردانی خەبابی کوڕی ئەرەت سکی خـۆی داخ کردبـوو وەك چارەسەری، فەرمووی: پێ نازانم هیچ کەسێ لە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بـەم شـێوەیەی مـن تووشـی بـەڵاو ناخۆشـی بووبێـت، لەسـەردەمی پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) درهەمێکم شك نەدەبرد کەچی ئێستا خاوەنی چل هەزار درهەمم، ئەگەر پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئـاوات خواسـتنی بـۆ مەرگ لێ قەدەغەنەکردینایە ئەوا ئاواتم دەخواست بۆ مەرگی خۆم.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگـەر کەسـێکتان تووشـی ئـازار و زیانێ بوو با ئاوات بـۆ مـەرگ نـەخوازێ، بـەڵکو بڵـێ: خودایـە ئـەی پـەروەردگارم ئەگەر ژیان چاکترە بۆم لە مردن ئەوا بمژێنە، خۆ ئەگەر مردنیش چاکترە بۆم لە ژیان ئەوا بمرێنە).

٩٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَال: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَال: أَخْبَرَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پەناگرتنی نەخۆش

### ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّعَوُّذِ لِلْمَرِيضِ

٩٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ هِلاَلٍ البَصْرِيُّ الصَّوَّافُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ، وَعَيْنٍ حَاسِدَةٍ، بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ وَاللَّهُ يَشْفِيكَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە جیبریل هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: ئەی موحەممەد نەخۆشی؟ فەرمووی: (بەڵێ). جیبریل فەرمووی: بەناوی خواوە نوشتەت بۆ دەکەم، لەزیانی هەموو شتێ کە ئازارت بدات، لە شەڕ و خراپەی هەموو نەفسێ، لە چاوی پیس، بەناوی خواوە نوشتەت بۆ دەکەم، خوای گەورە شیفات بدات.

٩٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَثَابِتٌ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، فَقَالَ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ اشْتَكَيْتُ، فَقَالَ أَنَسٌ: أَفَلاَ أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، مُذْهِبَ البَاسِ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شَافِيَ إِلاَّ أَنْتَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَسَأَلْتُ أَبَا زُرْعَةَ عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقُلْتُ لَهُ: رِوَايَةُ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَصَحُّ، أَوْ حَدِيثُ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كِلاَهُمَا صَحِيحٌ. أَخْبَرَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَبِي

نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ.

واتە: لە (عبد العزیز)ی كوڕی صوهەیبەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: مـن و (ثَابِت) چووینە خزمـەت ئەنەسـی كـوڕی مالیـك ڕەزای خـوای لـێ بـێ، (ثَابِت) فەرمووی: ئەی ئەبا حەمزە نەخۆشم، ئەنەس فەرمووی: ئایا نوشتەیەكت بـۆ نەكـەم وەك نوشتەی پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فـەرمووی: بـەڵێ، ئەنـەس فەرمووی: (ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵك، ئەی لابەری ئێش و ئازار، شیفای بدە تۆ شیفابەخشـی، جگـە لـەتۆ شیفابەخشـی تـر نیـە، شـیفایەكی وەهـا هـیچ دەردو نەخۆشیە بەجێ نەهێڵێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی هاندان بۆ وەسیەتكردن

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَثِّ عَلَى الوَصِيَّةِ

٩٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومـەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمویەتی: (ئەگـەر موسـوڵمانێك شـتێكی هـەبێت بیـەوێت ڕاسپێریی بكات، هەق وایە دوو شەوی بەسەردا تـێ نەپـەڕێت وەسـیەتنامەكەی بـە نوسراوی لە لای خۆی دانێ).

## دەربارەی وەسیەتكردن بە سێ یەك و چوار یەك

### ٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الوَصِيَّةِ بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ

٩٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: عَادَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَرِيضٌ، فَقَالَ: أَوْصَيْتَ؟، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: بِكَمْ؟، قُلْتُ: بِمَالِي كُلِّهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، قَالَ: فَمَا تَرَكْتَ لِوَلَدِكَ؟ قُلْتُ: هُمْ أَغْنِيَاءُ بِخَيْرٍ، قَالَ: أَوْصِ بِالعُشْرِ، فَمَا زِلْتُ أُنَاقِصُهُ حَتَّى قَالَ: أَوْصِ بِالثُّلُثِ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ. قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: وَنَحْنُ نَسْتَحِبُّ أَنْ يَنْقُصَ مِنَ الثُّلُثِ، لِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ سَعْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ - وَيُرْوَى كَبِيرٌ- وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ أَنْ يُوصِيَ الرَّجُلُ بِأَكْثَرَ مِنَ الثُّلُثِ، وَيَسْتَحِبُّونَ أَنْ يَنْقُصَ مِنَ الثُّلُثِ. قَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: كَانُوا يَسْتَحِبُّونَ فِي الوَصِيَّةِ الخُمُسَ دُونَ الرُّبُعِ، وَالرُّبُعَ دُونَ الثُّلُثِ، وَمَنْ أَوْصَى بِالثُّلُثِ فَلَمْ يَتْرُكْ شَيْئًا وَلاَ يَجُوزُ لَهُ إِلاَّ الثُّلُثُ.

**واتە: لە سەعدی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: نەخۆش بووم پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەردانی كردم، فەرمووی: (وەسیەتت كردووە؟) ، وتم: بەڵێ، فەرمووی: (وەسیەتت كردووە چەندی ماڵ و سامانەكەت بۆ بكەن بە خێر؟) وتم: هەموو ماڵەكەم لەپێناوی خوا، فەرمووی: (ئەی چی بەجێ دەهێڵی بۆ منداڵەكەت؟). وتم: ئەوانە دەوڵەمەندن، فەرمووی: (دەیەكی بكە بەخێر) بەردەوام لێم كەم كردەوە هەتا فەرمووی: (دەی وەسیەت بكە بە سێ یەكی، سێ یەكیش زۆرە). ئەبو (عبد الرحمن) فەرمووی: ئێمە پێمان خۆش بوو لە سێ یەكیش كەمی كاتەوە، لەبەر فەرمایشتەكەی**

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە فەرمووی: (سێ یەکیش زۆرە).

## دەربارەی تەلّقینی نەخۆش لە سەرەمەرگداو لەلای حۆیدا پاڕانەوە بۆی

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَلْقِينِ الْمَرِيضِ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَالدُّعَاءِ لَهُ عِنْدَهُ

٩٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَعَائِشَةَ، وَجَابِرٍ، وَسُعْدَى الْمُرِّيَّةِ وَهِيَ امْرَأَةُ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (وشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بدەن بە گوێی مردووەکانتاندا). لەلایاندا بە ئارامی بڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بەڵکو ئەوانیش بیڵێن.

٩٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ أَوِ الْمَيِّتَ فَقُولُوا خَيْرًا، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ. قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ مَاتَ، قَال: فَقُولِيَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً. قَالَتْ: فَقُلْتُ: فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ مِنْهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. شَقِيقٌ هُوَ ابْنُ سَلَمَةَ، أَبُو وَائِلٍ الأَسَدِيُّ. حَدِيثُ أُمِّ سَلَمَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ كَانَ يُسْتَحَبُّ أَنْ يُلَقَّنَ الْمَرِيضُ عِنْدَ الْمَوْتِ قَوْلَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا قَالَ ذَلِكَ مَرَّةً، فَمَا لَمْ يَتَكَلَّمْ بَعْدَ ذَلِكَ، فَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يُلَقَّنَ، وَلاَ يُكْثَرَ عَلَيْهِ فِي هَذَا. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ

الْمُبَارَكِ: أَنَّهُ لَمَّا حَضَرَتْهُ الوَفَاةُ جَعَلَ رَجُلٌ يُلَقِّنُهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَكْثَرَ عَلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ: إِذَا قُلْتُ مَرَّةً فَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مَا لَمْ أَتَكَلَّمْ بِكَلاَمٍ، وَإِنَّمَا مَعْنَى قَوْلِ عَبْدِ اللهِ إِنَّمَا أَرَادَ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ كَانَ آخِرُ قَوْلِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الجَنَّةَ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرموویین: (كاتێ لای نەخۆشێ یان كەسێ لەسەرەمەرگدا بوو ئامادەبوون قسەی خێر و چاك بكەن، بێگومان مەلائیكە (آمین) دەكەن لەسەر ئەوەی كە دەیڵێن)، كاتێ كە ئەبو سەلەمە مرد، ڕۆشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەبو سەلەمە مرد، فەرمووی: (بڵێ: خوایە لەمن و ئەبو سەلەمە خۆشبە، جێگەی پڕبكەرەوە بۆم بە چاكتر). وتی: وتم: خوای گەورە جێگەكەی بۆ پڕكردمەوە بە چاكتر، پێغەمبەری خوای (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كردە هاوسەرم كە زۆر زۆر لە ئەبو سەلەمە باشترە بۆم. وا باشە وشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بدرێت بە گوێی ئەو كەسەدا لەسەرەمەرگدایە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەگەر جارێ وتی و قسەی تری نەكرد ئیتر پێویست ناكات ئەوەندەی لەگەڵ بوترێت، زۆری لەگەڵ نەوترێت.

دەگێڕنەوە (عبد الله)ی كوڕی موبارەك كاتێ كەوتە حاڵەتی ڕۆح دەرچوونەوە پیاوێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه)ی دا بە گوێیدا زۆری وتەوە، (عبد الله) پێی فەرموو: كە جارێ وتت ئیتر من لەسەر ئەوەم، كە وتم: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) ئەوەم بەسە هەتا قسەی تر نەكەم، بێگومان (عبد الله) مەبەستی لەم فەرمودە بوو، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (هەركەس كۆتا وتەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بێت دەچێتە بەهەشتەوە).

## دەربارەی ئازار و ژانە سەختەکان لەکاتی مردندا

### ٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشْدِيدِ عِنْدَ الْمَوْتِ

٩٧٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ الهَادِ، عَنْ مُوسَى بْنِ سَرْجِسَ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِالمَوْتِ، وَعِنْدَهُ قَدَحٌ فِيهِ مَاءٌ، وَهُوَ يُدْخِلُ يَدَهُ فِي القَدَحِ، ثُمَّ يَمْسَحُ وَجْهَهُ بِالمَاءِ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى غَمَرَاتِ الْمَوْتِ أَوْ سَكَرَاتِ الْمَوْتِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی لە گیانەڵادا دەفرێ ئاوی لەلادا بوو، دەستی دەخستە ناوی و ئاوەکەی دەیهێنا بەدەم و چاویدا، لەپاشدا دەیفەرموو: (خودایە یارمەتیم بدەی لەسەر ئازار و ژانە سەختەکانی مردن).

٩٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَزَّارُ البَغْدَادِيُّ، قَال: حَدَّثَنَا مُبَشِّرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الحَلَبِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ العَلاَءِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا أَغْبِطُ أَحَدًا بِهَوْنِ مَوْتٍ بَعْدَ الَّذِي رَأَيْتُ مِنْ شِدَّةِ مَوْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَسَأَلْتُ أَبَا زُرْعَةَ عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، وَقُلْتُ لَهُ: مَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ العَلاَءِ؟ فَقَال: هُوَ ابْنُ الْعَلاَءِ بْنِ اللَّجْلاَجِ، وَإِنَّمَا أَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەپاش ئەوەی پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دی ئەوەندە بە سەختی ڕۆحی دەرچوو، ئەگەر کەسێکم دی بە ئاسانی ڕۆحی دەرچوو هەرگیز پێی دڵخۆش نابم و

ئاواتی پێ ناخوازم.

٩٨٠ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الْحَسَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَامُ بْنُ الْمِصَكِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مَعْشَرٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم، يَقُولُ: إِنَّ نَفْسَ الْمُؤْمِنِ تَخْرُجُ رَشْحًا، وَلاَ أُحِبُّ مَوْتًا كَمَوْتِ الْحِمَارِ. قِيلَ: وَمَا مَوْتُ الْحِمَارِ؟ قَالَ: مَوْتُ الْفَجْأَةِ[1].

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووە دەیفەرموو: (ڕۆحی باوەڕدار لەگەڵ ئارەق کردنەوەدا دەردەچێ، حەزم لەو مردنە نییە وەك مردنی گوێدرێژ وایە، وترا: مردنی گوێدرێژ کامەیە؟ فەرمووی: (مردنی کوتوپڕییە).

باسێکی تر:

٩ - بَابٌ

٩٨١ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُبَشِّرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الْحَلَبِيُّ، عَنْ تَمَّامِ بْنِ نَجِيحٍ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

---

[1] قال بشار عواد (٢/ ٣٠٠): هذا الحديث ليس من سنن الترمذي قطعا، إذ لم نجد له أصلاً في النسخ المخطوطة ولا الشروح، وإنما جاء في طبعة بولاق، وعنها متن عارضة الأحوذي. وأيضا: فإن المزي لم يذكر هذا الحديث في "التحفة" ولا استدركه عليه المستدركون كالحافظين العراقي، وابن حَجَر. وأيضا: فإن الهيثمي ذكر الحديث في "مجمع الزوائد" (٢/ ٣٢٣) ونسبه إلى الطبراني، وهو عنده كذلك في "الكبير" (١٠٠٤٩) وفي "الأوسط" (٥٨٩٨)، والله الموفق للصواب. انتهى.

وَسَلَّمَ: مَا مِنْ حَافِظَيْنِ، رَفَعَا إِلَى اللهِ مَا حَفِظَا مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ، فَيَجِدُ اللَّهُ فِي أَوَّلِ الصَّحِيفَةِ وَفِي آخِرِ الصَّحِيفَةِ خَيْرًا، إِلاَّ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي مَا بَيْنَ طَرَفَيِ الصَّحِيفَةِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەو دوو مەلائیکەی کە نامەی کردەوەکان تۆمار دەکەن کاتێ کە بەرزدەبنەوە بۆ ئاسمان بە نامەی کردەوەی بەندەوە ئیتر شەو بێ یان ڕۆژ، خوای گەورە سەرەتاو کۆتای نامەکەی بینی چاکەی تێدا تۆمار کرابوو، ئیللا خوای گەورە دەفەرمووێت: دەی ئێوە بە شایەت بن ئەوا بەڕاستی لەو بەندەیەم خۆشبووم لەسەر ئەوەی لەناو نامەکەیدایە).

## باوەڕدار کاتێ ڕۆحی دەردەچێ ناوچاوانی ئارەق دەردەدا

١٠ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْمُؤْمِنَ يَمُوتُ بِعَرَقِ الجَبِينِ

٩٨٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَال: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ الْمُثَنَّى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الجَبِينِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْحَدِيثِ: لاَ نَعْرِفُ لِقَتَادَةَ سَمَاعًا مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ.

واتە: لە بورەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (باوەڕدار کاتێ ڕۆحی دەردەچێت ناوچاوانی ئارەق دەردەدات).

**باسێکی تر:**

١١ - بَابٌ

٩٨٣ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْحَكَمِ بْنِ أَبِي زِيَادٍ الْكُوفِيُّ، وَهَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الْبَزَّارُ الْبَغْدَادِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سَيَّارٌ هُوَ ابْنُ حَاتِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَى شَابٍّ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ، فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدُكَ؟، قَالَ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَرْجُو اللَّهَ، وَإِنِّي أَخَافُ ذُنُوبِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَجْتَمِعَانِ فِي قَلْبِ عَبْدٍ فِي مِثْلِ هَذَا الْمَوْطِنِ إِلاَّ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَا يَرْجُو وَآمَنَهُ مِمَّا يَخَافُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چوو بۆ سەردانی گەنجێ لەسەرەمەرگدا بوو، فەرمووی: (خۆت چۆن دەبینی؟)، وتی: سوێند بە (الله) ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، من هیواو ئومێدم هەیە بە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە، وە لە گوناهەکانیشم دەترسم، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (لەم کاتی سەرەمەرگەدا ئەم دوو شتە لەدڵی هەر بەندەیەکدا کۆببێتەوە ئیللا خوای گەورە هیواو ئاواتەکەی دێنێتەدی و ترسەکەی دەڕەوێنێتەوە).

## بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردوو باش نیە

### ١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النَّعْيِ

٩٨٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَكَّامُ بْنُ سَلْمٍ، وَهَارُونُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، عَنْ عَنْبَسَةَ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالنَّعْيَ، فَإِنَّ النَّعْيَ مِنْ عَمَلِ الجَاهِلِيَّةِ. قَالَ عَبْدُ اللهِ: وَالنَّعْيُ: أَذَانٌ بِالمَيِّتِ. وَفِي البَاب عَنْ حُذَيْفَةَ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هۆشیاربن خۆتان بپارێزن لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردوو، بێگومان بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردوو لە کردەوەی سەردەمی نەفامییە.

٩٨٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الوَلِيدِ العَدَنِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ وَالنَّعْيُ أَذَانٌ بِالمَيِّتِ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَنْبَسَةَ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ. وَأَبُو حَمْزَةَ هُوَ مَيْمُونٌ الأَعْوَرُ وَلَيْسَ هُوَ بِالقَوِيِّ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ كَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ النَّعْيَ، وَالنَّعْيُ عِنْدَهُمْ: أَنْ يُنَادَى فِي النَّاسِ أَنَّ فُلاَنًا مَاتَ لِيَشْهَدُوا جَنَازَتَهُ، وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُعْلِمَ أَهْلَ قَرَابَتِهِ وَإِخْوَانَهُ وَرُوِيَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ أَنَّهُ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِأَنْ يُعْلِمَ الرَّجُلُ قَرَابَتَهُ.

هەندێ لە زانایان بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردوویان پێ باش نیە، (النَّعْي) لای ئەوان ئەمەیە: جاڕبدرێ بەناو خەڵکداو بوترێت: فڵانە کەس مردووە ئامادەی جەنازەکەی و بە خاك سپاردنی بن، هەندێکی تر لە زانایان دەفەرموون: دروستە براکانی و خزمەکانی بزانن، لە ئیبراهیمی نەخەعیەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

دروستە هەواڵی مردنەکەی رابگەیەنرێت بە خزمەکانی.

٩٨٦ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْقُدُّوسِ بْنُ بَكْرِ بْنِ خُنَيْسٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبِيبُ بْنُ سُلَيْمٍ الْعَبْسِيُّ، عَنْ بِلَالِ بْنِ يَحْيَى الْعَبْسِيِّ، عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ قَالَ: إِذَا مِتُّ فَلاَ تُؤْذِنُوا بِي، إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ نَعْيًا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنِ النَّعْيِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە (حُذَيْفَة)ی کوڕی یەمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (ئەگەر مردم هەواڵی مردنەکەم بڵاومەکەنەوەو بەکەس مەڵێن، چونکە من دەترسم ئەوە (النَّعْي) بێت، بێگومان بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردووی قەدەغەکرد.

### ئارامگرتن لەسەرەتای لێ قەومانەوە دەبێت

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الصَّبْرَ فِي الصَّدْمَةِ الأُولَى

٩٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الصَّبْرُ فِي الصَّدْمَةِ الأُولَى.
هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (دەبێ ئارامگرتن لەسەرەتای لێ قەومانەوە بێت).

٩٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئارامگرتن لەسەرەتای لێ قەومانەوەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ماچكردنی مردوو

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْبِيلِ الْمَيِّتِ

٩٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبَّلَ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ وَهُوَ يَبْكِي، أَوْ قَالَ: عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرٍ، وَعَائِشَةَ، قَالُوا: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ قَبَّلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مَيِّتٌ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كاتێ كە (عُثْمَان)ی كوڕی (مَظْعُون) مرد پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ماچی كردوو گریا بۆی، یان فەرمووی: فرمێسك بە چاوەكانیدا دەهاتەخوارەوە. ئیبنو عەباس و جابیر و عائیشە ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرموون: پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ماچكرد لەكاتێكدا كە وەفاتی كردبوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی شتنی مردوو

## ١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي غُسْلِ الْمَيِّتِ

٩٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدٌ، وَمَنْصُورٌ، وَهِشَامٌ، فَأَمَّا خَالِدٌ، وَهِشَامٌ فَقَالاَ: عَنْ مُحَمَّدٍ، وَحَفْصَةَ، وَقَالَ مَنْصُورٌ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَتْ إِحْدَى بَنَاتِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا وِتْرًا ثَلاَثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، إِنْ رَأَيْتُنَّ، وَاغْسِلْنَهَا بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ، فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا بِهِ. قَالَ هُشَيْمٌ: وَفِي حَدِيثِ غَيْرِ هَؤُلاَءِ، وَلاَ أَدْرِي وَلَعَلَّ هِشَامًا مِنْهُمْ قَالَتْ: وَضَفَّرْنَا شَعْرَهَا ثَلاَثَةَ قُرُونٍ. قَالَ هُشَيْمٌ: أَظُنُّهُ قَالَ: فَأَلْقَيْنَاهُ خَلْفَهَا. قَالَ هُشَيْمٌ، فَحَدَّثَنَا خَالِدٌ مِنْ بَيْنِ الْقَوْمِ، عَنْ حَفْصَةَ، وَمُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: وَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا، وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ. وَفِي البَاب عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ. حَدِيثُ أُمِّ عَطِيَّةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ أَنَّهُ قَالَ: غُسْلُ الْمَيِّتِ كَالغُسْلِ مِنَ الجَنَابَةِ. وقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: لَيْسَ لِغُسْلِ الْمَيِّتِ عِنْدَنَا حَدٌّ مُؤَقَّتٌ، وَلَيْسَ لِذَلِكَ صِفَةٌ مَعْلُومَةٌ وَلَكِنْ يُطَهَّرُ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنَّمَا قَالَ مَالِكٌ قَوْلاً مُجْمَلاً: يُغَسَّلُ وَيُنْقَى وَإِذَا أُنْقِيَ الْمَيِّتُ بِمَاءٍ قَرَاحٍ أَوْ مَاءٍ غَيْرِهِ أَجْزَأَ ذَلِكَ مِنْ غُسْلِهِ، وَلَكِنْ أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يُغْسَلَ ثَلاَثًا فَصَاعِدًا، لاَ يُقْصَرُ عَنْ ثَلاَثٍ، لِمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا، وَإِنْ أَنْقَوْا فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثِ مَرَّاتٍ، أَجْزَأَ، وَلاَ يَرَى أَنَّ قَوْلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّمَا هُوَ عَلَى مَعْنَى الإِنْقَاءِ ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا وَلَمْ يُؤَقِّتْ، وَكَذَلِكَ قَالَ الفُقَهَاءُ وَهُمْ أَعْلَمُ بِمَعَانِي الحَدِيثِ، وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: وَتَكُونُ الغَسَلاَتُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَيَكُونُ فِي الآخِرَةِ شَيْءٌ مِنْ كَافُورٍ.

واتە: لە ئوممو (عَطِيَّة)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: یـەكێ لە كچەكانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مرد، فەرمووی: (بە ئاو و مۆرد بیشۆن سێ جار یان پێنج جار یان زیاتر گرنگ ئەوەیە تاك بێ، لەدوا جاردا كـافور یان شتێ لە كافوری تێ بكەن، كاتێ كە لێ بوونەوە ئاگادارم بكەنەوە). كاتێ لـێ بووینـەوە ئاگادارمـان كـردەوە، ئـەویش كراس(ئیزار)ەكـەی خـۆی هەڵـدا بۆمـان فەرمووی: (بیكەن بە ژێر كراس بۆی)، هوشەیم فەرمووی: لە فەرموودەكـەدا نـاوی ئەمانە نەهاتووە — خالید و مەنصور و هیشام — نازانم لەوانەیە هیشام لەوان بـێ، ئوممو (عَطِيَّة) فەرمووی: قژیان بـۆ كـرد بـە سـێ پەلكـەوە، هوشـەیم فـەرمووی: وا ئەزانم فەرمووی: قـژیان دا بەسـەر پشـتیدا شـۆڕكردەوە، ئوممـو (عَطِيَّة) فـەرمووی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمووین: (لەلای راست و ئەندامەكانی دەستنوێژەوە دەست پێ بكەن).

ئیبراهیمی نەخەعی دەفەرمووێ: شۆردنی مردوو وەك خۆشتنی لەشگران وایـە، پێشەوا مالیكی كوڕی ئەنەس دەفەرمووێ: سـنورێكی دیـاریكراوی نیـە، هـەروەها سیفەتێكی دیاریكراوی نیە، بەڵام پاك دەشۆردرێت. پێشەوا شـافیعی دەفـەرمووێ: وتەكەی پێشەوا مالیك گشتگیرە، دەشۆردرێت و پاك دەكرێتـەوە، ئەگـەر بـە ئـاوی روون هیچی تێكـەڵ نـەكرێ بشـۆردرێ دروسـتە، بـەڵام پـێم باشـە سـێ جـار زیـاتر بشۆردرێت، لە سێ جار كەمتر نەبێ لەبەر فەرموودەكـەی پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كە دەفەرمووێت: (سێ جار یان پێنج جار بیشۆن). ئەگەر لەسێ جار كەمتر بوو دروستە.

## دەربارەی بەکارهێنانی میسك بۆ مردوو

## ١٦ - بَابٌ فِي مَا جَاءَ فِي الْمِسْكِ لِلْمَيِّتِ

٩٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، وَشَبَابَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ خُلَيْدِ بْنِ جَعْفَرٍ، سَمِعَ أَبَا نَضْرَةَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَطْيَبُ الطِّيبِ الْمِسْكُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (چاکترین بۆنی خۆش میسکە).

٩٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ خُلَيْدِ بْنِ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ الْمِسْكِ؟ فَقَالَ: هُوَ أَطْيَبُ طِيبِكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَدْ كَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ الْمِسْكَ لِلْمَيِّتِ. وَقَدْ رَوَاهُ الْمُسْتَمِرُّ بْنُ الرَّيَّانِ أَيْضًا، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ عَلِيٌّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: الْمُسْتَمِرُّ بْنُ الرَّيَّانِ ثِقَةٌ. خُلَيْدُ بْنُ جَعْفَرٍ ثِقَةٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی میسك پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فەرمووی: (میسك چاکترینی بۆنی خۆشی ئێوەیە).

هەندێ لە زانایان کار بەم فەرموودە دەکەن و میسك بەکاردەهێنن بۆ مردوو،

ئەمەش وتەی پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاقە. بەڵام هەندێكی تر لە زانایان بەلایانەوە باش نیە.

### دەربارەی خۆشتنی كەسێ كە مردوو دەشۆرێ

### ١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الغُسْلِ مِنْ غُسْلِ الْمَيِّتِ

٩٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَال: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ الْمُخْتَارِ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مِنْ غُسْلِهِ الغُسْلُ، وَمِنْ حَمْلِهِ الوُضُوءُ يَعْنِي: الْمَيِّتَ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ مَوْقُوفًا، وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الَّذِي يُغَسِّلُ الْمَيِّتَ، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِذَا غَسَّلَ مَيِّتًا فَعَلَيْهِ الغُسْلُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: عَلَيْهِ الوُضُوءُ. وقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: أَسْتَحِبُّ الغُسْلَ مِنْ غُسْلِ الْمَيِّتِ، وَلاَ أَرَى ذَلِكَ وَاجِبًا، وَهَكَذَا قَالَ الشَّافِعِيُّ. وقَالَ أَحْمَدُ: مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا أَرْجُو أَنْ لاَ يَجِبَ عَلَيْهِ الغُسْلُ، وَأَمَّا الوُضُوءُ فَأَقَلُّ مَا قِيلَ فِيهِ وقَالَ إِسْحَاقُ: لاَ بُدَّ مِنَ الوُضُوءِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ قَالَ: لاَ يَغْتَسِلُ وَلاَ يَتَوَضَّأُ مَنْ غَسَّلَ الْمَيِّتَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەركەسێك مردووی شۆرد با خۆی بشوات، هەركەسێكیش تەرمەكەی هەڵ بگرێ با دەستنوێژ بگرێت).

بێگومان زانایان رایان جیاوازە لەسەر كەسێ مردوو بشۆرێت، هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش دەفەرموون: هەركەسێ مردوو بشۆرێت خۆشتنی لەسەر واجبە، هەندێكی تریان

دەفەرموون: دەسنوێژگرتنی لەسەرە.

پێشەوا مالیك دەفەرمووێ: پێم خۆشە هەرکەسێك مردووی شۆرد خۆی بشوات، بەڵام بە واجبی نازانم، پێشەوا شافیعی هەمان بۆچوونی هەیە. پێشەوا ئەحمەد دەفەرمووێ: ئومێد دەکەم هەرکەسێك مردووی شۆرد خۆشتنی لەسەر واجب نەبێت، بەڵام بۆ دەسنوێژ کەمی لەسەر وتراوە. پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێ: هەردەبێ دەسنوێژ بگرێت، واتە واجبە. فەرمووی: لە (عبد الله)ی کوڕی موبارەکەوە هاتووە، هەرکەسێ مردوو بشوات نە خۆشتنی لەسەر واجبە، نە دەسنوێژگرتن.

### دەربارەی چ قوماشێ باشە بۆ کفن

١٨ - بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الأَكْفَانِ

٩٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ خُثَيْمٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: البَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ البَيَاضَ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ. وَفِي البَاب عَنْ سَمُرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ الَّذِي يَسْتَحِبُّهُ أَهْلُ العِلْمِ. وقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يُكَفَّنَ فِي ثِيَابِهِ الَّتِي كَانَ يُصَلِّي فِيهَا، وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَيْنَا أَنْ يُكَفَّنَ فِيهَا البَيَاضُ، وَيُسْتَحَبُّ حُسْنُ الكَفَنِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (جل و بەرگی سپی لەبەر بکەن چونکە چاکترین جل و بەرگە بۆ ئێوە، بیکەن بە کفنیش بۆ مردووەکانتان).

زانایـان ئەمـەیان پـێ باشـە، ئیبنـو موبـارەك دەفـەرموێت: پـێم خۆشـە ئـەو پۆشاكەی بۆ بكەن بە كفن كە نوێژی پێـوە دەكـرد. پێشـەوایان ئەحمـەد و ئیسـحاق دەفەرموون: باشترین پۆشاك بەلامانەوە پۆشـاكی سـپییە پبكرێـت بـە كفـن بـۆی، پێمان باشە كفنێكی باشی بۆ بكرێت.

## باسێكی تر لەوبارەوە

٩ - بَابٌ مِنْهُ

٩٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ يُونُسَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا وَلِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، فَلْيُحْسِنْ كَفَنَهُ. وَفِيهِ عَنْ جَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: قَالَ سَلاَّمُ بْنُ أَبِي مُطِيعٍ فِي قَوْلِهِ: وَلْيُحْسِنْ أَحَدُكُمْ كَفَنَ أَخِيهِ، قَال: هُوَ الصَّفَاءُ وَلَيْسَ بِالمرْتَفِعِ.

واتە: لـە ئـەبی قـەتادەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێرنـەوە، كـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێ براكەی كـرد بـە سەرپەرشتیار، بـا كفنێكـی جـوانی بـۆ بكـات). — پـاك و خـاوێن بـێ و گرانبـەها نەبێ- .

پێشەوا ئیبنـو موبـارەك دەفـەرمووێ: سـەلامی كـوڕی ئـەبو (مُطِيع) دەربـارەی (وَلْيُحْسِنْ أَحَدُكُمْ كَفَنَ أَخِيهِ) دەفەرموێت: مەبەست ئەوەیە پاك و خاوێن بـێ نـەك گرانبەها بێ.

## دەربارەی کفنەکەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَفَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٩٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَال: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُفِّنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ يَمَانِيَةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ، وَلاَ عِمَامَةٌ، قَال: فَذَكَرُوا لِعَائِشَةَ قَوْلَهُمْ: فِي ثَوْبَيْنِ وَبُرْدِ حِبَرَةٍ، فَقَالَتْ: قَدْ أُتِيَ بِالبُرْدِ، وَلَكِنَّهُمْ رَدُّوهُ، وَلَمْ يُكَفِّنُوهُ فِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسێ پارچە قوماشی سپی یەمەنیدا کفن کرا، بەبێ قەمیس و عەمامە. راوی فەرمووی: وتەکەیان بۆ عائیشە گێڕایەوە: لە دوو پۆشاك و (وَبُرْدِ حِبَرَةٍ) کە پۆشاکێکی خەت خەتی یەمەنییە کفن کرا، عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پۆشاکە خەت خەتە یەمەنیەکەیان بۆ هێنا بەلاّم رەدیانکردەوە نەیانکرد بە کفن بۆی.

٩٩٧ - (حسن) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَفَّنَ حَمْزَةَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فِي نَمِرَةٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ فِي كَفَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِوَايَاتٌ مُخْتَلِفَةٌ، وَحَدِيثُ عَائِشَةَ أَصَحُّ الأَحَادِيثِ الَّتِي رُوِيَتْ فِي كَفَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ عَائِشَةَ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. قَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: يُكَفَّنُ الرَّجُلُ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ، إِنْ شِئْتَ فِي قَمِيصٍ وَلِفَافَتَيْنِ، وَإِنْ شِئْتَ فِي ثَلاَثِ لَفَائِفَ،

وَيُجْزِي ثَوْبٌ وَاحِدٌ إِنْ لَمْ يَجِدُوا ثَوْبَيْنِ، وَالثَّوْبَانِ يُجْزِيَانِ، وَالثَّلاَثَةُ لِمَنْ وَجَدَهَا أَحَبُّ إِلَيْهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَالُوا: تُكَفَّنُ الْمَرْأَةُ فِي خَمْسَةِ أَثْوَابٍ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پۆشاکێکی خوری خەت خەتی کرد بە کفن بۆ حەمزەی کوڕی (عبد المطلب) ڕەزای خوای لێ بێ.

پێشەوا سوفیانی (ثوري) دەفەرموویێت: سێ پۆشاك دەکرێت بە کفن بۆ نێرینە، قەمیسێك و دوو پۆشاك دەپێچرێت بە هەموو جەستەیەوە، یان سێ پۆشاك دەپێچرێت بە هەموو جەستەیەوە، ئەگەر دوو پۆشاك دەستنەکەوت پۆشاکێ دروستە بکرێت بە کفن بۆی، دوو پۆشاکیش هەر دروستە، بەڵام ئەگەر دەستکەوت و توانا هەبوو ئەوە زانایان سێ پۆشاکیان پێ خۆشترە، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە، دەفەرموون: پێنج پۆشاك دەکرێت بە کفن بۆ ئافرەت.

## دەربارەی خواردن دروستکردن بۆ کەسوکاری مردوو

### ٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الطَّعَامِ يُصْنَعُ لأَهْلِ الْمَيِّتِ

٩٩٨ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: لَمَّا جَاءَ نَعْيُ جَعْفَرٍ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اصْنَعُوا لأَهْلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا، فَإِنَّهُ قَدْ جَاءَهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ كَانَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى أَهْلِ الْمَيِّتِ شَيْءٌ لِشُغْلِهِمْ بِالمصِيبَةِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. وَجَعْفَرُ بْنُ خَالِدٍ هُوَ ابْنُ سَارَةَ وَهُوَ ثِقَةٌ رَوَى عَنْهُ ابْنُ جُرَيْجٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی جەعفەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ هەواڵی مردنی جەعفەر بڵاوبوەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (خواردن دروستکەن بۆ خانەوادە و کەسوکاری جەعفەر، چونکە خۆیان غەمبارن و هەواڵێ هاتۆتە پێشەوە سەرقاڵی کردوون).

## دەربارەی قەدەغەکردنی لەروخساردان و یەخە دادڕین لەکاتی کارەساتدا

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ ضَرْبِ الْخُدُودِ، وَشَقِّ الْجُيُوبِ عِنْدَ الْمُصِيبَةِ

٩٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، قَالَ: حَدَّثَنِي زُبَيْدٌ الأَيَامِيُّ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ شَقَّ الجُيُوبَ، وَضَرَبَ الخُدُودَ، وَدَعَا بِدَعْوَةِ الجَاهِلِيَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لەسەر سوننەت و ڕێبازی من نیە ئەوکەسەی لەکاتی کارەساتدا لەروخساری خۆی دەدات، یەخەی خۆی دادڕێت، بە هاواری سەردەمی نەفامی هات و هاوار دەکات، مردووەکە دەلاوێنێتەوە). — بەکارهێنانی وتەی ناشەرعی دەگرێتەوە کە پەنا بە خوا هەندێ جار دەگاتە ڕادەی بێ باوەڕی -.

## دەربارەی شیوەنكردن كە باش نیە

## ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النَّوْحِ

١٠٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا قُرَّانُ بْنُ تَمَّامٍ، وَمَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عُبَيْدٍ الطَّائِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبِيعَةَ الأَسَدِيِّ، قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ: قَرَظَةُ بْنُ كَعْبٍ، فَنِيحَ عَلَيْهِ، فَجَاءَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: مَا بَالُ النَّوْحِ فِي الإِسْلاَمِ، أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ نِيحَ عَلَيْهِ عُذِّبَ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَأَبِي مُوسَى، وَقَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجُنَادَةَ بْنِ مَالِكٍ، وَأَنَسٍ، وَأُمِّ عَطِيَّةَ، وَسَمُرَةَ، وَأَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ. حَدِيثُ الْمُغِيرَةِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەلی كوڕی ڕەبیعەی ئەسەدیەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاوێكی ئەنصاری وەفاتی كرد بە ناوی (قَرَظَة)ی كوڕی كەعبەوە شیوەنیان بۆ گێڕا، موغیرەی كوڕی شوعبە ڕەزای خوای لێ بێ چووە سەر مینبەر، سوپاس و ستایشی خوای كردوو، فەرمووی: لەم سەردەمە زێڕینەی ئیسلامدا ئەم شیوەن و واوەیلایەتان لەچی، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو دەیفەرموو: (هەركەس شیوەنی بۆ بكرێت لەسەری سزا دەدرێت).

١٠٠١ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، وَالمَسْعُودِيُّ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ أَبِي الرَّبِيعِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الجَاهِلِيَّةِ لَنْ يَدَعَهُنَّ النَّاسُ: النِّيَاحَةُ، وَالطَّعْنُ فِي الأَحْسَابِ، وَالعَدْوَى أَجْرَبَ بَعِيرٌ فَأَجْرَبَ مِائَةَ بَعِيرٍ مَنْ أَجْرَبَ البَعِيرَ الأَوَّلَ، وَالأَنْوَاءُ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (چوار شت لەم ئومەتەی مـن لەکار و کردەوەی سەردەمی نەفامین و خەڵك وازیـان لـێ نـاهێنن: شـین و واوەیلا، تانەو تەشەردان لە ڕەچەڵەك، تەنینەوەی نەخۆشی دەڵێن: وشترێ سەد وشتر تووشـی نەخۆشی (جرب) دەکات، ئەی کێ وشتری یەکەمی تووش کرد، پێشبینی بورجەکان دەڵێن: بەهۆی فلان بورج و فلان بورجەوە بارانمان بۆ باری).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گریان بۆ مردوو باش نیە

### ٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ البُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

١٠٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ. حَدِيثُ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ البُكَاءَ عَلَى الْمَيِّتِ، قَالُوا: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، وَذَهَبُوا إِلَى هَذَا الحَدِيثِ. وقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: أَرْجُو إِنْ كَانَ يَنْهَاهُمْ فِي حَيَاتِهِ أَنْ لاَ يَكُونَ عَلَيْهِ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (مـردوو سـزا دەدرێت بـەهۆی گریانی ناشەرعی کەسوکاریەوە بۆی).

بە پێی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان گریانیان بۆ مردوو پـێ پەسـەند و بـاش نیە، دەفەرموون: مردوو سزا دەدرێت بەهۆی گریانی ناشەرعی کەسـوکاریەوە بـۆی.

ئیبنو موبارەك دەفەرمووێت: هیوام وایە لەپێش مردنی رێگری لێ کردبن و وەسیەتی کردبێ بۆیان کە بۆی نەگرین.

١٠٠٣ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَسِيدُ بْنُ أَبِي أَسِيدٍ، أَنَّ مُوسَى بْنَ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيَّ، أَخْبَرَهُ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: مَا مِنْ مَيِّتٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ بَاكِيهِ، فَيَقُولُ: وَاجَبَلاَهْ وَاسَيِّدَاهْ أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ، إِلاَّ وُكِّلَ بِهِ مَلَكَانِ يَلْهَزَانِهِ: أَهَكَذَا كُنْتَ؟ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر مردوویەك کە دەمرێت ئەوەی بۆی دەگری هەڵەسێتەوەو دەڵێ: ئای ئەو کێوەم رۆ، ئەو گەورەیەم رۆ، فلانم رۆ و وێنەی ئەمانە، ئیللا مردووەکە دەدەنە دەست دوو مەلائیکە لێی دەدەن و بە تانەو تەشەردانەوە پێی دەڵێن: ئایا تۆ بەو شێوەیە بووی کە ئەمە دەیڵێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی روخسەتی گریان بۆ مردوو

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي البُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

١٠٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ عَبَّادٍ الْمُهَلَّبِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَرْحَمُهُ اللَّهُ، لَمْ يَكْذِبْ وَلَكِنَّهُ وَهِمَ، إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِرَجُلٍ مَاتَ يَهُودِيًّا: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ، وَإِنَّ أَهْلَهُ لَيَبْكُونَ عَلَيْهِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَقَرَظَةَ بْنِ كَعْبٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ

عَائِشَةَ. وَقَدْ ذَهَبَ أَهْلُ العِلْمِ إِلَى هَذَا، وَتَأَوَّلُوا هَذِهِ الآيَةَ: (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى)، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (مردوو سزا دەدرێت بەهۆی گریانی ناشەرعی كەسوكاریەوە بۆی). عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ڕەحمەتی خوای لێ بێ درۆ ناكات بەڵكو لێی تێكچووە، بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی پیاوێكی جولەكە كە مردبوو فەرمووی: (بەڕاستی مردوو سزا دەدرێت بەهۆی گریانی كەسوكاریەوە بۆی).

هەندێ لە زانایان ڕایان لەسەر ئەمەیە، تەئویلی ئەم ئایەتە دەكەن: (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى). واتە: هیچ كەسێك باری گوناهی هیچ كەسێكی تر هەڵناگرێت. ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیە.

١٠٠٥ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَخَذَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى ابْنِهِ إِبْرَاهِيمَ، فَوَجَدَهُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَوَضَعَهُ فِي حِجْرِهِ فَبَكَى، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: أَتَبْكِي؟ أَوَلَمْ تَكُنْ نَهَيْتَ عَنِ البُكَاءِ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ نَهَيْتُ عَنْ صَوْتَيْنِ أَحْمَقَيْنِ فَاجِرَيْنِ: صَوْتٍ عِنْدَ مُصِيبَةٍ، خَمْشِ وُجُوهٍ، وَشَقِّ جُيُوبٍ، وَرَنَّةِ شَيْطَانٍ. وَفِي الحَدِيثِ كَلاَمٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ

واتە: لە جابیری كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستی (عبد الرحمن)ی كوڕی عەوفی گرت

بردی بۆ لای ئیبراهیمی کوڕی، کە چوون بینیان ئیبراهیم گیانی دەدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەڵی گرت و خستیە باوەشی و گریا، (عبد الرحمن) پێی فەرموو: ئەوە تۆش دەگریی؟ ئایا تۆ رێگریت نەکردووە لە گریان؟ فەرمووی: (بەڵکو من رێگریم کردوو لە دوو دەنگە گەوج و گێل و خراپەکە: دەنگ لەکاتی موسیبەت و کارەساتدا، دەم و چاو رنین بە نینۆك، یەخەدادڕین و، لاواندنەوەی شەیتان).

١٠٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ (ح) وحَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمْرَةَ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ وَذُكِرَ لَهَا أَنَّ ابْنَ عُمَرَ، يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الحَيِّ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: غَفَرَ اللَّهُ لأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ، وَلَكِنَّهُ نَسِيَ أَوْ أَخْطَأَ، إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى يَهُودِيَّةٍ يُبْكَى عَلَيْهَا، فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

بۆ خاتوو عائیشەیان رەزای خوای لێ بێ گێڕایەوە، کە ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ فەرموویەتی: مردوو سزا دەدرێت بەهۆی گریانی زیندووە بۆی. عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: خوای گەورە لە باوکی (عبد الرحمن) خۆشبێ، بەڕاستی درۆ ناکات، بەڵکو لەیادی چووە یان کەوتۆتە هەڵەوە، بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دای بەلای جولەکەیەکدا مردبوو بۆی دەگریان، فەرمووی: (بەڕاستی ئەمانە بۆی دەگرین، ئەویش لەگۆڕەکەیدا سزا دەدرێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆشتن لەپێش جەنازەوە

### ٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَشْيِ أَمَامَ الجَنَازَةِ

١٠٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَإِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ يَمْشُونَ أَمَامَ الجَنَازَةِ.

واتە: لە سالیمەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەرم بینیوە لەپێش جەنازەوە دەڕۆشتن.

١٠٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، وَبَكْرٍ الكُوفِيِّ، وَزِيَادٍ، وَسُفْيَانَ، كُلُّهُمْ يَذْكُرُ أَنَّهُ سَمِعَهُ مِنَ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ يَمْشُونَ أَمَامَ الجَنَازَةِ.

واتە: لە سالیمی کوڕی (عبد الله)وە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەرم ڕەزای خوایان لێ بێ بینی لەپێش جەنازەوە دەڕۆشتن.

١٠٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ يَمْشُونَ أَمَامَ الجَنَازَةِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَأَخْبَرَنِي سَالِمٌ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يَمْشِي أَمَامَ الجَنَازَةِ. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ هَكَذَا، رَوَاهُ ابْنُ جُرَيْجٍ، وَزِيَادُ بْنُ سَعْدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، نَحْوَ حَدِيثِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، وَرَوَى مَعْمَرٌ، وَيُونُسُ بْنُ يَزِيدَ،

وَمَالِكٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الحُفَّاظِ عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمْشِي أَمَامَ الجَنَازَةِ. وَأَهْلُ الحَدِيثِ كُلُّهُمْ يَرَوْنَ أَنَّ الحَدِيثَ الْمُرْسَلَ فِي ذَلِكَ أَصَحُّ. وَسَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ مُوسَى يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّزَّاقِ يَقُولُ: قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: حَدِيثُ الزُّهْرِيِّ فِي هَذَا مُرْسَلٌ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُيَيْنَةَ. قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: وَأَرَى ابْنَ جُرَيْجٍ أَخَذَهُ عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ. وَرَوَى هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ زِيَادٍ وَهُوَ ابْنُ سَعْدٍ، وَمَنْصُورٍ، وَبَكْرٍ، وَسُفْيَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَإِنَّمَا هُوَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ رَوَى عَنْهُ هَمَّامٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الْمَشْيِ أَمَامَ الجَنَازَةِ، فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الْمَشْيَ أَمَامَهَا أَفْضَلُ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ. وَحَدِيثُ أَنَسٍ فِي هَذَا البَابِ غَيْرُ مَحْفُوظٍ.

واتە: لە پێشەوا زوهریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر لەپێش جەنازەوە ڕۆشتوون. پێشەوا زوهری دەفەرمووێت: سالیم پێی ڕاگەیاندم کە باوکی لەپێش جەنازەوە دەڕۆشت.

زانایان دەربارەی ڕۆشتن لەپێش جەنازەوە ڕایان جیاوازە، هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش ڕایان وایە و دەفەرموون: ڕۆشتن لەپێش جەنازەوە چاکترە، ئەمەش وتەی شافیعی و ئەحمەدە.

١٠١٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، كَانُوا يَمْشُونَ أَمَامَ الجَنَازَةِ. سَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ خَطَأٌ أَخْطَأَ فِيهِ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ، وَإِنَّمَا يُرْوَى هَذَا الحَدِيثُ عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، كَانُوا يَمْشُونَ أَمَامَ الجَنَازَةِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَأَخْبَرَنِي سَالِمٌ: أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يَمْشِي أَمَامَ الجَنَازَةِ. قَالَ مُحَمَّدٌ: هَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و (عثمان) ڕەزای خوایان لێ بێ لەپێش جەنازەوە دەڕۆشتن.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆشتن لەدوای جەنازەوە

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَشْيِ خَلْفَ الجَنَازَةِ

١٠١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ يَحْيَى إِمَامِ بَنِي تَيْمِ اللهِ، عَنْ أَبِي مَاجِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: سَأَلْنَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمَشْيِ خَلْفَ الجَنَازَةِ؟ قَالَ: مَا دُونَ الخَبَبِ، فَإِنْ كَانَ خَيْرًا عَجَّلْتُمُوهُ، وَإِنْ كَانَ شَرًّا فَلاَ يُبَعَّدُ إِلاَّ أَهْلُ النَّارِ، الجَنَازَةُ مَتْبُوعَةٌ وَلاَ تَتْبَعُ، وَلَيْسَ مِنْهَا مَنْ تَقَدَّمَهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ لاَ يُعْرَفُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يُضَعِّفُ حَدِيثَ أَبِي مَاجِدٍ هَذَا، وقَالَ مُحَمَّدٌ: قَالَ الحُمَيْدِيُّ: قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: قِيلَ لِيَحْيَى، مَنْ أَبُو مَاجِدٍ هَذَا؟ قَالَ: طَائِرٌ طَارَ فَحَدَّثَنَا. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ إِلَى هَذَا، رَأَوْا أَنَّ الْمَشْيَ خَلْفَهَا أَفْضَلُ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَإِسْحَاقُ. وَأَبُو مَاجِدٍ رَجُلٌ مَجْهُولٌ لاَ يُعْرَفُ، إِنَّمَا يُرْوَى عَنْهُ حَدِيثَانِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَيَحْيَى إِمَامُ بَنِي تَيْمِ اللهِ ثِقَةٌ، يُكْنَى أَبَا الحَارِثِ، وَيُقَالُ لَهُ يَحْيَى الجَابِرُ، وَيُقَالُ لَهُ يَحْيَى الْمُجْبِرُ أَيْضًا، وَهُوَ كُوفِيٌّ، رَوَى لَهُ شُعْبَةُ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَأَبُو الأَحْوَصِ، وَسُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ڕۆشتن لەدوای جەنازەوە پرسیارمان کرد لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فەرمووی: (بە پەلە جەنازە بەرێ بکەن، ئەگەر مردوەکە کردەوەی

چاك بێت ئەوە با بگات بە خێر و چاکەو پاداشتی خۆی، ئەگەر ئەوەش نەبێت مەگەر دورکەوتنەوە نیە لە ئەهلی ئاگر، دەبێ خەڵك شوێنی جەنازە بکەون نابێ پێشی بکەون، ئەوەی پێشی بکەوێت ئەوە لەگەڵ جەنازەکەدا نیەو پاداشتی بۆ نانوسرێت).

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان وایە: رۆشتن لەدوای جەنازەوە چاکترە، سوفیانی (ثوري) و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی رۆشتن بەسواری لەدوای جەنازەوە

٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الرُّكُوبِ خَلْفَ الجَنَازَةِ

١٠١٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ رَاشِدِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَنَازَةٍ فَرَأَى نَاسًا رُكْبَانًا، فَقَالَ: أَلاَ تَسْتَحْيُونَ إِنَّ مَلاَئِكَةَ اللهِ عَلَى أَقْدَامِهِمْ وَأَنْتُمْ عَلَى ظُهُورِ الدَّوَابِّ. وَفِي البَاب عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ. حَدِيثُ ثَوْبَانَ قَدْ رُوِيَ عَنْهُ مَوْقُوفًا، قَالَ مُحَمَّدٌ: الْمَوْقُوفُ مِنْهُ أَصَحُّ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەرچووین بۆ بەرێکردنی جەنازەیە، هەندێ کەسی بینی بە سواری لەگەڵ جەنازەکە دەڕۆشتن، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئایا ئێوە شەرم ناکەن مەلائیکەکانی خوا بەپێ دەڕۆن، کەچی ئێوە بەسواری).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی روخسەت لەمەدا

## ٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

١٠١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ يَقُولُ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَنَازَةِ ابْنِ الدَّحْدَاحِ وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لَهُ يَسْعَى وَنَحْنُ حَوْلَهُ وَهُوَ يَتَوَقَّصُ بِهِ.

واتە: لە سەماکەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە جابیری کوڕی سەمورەوە بوو رەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: ئێمە کاتێ لەخزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جەنازەی ئیبنو دەحداحمان بەڕێ دەکرد، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەسەر ئەسپێکی خۆیەوە بوو هەنگاوەکانی نزیک بوون لەیەکەوە، ئێمەش بەدەوریدا لەگەڵ جەنازەکە دەڕۆشتین.

١٠١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الصَّبَّاحِ الهَاشِمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ، عَنِ الجَرَّاحِ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اتَّبَعَ جَنَازَةَ، ابْنِ الدَّحْدَاحِ مَاشِيًا، وَرَجَعَ عَلَى فَرَسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەپێ شوێن جەنازەی ئیبنو دەحداح کەوت، کاتێ کە گەڕایەوە بەسواری ئەسپێکەوە هاتەوە.

الأَسْقَعِ، عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الغَنَوِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَجْلِسُوا عَلَى القُبُورِ، وَلاَ تُصَلُّوا إِلَيْهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، وَبَشِيرِ ابْنِ الخَصَاصِيَةِ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو (مَرْثَد)ی غەنەویـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویـەتی: (لەسـەر گـۆڕ و دامەنیشن و بەرەو ڕووشی نوێژ مەکەن).

١٠٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، وَأَبُو عَمَّارٍ قَالاَ: أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، عَنْ بُسْرِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ، عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الغَنَوِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ وَلَيْسَ فِيهِ عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ، وَهَذَا الصَّحِيحُ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَحَدِيثُ ابْنِ الْمُبَارَكِ خَطَأٌ، أَخْطَأَ فِيهِ ابْنُ الْمُبَارَكِ وَزَادَ فِيهِ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيِّ، وَإِنَّمَا هُوَ بُسْرُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ وَاثِلَةَ هَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، وَلَيْسَ فِيهِ عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ، وَبُسْرُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ قَدْ سَمِعَ مِنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ.

## دەربارەی نەهی لە گەچکاری گۆڕ و نووسین لەسەری

### ٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ تَجْصِيصِ القُبُورِ، وَالكِتَابَةِ عَلَيْهَا

١٠٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَسْوَدِ أَبُو عَمْرٍو البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُجَصَّصَ القُبُورُ، وَأَنْ يُكْتَبَ عَلَيْهَا، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهَا، وَأَنْ تُوطَأَ. هَذَا

حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ جَابِرٍ. وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْهُمْ: الحَسَنُ البَصْرِيُّ، فِي تَطْيِينِ القُبُورِ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُطَيَّنَ القَبْرُ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەمانەی قەدەکردووە: گەچکاری گۆڕ و نووسین لەسەری و دروستکردنی بینا لەسەری و پێ پیانانی. هەندێ لە زانایان و پێشەوایان حەسەنی بەصری و شافیعی قوڕکاری گۆڕیان بەلاوە دروستە.

## دەربارەی کەسێ چووە سەر گۆڕستان چی بڵێ

٥٩ - بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا دَخَلَ الْمَقَابِرَ

١٠٥٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّلْتِ، عَنْ أَبِي كُدَيْنَةَ، عَنْ قَابُوسَ بْنِ أَبِي ظَبْيَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقُبُورِ الْمَدِينَةِ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ القُبُورِ، يَغْفِرُ اللَّهُ لَنَا وَلَكُمْ، أَنْتُمْ سَلَفُنَا، وَنَحْنُ بِالأَثَرِ. وَفِي البَاب عَنْ بُرَيْدَةَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو كُدَيْنَةَ: اسْمُهُ يَحْيَى بْنُ الْمُهَلَّبِ. وَأَبُو ظَبْيَانَ: اسْمُهُ حُصَيْنُ بْنُ جُنْدُبٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەمەدینە دای بەلای چەند گۆڕێکدا فەرمووی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ القُبُورِ، يَغْفِرُ اللَّهُ لَنَا وَلَكُمْ، أَنْتُمْ سَلَفُنَا، وَنَحْنُ بِالأَثَرِ) واتە: سڵاوی خواتان لێ بێ ئەی دانیشتوانی گۆڕستان، خوا لە منیش و لەئێوەش خۆشببێت، ئێوە پێشینانی ئێمەن و ئێمەش بەدوای ئێوەدا دێین.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی روخسەتی سەردانی گۆڕستان

٦٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي زِيَارَةِ الْقُبُورِ

١٠٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ النَّبِيلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَدْ كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ القُبُورِ، فَقَدْ أُذِنَ لِمُحَمَّدٍ فِي زِيَارَةِ قَبْرِ أُمِّهِ، فَزُورُوهَا فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الآخِرَةَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ بُرَيْدَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ بِزِيَارَةِ القُبُورِ بَأْسًا، وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (بێگومان سەردانی گۆڕستانم لێ قدەغەکردن، بەڕاستی موحەممەد ڕێگەی پێ درا سەردانی گۆڕی دایکی بکات، دەی ئێوەش سەردانی گۆڕستان بکەن لەبەرئەوەی دوارۆژتان یاد دەخاتەوە).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان رایان وایە سەردانی گۆڕستان دروستە، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

١٠٥٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ: تُوُفِّيَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ بِحُبْشِيٍّ قَالَ: فَحُمِلَ إِلَى مَكَّةَ، فَدُفِنَ فِيهَا، فَلَمَّا قَدِمَتْ عَائِشَةُ أَتَتْ قَبْرَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي

بَكْرٍ، فَقَالَتْ:

وَكُنَّا كَنَدْمَانَيْ جَذِيمَةَ حِقْبَةً — مِنَ الدَّهْرِ حَتَّى قِيلَ لَنْ يَتَصَدَّعَا
فَلَمَّا تَفَرَّقْنَا كَأَنِّي وَمَالِكًا — لِطُولِ اجْتِمَاعٍ لَمْ نَبِتْ لَيْلَةً مَعَا[1].

ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ لَوْ حَضَرْتُكَ مَا دُفِنْتَ إِلاَّ حَيْثُ مُتَّ، وَلَوْ شَهِدْتُكَ مَا زُرْتُكَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبو مولەیکەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبو بەکر لە حوبشی مرد — حوبشی شوێنێکە لە نزیك مەککە، هەڵیانگرت و بردیان بۆ شاری مەککە، لەوێ ئەسپەردەیان کرد. کاتێ عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ گەیشتە مەککە سەردانی گۆڕی براکەی کرد و شیعرەکەی سەرەوەی خوێندەوە. لەپاشدا فەرمووی: سوێند بە (الله) ئەگەر کاتی مردنت ئامادەبوومایە هەر لە حوبشی دەمناشتی و نەمدەهێشت بتگوێزنەوە بۆ مەککە، هەروەها ئەگەر کاتی مردنت ئامادەبوومایە ئێستا سەردانی گۆڕەکەتم نەدەکرد — (طيبي) دەفەرمووێ: لەبەرئەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت: (نەفرەت لەو ئافرەتانەی سەردانی گۆڕستان دەکەن) - .

١٠٥٦ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَنَ زَوَّارَاتِ الْقُبُورِ. وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَأَى بَعْضُ أَهْلِ

(١) شیعرەکە لاوانەوەی تەمیمی کوڕی نوەیرەیە بە بۆنەی کوشتنی مالیکی برایەوە وتویەتی کە لەلایەن خالیدی کوڕی وەلیدەوە کوژرا, مانای هۆنراوەکە بە کورتی ئەمەیە: کۆبوونەوە لەگەڵ خۆشەویستان و دۆستان لە ژیانی دونیادا لەدوای جیابوونەوە بە مردن, کەمترین کات و ساتێکە زوو کۆتایی دێت و دەڕوات (تحفة الأحوذي).

العِلْمِ أَنَّ هَذَا كَانَ قَبْلَ أَنْ يُرَخِّصَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي زِيَارَةِ القُبُورِ، فَلَمَّا رَخَّصَ دَخَلَ فِي رُخْصَتِهِ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا كُرِهَ زِيَارَةُ القُبُورِ لِلنِّسَاءِ لِقِلَّةِ صَبْرِهِنَّ وَكَثْرَةِ جَزَعِهِنَّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی سەردانی گۆڕستان دەکەن.

هەندێ لە زانایان رایان وایە ئەمە لەپێش روخسەتی سەردانی گۆڕستاندا فەرموویەتی، کاتێ کە روخسەتی دا روخسەتەکە پیاو و ژن دەگرێتەوە، هەندێکی تریان دەفەرموون: سەردانی گۆڕستانی قەدەغەکرد لە ئافرەتان چونکە توانای ئارامگرتنیان کەمە و زوو دەست دەکەن بە گریان.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ناشتنی مردوو لە شەودا

### ٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدَّفْنِ بِاللَّيْلِ

١٠٥٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو السَّوَّاقُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ اليَمَانِ، عَنِ الْمِنْهَالِ بْنِ خَلِيفَةَ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ قَبْرًا لَيْلاً، فَأُسْرِجَ لَهُ سِرَاجٌ، فَأَخَذَهُ مِنْ قِبَلِ القِبْلَةِ، وَقَالَ: رَحِمَكَ اللَّهُ، إِنْ كُنْتَ لأَوَّاهًا تَلاَّءً لِلْقُرْآنِ، وَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعًا. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ، وَيَزِيدَ بْنِ ثَابِتٍ، وَهُوَ أَخُو زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ أَكْبَرُ مِنْهُ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا، وَقَالُوا: يُدْخَلُ الْمَيِّتُ القَبْرَ مِنْ قِبَلِ القِبْلَةِ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُسَلُّ سَلًّا. وَرَخَّصَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ فِي الدَّفْنِ بِاللَّيْلِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە شەوێ

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چووە ناو گۆڕێکەوە، چرایەکیان بۆ داگیرساند، مردووەکەی هەڵگرت و لەڕووی قیبلەوە خستیە ناوگۆڕەکەوە و فەرمووی: خوا ڕوحمی پێ بکات ئەگەر بە تیلاوەت و گریانەوە قورئانی خوێندووە لەترسی خوا، جا چوار (الله اكبر)ی کرد.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی باسی مردوو بە چاکە

٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الثَّنَاءِ الحَسَنِ عَلَى الْمَيِّتِ

١٠٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مُرَّ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِجَنَازَةٍ، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَجَبَتْ، ثُمَّ قَالَ: أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الأَرْضِ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جەنازەیەکیان بەلای پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) برد، خەڵکەکە بە باشی باسیان کرد، فەرمووی: (پێویست بوو). — واتە مادەم بە باشی باسیان کرد بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو، لەپاشدا فەرمووی: (ئێوە شایەتحاڵی خوای گەورەن لەزەوی دا).

١٠٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، وَهَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللهِ البَزَّازُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي الفُرَاتِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّيلِيِّ، قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، فَمَرُّوا بِجَنَازَةٍ، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ عُمَرُ: وَجَبَتْ، فَقُلْتُ لِعُمَرَ وَمَا وَجَبَتْ؟ قَالَ: أَقُولُ

كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ لَهُ ثَلاَثَةٌ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، قَالَ: قُلْنَا: وَاثْنَانِ؟ قَالَ: وَاثْنَانِ، قَالَ: وَلَمْ نَسْأَلْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْوَاحِدِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو الأَسْوَدِ الدِّيلِيُّ: اسْمُهُ ظَالِمُ بْنُ عَمْرِو بْنِ سُفْيَانَ.

واتە: لە ئەبو ئەسوەدی دیلیەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: گەیشتمە شاری مەدینە لەخزمەت پێشەوا عومەردا رەزای خوای لیّ بیّ دانیشتم، جەنازەیەكیان بەلایدا برد، خەڵكەكە بە باشی باسیان كرد، پێشەوا عومەر رەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی: پێویست بوو، منیش بە پێشەوا عومەرم رەزای خوای لیّ بیّ وت: چی پێویست بوو؟ فەرمووی: من ئەوە دەڵێم كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانیّ سیّ كەس شایەتی چاكەی بۆ بدات ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت). فەرمووی: وتمان دوو كەسیش؟ فەرمووی: (بەڵیّ دوو كەسیش)، فەرمووی: بەڵام دەربارەی یەك كەس پرسیارمان لیّ نەكرد.

## پاداشتی كەسیّ منداڵی پێش خۆی بمرێت

## ٦٤ – بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ مَنْ قَدَّمَ وَلَدًا

١٠٦٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ (ح) وحَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَمُوتُ لأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ إِلاَّ تَحِلَّةَ الْقَسَمِ. وَفِي الْبَاب عَنْ عُمَرَ، وَمُعَاذٍ، وَكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، وَعُتْبَةَ بْنِ عَبْدٍ، وَأُمِّ سُلَيْمٍ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي ثَعْلَبَةَ الأَشْجَعِيِّ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَقُرَّةَ بْنِ إِيَاسٍ الْمُزَنِيِّ. وَأَبُو

ثَعْلَبَةَ الأَشْجَعِيُّ لَهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثٌ وَاحِدٌ هُوَ هَذَا الحَدِيثُ، وَلَيْسَ هُوَ الخُشَنِيُّ: حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ سێ منداڵی بمرن ئارام بگرێ و ناشكوری نەكات لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزرێت، مەگەر بۆ (تَحِلَّةَ القَسَمِ) مەبەست پێی ئەم ئایەتەیە: (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا). سورة مريم:٧١. واتە: ئەی خەڵكینە! ئیللا دەبێ نزیكی ئاگری دۆزەخ ببنەوەو بەسەر پردی (صراط)دا تێپەڕن.

١٠٦١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: حَدَّثَنَا العَوَّامُ بْنُ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَدَّمَ ثَلاَثَةً لَمْ يَبْلُغُوا الحُلُمَ كَانُوا لَهُ حِصْنًا حَصِينًا مِنَ النَّارِ. قَالَ أَبُو ذَرٍّ: قَدَّمْتُ اثْنَيْنِ، قَالَ: وَاثْنَيْنِ، فَقَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ سَيِّدُ القُرَّاءِ: قَدَّمْتُ وَاحِدًا، قَالَ: وَوَاحِدًا، وَلَكِنْ إِنَّمَا ذَاكَ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ پێش خۆی سێ منداڵی بمرن نەگەیشتبنە تەمەنی باڵغ بوون ئارام بگرێ، ئەوە دەبنە قەڵایەكی پۆڵایین بۆ پاراستنی لە ئاگری دۆزەخ). ئەبو (ذر) رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: من دوانم مردوون؟ فەرمووی: (دوانیش)، گەورەی قورئان خوێنەكان ئوبەی كوڕی كەعب رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: من یەك دانەم مردووە؟ فەرمووی: (یەكێكیش، بەڵام ئەمە دەبێ ئارامگرتنەكەی لەسەرەتای

موسیبەتەکەوە بێ).

١٠٦٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، وَأَبُو الخَطَّابِ زِيَادُ بْنُ يَحْيَى البَصْرِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ رَبِّهِ بْنُ بَارِقٍ الحَنَفِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ جَدِّي أَبَا أُمِّي سِمَاكَ بْنَ الوَلِيدِ الحَنَفِيَّ يُحَدِّثُ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يُحَدِّثُ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ كَانَ لَهُ فَرَطَانِ مِنْ أُمَّتِي أَدْخَلَهُ اللَّهُ بِهِمَا الجَنَّةَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: وَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ يَا مُوَفَّقَةُ، قَالَتْ: فَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: فَأَنَا فَرَطُ أُمَّتِي لَنْ يُصَابُوا بِمِثْلِي. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ بَارِقٍ، وَقَدْ رَوَى عَنْهُ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ الْمُرَابِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ قَالَ: أَنْبَأَنَا عَبْدُ رَبِّهِ بْنُ بَارِقٍ فَذَكَرَ نَحْوَهُ. وَسِمَاكُ بْنُ الوَلِيدِ هُوَ أَبُو زُمَيْلٍ الحَنَفِيُّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ پێش خۆی دوو منداڵی بمرن بەهۆی ئەوانەوە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە). عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی ئەگەر کەسێ لە ئوممەتی تۆ پێش خۆی منداڵێکی بمرێ حوکمی چیە هەمان پاداشتی بۆ هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەوەی منداڵێکی بمرێ هەمان پاداشتی بۆ هەیە)، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی ئەگەر کەسێ لە ئوممەتی تۆ پێش خۆی منداڵی نەمرد؟ فەرمووی: (دەی مردنی من لە بریتی، چونکە ئوممەتی من تووشی هیچ موسیبەتێ نابن وەك موسیبەتی مردنی من بێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی شەهیدان کێن؟

٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشُّهَدَاءِ مَنْ هُمْ

١٠٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الشُّهَدَاءُ خَمْسٌ: الْمَطْعُونُ، وَالمَبْطُونُ، وَالغَرِقُ، وَصَاحِبُ الهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَصَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ، وَجَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ، وَخَالِدِ بْنِ عُرْفُطَةَ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ، وَأَبِي مُوسَى، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەم پێنجە شەهیدن: ئەو کەسەی بە نەخۆشی (طاعون) بمرێت، ئەوەی بە دەردی ناوسك بمرێت، ئەو کەسەی لەئاودا بخنکێ، ئەو کەسەی شت بڕوخێ بە سەریدا و لەژێریا بمرێت، ئەوەی لەپێناوی خوادا بکوژرێت).

١٠٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنِ أَسْبَاطِ بْنِ مُحَمَّدٍ القُرَشِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سِنَانٍ الشَّيْبَانِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ السَّبِيعِيِّ قَالَ: قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ لِخَالِدِ بْنِ عُرْفُطَةَ أَوْ خَالِدٌ لِسُلَيْمَانَ، أَمَا سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ قَتَلَهُ بَطْنُهُ لَمْ يُعَذَّبْ فِي قَبْرِهِ؟ فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: نَعَمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ فِي هَذَا البَابِ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: سولەیمانی کوڕی صورەد و خالیدی کوڕی (عُرْفُطَة) یەکێکیان بەوی تریانی فەرموو: ئایا نەتبیستووە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: (ئەو کەسەی بە سك ئێشە بمرێت ئەوە لە گۆڕەکەیدا سزا نادرێت). یەکێکیان بە هاوڕێکەی فەرموو: بەڵێ.

## دەربارەی قەدەغەکردنی راکردن لە نەخۆشی (طاعون)

٦٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الفِرَارِ مِنَ الطَّاعُونِ

١٠٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرَ الطَّاعُونَ، فَقَالَ: بَقِيَّةُ رِجْزٍ، أَوْ عَذَابٍ أُرْسِلَ عَلَى طَائِفَةٍ مِنْ بني إسرائيل، فَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا مِنْهَا، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَلَسْتُمْ بِهَا فَلاَ تَهْبِطُوا عَلَيْهَا. وَفِي البَاب عَنْ سَعْدٍ، وَخُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَجَابِرٍ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی نەخۆشی (طاعون)ی کرد، فەرمووی: (باقی سزایەکە خوای گەورە ناردی بۆ کۆمەڵێ لە بەنی ئیسرائیل، ئەگەر لەشوێنێ بوون نەخۆشی (طاعون)ی تێدا بڵاوبوەوە لێی دەرمەچن، ئەگەر لەشوێنێکیش نەخۆشی (طاعون) بڵاوبوەوە مەڕۆن بۆ ئەو شوێنە).

## هەرکەسێ دیداری خوای پێ خۆش بێ، خواش دیداری ئەوی پێ خۆشە

٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ

١٠٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مِقْدَامٍ أَبُو الأَشْعَثِ العِجْلِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي مُوسَى، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ.

حَدِيثُ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە عویـادەی کـوڕی صـامیتەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرموویـەتی: (هەرکەسـێ پێـی خـۆش بـێ بەدیـداری خـوای گـەورە شـاد بـبێ، خـوای گـەورەش دیـداری ئـەوی پـێ خۆشـە، هەرکەسـێ دیـداری خـوای پـێ نـاخۆش بـێ، خـوای گـەورەش دیـداری ئـەوی پـێ ناخۆشە).

١٠٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ (ح) وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا ذَكَرَتْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ. قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، كُلُّنَا نَكْرَهُ الْمَوْتَ، قَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ، وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا بُشِّرَ بِرَحْمَةِ اللهِ وَرِضْوَانِهِ وَجَنَّتِهِ، أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ، وَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الكَافِرَ إِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللهِ وَسَخَطِهِ، كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ، وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ پێی خۆش بێ بەدیداری خوای گەورە شـاد ببێ، خوای گەورەش دیداری ئەوی پێ خۆشە، هەرکەسێ دیداری خوای پێ نـاخۆش بێ، خوای گەورەش دیداری ئـەوی پـێ ناخۆشـە). عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ فـەرمووی: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) ئێمـە مردنمـان پـێ ناخۆشە، فەرمووی: (ئەمە بەو جۆرە نیە، بەڵکو بەم شـێوەیە: کـاتێ کـە بـاوەڕدار موژدەی ڕەحمەت و ڕەزامەندی و بەهەشتی خوای دەدرێتێ ئەوە گەیشـتن بەدیـداری

خوای پێ خۆشە، خوای گەورەش دیداری ئەوی پێ خۆشە، بێگومـان کـاتێ کـافر و بێ باوەڕ موژدەی سزای سەخت و ناخۆشی و قار و غەزەبی خوای گەورەی دەدرێتێ ئەوە دیداری خوای پێ ناخۆشە، خوای گەورەش دیداری ئەوی پێ ناخۆشە).

## دەربارەی کەسێ خۆی بکوژێت نوێژی لەسەر ناکرێ

٦٨ – بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ لَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِ

١٠٦٨ – (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، وَشَرِيكٌ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، أَنَّ رَجُلاً قَتَلَ نَفْسَهُ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُصَلَّى عَلَى كُلِّ مَنْ صَلَّى إِلَى القِبْلَةِ، وَعَلَى قَاتِلِ النَّفْسِ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ أَحْمَدُ: لاَ يُصَلِّي الإِمَامُ عَلَى قَاتِلِ النَّفْسِ، وَيُصَلِّي عَلَيْهِ غَيْرُ الإِمَامِ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ خۆی کوشت، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی لەسەر نەکرد.

هەندێ لە زانایان ڕایان جیاوازە لەوبارەوە، هەنـدێکیان دەفـەرموون: هەرکەسـێ ڕوو بە قیبلە نوێژ بکات نوێژی لەسەر دەکرێت، هەروەها لەسـەر کەسـێ کـە خـۆی بکوژێت، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیسـحاقە، پێشـەوا ئەحمـەد دەفەرموێت: کەسێ خۆی بکوژێت ئیمام نوێژی لەسەر ناکات، غەیری ئیمام نوێژی لەسەر دەکات.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لەسەر قەرزار

### ٦٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الْمَدْيُونِ

١٠٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي قَتَادَةَ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِرَجُلٍ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ، فَإِنَّ عَلَيْهِ دَيْنًا. قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: هُوَ عَلَيَّ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بِالوَفَاءِ، قَالَ: بِالوَفَاءِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ، وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ. حَدِيثُ أَبِي قَتَادَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە جەنازەی پیاوێکیان هێنا بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نوێژی لەسەر بکات، فەرمووی: (نوێژ لەسەر هاورێکەتان بکەن، من نوێژی لەسەر ناکەم چونکە قەرزارە). ئەبو قەتادە فەرمووی: ئەوە قەرزەکەی لەسەر من بۆی قەرەبوو دەکەمەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (قەرزەکەی بۆ دەدەیتەوە؟) فەرمووی: بەڵێ، جا نوێژی لەسەر کرد.

١٠٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنِي أَبُو الفَضْلِ مَكْتُومُ بْنُ العَبَّاسِ التِّرْمِذِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمُتَوَفَّى عَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَقُولُ: هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ، فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِلاَّ قَالَ لِلْمُسْلِمِينَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ

عَلَيْهِ الْفُتُوحَ، قَامَ فَقَالَ: أَنَا أَوْلَى بِالمؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَتَرَكَ دَيْنًا عَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ نَحْوَ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَالِحٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، ئەگەر جەنازەی پیاوێکی قەرزاریان بهێنایە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی لەسەر بکات، دەیفەرموو: (کەسێ هەیە قەرزەکەی بداتەوە؟)، ئەگەر کەسێ ببوایە نوێژی لەسەر دەکرد، ئەگینا بە موسوڵمانانی دەفەرموو: (نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن). کاتێ کە خوای گەورە یارمەتی موسوڵمانانی دا ناوچەکانیان ڕزگار کرد و سامان و دارایی زۆر بوو، هەستا وتاری بۆدان و فەرمووی: (من بۆ باوەڕداران لەخۆیان لەپێشترم، هەر کەسێ لە موسوڵمانان وەفاتی کرد قەرزار بوو، قەرزەکەی لەسەر من، ئەوەی لەدوای خۆی ماڵ و سامانی بەجێهێشت بۆ میراتبەرانی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سزای گۆڕ

### ٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عَذَابِ القَبْرِ

١٠٧١ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا قُبِرَ الْمَيِّتُ، أَوْ قَالَ: أَحَدُكُمْ، أَتَاهُ مَلَكَانِ أَسْوَدَانِ أَزْرَقَانِ، يُقَالُ لأَحَدِهِمَا: الْمُنْكَرُ، وَلِلآخَرِ: النَّكِيرُ، فَيَقُولاَنِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ: مَا كَانَ يَقُولُ هُوَ عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَيَقُولاَنِ: قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُولُ هَذَا، ثُمَّ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا فِي سَبْعِينَ، ثُمَّ يُنَوَّرُ لَهُ فِيهِ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ، نَمْ، فَيَقُولُ: أَرْجِعُ إِلَى أَهْلِي

فَأُخْبِرُهُمْ، فَيَقُولاَنِ: نَمْ كَنَوْمَةِ العَرُوسِ الَّذِي لاَ يُوقِظُهُ إِلاَّ أَحَبُّ أَهْلِهِ إِلَيْهِ، حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ مُنَافِقًا قَالَ: سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ، فَقُلْتُ مِثْلَهُ، لاَ أَدْرِي، فَيَقُولاَنِ: قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُولُ ذَلِكَ، فَيُقَالُ لِلأَرْضِ: التَئِمِي عَلَيْهِ، فَتَلْتَئِمُ عَلَيْهِ، فَتَخْتَلِفُ فِيهَا أَضْلاَعُهُ، فَلاَ يَزَالُ فِيهَا مُعَذَّبًا حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَالبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَأَنَسٍ، وَجَابِرٍ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، كُلُّهُمْ رَوَوْا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي عَذَابِ القَبْرِ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکاتێ مردوو یان یەکێکتان خرایە ناو گۆڕەوە و نێژرا دوو مەلائیکەی ڕەشی دەم و چاو شین دێنە لای یەکێکیان پێی دەوترێ: مونکەر، ئەوی تریشیان پێی دەوترێ: نەکیر، دەفەرموون: تۆ لەژیانی دونیادا دەربارەی ئەو پیاوە - واتە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) - چیت دەوت؟ دەڵێ: بەندەو پێغەمبەری خوایە، (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، دەفەرموون: ئێمە زانیومانە کە تۆ ئەمە دەڵێی، لەپاشدا گۆڕەکەی حەفتا گەز بە حەفتا گەز بۆ فراوان دەکرێت، ئینجا بۆی ڕووناک دەکرێتەوە، لەپاشدا پێی دەوترێ: بخەوە، دەڵێ: با بگەڕێمەوە هەواڵ بدەم بە کەسوکارەکەم، دەفەرموون: بخەوە وەك خەوتنی ئەو زاوایەی کە لە پەردەدایە جگە لە خۆشەویسترین کەسی کەسێکی تر خەبەری ناکاتەوە، ئیتر بەردەوام لەسەر ئەو حاڵەتەیە هەتا خوای گەورە لەو جێگایەدا کە تێیدا ڕاکشاوە زیندووی دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر دووڕوو و مونافیق بوو دەڵێ: نازانم گوێم لێ بوو خەڵك شتێکیان دەوت منیش وەك ئەوەم دەوت، دوو مەلائیکەکە دەفەرموون: ئێمە زانیومانە کە تۆ ئەمە دەڵێی، بە زەوی دەفەرموون: خۆتی لێ بهێنەوە یەك، زەوی خۆی لێ

دەهێنێتەوە یەك پەراسوەکانی بەناو یەکدا دێن، ئیتر بەردەوام لەسەر ئەو حاڵەتەیە هەتا خوا زیندووی دەکاتەوە لەو جێگایەدا).

١٠٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، ثُمَّ يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەرکاتێ مردوو خرایە ناو گۆڕەوە و نێژرا بەیانیان و ئێواران جێگای خۆی لە بەهەشت یان لە دۆزەخ پێ نیشان دەدرێت، لەپاشدا پێی دەوترێ: ئەوە جێگاکەتە هەتا خوا زیندووت دەکاتەوە).

## دەربارەی پاداشتی کەسێ سەرخۆشی لە خاوەن پرسەیە بکات

٧١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَجْرِ مَنْ عَزَّى مُصَابًا

١٠٧٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَاللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ سُوقَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ عَزَّى مُصَابًا فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَلِيِّ بْنِ عَاصِمٍ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سُوقَةَ بِهَذَا الإِسْنَادِ مِثْلَهُ مَوْقُوفًا، وَلَمْ يَرْفَعْهُ. وَيُقَالُ: أَكْثَرُ مَا ابْتُلِيَ بِهِ عَلِيُّ بْنُ عَاصِمٍ بِهَذَا الحَدِيثِ نَقَمُوا عَلَيْهِ.

واتە: لە (عبد الله)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرموویـەتی: (هـەر کـەس سەرخۆشـی لـە خـاوەن موسـیبەتێ بکـاو دڵنـەوایی بکـا بەشـێوەیە پـەژارەی بڕەوێنێتـەوە ئەوەنـدەی خـاوەن موسـیبەتەکە پاداشتی بۆ دەنوسرێ).

### دەربارەی ئەوەی لەڕۆژی هەینیدا بمرێت

٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ مَاتَ يَوْمَ الجُمُعَةِ

١٠٧٤ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، وَأَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ سَيْفٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَوْمَ الجُمُعَةِ أَوْ لَيْلَةَ الجُمُعَةِ إِلاَّ وَقَاهُ اللَّهُ فِتْنَةَ القَبْرِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَهَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ رَبِيعَةُ بْنُ سَيْفٍ، إِنَّمَا يَرْوِي عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَلاَ نَعْرِفُ لِرَبِيعَةَ بْنِ سَيْفٍ سَمَاعًا مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لـە (عبـد الله)ی کـوڕی عـەمرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرموویـەتی: (هـەر موسوڵمانێ لە شەو و ڕۆژی هەینیدا بمرێت ئیللا خوای گەورە لە فیتنەو سزای گۆڕ دەیپارێزێ).

## دەربارەی زوو بەڕێکردنی جەنازە

٧٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْجِيلِ الجَنَازَةِ

١٠٧٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الجُهَنِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عُمَرَ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: يَا عَلِيُّ، ثَلاَثٌ لاَ تُؤَخِّرْهَا: الصَّلاَةُ إِذَا أَتَتْ، وَالجَنَازَةُ إِذَا حَضَرَتْ، وَالأَيِّمُ إِذَا وَجَدْتَ لَهَا كُفْئًا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَمَا أَرَى إِسْنَادَهُ بِمُتَّصِلٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمووە: (ئەی عەلی سێ شت دوامەخە: نوێژ کە کاتی هات یەکسەر ئەنجامی بدەن، جەنازە کە ئامادەبوو زوو ئەسپەردەی بکەن، بێوەژن ئەگەر هاوشانی خۆی دەستکەوت زوو لێی مارەبڕەن).

## باسێکی تر دەربارەی گەورەیی پرسە

٧٤ - بَابٌ آخَرُ فِي فَضْلِ التَّعْزِيَةِ

١٠٧٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَاتِمٍ الْمُؤَدِّبُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَتْنَا أُمُّ الأَسْوَدِ، عَنْ مُنْيَةَ بِنْتِ عُبَيْدِ بْنِ أَبِي بَرْزَةَ، عَنْ جَدِّهَا أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ عَزَّى ثَكْلَى كُسِيَ بُرْدًا فِي الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ.

واتە: لە ئەبو بەرزەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی،

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (هەر کەسێ سەرخۆشی لە دایکێ بکات کە منداڵێکی لەدەست دابێ و دڵنەوایی بکات بەشێوەیە خەم و پەژارەی سوك بکات لە بەهەشتدا پۆشاکێکی گەورە و بە بەهای لەبەردەکرێ).

## دەربارەی دەست بەرزکردنەوە لەسەر جەنازە

٧٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رَفْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الْجَنَازَةِ

١٠٧٧ - (حسن) حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ الْكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبَانَ الْوَرَّاقُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِي فَرْوَةَ يَزِيدَ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ زَيْدٍ وَهُوَ ابْنُ أَبِي أُنَيْسَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ فِي أَوَّلِ تَكْبِيرَةٍ، وَوَضَعَ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي هَذَا، فَرَأَى أَكْثَرُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنْ يَرْفَعَ الرَّجُلُ يَدَيْهِ فِي كُلِّ تَكْبِيرَةٍ عَلَى الْجَنَازَةِ، وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِلاَّ فِي أَوَّلِ مَرَّةٍ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ. وَذُكِرَ عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ قَالَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَازَةِ: لاَ يَقْبِضُ يَمِينَهُ عَلَى شِمَالِهِ. وَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنْ يَقْبِضَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ كَمَا يَفْعَلُ فِي الصَّلاَةِ. يَقْبِضُ أَحَبُّ إِلَيَّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی کرد لەسەر جەنازەیە، لە (الله اكبر)ی یەکەمدا هەردوو دەستی بەرزکردەوە، جا دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا.

زانایان رایان جیاوازە لەوبارەوە، زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جگە لەوانیش رایان وایە لەکاتی هەموو (الله اکبر)ێکدا هەردوو دەست بەرزدەکرێتەوە لەسەر جەنازە، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

هەندێ تر لە زانایان دەفەرموون: لە (الله اکبر)ی یەکەمدا دەست بەرزدەکرێتەوە، ئەمەش وتەی سوفیانی (ثوري) و خەڵکی کوفەیە. دەگێڕنەوە کە ئیبنو موبارەك دەربارەی نوێژی جەنازە فەرموویەتی: با بەدەستی راستی دەستی چەپی نەگرێ. هەندێ لە زانایان رایان وایە بەدەستی راستی دەستی چەپی بگرێ. (ترمذي) دەفەرمووێ: دەست گرتنم پێ خۆشترە.

٧٦ - بَابُ مَا جَاءَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ:

(نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ)

١٠٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (گیانی باوەردار پەیوەستە بە قەرزەکەیەوە هەتا قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە). واتە: حوکم نادرێت هەتا قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە .

١٠٧٩ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ

مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَهُوَ أَصَحُّ مِنَ الأَوَّلِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (گیانی باوەڕدار پەیوەستە بە قەرزەکەیەوە هەتا قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە).

به پشتیوانی خوای خاوەن دەسەڵاتی رەها بەرگی یەکەم تەواو بوو

سلێمانی ٢٠ / ١٢ / ٢٠١٥ ز - ٩ ی ربیع الأول ١٤٣٧ کۆچی.

# ناوەڕۆك

## ناوەرۆك

## ناوەرۆك

## باسەكانی نوێژ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم............ ١٢٧

## ناوەرۆك

## ناوەرۆك

## ناوەرۆك

## 

## دەربارەی باسەكانی جەژنی رەمەزان و قوربان ................ ٤٣٥

## باسەكانی نوێژی سەفەر............................... ٤٤٧

## ناوەرۆك

## باسەکانی رۆژوو لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم.........٥٥٨

## ناوەرۆك

## باسەکانی حەج لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم .... ٦٥٢

## ناوەرۆك

# ناوەرۆك

## 